186

2004

- دەوڵەت وەک بناغەی خواستی ئیرادەی ڕەها
- پەراوێزکردنی تەوتەمەکانی شیعری کوردی
- پۆست مۆدێرنیزم
- شێوازگەرایی و دەقی ئەدەبی



## دۆسییە

- دادگاییکردنی سەدام
- عەلی ئەشرەفی دەروێشیان



تابلۆی هونەرمەند: ئەرسەلان ئەحمەد

186
ئەیلول

**خاوەنی ئیمتیاز**

**سامی شۆڕش**
**وەزیری رۆشنبیری**

**سەرنووسەر**

**كاروان عەبدوڵڵا**

**بەرێوەبەری نووسین**

**سەلاح عومەر**

**بەرێوەبەری هونەری**

**سلێمان یاسین**

**سەرپەرشتی چاپ**

**نەوزاد سلێمان**

ناونیشان: هەولێر - شەقامی ئاراس - نزیک بەرێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر

سایتی گۆڤاری كاروان
لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت
www.karwang.net
Email: karwan@karwang.net
4450861 لە ناوەوە
Mobile 0032484450861 لە دەرەوە

چاپخانەی رۆشنبیری/ هەولێر

## لەم ژمارەیەدا

# جەنــگ هەمیشە جەنــگ

**هەر ئێستاکە هەڵبژێرە زوو مردن یا تەوێنێکی درێژخایەن! «نیچە»**



**هاشم سەراج**

جــــەنگ رۆمـــانێکی قـــەبارە مـــامناوەندی «١١٠» لاپەڕەیی چاپ و بلاوکراوەی ساڵی «٢٠٠٣»ی دەزگـای «ئاراس»ەو، دوایـن بـەرهەمـی ئـەدەبی «سەلاح عومەر»ی چیرۆکنووسە.

جــەنگ هەوڵێکە بۆ لێکدانەوەی چەمک و ماناکانی بوون و چارەنووس، یان راڤـەکـردنی هۆکـارەکـانی رووداوە تراژیدی و جەرگبڕەکانی ئەم سەرزەمینە پڕ مـیـحنەت و چەرمەسەرییە. ،هەروەها وێڵ و سەرگەردانبوونە بەدوای تەلیسم و جـادووی چەندین سـپـاردەو نهـێنی گەلێک کە لە چەشنی میراتێکی پیرۆز بۆ دوایـن فـــەرزەندەی خــانەوادەیەک دەمـێنێتــەوەو، ئەویش وەک رۆڵەیەکی خـاوەن بەهرەو خـەیاڵگەی شـیـعـری هێدی هێدی بەئەشکەنجەو خەمۆکی و نـیـگـەرانـی و دوودڵـی، بـەدوا رازو بەهاکـانی مـیراتەکەدا دەگـەڕێت، بەڵام کێ هەس وەڵامی پرسـیاری بەرپابوونی جەنگە هەمە چەشنەکـانی گـەردوون و وجوود بداتەوە، ئەوکاتەی خودی مرۆڤ عـیشق و ئەڤین و جوانی و مـیهـرەبانی لەکـیس دەدا، ئەژدەهاکی بوغـزو کـینە هەژمـوونی خـۆی دەسـەپێنێ و جـاڕی خـاپوورکـاری جـەنگ دەدا. جـەنگ سەرەتاییترین و دڕندەترین کـەرەستـەو ئامـرازی دنیـای بەرفـراوانی مـرۆڤـە و سـاتەوەختـەکـانی خـەلیـفـەیش پڕە لە جــــەنگ و وێرانکاری، جــــەنگی لەدەســـــتــدانی شـــۆرە ژنە شـــۆخ و قـــەشـــەنگەکـــان، جـــەنگی گـــاڕانە جیاجیاکانی ئەم سـەرزەمینە، جەنگی داگیرکەرە بەرژەوەند خوازەکان و نەتەوە مـافـخوراوەکـان، جەنگی خودو وشـەو دەربڕینی شـــەیدایی ئارەزووەکـــان، جـەنگی مـەزداپەروەران دژی کـەرپەن و هەرمـاس و ئەهریمەنڕەفتـاران، جەنگی سـەرمایەو سـامـان و سێکس و لەززەتە ئیـرۆتکیـیـەکـانی زیندەگی و مـەرگ و قـــەدەرو لە بەینچـــوون.. یەکـــەمین پرسـیـاری تێکسـتی جـەنگ گـەڕانە بەدوای دەراوی کانیلەو سەرچاوەی تۆڤ و ســـــەرجـــــەلەو بنەچەو رەچەڵەکی خـــانەوادەیەکی ئاوارەو بەلـەنگاز.. پرسـیـــارە.. ئەی دوایـن جـارو دەرەنجـام کێ بەرپرسی ئەو هەمـوو مـــەینەت و مـــەرگـــەسـات و چەرمـەسـەریـانەی چارەنووسی مـرۆڤـە؛ جـەنگ لە مـیـان هەڵدانی تێکستێکەوە پرسیارگەلێک دەوروژێنێت، تێکســـــتــــێک بەکەشوهەوایەکی فەنتازی و فرەدەنگی و گفتوگۆی دەروونی و مەنەلۆژو نوستال ژیاوە، مەودا تاریک تاریکەکانی خودو رێگا ئاڵۆزەکـــانی پرۆســەی نووسین دەبڕێت ، پرسیارە تایبەتییەکانیش بۆ بەر دیدەو زەینی خوێنەر جێدەهێڵێت.

سـەرەتا تێکست هەوڵ و کـۆششی خــولقــاندنی شــارێکی وەهمی و ئەفســـانەیی دەدات، کـــە ســـەراپای



ڕووداوەکـــان لەوێوە سەرهەڵدەدەن، کەچی (لە ئـەنجـــــامی لێـکدانەوەی هێـڵ و لاکێشـەو چوارگۆشەو خـــاڵ و وێنـەکـــان گـەیشـتـــوونەتە ئەو ڕایەی کە نەخشـەکە، نەخــشــەســازی شــارێکە، دەکـەوێتە ڕۆژهەڵاتی دەریای ئیـــجـــەو بەلای دەوڵـەتی یـۆنانـەوە دەڕوانـێ **(لاپەڕە «٤٧»)**، بەڵام دوایـن جـــار هەست دەکــــرێت کــــە ڕووداوەکــان بەشـێـوەیەکی شەپۆلئامێز لەگیـان و زەینی هێـمنـترین و مـیـهرەبانـترین کــاراکــتــەری ڕۆمــانەکــە هەڵدەقـوڵێن کە گـێـڕەرەوەی سـەربوردەو بەسـەرهاتەکـانە، ئەمـــــەیش بەهـۆی هەوڵ و تەقـــەلای دنیـــای نیگەرانی کــوژێـتــۆی خـــەفـــەتبــاری شـیـعـرەوە، کـە پەیتـاپەیتـا هەوڵدەدات کـەسایەتییـەکان بدوێنێت و گـیـانی بیـمـاریان بەئاخاوتن بێنێت - ئەخاسما دڵ و دەروونی دایک - کـــە ئاگرینـترین گەنجینەیە کە لە ڕازو خـەفـەت و حەســرەت، بەردەوام بیـــر لە چارەنووسی فـــەرزەندە ڕفـــێنراوەکـــەی دەکاتەوەو فرمێسکی گەرمی بۆ دەڕێژێت و لە هەرسـات و چرکـەیەکـیش نێـوی دێنێ و

**ڕووداوەکان بەشێوەیەکی شەپۆلئامێز لەگیان و زەینی هێمنترین و میهرەبانترین کاراکتەری ڕۆمانەکە هەڵدەقوڵێن کە گێڕەرەوەی سەربوردەو بەسەرهاتەکانە**

لەگـەڵ سـەرپاکی یادەوەرییـەکـانیـا دەژیێت..

یا حاڵەتە پڕ میهرو ئولفەتییەکانی (پوور) کە دایکی (ئاز)ە هەردەم چرکە رام و هۆگـری و ژیاندۆسـتـیـیـەکـانی شەپۆلێک ڕەونەقی ڕۆح و شیعرییەتی لێ دەدرەوشێت، پوور تاڕادەی عیشق و ئەڤین و سەرگەردانی ئالوودەی ئەشتەباو شتگەلە تایبەتییەکانی نێو ماڵ و قاپ و قـاچاخ و هیـبـارو توحـفـەو کـوتاڵ و کەرەستەو نوێنەکانییەتی، کە هەرگیزاو هەرگـیـز بیـر لە شاڵاوەکـانی مـەرگ و قـەدەر ناکـاتەوە، ئەم ئاگـری عـیـشـقی گەشبینییەش لەهیچەک ئومێدو شادی و خۆشنوودی دەبەخشێتە گیانییەوە، بەڵام تا دێ ڕووداوەکان قوولتر هەڵدەکشێن و جەرگبڕتر دەکەونەوە.

- برایەکم هەیە بەنێـوی «عـەلی» ئەویش لەلایەن جەندرمەوە ڕفـێنراوە.. لەوساوە سەرو سۆراغی نییە.

- ئێـمــــە خـــەڵکی گـــوندێکی کوردستانی ئەودیوین.

- شەڕی یەکەمی جیهانی دایکم و پوورمی ئاوارە کردووە.

- پاش ڕفاندنی عەلی برام و مردنی باوکم.

- باوکم خاوەن زەوی و زار و باغ و باغات و مەزرایەکی زۆربوو.

- پوورم دەیگوت - مـرۆڤ مـاڵی نەبێ، مرۆڤ نییەو هەست بە ئاسایش ناکات.

بەڵام «عەلی» کێیە؟ یان تەقسی لە دایکبوونی عەلی وەک کەسایەتییەکی ئازاو چەلەنگ و جـــەربەزەو پیـــرۆز بەشێکی ئەم سیفەتانەی زێتر پابەندی چەمکی ئاونانەکـــەیەتی، بۆیە تا دێ خـــەســـڵـــەت و ئادگـارە ئایینی و خـاریق و خـورافـیــیـــەکـانی بەسـەرا دەسەپێنێرت (دایک.. عەلی لە خـەونمدا سـواری بوراقێ بووە بۆ ئێرە دەهات، جلێکی ســـپی ئاوریشـــمی ئەرمی پۆشی بوو و عـەباکـەی لەبەر شنەبا دەشنایەوەو جار جارە دەموچاوی لەژێر لێچەکەکەی دەردەکەوت، چەپکێ تیشکی پیرۆز لە ڕووخسارییەوە بەرز دەبۆوەو دەوروبەری ڕوونـاک دەکردەوە، ئالاسپی و سەوزو زەردەکەی دەستیشی هەنگاو بەهەنگاو پتر دەردەکەوت و بۆ پێـشـــەوە دەهات. لاپەڕە (١٣) دارژانی برگـەیەکی پڕ سۆزو میهرە لە دڵ و دەروونی دایکێـکی مـــیـــهـــرەبانەوە هەڵدەقوڵێت و پڕیەتی لە ئاهـ و حەسرەت و سوێ و سـۆزی ئاگـــرین کــــە تێکەڵ بە سیـاقەکانی زمـان دەبێت و، زمانێک لێوڕێژ لە ئەواکانی لیـریـک و سـۆزو خـەفـەت و لالانەوەو نزاو مـەحـەبـبـەت بەرانبـــەر بەرۆڵەیەکی ون و شـونبـزرکـراودا... ئاخـر (ئەوانەی «عـــــەلی» یان بـــەدەســـت و پــــێـــی کەلەپچـەکراوەوە ڕاپێـچاو بردیان... مــرۆڤ ئەبوون. گـورگ و دڕندە بوون عـەلی

سەنگەری لێ گرتن لە شەڕێکی بێ وێنەدا بەرگری کرد یەک دوانێکی لێ بریندارکردن، کە فیشەکیشی نەما.. هەڵیان کوتایە سەری دەست و قاچیان شەتەکدا).. ئیتر تا دێ کۆمەڵێک هێماو خەسڵەت و نادگاری ئەفسانەیی پەرجوئامێز ناوێتەی سەردەمی قۆناغی منداڵی عەلی دەکرێت.. (ئەو بەیانییەش کە عەلی برات تێیدا لە دایکبوو، بەیانییەکی ئاسایی نەبوو، بەیانییەک بوو گشت خەڵقەندەکانی دەوروبەر بەرزەپێ لەبەردەم دەرگای ماڵەکەمان وەستابوون.. جارجارە باڵندەکان تا سنووری گوندەکەمان، تا سنووری حەوشەکەمان دەهاتن ماوەیەک دەمانەوەو سەیری ژوورەوەیان دەکردو دەیانویست دەموچاوی عەلی ببینن، یا عەلی بیاندوێنێ و دوعایان بۆ بکات.

**لاپەڕە (١٦-١٧)** عەلی تا دێ سیفاتە موقەددەس و ئیلاهییەکانی پێ دەبەخشێنرێت دوای سێ مانگ گەیاندمانە ئەشکەوتی محیەدین خەنجەر.. کە لەو دیو چیای سپی بوو، ئەو ئەشکەوتەی لانەی دەیان ئازادی وەک باوکت بوو.. دەیان گوت لەوێ شەوان باپیرە گەورەی محیەدین خەنجەر زیندوو دەبێتەوەو دەست بەسەری ڕێبوارەکاندا دەهێنێ.. دەیانگوت محیەدین خەنجەر خۆیشی بەسەر ئەسپێکەوە لە ناوەندی ئەشکەوتەکە بەتیرو شمشێرو خەنجەرێکی دەسک زێڕەوە لەگەڵ کۆمەڵێک ئاسک و کەڵەکێوی شایی دەکەن و، ئینجا پێکەوە بۆ چیای سەرکەشی سپی دەچن و بەیانی زوو دەگەڕێتەوە دیمەنی ئەشکەوتی محیەدین خەنجەر، پانتاییەکی بەرفراوانی ڕۆمانەکە داگیردەکات و ئەو وەک پیرو پارساو زاهیدێک لە ئەشکەوتەکەدا ژیاوەو چەندین نەخۆش و دەردەدارو پەرکەمداری چاککردۆتەوەو، ئەمێستاش شوێن و قسن و مەزارەکەی پیرۆزەو شەفاگەی بیمار و نەزۆکی و نائومێدانە، ئاخر خەڵکی لەوێ لە دوور ئەم ئەشکەوتە مرازیان حاسڵ دەبێت «عەلی»یش هەر لەم کەشوهەوای ئەشکەوتە پیرۆزو دەمئامێزە چارەسەر دەکرێت و لەکوشندەترین درم و پەتای نەخۆشی ڕزگاری دەبێت، لێرەوە تەوژمی فەنتازیای کردەی نووسین




جۆرێک لە «ریالیزمی سیحری» بەرپا دەکات و، دەسەڵاتی خەون و خەیاڵ و ئەندێشەی لە هۆش بەدەر ئاوێتەی چەمکی موجزەو موقەددەس دەکرێت و، فەزایەکی ئەفسانەیش جیهانە تایبەتییەکەی نێو ئەشکەوتی محیەدین خەنجەر داگیردەکات، ئەشکەوتێک رووگەو پەرستگای تێکڕای کەسەکانی خانەوادەیەو ئەوان چەشنی موریدێکی بەئەمەک هەردەم نەزر لەخۆ دەگرن و کوشتوو و قوربانی بۆ پێشکەش دەکەن، تا مرازیان حاسڵ دەبێت... دیمەنێکی چکۆلانەی ئەم ئەشکەوتە (بەیانییان پێش ئەوەی بەخەبەر بێین و چاو بکەینەوە کەوڵە ئاسک و کەوڵە کێوی و کەوڵە نەهەنگەکان دەچوونەوە شوێنی خۆیان و بەدیوارەکانەوە هەڵدەواسرانەوە)، چونکە شەوان لە ئەشکەوتەکەدا (ئەو کەوڵانەی بەدیوارەکانەوە هەڵواسرابوون هەر لە خۆیانەوە دادەبەزین و دەهاتنە سەر لەشمان. بۆمان دەبوونە لێف و بەتانیەو لەسەرما دەیانپاراستین ئێمە لەبەر پیرۆزی دەستمان بۆ نەدەبردن). **لاپەڕە ١٨** تادێ پێوەندییە سۆزو ئولفەت ئامێزەکان دڵ و دەروونی عەلی ئاگرینتر دەکەن و، ئەو پێوەندییە ئەڤینی و میهرەبانییەی نێوان کار ئاسک و کەوڵە بەدیوار هەڵسراوەکەی دایکی و پاشان هۆگری عەلی لەگەڵ کار ئاسکەکە ئەو

لێکدانەوەی بوون و هەبوون و ڕووداوەکان لەدیدو گۆشەنیگای خودێکی پارچەپارچەکراوی نێو قەڕای دەقەوە سەرهەڵدەداو کە ئێروانینی خەفەتبارترین کۆزێتۆی شیعر و پرۆسەی نووسینە.

ڕۆژەی لەشكری جەندرمان بەگوند وەربوون و لەماوەی چاوتروكانێكدا عەلی و ئاسكەكەیان لەیەک جیاكردەوە (عەلییان بۆ دوور بردو بزریان كرد، كە تائێستاش نەگەڕاوەتەوە.

چونكە هێزی ستەم و شەڕانگێزی چركە ساتەكانی شادی و خوڕڕەم و خۆشنوودییەكانی ژیان لەنێو دەبات و خەریكە نرخ و بەها جوانەكانی بوون دەشێوێنرێت و بەرهەمی ماناكان لەكیس دەچێ. لێكدانەوەی بوون و هەبوون و ڕووداوەكان لەدیدو گۆشە نیگای خودێكی پارچەپارچەكراوی نێو فەزای دەقەوە سەرهەڵدەداو، كە تێڕوانینی خەفەتبارترین كۆژێتۆی شیعر و پرۆسەی نووسینە و، هەروەها هەڵگری دنیایەک كەڵكەڵەو ئارەزوو شەیدایی زەمەنە و یان هەڵوەدای گەڕانە بەدوای نرخ و بەها لە دەستچووەكانی ئۆخژنی و دڵنیایی و بەختەوەری، بۆیەش هەست دەكرێ چەند یەكەیەكی دانسقەو شاراوەو شڵەژاوی نووسین جارجارە بەپارێزەوە دەردەكەوێت یەكەیەک كە لێوانلێوە بەتەوژمەكانی گومان و ڕاڕایی و نیگەرانی ئەم حاڵەتەش لە هەندێ لاپەڕەو ڕستە و دەستەواژەدا جۆرێک لە تۆخم و ڕەگەزی شیعرییەت بەتێكستەكە دەبەخشێت و، زمانی گوزارشت و دەربڕین بەسۆزی تەژی لە ئەواز و لاوانەوە بارگاوی دەكرێت وەكیدی ئەوەی لە چۆنیەتی و بنەچەی لە دایكبوونی «عەلی» بكۆڵێتەوە بۆی دەردەكەوێت، كە عەلی و لەڕێگەی مرازو ئەزر لە خۆگرتن و هەزارویەک خۆزیاو خواستە و هاتۆتە دنیاوە. ئەمەیش وایلێكردووە كە مۆركی و خەسڵەتێكی پیرۆزو قەدەری بەكەسایەتیەكەی ببەخشێنرێت.. (دوای خواردنی كەرتە سێو عەلی كەوتۆتە سكی، یان بەرووت و قووتی لەبەر بای نیوەشەوێكی ساماڵدا لەبەر جریوەی ئەستێران وەستاوەو بەڵام وەستانێک لەسەر ترۆپكی چیای سپی.. یان بەخشینی سیماو خەسڵەتە مۆجزە ئامێزەكانی «مەسیح» بەكەسایەتیەكەی «كە عەلی لە دایک بوو عەلی چ عەلی دەتگوت مانگە و هەر لە یەكەمین چركە لە دایكبوونی لەتەنیشتمدا لەسەر سەبەتە هاتە خوارێ و كەوتە گڕوگاڵ و بەبەرچاوی من و ژنە دراوسێكانمان كەوتە قسەكردن یان بەرجەستە كردنی سیفاتە ڕامانئامێزەكانی «بودا» لەگیانی هەمان كەسایەتیدا.. «زۆرتر لە دەرەوە دەمایەوە. جاری وا هەبوو چەند ڕۆژێ لە دەرەوە دەمایەوە نەمدەزانی لەمێرگەكە دەمێنێتەوە یا دەچێتە شوێنێكی دیكە، ئەگەر لەماڵەوەیش بوایە سبەینان زوو دەچووە ناو باخچەكەمان و لەژێر دار هەنجیرێ دادەنیشت، هەردوو قاچی دەنووشتاندەوە و چوار مەشقی پشتی بەدار هەنجیرەكە دەدا، بێدەنگ دەیڕوانینە بۆشاییەكەی پێش خۆی و لە بۆشایی ڕادەما بێ هەست و خوست تا ئێوارەیەكی درەنگ بەو شێوەیە دەیڕوانی. **لاپەڕە (٨٣)** زۆرجاریش چركەی چاوەڕوانی عەلی و چەندین سیفاتی مودەقەددەسی لەدووتوێی كوپڵە شیعرێكدا بەرجەستە دەكرێت، یان سەرپاكی ڕووداوەكان بەچڕی و زمانێكی شیعر ئامێزی بروسكەیی دەردەبڕدرێت. چەشنی ڕۆمانەكانی كتۆلب و سیدهارتای هیرمان هیسە، لەڕوویەكی تر تێكستی جەنگ بەردەوام لەسەر بونیادی لوغزو هێما شاراوەكان كاردەكات، كۆمەڵێک ڕازو نهێنی لە شێوەی كۆدگەلێک جێدەهێڵێت، ئەم حاڵەتەیش پەیتاپەیتا جۆرێكە لە بەردەوامی و هەناسەو پشوو درێژی بەكردەی نووسین دەبەخشێت ئەخوازەڵلا میراتەكانی «باوک» كە بریتییە لە شمشاڵێک و پارچە كاغەزێک و سبیلێک بەس! چونكە (باوكت كە مرد ئەزەوی مابوو، نە مەڕوماڵات، ئەوەی هەیبوو

سەرپاكی ڕووداوەكان بەچڕی و زمانێكی شیعرئامێزی بروسكەیی دەردەبڕدرێت، چەشنی ڕۆمانەكانی كۆلێبەو سیدهارتای هیرمان هیسە، لەڕوویەكی دیكە تێكستی جەنگ بەردەوام لەسەر بونیادی لوغزو هێما شاراوەكان كاردەكات.

سووتا یا تالآنیان کرد، ئەوە جگە لەو وشکە سالیـیەی **لاپەڕە ٢٩)**، ئیتر چلۆن مامەڵە لەگەڵ میراتییەکانی باوک دەکرێتە پاڵەوانی شاراوەی رۆمانەکە چەشنی ئەکتەرێک ئێکسسواری میراتەکانی سەر شانۆ بەجووڵە دێنێت و، نیازیەتی لە بچوکترین نهێنی شتگەلەکان بگات، ئەم حاڵەتەش پەیوەستە بەساردەکانی باوکەوە.

یا ناشتنی تەرمی، باوک لە حەوشەدا کە چلۆن دایک دەتوانی ئەو هەوڵ و تەقەلایە ئەنجام بدات و دواین جارین هەلکشانی تەرمەکە رووەو ئاسمان بەشێوەیەکی جیاواز لە شێوە ئەفسانەییەکان کە چەشنی خەیاڵی یان ئەندێشەی زانستی تاقمێک بەتەنێکی رەش لاکێشەیی دێن و لە حەوشە دەنیشن و تەرمەکە دەرفێنن. باوک لەم رۆمانەدا لە پاڵ «عەلی» هێمای مرۆڤێکی ماندونەناسی ئازاو جەربەزەو تێکۆشەرەو بەردەوام داکۆکی لە زێدەو زاگەو مەفتەنە پیرۆزەکەی دەکات، ئەخاسما ئەو چرکە ساتانەی کە لەنێو رەزو باغ و باغاتەکاندایە گرنگترین هێمای ساتەوەختە خۆشەکانی ژیانی مرۆڤ لە (قۆناغی راووشکاردا) کە خۆشترین قۆناغی تێپەڕبوونی مرۆڤایەتییە.. کە بەشێوەیەکی بەرجەستە دەکرێت، مەرگی باوک هێمای مەرگی لە دەستدانی گوندو مەفتەن و بۆیە بەنرخترین و بەهادارترین دیاری کە بۆ رۆڵەکانی جێدەهێڵێت بریتییە لەو پارچە کاغەزەی کە بەشێوە زمانێک و رێنووسێک نووسراوە، ئەستەمە کەس بتوانێ هێماکانی راڤە بکات و دەلالەکان لێکبداتەوە (ئەو کاغەزەی وا ئێستا لەبەر دەستدایەو رۆژگار زەردی کردووەو هێندە کۆن بووە رەنگی لە رەنگی ئەو کاتە ناکات ئەوکات رەنگی پیت و ئەخشەو نووسینەکانی کراوە بوون و وا کاڵ نەبووبوونەوە شینێکی ئاسمانیان هەبوو، هێڵ و لاکێشەو چوارگۆشەکانی سەری بەقەڵەمی رەش کێشرابوون کاغەزو شمشاڵ و سبیلەکەم لەناو گۆڕەکە دەرهێنا...) بەڵام ئاوازی شمشاڵەکەی باوک تا دێ خەسڵەت و خاسیەتەکانی ئاوازی ئۆرفیۆسی وەردەگرێت (وەک دایکیشم گێڕایەوە رەنگە هەمان ئەو دەنگە بێ کە پاش هەلکێشانی تەرمەکەی باوکم لەگۆڕەکەی هەمان حاڵەت و چارەنووسی مەرگی مەسیح و ئیمامی عەلی - وەک سیفات بەکەسایەتی باوک دەدرێت. ئەویش سیفاتی هەلکشان و بەرزبوونەوەیە.. یان خەسڵەتە سوفیزمەکانی ئۆرفیوسی کە لە شمشاڵە بەهادارەکەیەوە بۆی جێهێشتووە، ئاوازە رۆحییەکان لەکوێوەوە دێن کام دەست و پەنجەو هەناسە ساردێک دەیژەنێ. سەر بهووردی کامە کارەسات و مەرگەساتێک بگێڕێتەوە. مەرگەساتی خەفەت و ئاوارەبوون و شونبزربوونی ئازیزان، یان دەستبەرداربوونی زێدو مەفتەنی باووباپیران.. وێڕای ئەمەیش ئاوازێکی وجوودییەو سەر بە دەڤەری خەفەتباری کۆژێتۆی شیعرەو کە خەیاڵگەی شیعرو نووسین هێندە کەسیرەو سەرمەست و خەمبارە ناتوانێ گوزارشت لە چەمکەکانی بوون و مەرگ و جوانی بکات تێکڕای خەفەت و ئارەزووە پەنهان و ئاگرینەکانی هەڵرێژێت و چەمکی هەڵچوون و راراییەکان هەڵبدات «هەمان ئاوازی کەمەرشکێن و خەمبار بوو کە لەکونە بچکۆلەکانی دارو بەردو خاکو خۆڵ و کەلوپەلەکانی حەوشەو ماڵەکانی بەر لە چل ساڵ خستبووە گریان و دادو فیغان) دایکم وای گوت... بێ ئەوەی کەسێ لە حەوشەکەمان هەبێ و فوو بەشمشاڵەکەوە بکات، بێدەنگی و تاریکی شەو بڕەوێنێتەوە.. دەنگێ ئاوازێ سەرسامی کردم.. وەک بۆنێکی خۆش لە کەللەی دام و بەناو دەمارەکانمدا شۆڕبووەوە.. تێکست بەشێوەیەکی کەرنەڤالی و بەردەوام توخم و هێما ئەفسانەیی و رۆحییەکان بەدنیای بەرفراوان رووداوو کەسایەتییەکانی رۆمانەکە دەبەخشێت، توخمەکانیش چەندەها دەلالەو رەهەندی جیاجیا لەگەڵ خۆدا هەڵدەگرن، بەڵام وەک ئەو گوفتارەی کە «میخائیل باختین» دەیدرکێنێ «کە هەموو تێکستێک خاوەنی چەند دەنگێکە یاخود چەند دەنگێک ناواخنی ئەو تێکستەی راگرتووە» دەتوانم بڵێم دەنگێک هەس خەفەتئامێزو خەفەتبار لە قوڵایی و جەنگەی کارەساتەکانەوە هەڵدەقووڵێت.. دەنگی ئەوی دییە وەک رامبۆی شاعیر ئاماژەی بۆ دەکات یان دەنگی منی شیعرو نووسینە.. زیندانەکانی سەڵتەنەتی عەقڵ و هۆشی تێکشکاندووەو زۆرجار لە شێوەی شەبەنگێکی درەوشاوە دەردەکەوێت و بەموسیقاکانی غەریزەو ئاگردکانی

زمانی ناخودئاگا لەرووداو کارەساتەکان دەدوێت و کاراکتەرو کەسایەتییەکان بەپەیڤین دێنێت و شەبەنگێکە رمووەدەی عیشق و جوانی و خۆشنوودییەکانی ژیانەو لەبەردەم چرکە میهرەبانییەکانی ئەڤین و حەسرەتەکانی دایکدا سەرگەشتەو حەیرانە... ئەو چرکە ساتەی لە پانتایی ئاسماندا وێنەی «کۆن و کوندەبوو» بەدیدەکات.. زەندەقرێژو دەسەپاچە بیر لە دڵاوایی و ماڵئاوایی دایک ددکاتەوە.

هەروەها گرنگترین کێشەی ئەم رۆمانە پابەندە بەرۆحی فیردەوسینی زێدو زاگەوە یا ئەو مەفتەنەی کە لە دێرزەمانەوە بەدکارو نەیارو داگیرکەران چاویان تێبریوودو هەوڵی چەپاوو تاڵان کردنیان داوە..

هەر ئەم هۆکارەشە وای کردووە. ناوازەترین و دانسقەترین میراتێک کە لە باوکەوە بۆ کور جێ بمێنێت وەک توحفەیەکی ئاڵۆزو قەشەنگ و بەهادار، یان چەشنی تەلیسم و جادوو و نوشتەیەکی پیرۆزەو کۆدگەلێک دەگەڵ خۆیا هەڵدەگرێت و وەک تێکستێکی ئاڵۆزو جوان ئەستەمە لوغزە ئاڵۆزەکانی راڤەو شی بکرێنەوە..

هەروەها رووداوو سەربوردە دڵتەزێنەکان هێندە بەئاه و سوێ و حەسرەتەوە لە زمانی دایک دەگێردرێنەوەو هێدی هێدیش یان لە پڕ دەنگ و گوزارشت و دەربڕینەکان لەکەسایەتییەکەوە بۆ کەسایەتییەکی دیکە دەگوازرێتەوەو هەندێ جاریش خەسڵەتی مەنەلۆژو گفتوگۆی رۆحی و فلاشباک.. دەسەپێنرێتە سەر دنیای دەق و جاریش هەیە بەتەقسێکی ئەفسانەیی رووداوەکان بەڕێوە دەبرێن ، بەڵام رەوشی خەفەت و کەدەرو حەسرەت و خەمۆکی سەرتاسەری رۆمانەکە داگیردەکات (کە دایکم بێدەنگ بوو، ئیتر منیش پرسیاری دیکەم لێ نەکرد، هەستامە سەر پێ و بەتانیەکەی سەر قاچی دایکم چاک کردو درێژم کردەوە رامکێشایە سەرسنگی، ئینجا بێ گەردو دڵپاکم بێدارکردەوە، کە ئەوانم بەخەبەر هێنا دایکم لەگێڕانەوەی سەربوردەی ژیانی خۆی و بەسەرهاتی مردنی باوکم و شمشاڵ و کاغەزەکەو رفاندنی عەلی تەواو ببوو لاپەڕە ٤١).

لەکۆتاییدا دەتوانم بڵێم، رۆمانی جەنگ هەوڵ و کۆششی کۆژێتۆی نووسینەو کە بەدوای تەنیایی و گومڕایی خۆیدا وێڵ و سەرگەردانە، کۆژێتۆیەک بەردەوام دەگەڕێ و لەنێو ماڵی وجوددا، تا بتوانێت لە دنیای ئازارو ئەشکەنجەو گیان بنووسێتەوە.

کەچی.. رەوشی جەنگ بەردەوامەو سەرلەبەری جێگەو شوێن و خودی کەسایەتییەکانی تەنیوەتەوە رەوشێک زۆرجار ئاوێتەو ئاوێزانی چرکەکانی قەدەرو ئەجەل دەبێ و لە پڕ مرۆڤە بێ گوناهەکانی لەنێو دەبات، وەک لەناکاو کوژانی «ناز» کە دایکی بێ گەردو دڵپاکە. هەروەها «ئیسماعیل»ی خەزووری «عەلی» کە دڵ و دەروونی مەکۆی سەربهووردو یادەوەرییەکانی جەنگ و وێرانکارییە.. هەروەها سەفەرەکانی جەنگ یان جەنگەکانی سەفەر کە گەڕانە بەدوای شوون و ئاسەواری باوک و چارەنووسی عەلی.. یا خۆ هەڵداشتنی مەم... تا.. بەڵام تێکستی جەنگ وێڕای ئەوەی کە بایەخی بەکاربردنی هونەری نامەو نامەگۆڕینەوەی داوە، زێتریش گرنگی بەدنیای شیعر داوە. جەنگ خەریکە لەمیان چەندین پەخشانە شیعرێک پوختەی رووداوو سیفات و خەسڵەتە دەروونییەکانی کەسایەتییەکان دەدرکێنێت، یان گوزارشت لە هەندێ لایەنی شاراوەی دەق دەکات، ئەمەیش هونەرێکە و زیاتر لە نۆڤلێتەکانی هیرمان هیسە»دا بەدیدەکرێت..

**بڕگەیەک لە**

**پەخشانە شیعری جەنگ**

**ماڵەکەی لێ کردمە مێرگێکی خۆشی پڕ**
**گوڵ و گوڵزار**
**پڕ ئاسکی خرین**
**پڕ نووری خوا**
**ئەم دەنگە خۆشە لەم کاتە پڕ ماتەمینیەدا**
**لەکوێ دەهات**
**لە قووڵایی دەریای رۆحی ئاسکە خرینەکەی**
**عەلی برام**
**یا لە لەگەرووی شمشاڵە بەجێ ماوەکەی**
**ناو گۆڕی باوکم**
**ئەم دەنگە خۆشە دنیای دەهێنایە هەژان**
**لەکوێ دەهات**
**لە سندووقەکەی تەرمی مەم**
**یا لە رۆحی پەپوولەیی دایکم**
**ئەو دەنگە خەم رەوێنەی لەو دیو سنوور**
**دەهات**
**رێ رێ وەک بۆنی هەڵاڵەو بەیبوون**
**دەڕۆیشت**
**دەهات و مەرگی دایکمی پیرۆز دەکرد**
**لە دووری هەزاران کیلۆمەترەوە**
**لە ئاسمانەوە**
**لەو دیو سنوورەوە دەهات و**
**دەیگوت مەرگتان پیرۆز**
**ئەی پەپوولە رۆح سووکەکانی بەهەشت.**

«لاپەڕە ١١٠»

# رامانێ بەئاقاری پێنج جمکە شیعری

# کەریم کاکە-دا

### دستپێک

لەم نووسینەدا، هەروەک شێوەی دەرەوەی نووسینەکە وا خۆی دەنوێنێ، مەخسەدم رەخنەکاری نییە، وەک چەمکی رەخنەیەکی رەخساو، بەڵکو نیازی من تێرامانێکی پیاسە ئاسایە بەمدیوی رۆحی شیعرەکاندا، دەخوازم بێژم: رەخنە نووسین ئەو گەمە ئاسانە نییە کە بێ روخسەتی هونەرەکەی خۆمی تێهەڵقورتێنم و لە ئاوکوفیدا بەخۆم بنازم، چونکە منیش پێموایە، ئەگەر شیعر هونەرێک بێ لەیاری، ئەوکات رەخنەش هونەرترە. بۆیە لەگینە رەمەکییەتی و پازیازوکانێی ئەم نووسینە ئاقاری ئاخی شیعرەکان و خودی شاعیریشی نەدۆزیبێتەوە. هەروا ناوی شوێن و تەمەنی شیعرەکانی بێسۆراغ لە چاوەڕوانی پرسیارەکان بهێڵنەوە لەوەدا پێموایە، شیعری شاعیر گەر مەرگەمووشی بازاڕی هەڕمێنی ئەتەکێت و بازرگانی بە رەوشتی شیعر نەسوابێ، ئەوە شیعرەکان بێگەردترین باڵانمای خودی شاعیرە.

کاتێک شاعیر راشکاوانە بە رووی ئەو ئاکارە کرێتانە راپەرموێ، چ دەخوازێ زێدە نووسی لە نووسین بکەین؟

لەوێ.

لەم وڵاتە مەرگ هەڕمێنەدا سەیر نییە کە تەقینەوەی تۆیەکان هەناسەی شیعریش شەهید دەکەن. کانییەک لەوێ لەو بنارە، درەختێک لە زەمەندێک، شیعرێک لە هەناوی قەڵەمێ، یان لەدوا ساتی گاگۆلکێدا کۆستیان لێدەکەوێ. کانی گۆزەیەکی لە دامێن دەشکێ و درەخت زەرد هەڵدەگەرێ و

### هەندرێن

شیعریش دەبێتە جوانەمەرگی شاعیر. لەو مەرگەساتەدا، شیعر لە دەروونی خەمگرتووی شاعیر دەپەنگێتەوە و. لە جوگرافیای ژانەکاندا دەجمجمێ و مانای هەبوونی کەسایەتییە گشتییەکەی دەسەپێنێ.

کە هەڵاتن لەشیعر مەحاڵ بێ، ئەوکات هەڵاتن لەبەر گوللەش لە مەحاڵ مەحاڵترە. ئەنجام هەبوون لەرووی ئەو رکبەرایەتییەی مەرگدا، دڵنیایی هەبوونی خۆی رادەگەیەنێ. تەمەنی شیعر لەم یەکانگیرییە تراژیدیایەدا هەراش دەبێ و دەروون لە هەستدا زاوزێ دەکا. لە هاقڕێکی زاناکاندا شاعیر ئاوێزانی تەنیاییە ئاپۆرەکەی: تاوانی مەرگ. مەرگی بەسەر خاک سەپێنراو، مەوتەن لە کروکپی دەروونیدا دەناڵێنێ و وەک سێبەری باڵای دادەپۆشن. دیسان ئەو مەرگە لە **لانکۆڵەی دۆڵی** نێوان کێوبشدا وازی **لێناهێنێت**.


کەریم کاکە

> **ڕەخنە نووسین ئەو کەمە ئاسانە نییە کە بێ ڕوخسەتی هونەرەکەی خۆمی تێیەڵقورتێنم و لە ناوکۆفیدا بەخۆم بنازم، چونکە منیش پێموایە، ئەگەر شیعر هونەرێک بێ لەیاری، ئەوکات ڕەخنەش هونەرترە.**

دیمەنەکان لەهەر کاتێک کە دیقەتی دەداتێ و دەیبینێ، خوێنییان لەبەردا دەچۆڕێ. شیعر تاقە دڵسۆزێکە کە ئازارگەرەکان دەخافڵێنێ هەموو ڕازەکانی تەنیان. تەنیاییش مامانی لەدایکبوونی شیعرەکانە ئەو تەنیاییە وێنەو پەیڤ و هارمۆنی و دارشتنی خۆی لە شیعرەکاندا دەدۆزێتەوە، یان (تۆماس مان) واتەنی: هونەر ئەو تەنیاییە کە لەدووتوێی تەنیایی و گۆشەگیریدا سەرلەنوێ لەدایک دەبێتەوە.(١)

تەنیایی و گۆشەگیری مەملەکەتی پڕ لە قەومانی(ک. کاکە)یە، ئەمەش خودی حەوسەڵەکەیەتی. مۆسیقاو نەزمی ئەو جمگە شیعرانە لەناو کوچەو دەروازەکانی دەروونی شاعیردا ئاوازێک دەژەنن، ئاوازەکەش ئەودیوی ڕووداوەکانی بەرچاوی خودی ئەون، کە گەمارۆی دەدەن و بەمەش شیعر لەدایک دەبێ.

هەر ئەو بارە ناسۆریانەشن کە داگیری دەکەن، ئەوجا هەستدەکا زەنگێکی خەفەزدن ئەو زەنگە لە بێدەنگییە تەنیایەکەیدا مژدەی لەدایکبوونێکی بێساتی شیعر دەگەیەنێ. لە ئەشکەوتی دەروونی شاعیردا، چاوەڕوانی و ئازار دووتای یەک مەسەلەن، ئازار بۆ چاوەڕوانی، چاوەڕوانیش بۆ ئازار. دواجاریش شیعر هەڵدەقوڵێن شیعریش ناو لە چاوەڕوانی دەنێت ماڵئاوا، لە ماڵئاواییشدا ئازارێکی دیکەو چاوەڕوانییەکی دیکە سەرەتاتکێ دەکەن. ئەم ئازارو چاوەڕوانییە، مایەی ژیاری مەرگەساتی بەرچاوی شاعیرە، کە بەم چەشنە لە هەڵچوونە هێمنەکەیدا بابەت، فۆرم و باڵای شیعر دەچننەوە. شاعیرش لەمەوتەنی شیعرەکانیدا بە دوای عەشقێکی مەحاڵدا ئازار دەچێژێ. ڕاستینەی عەشقیش، لەدیدی شاعیردا کۆتاییەکی بێ کۆتاییە، هەرگیز سەرەتای بەدوادا نایێت. شیعرەکانی سێبەرێکن هەرگیز لەسەرەمەرگ وجاغی مەوتەنەکەی جێناهێڵن. ئەم سێبەرەش تریوەی دڵی خۆیەتی، کە لێیدا بوونی ڕاستییەکان دەرک دەکرێت.

سەیرنییە کە(کەریم کاکە). لە نامەیەکدا دەڵێ: هەر لێرەم و دەستەبەرداری شاخان و مەرگی بەکۆمەڵ نابمەوە، چاوەڕوانی هاتنە دنیای کارەساتە گەورەکان دەکەم، با جارێ هەر لەناخی ئاخا بژیم.

* * *

کە دەچینە ئاقاری شیعری پەیکەری نسکۆ، هەستدەکەین کە چاوەڕوانی مەرگ، بەرجەستە دەکاتەوە. عەشق باڵای کێوە، کێویش مانای گەل و خاکەکەیە. شاعیر بۆ ئەوەی داخی نسکۆ گەورە بکا، خۆی دەکاتە پەیکەری ئەم نسکۆیە. هەستکردن بەو بوونە، بستەخاکی سەرسنوورە کە هەموو کەینونەکەی دەسەڵمێنێ، کەچی ئەو کەینونەش هەڕەشەی لێدەکرێت. ئەگەر ئەو خاکە داگیر کرا، هەبوون لە نەبووندا بۆ ئەو مانایەکی دیکە دەبەخشێ. بەرەنگاری لە بووندا سەدای بەرز دەکاتەوە:

**هەردوو پێم تا ژوور ئەژنۆ**
**لەگوێی کەنار ئەبنە ڕەگ و**
**خۆم لەخۆما ئەڕوێم...**

پەیکەری نسکۆ

گەمارۆدان هەبوونی رادەچڵەکێنێ، ئاوێزانی خاک بۆ بوونی ئەوە، کە بەرەگی مەمکی فرچکگرتوویدا دەچێتە نێو دەروونییەوە. دەزانێ دژ، لە دژەکەی ئەو بەهێزترە، بۆیێ لەرەگدا خۆی بەهێزتر رادەگەیەنێ، بەرامبەر ئەو هێزە دژە. لە ئاکامی ئەو مرکێش

مرکێشەدا، هەست پایەی پاسەوانی خودی ئەو وەردەگرێ، هەر جوولەیەک دەبزڤێ، رایدەچڵەکێنێ و لەسامی نەبووندا، بوونێکی دیکە دروست دەکا:

**دەنگەکان گەیشتن**
**وا چرنووک لە مۆخم دەنێن**
**و**
**هەڵوێستم رائەچەنن...**

«پەیکەری نسکۆ»

ترس هێزێکە بۆ بەرەنگاری، کە هێزی دژی داگیرکار دەیوروژێنێ و لەو چاوەڕوانییەدا، حاڵەتی قووچاندنی وەرگرتووە. هەڵکێشان لە رەگدا، هەستی رەهایی نەمانییەتی و ئیتر بۆ یەکجارەکی مەرگی لەسەرخۆ دەست پێدەکات.

ئەمجارە لە بەرامبەر ئەو هەرەشە دژەکارییەدا، شەپۆل دەبێتە وەرامی هەڵوێستی، شەپۆلیش هێزی گیانە. لێرەوە مەرگ دەکەوێتە گۆڕێ. دەروون و جەستە، دوو ئەندامی بینراو و نەبینراون، جەستە قەڵغانی دەروونەو تەوقەکەی سەر دەروونی پێدەرەتێنێ.

«کەریم کاکە» کێشەی مانەوە لەلایەک و داناتیش بە«نسکۆ»، کە بەرهەمی شۆڕشێکی چەکداری بوو، بەنسکۆ کۆتایی پێدێنێ. لەلایەکی دیکەشەوە، ئەو لە تراژیدیایەکی هەڵچووی دەروونییەوە نسکۆ دەردەبڕێ و خۆی دەکاتە ئاکامی ئەمەو دەڵێ:

**ئەی شەپۆل**
**ها خوێنەکەم**
**با سپاردەی تۆ بێ،**
**لاشەی رەقهەڵاتووشم**
**لە سێبەری ئەم دوندە**
**سەرکزە**
**با پەیکەری نسکۆ بێ!**

«پەیکەری نسکۆ»

لە لووتکەی هەڵوێستی نسکۆدا، کە ئاکامێکی هێندە دڵتەزێنە، بێعاری مانەوەی لەدوای ئەو کۆستەدا جەستەی مۆمیایی دەکا. سێبەری تاریکی و دوندی بێزار، هێمای مەبەستەکەی تەواو دەکەن، کە رەنگدانەوەی دوای نسکۆکەیە. نسکۆ قۆناغێک لە شیعرەکەو لە نەتەوەی، بۆ دەستپێکردنەوەیەکی دیکە، کۆتایی پێدێنێ.

* * *

فەروخزاد، سەبارەت بە راستگۆیی شاعیر لەگەڵ خۆی و شیعردا، گوتی: «هەندێ شاعیر هەن رەفتاری رۆژانەیان هیچ پەیوەندییەکیان بەشیعرەکانیانەوە نییە، تا شیعر دەنووسن شاعیرن، پاشان تەواو دەبن» ئەم گوتەیەی فەروخزاد، سەبارەت بە (کەریم کاکە) بۆ ویستی مەبەستەکەی دیکەی، دووتای هاوسان پێکدێنێ: بابەت ئەون. ئازار هەمیشە لەودا دەتەقێتەوە، لە کرداری شیعردا وێنای دەکا.

لەشیعری «هەورە کولێرە»دا بۆ قڕکردنی وەرزی برسییەتی، چاوەڕوانی بارانە، باران نانەو مەرگ دوور دەخاتەوە، یان نەخشەی وڵاتەو لە زەویدا دەسووتێنێ و دەبێتە پەڵەهەور، لە ئاسمانەوە بۆ خاکی مەبەست دەگرێتەوە. تەنیایی دەروون باڵای شاعیرن، لە مۆسیقای چاوەڕوانی بەفربارینداائازاری برسییەکان رادەژەنێ:

**بەفرانبارەو**
**تۆ شێوەی نەخشی وڵاتم بگرە...**
(هەورە کولێرە)

خاکی وڵاتی شاعیر کە سوتماکە، وشەی خۆڵەمێشی نەبێ چ رەنگ و وشەی دیکە، دەتوانێ رەنگی ئەم خاک و دەروون و وێنەو دنیای بەرچاوی بکێشێ. رەهایی مەسەلەکان خۆڵەمێشین؛ برسییەتی هەرەشەی مەرگ دەکاو خەونی نان یاسای وەرزەکان وێکدێنێتەوەو جەمسەرەکان نامێنێ. شیعر کۆلیرەیە و لە هەستی شاعیردا دەبارێ و خەونەکان دەکاتە

**لە نەشکەوتی دەروونی شاعیردا، چاوەڕوانی و ئازار دووتای یەک مەسەلەن، ئازار بۆ چاوەڕوانی، چاوەڕوانیش بۆ ئازار.**

بەرتەکی داگیرکردن و نکۆڵی لە کەسایەتی هەبوونی نەتەوەی کورد، گیانفیداکاری و سووربوونە لەرووی داگیرکاراندا، بۆیە شاعیر، لە «کەمەربەندی سوور»دا، لە روانگەی ئەو مێژووە راستینەوە، رووداوێکی راستینە دەخاتە ناو دیمەنێکی ترازیدی شیعرییەوە.

راستی:

**بە کولێرەیەکی گەرم**
**رێیەندانێ**
**بۆ ئەم برسیەتییە سامناکە**
**بنێتەوە..**
(هەورە کولێرە)

خودی شاعیر برسییەکە لە برسییەکان. تارمایی برسیەتی دەیان مرۆی وڵاتی ئەویان راونەکردبا، چۆن سکی تیر ئاگای لە سکی برسی دەبوو؟ ئەم پەلەهەورە وڵات ئاسایە بۆ لەسەردەمی مرۆکوژیدا دەبێتە کولێرە؟ ئەگەر هەورە شیعر و هەمیش بیرۆکەی شیعر روخساریان رازاوەتر دەبوون.

* * *

چڕ کردنەوەی بیرۆکە، خەسڵەتێکی سەرەکی شیعرە، یان وەک سارتەر دەڵێ: «قارەمان ئەوەیە کە هەمیشە هزرەکانی چڕ دەکاتەوە». ئێمەش دەبینین کە شاعیر، لە شیعری «لە زمانی...وە» دا بۆ دەوڵەیی و ماچەیی مرۆڤی شۆڕشگێر، کۆمۆنیستی چۆرتە، گیان و هەڵوێستی هەڵدەپشێون و ئەو بۆچوونە لە شیعردا چڕ دەکاتەوە، بەمجۆرە پشتینە و ریشە فەلسەفەی ژیانی دەکاتە وردە دەماری شیعرەکەی.

دیارە شاعیر خۆی لەریزی ئەو پارتەش کار دەکا، بەڵام ئەو مرۆڤە سادە و بەرژەوەندخوازە نییە، کە لە ئاست هەڵەکاندا وسکت بێ. بۆیە مەسەلە رەوایەکانی مرۆڤایەتی، لەپێشەوەیاندا مەسەلەی خود، چەک لە شانە بە گژ ستەمکاردا دەچێتەوە. کۆمۆنیستە و بەڵام فشەی بە کۆمۆنیستی فشەڵۆک و شۆڕشگێری درۆزن دێ. راستگۆیی کردەی ئەون، هەقیقەتی شیعرەکەیەتی، نەک وەک ئەو نووسەرانەی کە لە پێناوی بەرژەوەندی ژیانی خۆشی و هەڵاتن لە ئاودیوی لای ئێمە کراوە، تۆز لە رەخنە هەڵدەستێن.

کەچی ئەم شاعیرەمان «لە زمانی.. وە»دا، بە دربڕینێکی کاریکاتێر و هزر بیرۆکە ئامێز، رەخنە لە مارکسیستی لووسکە دەگرێ:

**بای.. بای**
**مامە مێژوو**
**شەوت شاد:**
**مرۆڤی یەک چاوی پێنج روو...**
(لە زمانی...وە)

کرداری ماچەیی لەمرۆیی گەرمەو لە بووی رێزی رێکخستنێکدا، نەخۆشیەکی گرێتە و لە پەروەراندنی خودی رێکخستنەکەوە دێتە بەرهەم. ئەندامی لەرزۆک کە زەمینەی لەبارە بۆ ئەو نەخۆشیە، زوو دەبێتە کاسەلێس و ماچە. کەریم بۆ ریسواکردن و بەگژداچوونی ئەو کارە دزێوە. مانتفێست و بناغەی فیکرەکەی خۆیان بەرووییاندا دەداتەوە. بە بسمیلدەکا. بێ بوونی هزر و پراکتیک، دان بە شتەکان نانێ، کە بەم وێنەیە بەهای رەخنەکەی خەتم دەکا:

**کێیە! لەم هەورە بخواتەوە**
**تا ئەسپە سورەی بۆ زین کەم!...**
(لە زامانی..وە)

* * *

لە «شەقامی نامۆیی»دا عەشق بۆ شار هەڵیدەگرێ، ئەمجارە شار دەبێتە هەناسەی شیعر. لەنێوان ئەو و ئەمدا، نامۆیی ئەو لەشاردا بە دیار دەکەوێت. نامۆیی و نامرادی لەودا لە هەر گۆشەیەکی ئەو دونیایە بێ هەستی پێدەکا، یان ئەو هەر خۆی نامۆییەکەیە و سیمای نامۆیی خۆی لە دیاردەکان دەچنێ و تامی ئازارەکان چێژدارتر دەکا. خۆ ئازاردان هەستێکە لە شاعیردا کە خۆشەویستە. ماخولیای دیواری ئەڤینە دوورەکە راپێچی دەکا و دەیبا بۆ شار، ئێوارەی شەقام دەبێتە زەمەنی ژوانەکەی. ئەم

«کـــــات»ەش ڕەنگی خـــــەیاڵ و ئەندێشەکانی شاعیرەو دەبێتە ڕەنگ و مۆسیقای شیعرەکە. بۆ خاتری نازار چەشتن لە دیداری ئەڤـــینداری، لە تەریبی شەقامدا بیردۆزی مەحاڵ دەبینی:

**ناشنای ئەم شەقامە نیم و**
**گەر دەزانی،**
**ئەم دوو شەقامە نیم و**
**گەر دەزانی،**
**ئەم دوو شۆستە هاوتەریبە**
**لە بووڵێلدا، وێک ناگەن و**
**شێوە ئەبرۆی تۆ ناگرن..**

(شەقام نامۆیی)

دیدار بۆ نازار تازەکـــردنەوەیە، تا خـۆی لە گـریانی نازاردا نقـووم بکا و ڕۆحی بشواتەوە. دەنا بۆشایی ئەمبەر و ئەوبەری شـەقـام، تەنیـا بۆ دابینکردنی مەبەستە. شاعیر نیگایەکی بەسەر بۆ تەڤـینەوەی نازارەکـەی و لە دونیـای تەنیایی شیعردا ئاشنا بێ.

* * *

بەرتەکی داگـــیرکـردن و نکۆڵی لە کـەسـایەتی هەبوونی نەتەوەی کـورد، گیانفیداکاریی و سووربوونە لە ڕووی داگـــیرکـاراندا. بۆیە شـاعـیـر، لە «کـەمەربەندی سـوور»دا، لە ڕوانگەی ئەو مـێـژووە ڕاسـتـینەوە، ڕووداوێکی ڕاستینە دەخاتە ناو دیەنێکی تراژیدی شـیعرییەوە. بۆ بەختکردن و سەپاندنی ئەم هەبوونە کوردییە، خۆکوشتن بە هەر ڕێـگـەیـەک بـێ بـەرزتـرین لـوتـکـەی هەڵوێســتی نازایەتی و بەرانگاریە لە تەک هەڵوێستە بەهێزەکانی دیکەدا. کیژێک بۆ خاتری نشتیمانەکەی خۆی دەسووتێنێ و بە گڕەکەشی پاسەوانی کوردستانەکە دەکا:

وێنەی ئەم سـووتانە، بەم سـەرەتایە، سووتانە شیعرییەکەش دەستپێدەکا:

**مەرگی دەنکێ شخاتە بوو**
**بەدوای نیگایەوە**
**ئۆقرەی نەدەگرت**
**خۆی لە پەنجەکانی هەڵدەسوو..**

(کەمەربەندی سوور)

هەڵوێست لە ئەنگوستیلەی موچرک دەچێ و هەموو گیانی دەگرێتەوە.

کـاری خـۆکـوشتن، زەمنەیەکی خـۆی هەیە لە ناو مـرۆڤدا، چونکە ئەم کـارە هەڵوێسـتێکی هێندە ئاسان نییـە، کـە هەر کەسێ بیەوێ ئەنجامی بدات. بڕیار وەرگرتنی خۆ سووتان. ڕەنگە بۆ مرۆی کـورد. بناغـەی پیـرۆزیـەتیـەکـەی لە ئایینی زەردەشتیەوە سەرچاوەی گرتبێ و تا ئێسـتـاش درێژەی هەیە. سـووتان لەو کـیــژەدا هێـدی هێـدی دەگـاتە تەقینەوەی هەموو دەنگەکانی دەروونی. (ک. کـاکـە) خـۆی لەم هەسـتە نزیکە، بۆیە لە شیعرەکەیدا. وێنەی ڕووداوەکە بە تێــــروانینی دەروونی خـــۆیەوە بەرجەستە دەکاتەوە:

**دوا موچرکە،**
**وەکو ئەنگوستیلەی شکاو**
**وا بە پەنجەی سەر بزێوەیەوە**
**هەناسە و ئەندێشەی دایسان...**

(کەمەربەندی سوور)

لێـرەدا دەبینین جـەمـســەری ساردو گـەرمی بڕوایەکـان پێکدەگـەن. ئیـدی داگــیـرسـان لووتکەی هەڵوێســتـە لە قــوربانیـــداندا. کــە لە بەرانبـــەر دوژمنەکەیدا ڕوودەدات.

هەڵبەتە ئەو خۆ سووتاندنە لە ڕۆژی نەورۆزدا ڕوویداوە. لە شـــــادی ئەم ڕۆژەدا. گـیـان بە ئاگـر گـرتنی دەروون شـاد دەبێت ئەمـەش هەسـتی پیـرۆزی مرۆی کوردە لە بەرانبەر نەورۆزدا.

ڕەنگیـن نووســـینەکــە لە ئاست شیعرەکاندا. قەڵەمکێشی بێ و لە دید و تێگەیشـتنی خـوێنەراندا تەبا نەبێ. دیارە ئەوە مـەزەندە و حـاڵی بووی منە لە ئاست شـاعـیر و جولەکـانی ناوەوەی شیعرەکاندا.

**زێدەرو پەراوێز**

- تۆماس مان، مەسەلەکانی ئەدەب، گۆڤاری بەیان.

- لە چاوپێکەوتنیـــێـک، کـــە بە کاسێت لامە، کە لەوێدا فروغ فروخزاد بە دەنگی خـۆی وەلامی ئێـرەج گـرگێن دەداتەوە.

- ژان پۆل سارتەر، بۆدلێر.

- بۆ زانیاری زێدەتر، ئەو شیعرانەی کەریم کاکە، لە گۆڤاری بانگ، ژمارە (١- ٢- ٣). گـۆڤـاری هەڵوێســتی ئەدەبی. ژمارە (٢-٣). گۆڤاری بیری نوێ، ژمـارە (٣١)، کــە لە کـــۆتایی هەشتایەکان دەردەچوون.

**بەهاری ١٩٩١**
**ستۆکهۆلم-سوێد**

## تێڕوانینێکی سەرپێی بۆ

# کلاسیزمی نوێ

## وشەی کلاسیک و ئەوانەی لەسەریان نوسیووە

ئا: عەبدوڵڵا سەبری

بەگشتی ئەوانەی لەم بارەیەوە دواون هەموویان لە مانای وشەکەدا یەک دەگرنەوە، کلاسیک یاخود کلاسیزم لە وشەی (کلاس)ی لاتینییەوە هاتووەو کە یەکێک لە ماناکانی (پارچەیەک کەشتی) دەگرێتەوە هەروەها هەندێکی تر دەڵێن: بەواتای (کۆمەڵێ دەریاوان) دێت لە پاشدا گۆڕاوەو بووە بەپۆلی خوێندن بەڵام ئاخۆ هەریەک مانای هەیە یا بۆ کۆمەڵێک شت و مەبەستی تر بەکاردێت؟ وەک کۆمەڵێک کەشتی، کۆمەڵێک قوتابی، پۆلێک، ئەو کۆمەڵە کەسەش کە چینێکی کۆمەڵ دروست بکات. هەروەها وەک زاراوەیەکی تایبەتی بۆ ئەو ئەدەبی کۆنی ئەغریقی و لاتینییەش بەکارهات کە لە پۆلدا دەخوێنرا، هەرودک بەناوەیەکەیدا دەردەکەوێت، مەبەست لەم ڕێبازە ئەدەبێکە بەرژەوەندی چینە دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵ بنوێنێ و تەنها دەستەیەکی هەڵبژاردە تێیبگەن، لەم دواییەدا لەم تێگەیشتنە کۆمەڵایەتیەی روون کراوەتەوەو وەسف کردنی (ئەدەبی بەرز) بەکارهێنراوە هیچ گومانیش لەوەدانییە کە ئەم ئەدەبە ئەدەبێکی دامەزراوو چەسپاوو پەسەندکراوی ئەوتۆ بوو کە دەستی رۆژگار نەیتوانیوە بیمرێنێ و نرخ و بایەخی زیندوی خۆی هەر ماوە، وەک چەند دەقێکی رەسەن و لێوەشاوە بۆ چەشتن و پەروەردەی نموونەی ئەدەبی بەکار دەهات و بەقووڵی دەخوێندرا.

هەروەها باوترین مانا بۆ ناوی کلاسیزم لەڕووی ئەدەبییەوە لاسایی کردنەوەیە، مەبەست لەمەش لاسایی کردنەوەی نموونە ئەدەبییەکانی یۆنان و شوێن پێ هەڵگرتنی ئەو دەستوورو یاساو سەرەتایانەیە کە (ئەرستۆ) لە کتێبی شیعردا باسی کردوون، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە ئەدەبی لاتین بەهۆی لاسایی کردنەوەی ئەدەبی یۆنانیەوە ئەشونمای کردو پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆوە دی، هەروەها ئەم ڕێبازە دەستنیشانی هونەری و مرۆڤایەتی تایبەتی خۆی هەیە کە بەپاکی زمان، رەوانبێژی پتەو دەکرێت بەبێ هەستکردن بەو داتاشینی وشەو زاراوە لە توێی نووسراوەکاندا بەمەرجێک لە تیۆرێکدا بێت کە ئەڵێت ئەو شتەی کە بەتەواوی هەستی پێدەکرێت شتێکە کە دەتوانرێت بەئاشکرا دەرببڕێت، بەم پێیە ئەگەر چاکی و پاکی دەربڕین کۆڵەکەی کلاسیزم بێت ئەوا ئەبێ روونی و ئاشکراییانە بێت بەشتی سەلماو، چونکە ئەبینین رەمزییەکان لالوتن لەم روونی و ئاشکرایە و دایدەنێن بەهۆی لاوازکردنی. بێ بایەخ کردنی ئەو ئەدەبەی کە تێئاکۆشێت بۆ گواستنەوەی مانایەکی تایبەتی یان دروست کردنی لەزاتی خوێنەردا. کلاسیزم بەڕووناکی عەقڵی دەدرەوشێتەوە، دوورە پەرێز لە توندوتیژی. لە شەپۆلی سۆز دەوەستێ،

بۆیە بەمـــــام ناوەند ناودەبرێت، لە کاتێکدا ڕۆمانسیزم جڵەو شل دەکات بۆ سۆزو ئەندێشەو خەیاڵ بەچەشنێک ئاگریان خۆشدەکاو گۆرانییان پێدا دەڵێ و پایە بەرزی مرۆڤایەتی و ڕەسەنایەتی لەوێدا دەبینێ.

ئێمە دەبێت سەبارەت بەکلاسیزم ئەوەمان لە پێش چاوبێت کە ئەو عەقڵەی ئەوی پێ دێتە دی بریتی نییە لە هۆشێکی ساردو سڕو بەس، بەڵکو عەقڵ و هۆشێکی گەرم و گوڕو بەوزەو بەتینەو کە لەوێدا خەیاڵ و بیرکردنەوەو هەست، یەکدەگرنەوە لە وەزعێکی بەرامبەردا وەک بڵێیت ئەدیبەکە بەدڵ بیردەکاتەوەو بەعەقڵ هەست دەکات و بەخەیاڵ ڕێبینی دەکات. کلاسیزم بەتەنها بەتەنگموشکیلەکانی دەگات، وەک مرۆڤ لەزاتی خۆیدا ئەوەک موشکیله و دەردی کۆمەڵگاکان ئەمەش بەپێچەوانەی ئەدەبی دەربارەوەیە کە تەنها بۆ مەبەستی ڕابواردن و چێژو خۆشی خستنە دڵ و پیاهەڵدانی سەردارانە.

**مێژووی سەرهەڵدانی ئەم ڕێبازە:**

ڕێبازی کلاسیزم، وەک بزوتنەوەیەکی بەتەوژم لە ئەورووپادا بووەو وردتر بڵێین لە ئیتاڵیا سەری هەڵدا، ئەورووپاییەکان کەوتنە ئەوەی خۆیان بەئەدەبی کۆنی خۆیانەوە ئەبەستنەوەو دەست بکەن بەوەرگرتنی بیرو فەلسەفەو داستان و کارەساتی ناو ئەدەبی یۆنانەکان و ڕۆمانەکان. ئەم بزوتنەوەیە لە سەردەستی (دانتی) خاوەن (کۆمیدیای یەزدانی) و تیرارک و پوکاشیۆوە بناوانەکەی هەڵگیرا بەتایبەتی دوای داهێنانی چاپ و بەهۆی دەربەدەربوونی زاناکانی (بیزنطە)و دوای داگیرکردنی (قسطنطینییە) ساڵی ١٤٥٣ و گیرسانەوەی ئەو زانایانە لە ئیتاڵیا، ئەم بزوتنەوەیە پەرەی سەندو فەرەنساو بەریتانیاو وڵاتەکانی تریشی گرتەوەو بەتەواوی بوو بەپێوانەیەک و زاراوەیەکی تایبەتی بۆ ناسینەوەو جیاکردنەوەی ئەدەبی کۆن و نوێ تا لەسەردەمێکی تازەکراو بەتایبەتی لە سەدەی هەڤدەهەمدا ڕەخنەگرو لێکۆڵەرەکان زاراوەی کلاسیزمی نوێشیان داهێناو داوایان لە شاعیرو نووسەرەکان دەکرد کە پەیڕەوی کۆنینەکان بکەن و لاسایی یۆنانەکان و ڕۆمانەکان بکەنەوەو بایەخی زۆر بەژیری و چەسپاوی و هێمنی بدەن، تەنانەت هونەرمەندکانیش دەستوری زۆر سەخت و گران و قایمیان بۆ شیعرو پەخشان دانا، وەک ئەو دەستورو مەرجانەی کە (بوالۆ) ڕەخنەگری ناوداری فەرەنسی بۆ شیعرو نووسینی دانا. ئەو شاعیرانە بەسایەتی شیعرو دەستوورە سەختەکانیانەوە لە ڕەشۆکی خەڵکەکە دابڕان و زیاتر بایەخیان بە ڕوخساری بەرهەمی ئەدەبی دا، نەک ناوەڕۆک..


مەحوی

کلاسیکیەتی تازە، یاخود کلاسیزم ڕێبازێکی ئەورووپی بوو تەنها بەیەک وڵاتەوە نەبەسترابۆوە هەرچەندە بەهێزترین دیاردەی لە فەرەنسادا دەرکەوت ئەمەش بەتایبەتی لە مەیدانی ڕەخنەی ئەدەبیدا نەک وەک ئەدەبیات، کلاسیکیەت لە بەریتانیا لاوازتر بوو وەک لە فەرەنسادا، بەڵام تەنانەت لە بەریتانیاشدا کارێکی گەورەی کرد بەسەر پەرەسەندنی مێژوویی ئەدەبی ئینگلیزی بەتایبەتی لەو سەد ساڵەی نێوان (١٦٦٠و ١٧٦٠)و ئەو دەروبەرانە.

کلاسیکیەتی تازە، ڕێبازێکی ئەورووپی بوو تەنها بەیەک وڵاتەوە نەبەسترابۆوە.

**خاسیەتەکانی کلاسیزمی کوردی:**

کلاسیزم بەرگێکە و هەر


نالی

ئەدەبەش بەقەد خۆی دەبیرێت و بەرگی هیچ کام لە ئەدەبی کلاسیکی گەلانی تر بەبەری ئەدەبی ولاتێکی تر نابێت بەواتا لە ١٠٠٪ لاسایی کردنەوە نییە، کلاسیکی کوردی ١٠٠٪ لاسایی کەرەوەی کلاسیکی لاتینییەوە بگرە زۆر تایبەتێتی خۆی دەستنیشان کردوە بەدرێژایی مێژوو، بەلام هەندێ مەرجی کلاسیکیەتی جیهانی تیا دەبینرێت لەگەل ئەو لادان و تایبەتمەندێتی خۆیدا، بەواتا ئەدەبی کلاسیکی کوردی هەم لادەرەو هەم پەیڕەو کەریشە ئەمانەی لە خواریشەوە بەخاڵ دەستنیشانی دەکەم هەندێکن لە تایبەتێتی کلاسیکی کوردی بەبەراوردکردنی لەگەل کلاسیکیەتی ئەورووپیدا:

> ئەدەبی کلاسیکی کوردی زۆر جیاوازە لە ئەدەبی کلاسیکی ئەورووپی و خاسیەت و تایبەتێتی خۆی هەیە کە لەوی جیادەکاتەوە.

**١- زمان،** ئەو زمانەی بەکارهێنراوە زمانی رەمەکی خەلکییە، بەلام وشە ئارایی و جوانکاری و بەلاغەکانی بەکارهێناوە، کە ئەمەش زمانەکە نەختێ ئالۆز دەکات و ئەدەبەکەش بەهەمان شێوە، بەواتایەکی تر: خەلکی ئاسایی تەنها لە (رووکەش) تێگەیشتوون و لە ناوەڕۆک و مەدلولە قولەکە نەگەیشتوون، تەنها لە توانای ئەوانە دابوون تێبگەن کە بەلاغەی عەرەبیان خوێندووە بەکورتی: «کلاسیکی کوردی زمانی بالای بەکارنەهێناوە بەلکو زمانە ئاساییەکەی خەلکییە بەپێچەوانەی کلاسیکیەتەوە کە دەبوو بەزمانی بالا بنووسرێت کە ئەویش لاتینییە).

٢- لە کلاسیکی کوردیدا سۆز مۆرکێکی دیاری لە شیعرەکاندا بەردەکەوێت لە زۆر پارچە شیعردا هەست و سۆزێکی هێند بەهێزی تیادایە کە کار لە مرۆڤ دەکات، ئەمەش پێچەوانەی کلاسیکی ئەورووپییە کە بەراوردی یەکەم بایەخ دەدات بەعەقل و فکر، وە سۆز فەرامۆش دەکات.

٣- دەبێت ناوەڕۆکی بابەت لە کلاسیکییەتدا یەک پارچە بێت واتە لە سەرەوە بۆ خوارەوە باسی یەک شت بکات، لای شاعیرانی لای خۆمان هەندێ جار ئەوە دەبینرێت و هەندێ جاریش یەکێتی دیرە شیعر هەیە کە هەر دیرە بۆ خۆی واتای خۆی دەدات ئەمەش لادانە لەکلاسیکیەت.

٤- بنەمای سەرەکی کلاسیکیەت لاسایی کردنەوەیە، شاعیرانی لای خۆمان ئەمەیان پەیرەو کردووە و کەم تا زۆر لاساییان کردۆتەوە، لاسایی شاعیرانی دەوروبەرو سەردەمی خۆیان و پاش خۆشیان، ئەمەش چ لەرووی شێوازەوە بێت یان کێش و سەروا وە لاسایی شاعیرە فارس و عەرەبەکانیان کردۆتەوە.

٥- بابەتەکانی شیعری کلاسیکی کوردی لەگەل کلاسیکی ئەورووپیدا یەک دەگرێتەوە کە ئەویش بەگشتی ئەم بابەتانەن: شیعری ئاینی، شیعری ئامۆژگاری و رەوشتی، ستایش و پیاهەلدان، هەجووکردن، گاڵتە، شیوەن، داستان.

**بەگشتی:**

دەتوانرێت بوترێت کە ئەدەبی کلاسیکی کوردی زۆر جیاوازە لە ئەدەبی کلاسیکی ئەورووپی و خاسیەت و تایبەتێتی خۆی هەیە کە لەوی جیادەکاتەوە، هەر شاعیرەش بەجۆرێک و بەپێی شارەزایی و رۆشنبیرێتی خۆی ئەو ریبازە بەکاردەبات. لە هەندێ شوێندا یەکدەگرێتەوە لەگەل کلاسیکییەتە ئەورووپییەکەداو لە هەندێ شوێنی تریشدا لادانێکی زۆر ئاشکراو روون بەدی دەکرێت ئەمەش نابێتە کەموکورییەک لە ریبازەکەدا، بەلکو بە پێچەوانەوە، کلاسیکیەتی کوردی تەنها بەچەمکە پەتییەکەی لاسایی کردنەوە

نەوەستاوە بەڵکو داهێنانی لەو بوارەدا کردووەو چەندین شتی نوێی هێناوەتە ناوەوە کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا تواناو شارەزایی شاعیران دەردەخات لەو بوارەدا.

**کلاسیک لە ئەدەبی کوردیدا:**

وەک ئاشکرایە سەرەتای ئەدەبیاتی کوردی بەکلاسیک دەست پێدەکات و ئەمەش هەر لە سەرەتاوە، بابا تاهیری هەمەدانی، و دواتر مەلای جزیری و نالی و مەحوی و تاد. ئەو رێبازەیان پەیڕەو کردووەو دوای ئەمانیش «حەریق و حەمدی و کەمالی.. هتد بەزیندو کەرەوەی ئەو رێبازەدا دەنرێن. هەموویان بە شوێن پێ هەڵگری ئەو رێبازو قوتابخانەیە دەژمێردرێن.

بێگومان ئەگەر بێتو ئێمە لە قوتابخانەی شیعری بابانەوە بچینە ناو باسەکەوە دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە ئەوان یاخود لەسەر دەستی «نالی و سالم و کوردی» بناغەی ئەو رێبازە زیندوکرایەوە بەکۆمەڵێ گۆڕانکارییەوە ئەمان هاتن لە زمانی کوردی زاری سۆرانییان بەکارهێناو کردیانە بناغەی ئەدەبەکەیان و دواتریش بووە پەیڕەوێک و هەموو شاعیران جێ بەجێیان دەکرد.

نالی و سالم و کوردی چراکەیان داگیرساندو تیشکەکەشی تا دوای سەردەمی خۆیان لەبرەو دابوو، نالی و سالم و کوردی بەشاعیرانی دەوری یەکەم دادەنرێن و هەرچی «وەفایی و حاجی قادر و حەریق و مصباح الدیوان و... تاد» ئەمان بەشاعیرانی دەوری دووەم دادەنرێن جا ئەگەر ئێمە بێین و بەراوردێک لە نێوان ئەو دوو دەورەدا بکەین کەم تا زۆر جیاوازی لە نێوانیان دەبینرێت، واتە لێرەشدا لە نێوان شاعیرانی یەک میللەتدا ئەدەبە کلاسیکیەکە تەواو و پڕاو پڕ لاسایی کردنەوە نیە، بەڵکو لێرەشدا لە نێوان شاعیرانی ئەم دوو دەورەدا لادان هەیەو شاعیرانی دەوری دووەم تەواو لاسایی شاعیرانی دەوری یەکەمیان نەکردۆتەوە، ئەمەش هەموو کات بەو جۆرە نیە.

کێشی شیعر لای شاعیرانی نیوەی یەکەم «نالی و سالم و کوردی» کێشی عەروزی عەرەبی بوو کە لە رێگای زمانی عەرەبی و فارسییەوە هاتبووە ناو کوردییەوە، شاعیرانی دەوری یەکەم زۆر بەتوانابوون لە بەکارهێنانیدا ،ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تواناو دەسەڵات و شارەزایی لە ئەدەبیاتی فارسی و عەرەبیدا هەروەها لە پاڵ ئەوەشدا یەکێ لە مەرجەکانی شاعیرێتیان بەجێ هێناوە، کە لەکۆندا دەبوایە شاعیر بەچەند زمانێ شیعر بنووسێت ئەمە بوە مەرجی شاعیرێتی لەو سەردەمەدا.

هەرچی شاعیرانی دەوری دووەمە بەدوو رێچکە باس دەکرێن، یەکەمیان: لاسایی کەرەوەی کێشی عەروزی عەرەبی وەکو شاعیرانی دەوری یەکەم، بەڵام هەندێ جار جۆرە لاوازییەک و کەم دەسەڵاتییەک دەبینرێت لای ئەمان واتە توانای شاعیرەکانی دەوری یەکەمیان نەبووە. دووەمیان: ئەو شاعیرانەی کە بەکێشی پەنجە (کێشی خۆماڵی) شیعرەکانیان نوسیوە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کەم دەسەڵاتی شاعیرانی دەوری دووەم لە بەکارهێنانی کێشی عەروزی عەرەبی یاخود دەگەڕێتەوە بۆ شارەزاییان لە ئەدەبیاتی گۆرانیدا، کە زۆربەی کێشەکان لەو جۆرەن. یان گونجاندنی کێشەکە لەگەڵ گۆرانی کوردیدا کە نەزمێکی رێکوپێکی داوەتێ یاخود هۆکارەکە دەگەڕێتەوە بۆ سووکی و ئاسانی نووسین بەو کێشە، واتە کێشدار نەبووە رەنگە ئەمە زۆر بەروونی لای «حاجی قادردا ببینین، لەبەر ئەوەی خاوەن بیرێکی تایبەت بووەو

> شاعیرانی دەوری یەکەم یەکێ لە مەرجەکانی شاعیرێتیان بەجێ هێناوە، کە لەکۆندا دەبوایە شاعیر بەچەند زمانێ شیعر بنووسێت.

هەروەهاش شیعرەکانی سیاسی بووە، لەبەرئەوە ویستویەتی ئەو بیرەی کە هەیەتی بەشێوەیەکی ئاسان بیگەیەنێتە خەڵکی بەبێ ئاڵۆزی، ئەم کێشە مەودایەکی بۆ کردۆتەوە بۆ ئەوەی چی ئەوێت بیڵێت بەبێ هیچ بەر بەستێک، یان ڕەنگە هەر لەبەر مەسەلە نەتەوایەتییەکە شاعیرانی گەڕاندبێتەوە سەر ئەم کێشە ئەمەش لای هەندێکیان وەک (حاجی قادرو گۆران)بەئاشکرا هەستی پێ دەکرێت بەڵام لای هەندێکی تر بەم جۆرە نییە.

سەروای شیعر، هەمان ئەو سەروا شیعرییەی لای شاعیرانی دەوری یەکەمیان بەکارهێناوە «هەمەڕەنگ، پاش قافیە، پێنج خشتەکی، غەزەل، قەسیدە..» ڕەنگە قافیەی ناوەوەشیان بەکارهێنابێت و دروستیان کردبێت ئەمەش لای «وەفایی» زۆر بەڕوونی و ئاشکرایی دەبینرێت، کە هەر بەمەبەست ئەم کێشەی بەکارهێناوەو قافیەی ناوەوەی بەکاربردووە. شێوازی سەروا لای وەفایی گۆڕانی تیا بەدی دەکرێن. واتە گۆڕانکاری لەسەروای پێش خۆیدا کردووەو بەجۆرێکی تر بەکاری هێناوە.

بابەتە ڕەوانبێژییەکانیش هەمان بابەتی ڕەوانبێژییەکەیە، کە «نالی و سالم و کوردی» بەکاریان هێناوە واتا حازر بووەو خۆیان هیلاک نەکردووە پێوەی، بەڵام هەندێ جار وێنەی شیعری جوانتریشیان دروستکردووە و هەندێ جاریش ئەوانەی ئەوانیان جوتەوەو ئینجا بەکاریان هێناوە واتە گۆڕانکارییان تیاداکردووە هەندێ جاریش هەمان تەشبیهو بابەتی ئەوانیان بەکاربردووە و هەندێ جار ئەوان بەهێزترو هەندێ جاری دیش لاوازتر.

زمانی شیعریش هەر هەمان زمانی شاعیرانی دەوری یەکەمە، بەڵام شاعیرانی دەوری دووەم وشەی کوردی نوێیشیان هێناوەتەکایەوە بۆ دەربڕینی هەستی شاعیرێتی و ئەمەش بواری بەکارهێنانی وشەی بێگانەی کەمکردۆتەوە واتە شاعیرەکان وشەکانی سەر بەبەشە زارەکەی ناوچەی خۆیان بەکارهێناودو ئەمەش بۆتە هۆی دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی.

شاعیرانی دەوری دووەم وشەی کوردی نوێیشیان هێناوەتەکایەوە ئەمەش بواری بەکارهێنانی وشەی بێگانەی کەمکردۆتەوە.

لەڕووی شێوازو هونەری شیعریشەوە هەر هەمان ناوەڕۆکی شیعری شێوازی شاعیرانی دەوری یەکەمیان پەیڕەوکردووەو شتێکی تازەیان نەهێناوەو تواناشیان بەسەریدا شکاوە وەکو ئەوان.

ناوەڕۆکی شیعری لای شاعیرانی دەوری دووەم هەمان ناوەڕۆکی شیعری شاعیرانی دەوری یەکەمە کە بریتی بووە لەمانە (غەزەل، دڵداری، وصف، شیعری ئاینی، شانازی، ستایش، داشۆرین، شیوەن، شیعری کۆمەڵایەتی، شیعری مەکشوف)، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە شاعیرانی دەوری دووەم وەک لەمەبەستەکانیان هەڵبژاردووەو تیایدا ڕۆچوون و تایبەتمەندێتییان تیایدا بەدەست هێناود، واتە لای شاعیرانی دەوری دووەم زیاتر ئەم شێوازانە گەیشتونەتە لوتکە، ئەگەر سەیری شیعری داشۆرین بکەین لای (نالی و سالم و کوردی) هەبووە، بەڵام بەشێوەیەکی کەم و تیایدا ڕۆنەچوون بەڵام لە قۆناغی دووەمدا لای (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) بەشێوەیەکی زۆر دیار دەبینرێت کە زۆرینەی شیعرەکانی لەم جۆرەن.

سەبارەت بەشیعری ئایینی لای نالی دەبینرێت، زیاتر لایەنی نوزاو پاڕانەوەی هێناوەو ئیشارەت پێدان بووە بەچەند ئایەتێک و ڕوداوێکی ئایینی، بەڵام لای شاعیرانی دەوری دوودم

مەسەلەکە هەروا نەمایەوە، واتە شاعیرەکە خۆی هەڵگری مەزهەبێکی ئایینیە وەکو (مەحوی) کە سەر بە (تەریقەتی نەقشبەندی) بوو شیعرەکانی ئەو مۆرکە ئایینیەکەیان پێوە بوو، هەروەها (حەریق) بەحوکمی ئەوەی ماوەیەکی زۆر لای (شێخ) بووە ئەمیش شیعری ئایینی زۆر بووە بەڵام مەزهەبەکە زۆر رەنگدانەوەی لای نەبووە.

شیعری نیشتمان پەروەری، لای شاعیرانی دەوری دووەم بەشێوەیەکی دیارو بلاو بەرچاو دەکەوێت، پێشەوای ئەم بزوتنەوەیەش (حاجی قادری کۆیی) کە ئەم شێوازە شیعرییەی هێندە فراوان کرد کە بۆ شاعیرانی دوای سەردەمی خۆی رێگای رۆشن کردەوە. شیعرەکانی حاجی هەم نیشتمانپەروەری هەم ستایشن بەم دوو رێبازە خزمەتێکی زۆری میللەتی کردووە.

شیعری دڵداری و لای شاعیرانی دەوری دووەم ئەم مەبەستە تەواو بلاوبۆوە یەکێکی وەکو (وەفایی) بەشاعیری دڵداری دادەنرێت. کە زیاتر شیعری دڵداری هەیە کە ئەمەش زۆرە بەنسبەت شاعیرانی ترەوە. هەروەها لای (مصباح الدیوان) خۆشەویستییەکی عوزری و پاکی بەدی دەکرێت وەلای (مەحوی)یش شیعری دڵداری دەبینرێت، بەڵام تەصومەژی زۆر تیایە و بەگران لە شیعرە تەصەوفەکانی جیادەکرێنەوە.

شیعری مەکشوف، لای (وەفایی) دەبینرێت، کە تەواو لاسایی (نالی) کردۆتەوە لە وێنەی شیعری و وشە ئارایی و جوانکاری، بەڵام بەرادەی ئەو نەیتوانیوە، واتە وەک نالی وەستا نەبووە.. هەروەها لای (ئەدەب - مصباح الدیوان) ئەم مەبەستە زیاتر رۆچوون و قووڵ بوونەوەی تیادایە.

وەسف، لای شاعیرانی دەوری دووەم تایبەتێتیکی خۆی وەرگرت، واتە نەک تەنها لە بەیتە شیعرێکدا وەسفەکە بکەن بەڵکو لە یەک پارچە شیعردا وەصفەکەیان تەواوکردووە.

واتە دەتوانین بەکورتی بڵێین:

شێوازەکان راستە هەمان شێوازی شاعیرانی دەوری یەکەم بوون، بەڵام شاعیرانی دەوری دووەم هەندێ جار شێوازەکەیان تێنەپەڕاندووەو ئەمان تایبەتمەندێتیان لە شێوازێکدا وەرگرتووە، وەکو شاعیرانی دەوری یەکەم نەبووە. واتە: مەحوی بە (متصوف) و شێخ رەزا بە (داشۆرین) و حاجی قادر بە (نیشتمانپەروەری) ناسراون، بەڵام هیچ کام لە شاعیرانی دەوری یەکەم بەیەکێ لەمانە نەناسراون.

**ئەنجام:**

**ئەوەی دەمەویست ئاماژەی پێ بکەم و لەدیدی خۆمەوە بڕیاری لەسەربدەم ئەدەبی کلاسیکە، کە مەفهوم و واتا گشتییەکە لە ئەدەبی یۆنان وەرگیراوە لەلایەن کوردەوە، بەڵام لە قالبی کوردیدا لەلایەن شاعیرانەوە بەکاربراوە مادەمیش هەموو گەلان لەسەر ئەوە ساغ بونەتەوەو بەدرێژایی کات بەو ئەدەبەیان وتووە کلاسیک ئێمەش هەروای ناو دەبەین و پێویست بەوە ناکات ئێمە بێین ناوێکی نوێ لەو داهێنانەی شاعیرەکانمان و لەو جۆرە ئەدەبە بنێین... چونکە بەراستی ئەو جیاوازییە هەر دەبێت و دێتە ئاراوە، ئەوەتا وەکو لێرەداو لەم راپۆرتەدا خستوومەتەڕوو جیاوازییەکە لە نێوان دوو قۆناغی کلاسیکیشدا دەبینرێت لەناو شاعیرەکانی خۆمان بە چ مانا ئەو جیاوازییە لە نێوان دو گەلدا نەیەتە ئاراوە؟؟!!**

**لە دوا** ستونیشدا دەمەوێت ئاماژە **بەوە بکەم** کە کلاسیک جوانترین **ئارایشی ئەدەبی کوردییەو تائێستەش رەونەق و بێژی و جوانتر و جوانتر دەبینێتەوەو هەرگیز کۆن نابێت و ئەو گەوهەرەیە کە لەسەر دەستی وەستاو شارەزای وەکو «نالی و سالم و کوردی»** و هاورێکانیەوە دارێژراوەو دروست کراوە، ئێستا وەستان وەک ئەوان شارەزامان نیە کە جۆرێک لەو گەوهەریە دابرێژێت، من بۆ خۆم هیوادارم بتوانم لە داهاتوودا توانام بخەمە کار بۆ ئەوەی شیعرێکی کلاسیکی بنووسم چونکە زۆر **تامەزرۆی ئەم جۆرە شیعرانەم.**

سەرچاوە
**١- دیداری شیعری کلاسیکی کوردی، حەمە سەعید حەمە کەریم.**
**٢- گۆڤاری بەیان، رێبازە ئەدەبیەکان، د. عبدالله دەباغ.**
**٣- دیوانی ناری، کاکەی فەلاح**
**٤- رەخنەسازی مێژوو پەیرەوکردنی، د. کامل حسن بصیر.**

# ئانازێگـەرز ١٩٠٠-١٩٨٣

## دەنگی زولالی چەوساوەو ئازادیخوازان

عومەر عەلی شەریف



ئەدیبی ناوداری ئەڵمانی، خاتوو ئانازێگەرز، یەکێکە لە نووسەرە هەرە دیارەکانی ئەدەبی سۆشیالیستی جیهانی لە سەدەی رابردوو کە تێیدا وەک رۆماننووس و چیرۆکنووسێکی بلیمەت و پێشەنگێکی لێهاتووی قوتابخانەی ریالیزمی - واقیعی - ناوبانگ و شۆرەتی دەرکردووەو لە گشت جیهاندا ناسراوە.



زێگەرز بە درێژایی تەمەنی پڕ لە بەرهەم و کۆشش و خەباتی نموونەی ئەدیبێکی داهێنەرو بەهرەمەند بوو، شۆڕشگێڕێکی کۆڵنەدەرو خەسڵەتبەرز بووە، بەردەوام داکۆکیی لە بوون و چارەنووسی میللەتی ئەڵمانی و مەسەلەی ئاشتی و سۆشیالیستی و مافی گەلان لە جیهاندا کردووە و هەرگیز کۆڵی لێنەداوە، لە هەمان کاتیشدا بڕواو هیوایەکی چەسپاوی بەئایندەیەکی بەختەوەر و ئاسوودە بۆ گشت مرۆڤایەتی هەبووە، ئەو هیوا بەرزە پیرۆزەشی لە زۆر نووسینەکانیدا بەروونی بەرجەستەیەو رەنگی داوەتەوە.

دیسان زێگەرز عاشقێکی رەسەن و دڵسۆزو راستەقینەی جیهانی کرێکارو چەوساوەو شۆڕشگێڕ و ئازادیخوازان بووە، هەر ئەو عیشقە رەسەنەش بوو پاڵی پێوەنا زوو بەزوو لە چینە دەوڵەمەندو بورجواکەی خۆی هەڵگەڕێتەوەو سەنگەری خەباتی دژ بە فاشیزم و نازیەت هەڵبژێرێت و، داکۆکی لە چارەنووسی گەلەکەی و چینەکانی ژێردەستەو زەحمەتکێشی تێکرای مرۆڤایەتی بکات و زۆربەی هەرە زۆری نووسینەکانی بۆ ئەو مەبەستە بخاتەگەڕ.

بەرهەمی خەرمانی ئەدەبی و هزریی ئەم خانمە مرۆڤدۆست و کۆڵنەدەرە بریتییە لە ١٧ رۆمان (یان زیاتر) و ژمارەیەکی زۆر چیرۆک و کورتە چیرۆک و بڕێک ئەفسانەو حیکایەت (هەڵبەت حیکایەت و ئەفسانە هەر لە بۆتەی چیرۆکدان و لێی بەدەرنین) جگە لە مانەش زێگەرز، زۆر وتارو توێژینەوەی لە بوارەکانی رەخنە، سیاسەت، مێژوو، زمانەوانی و هونەرە جوانەکاندا

نووسیوە. بەگشتی نووسینەکانی خاتوو زێگەرز، بەرهەمی خامەیەکی بەرشت ورەنگین، بیرێکی قووڵ و واقیعی، هەست و دەروونێکی پاک و بێگەرد، خەبات و تاقیکردنەوەیەکی دەوڵەمەند و بەهرەو سەلیقەیەکی ئەدەبی رەسەنن.

ئەوەی بەرهەمەکانی زێگەرز بخوێنێتەوە تێدەگات ئەم بەرهەمانە چەندە قووڵ و بەپێزو پڕ لە وێنەی ورد ورد جوان و پەندو ئامۆژگاری و حیکمەتن... تا چ رادەیەکی زۆر تەعبیر لە کەسایەتی مەزن و هەڵوێست و خەسڵەتە بەرزەکانی نووسەرەکەیان لە ژیاندا دەکەن... بە چ شێوەیەکی تۆکمەو کاریگەرو راستەوخۆ دایڕشتوون؟

زۆربەی ئەم بەرهەمانەی زێگەرز تا رۆژی ئەمڕۆمان، بۆ زۆر لە زمانەکانی گێتی وەرگێردراون و کەوتوونەتە بەر دەستی ملیۆنەها خوێنەرو خوێندراونەتەوەو دەخوێندرێنەوە، کەچی ئێمەی خوێنەرو رۆشنبیرانی کورد لە سوودو تام و چێژی ئەو بەرهەمانەو زۆر لە شاکارە جیهانییەکانی دی بێبەرین.

دیارە هۆکاری ئەم واقیعەش راستەوخۆ بۆ وەرنەگێرانی ئەو نووسینانە بۆ سەر زمانی کوردیمان دەگەڕێتەوە، رێژەی ئەوانەشیان وەرگێڕاونەتەوە سەر هەردوو زمانی عەرەبی و فارسی کە زۆرمان لێیان تێدەگەین و سوودیان لێوەر دەگرین هێشتا رێژەیەکی هەر کەمە.

## ژیاننامەی زێگەرز

ناوی راستەقینەی ئەم نووسەرە (نیتی رادفانی)ە، ساڵی ١٩٠٠ لە ئامێزی خێزانێکی دەوڵەمەند لە شاری (ماینس) بووکە رازاوەکەی رووباری راین، هاتۆتە دونیاوە، باوکی یەکێک بووە لە بازرگانە ناسراوەکانی ئەو شوێنەو بەکڕین و فرۆشتنی شتی عەنتیکەو ئاسەولری کۆن و تابلۆی هونەرییەوە خەریکبووە.

هەر لەو شارەدا (ماینس)، زێگەرز لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی تایبەتدا شانبەشانی رۆڵەی بەگزادە و بورجواو دەوڵەمەندەکان دەخوێنێت، دوایی لە هەمان شوێن لە ساڵی ١٩١٩ قۆناغی ئامادەیی تەواو دەکات و، لە هەردوو زانکۆی کۆلۆنیا و هایدلبێرگ، مێژووی هونەر، فەلسەفە و زمانەوانی دەخوێنێت، ساڵی ١٩٢٤ بڕوانامەی دکتۆرا لە مێژووی هونەردا بەدەستدێنێت، ئەوجا پەرە بەچالاکییە رۆشنبیری و ئەدەبییەکانی خۆی دەدات و لەو میانەدا سەردانی چەندین وڵات دەکات و، ساڵی ١٩٣٤، ئامادەی کۆنگرەی یەکێتی جیهانی نووسەرانی شۆڕشگێر لە شاری (خارکۆف) دەبێت. پاش ئەوەی نازییەکان لە ئەڵمانیا جڵەوی حوکم لە وڵاتدا دەگرنە دەست و دەکەونە گرتن و کوشتن و بڕینی هێزە دیموکراتی و ئازادیخوازەکان، زێگەرز مەردانە بەگژیاندا دەچێت و کردەوەکانیان ئیدانەو ریسوا دەکات، جا بەو هۆیەوەو لە ناکامی بیروباوەڕە پێشکەوتنخوازو شۆڕشگێڕانەکەیەوە دەکەوێتە بەر مەترسیی هەڕەشەی نازییەکانەوەو، بەندی دەکەن و نۆبەرەی نووسینەکانی دەسووتێنن، پاش ماوەیەک ئازادی دەکەن، بەڵام لێناگەڕێن بەئاسوودەیی و سەرفرازی بژێت و سەرلەنوێ نازی گرتنی دەکەن، وەلێ خۆشبەختانە ئەمجارە لە دەستیان دەرباز دەبێت و بەرەو وڵاتی فەرەنسا هەڵدێت و لە شاری (پاریس) نیشتەجێ دەبێت، ئیدی لەوێندەر پەرە بەخەبات و تێکۆشانی بێوچانی خۆی لە دژی نازییەکان دەدات، هەر لەو دەمەدا لە (پاریس) بەهاوکاریی نووسەرو رۆشنبیرە ئەڵمانییە پەراگەندەکانی دی، بەشداری لە دامەزراندنەوەی یەکێتی نووسەرانی ئەڵمانی و کۆنگرەی یەکەمی دەکات، پاش ئەوەی یەکێتی ناوبراو لە لایەن گۆبلز - وەزیری پروپاگەندەی هیتلەر - هەڵوەشابووەو پەکخرابوو.

دیسان لە پاریس، زێگەرز و هاوەڵەکانی لە ئەدیب و رۆشنبیرە فەرەنسی و ئەڵمانییەکان، ژمارەیەک سیمینارو ئێوارە کۆڕی ئەدەبی و فیکری ساز دەکەن و نامەو بانگەواز ئاراستەی کەسایەتییە رۆشنبیری و سیاسییەکانی جیهان دەکەن بەمەبەستی ئەوەی رووبەرووی مەترسیی نازییەکان ببنەوەو گشت خواست و تاوانە خوێناوییەکانیان مەحکوم و ریسوا بکەن.

هاوکات لەگەڵ ئەو چالاکیانەدا، زێگەرز شانبەشانی هەندێک لە هاوەڵانی، گۆڤارێکی ئەڵمانی بەناوی گۆڤاری (ئەڵمانی نوێ) لە شاری پراغ دادەمەزرێنن، ئەوجا ساڵی ١٩٣٤ زێگەرز بەشداری لە کۆنگرەی نووسەرانی ئەڵمانیا لە شاری ڤییەنا دەکات.

ساڵی ١٩٣٥ زێگەرز ئامادەی یەکەمین کۆنگرەی نووسەرانی جیهانی لە شاری پاریس دەبێت کە لە ژێر دروشمی داکۆکیکردن لە رۆشنبیری، دەبەسترێت، هەر لەو کۆنگرەیەدا زێگەرز وتارێکی یەکجار کاریگەر لە ژێر ناونیشانی (خۆشەویستی نیشتمان) پێشکەش دەکات و تێیدا لەمەڕ چارەنووسی ئەدیب و شاعیرە ئەڵمانییەکان لەسەردەمی نازییەکاندا دەدوێت و دەڵێت: هۆلدرلین بەشێتی مرد... بوشنەر لە ژیانی تاراوگەییدا عەقڵی لەدەست داو مرد، کارۆلین تەندوبەش خۆی کوشت، ئەو شاعیرە ئەڵمانییانە بەراستی و دروستی سروودی نیشتمانی ولاتەکەیان تۆمار کرد.

بەهەمان شێوە، زێگەرز (ساڵی ١٩٣٨) لە کۆنگرەی دووهەمی نووسەرانی جیهان لە شاری (مەدرید) پاشان لە کۆنگرەی سێهەمدا (لە شاری پاریس) بەشدار دەبێت، ئەم دوا کۆنگرەیە (واتە کۆنگرەی سێهەم) هەڵمەتێکی ئەدەبی چروپری دژ بەنازییەت پەیرەوکرد.

پاش داگیرکردنی ولاتی فەرەنسا لەلایەن ئەڵمانیای نازییەوە (ساڵی ١٩٤٠) داروودەستەی گوستابووی بەدناوو خوێنرێژ (دەزگای پولیسی نهێنی نازییەکان) دەکەونە گەڕان و پشکنین بە دوای زێگەرزدا، وەلێ ئەم زوو فریای خۆی دەکەوێت و پەنا بۆ ئەو بەشەی فەرەنسا دەبات کە هێشتا داگیرنەکرابوو، لەوێ لە شاری (مارسیلیا) ساڵێک بەسەر دەبات، دوایی روو دەکاتە ولاتی مەکسیک کە باوەش بۆ چەندین پەناهەندەی هاوچەشنیزێگەرز دەکاتەوە و دەبێتە نیشتمانی دووهەمیان و پێداویستی ژیانیان بۆ فەراهەم دەکات، ئیدی زێگەرز لە شاری (مەکسیکۆ) سەقامگیر دەبێت، لەوێوە بەوردی موتابەعەی هەواڵ و پێشهاتەکانی جەنگی جیهانی دووهەم دەکات، هاوکات بە ئەوپەڕی بایەخ و لەخۆبوردووییەوە لە ژیان و حاڵی ئەدیب و نووسەرە ئەڵمانییە پەناهەندەکان دەپرسێتەوەو کاروباری ژیانیان بۆ رێکدەخات، ئەوجا پێکەوە بزوتنەوەی (ئەڵمانیای ئازاد) پێکدێنن، ئەم بزوتنەوەیە هەڵدەستێت بەدەرکردنی گۆڤاری (ئەڵمانیای ئازاد) کە لەسەردەمی خۆیدا گرنگترین گۆڤار بوو بۆ ئەوانەی لە دۆزەخی نازییەت هەڵاتبوون.

هەر لەو سەروبەندەدا زێگەرز دەبێت بەسەرۆکی یانەی (هاینرش هاینە)ی دژ بە فاشیزم لە ولاتی مەکسیک.

پاش کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووهەم و رووخانی دەسەلاتی نازییەکانی ئەڵمانیا بەدوو ساڵ (واتە ساڵی ١٩٤٧)، زێگەرز بۆ ولاتەکەی دەگەڕێتەوەو لە شاری بەرلین - پایتەختی کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی جاران - جێگیر دەبێت و تێیدا لەسەر چالاکییە سیاسی و رۆشنبیری و ئەدەبییەکانی و خزمەتکردنی رەوشی ئاشتی سۆشیالیستی لە جیهاندا بەردەوام دەبێت و، وەکو ئەندامێکی کارای ئەنجوومەنی ئاشتیی جیهانی لە زۆربەی کۆنگرەکانی ئەو ئەنجوومەنەدا بەشداری دەکات.

ساڵی ١٩٥٠ زێگەرز بە سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی ئەڵمانیا (مەبەست ئەڵمانیا رۆژهەلات) هەڵدەبژێردرێت، دیسان لە گشت کۆنگرەکانی یەکێتی ناوبراودا تا ساڵی ١٩٧٨ شەرەفی هەمان ئەرکی پێدەسپێردرێتەوە، ئەوەبوو لە کۆنگرەی هەشتەمدا (ساڵی ١٩٧٨) دەستکێشانەوەی خۆی لەو ئەرکە بەهۆی باری تەندروستی و گەورەیی تەمەنییەوە، رادەگەیەنێت، ئامادەبووانی کۆنگرەی سوپاس و ستایشێکی زۆری لێ دەکەن و خزمەت و هەڵوێستەکانی بەرز دەنرخێنن و

بەسەرۆکی فەخریی یەکێتیی نووسەران دەستنیشانی دەکەن.

هەر لەو دەمـەدا (واتە پاش گەڕانەوەی بۆ ئەڵمانیا) زێگەرز گەلێک خەڵات و پاداشتی بەنرخی پێدەبەخشرێت، وەک خەڵاتی پۆشنەر ساڵی ١٩٤٧ (بۆ رۆمانی: خاچی حەوتەم)، خەڵاتی لینین بۆ ئاشتی ساڵی ١٩٤٩، سێ جار خەڵاتی نیشتمانی بۆ هونەرو ئەدەب لە ساڵەکانی ١٩٥٤، ١٩٥٩، ١٩٧١، پلەی دکتۆرای فەخری لە زانکۆی ڤییەننا، ساڵی ١٩٥٩ ... شایەنی باسە یەکەمین خەڵاتی ئەدەبی زێگەرز وەریگرت، خەڵاتی کلایست، بووە کە لە ساڵی ١٩٢٨دا بەهەردوو نۆبەرەی چیرۆک و رۆمانەکانی (چیرۆکی کروبیج و رۆمانی راپەڕینی ماسیگرەکان لە سانتاباربارە)، بەخشراوە.

ساڵی ١٩٨٣، زێگەرز، لە پاش تەمەنێکی پڕ لە کۆشش و خەبات و سەروەری کۆچی دواییدەکات و لەپاش خۆی گەنجینەیەک، لە یادو هەڵوێست و نووسینە بەنرخەکانی بۆ گەلەکەی و دۆست و شەیدایانی هونەرەکەی لەسەرتاسەری دونیادا، بەجێدەهێڵێت.

## شاکارەکانی زێگەرز

وەکو وتمان، لیستی بەرهەمە چیرۆکەکانی ئانازێگەرز پتر لە ١٧ رۆمان، کۆمەڵێکی زۆر چیرۆک و کورتە چیرۆک و ژمارەیەک حیکایەت و ئەفسانە لە خۆ دەگرێت. بڕێک لەم رۆمان و چیرۆکانە شوێنێکی شایستەیان لەنێو شاکارە ئەدەبییەکانی جیهاندا هەیە و شۆرەت و ڕێزێکی بەرچاویان بەخاوەنەکەیان بەخشیوە. کاتێکیش لە شاکارەکانی زێگەرز دەدوێین، دەبێت سەرەتا ئاماژە بکەین بەنرخ بایەخی هەردوو نۆبەرەی بەرهەمەکانی؛ چیرۆکی (کرویج) و رۆمانی (راپەڕینی ماسیگرەکان لە سانت باربارە) لە ژیانی ئەدەبیی نووسەرەکەیاندا، چونکە ئەم دوو شاکارە هەر لەسەرەتای دەرچوونیانەوە (ساڵی ١٩٥٨) زێگەرزیان وەک چیرۆکڤان و رۆمانڤانێکی هەڵکەوتوو و بەهرەمەند ناساند و خەڵاتی ئەدەبیی (کلایست) یان بۆ مسۆگەر کرد (وەک باسمان کرد)، جا لێرەدا بەپێویست و پەسەندی دەزانم پێناسەیەکی خێرای شاکارە گرنگ و ناسراوەکانی دیکەی زێگەرز بکەم و بەخوێنەرانی ئازیزیان بناسێنم.

**رۆمانی: خاچی حەوتەم لە ساڵی ١٩٤٢ لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەزمانی ئینگلیزی دەرچووە**

هەر لەو ساڵەدا ٦٠٠ هەزار دانەی لێ چاپکراوە ساڵی ١٩٢٤ لە هۆلیوود کراوەتە فیلمێکی سینەمایی سەرکەوتوو، کە ئەکتەری ئەمریکایی ناسراو (سپنسەر ترێسی) رۆڵی سەرەکیی تێدا بینیووە، ئەوجا ئەم رۆمانە ساڵی ١٩٤٧ خەڵاتی (بۆشنەر)ی پێبەخشراوە (وەک باسمانکرد).

رۆمانەکە باس لە حەوت بەندکراوی گرتوخانەیەکی نازییەکان لە ئەڵمانیا (ساڵی ١٩٣٧) دەکات، کە رۆژێک دەتوانن لە گرتوخانەکە هەڵبێن و دەربازبن. ئەوجا نازییەکان گشت توانای خۆیان دەخەنە گەڕ بۆ ئەوەی هەڵاتووەکان بگرنەوەو بیانکوژن.

بەڕێوەبەری گرتوخانەکە پێشبینی دەکات لە ماوەی یەک هەفتەدا هەڵاتووەکان بکەونە داوەوە و راپێچی گرتوخانەکە بکرێنەوە، بۆیە هەرزوو شوێنی لە سێدارەدانی هەریەک لە هەڵاتووەکان دیاریدەکات و بۆ هەر یەکێکیان خاچێک دادەنێت. جا وەک پێشبینی کردبوو. شەش لە هەڵاتووەکان دەگیرێنەوەو لە سێدارە دەدرێن، بەڵام خاچی حەوتەم بەبێ خاوەن دەمێنێتەوە، چونکە هەڵاتووەکەی دی هەرگیز دەستی جەلادەکان ناکەوێت و رزگاری دەبێت.

*** چیرۆکی: گەشتی کیژۆڵە مردووەکان ساڵی ١٩٤٣ لە مەکسیک نووسراوە، ساڵی ١٩٤٦ لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بلاوبۆتەوە.**

ئەم چیرۆکە بریتییە لە یەکێک لە جوانترین پارچە پەخشانەکانی ئەدەبی ئەڵمانی، تێیدا زێگەرزی دوورە ولات ئەوپەڕی تاسەو شەیدایی خۆی بەرامبەر ئەڵمانیا پیشاندات، ئەویش لە بۆتەی یادکردنەوەی چەند بیرەوەرییەکی سەردەمی منداڵیی و

ئامێتەکردنیان لەگەڵ ژیانی تاراوگەیی لە مەکسیکدا. لەم چیرۆکەدا زێگەرز یادی ژیانی جارانی خۆی و هاوەڵە قوتابییەکانی قوتابخانەی کیژان لە شاری (ماینس) دەکاتەوە، ئەوانەی کە دواتر بەهۆی جەورو رەفتاری نازییەکانەوە، کەسایەتییان دەشێوێندرێت و تێکدەدرێت.

*** رۆمانی مردووەکان هەر بەگەنجی دەمێننەوە - ساڵی ١٩٤٩ دەرچووە**

ئەمەش رۆمانێکی بەهێزو سەرنجراکێشە لەمەڕ ژیانی میللەتی ئەڵمانییەوە لە ساڵانی (١٩١٨-١٩٤٥) دەدوێت و تێیدا زێگەرز روونی دەکاتەوە؛ ئەو پەیمانە پیرۆزەی شۆڕشگێڕو تێکۆشەرەکان بەگەلەکەیان دابوو و لە پێناویدا گیانیان بەختکرد، هەر دەمێنێت و لە پاش ئەوان لە ئەستۆی نەوەکانیاندا دەبێت کە سەرباری گشت شکستی و نەهامەتییەکان، ئایندەی سۆشیالیستی بونیاتدەنێن.

*** چیرۆکی: تیشکێک لەسەر پەتی سێدارە ساڵی ١٩٦١ دەرچووە**

تێیدا زێگەرز باس لەوە دەکات: چۆن رەشپێستەکان دوورگەکانی کاریبی لە ئاکامی شۆڕشی فەرەنسیدا رزگاریان دەبێت.. ئەوجا چۆن سەرلەنوێ دووچاری کۆت و داوی بورجوا گەورەکان دەبن و بە چ شێوەیەکی دڕندانە دەچەوسێندرێنەوە؟

*** چیرۆکی پەڕینەوە ساڵی ١٩٧٠ دەرچووە** - تێیدا زێگەرز بەشێوەیەکی زۆر جوان و دروست باس لە مەسەلەی خۆشەویستی و بونیاتنانی پێوەندیی مرۆڤانە لە نێو کۆمەڵگایەکی نموونەییدا، دەکات و دەخوازێت بڵێت؛ شێوەو پێکهاتەو باری هەر کۆمەڵگایەک وا لە مرۆڤ دەکەن خێرومەندێکی مەزن یان شەڕخوازێکی ترسناک بێت!

بێگومان لیستی رۆمان و چیرۆکە نایابەکانی زێگەرز بریتی نییە تەنها لە مانەی باسمانکردن بەڵکو چەندین بەرهەمی بەنرخی دی دەگرێتەخۆ کەمایەی رێزو سەرنج و بایەخی زۆر لە رۆشنبیرو رەخنەگرو خوێنەرانی جیهان بوون، وەک هەردوو کۆمەڵە چیرۆکی هێزی لاوازەکان (ساڵی ١٩٤٥)و چەند دیدارێکی تایبەت (ساڵی ١٩٧٧)، رۆمانەکانی، هاوەڵانی رێگا (ساڵی ١٩٧٢)، رێگا لە شویاتدا (ساڵی ١٩٣٥)، قوتاربوون (ساڵی ١٩٣٧)، ترانسیت (ساڵی ١٩٤٣)، متمانە (ساڵی ١٩٦٨)... وەلێ دیارترین و نایابترین شاکاری ئانازێگەرز، بێگومان رۆمانی (شینی.. شین)ە، کە لە ساڵی ١٩٦٥دا دەرچووە، وا ئێمەش لێرەدا کورتەی ناوەرۆکی ئەم رۆمانە بەپێزو دڵگیرە بۆ خوێنەرانی هێژا باس دەکەین.

## شینی.. شین (یان: شینی راستەقینە)

بینیتۆ، چینیگەرێک (خەزەفکار)ێکی لێهاتوو و دەستڕەنگینی خەڵکی ولاتی مەکسیکە لە گوندی چینیگەرەکان نزیک بە شاری (مەکسیکۆ ستی)ی پایتەخت ژیان بەسەر دەبات، ئەم وەستایە نایابترین جۆری قاپ و قاچاغ و مەسینە و گولدان.. لە چینی (خەزەف) دروستدەکات و بەرەنگێکی شینی زەق و دڵڕفێن دەیانەخشێنێت، ئەوجا لە (مەکسیکۆ ستی) بەسەنیارانی -کڕیارانی- دەفرۆشێت ئیدی پیشەی ئەم وەستایە ، ساڵ لە دوای ساڵ، وەکو هونەرێکی بەنرخ و دەگمەن لە نێو سەنیاراندا دەنگدەداتەوەو رەواجێکی زۆری دەبێت، لەڕووی ئابووریشەوە قازانجێکی باش بەخاوەنەکەی دەگەیەنێت.

وەلێ لە ناکاو، پیشەکەی بینیتۆ پەکی دەکەوێت، ئەمیش بەهۆی نەمانی سەرچاوەی رەنگە شینەکە کە بینیتۆ چینییەکانی پێدەنەخشێنێت و دڵ و مێشکی سەنیارەکانی پێ مەفتون دەکات! بەڵێ! ئەو ولاتەی وشکە رەنگی شینی لێدەهێنرا (واتە ئەڵمانیا)، دەکەوێتە نێو گێژاوی جەنگی جیهانی دووهەمەوە پێوەندیی ئابووری و بازرگانی لەگەڵ ولاتانی دەرەوەدا ئیفلیج دەبێت، ئیدی بینیتۆی کارسازو هونەرمەند، شەیدای رەنگ و نیگاری شین، ناچار دەبێت بۆ سەرچاوەیەکی نوێی بۆیەی شین بگەڕێت، بەڵام هەوڵەکانی بێهودە

دەبن، پاشـــان هەوڵدەدات رەنگێکی دیکە بۆ نەخشەکانی هەڵبژێرێت، لێ، سـەنیـارەکـانی جگە لە نەخشی شین بەهیچ نەخش و نیگارێکی دی قـایل نابن!

لەو ســــەروبەندەدا شـــەوێک (ئۆزبیـا)ی پووری - خـوشکی باوکی - دێتــە لای و پێی رادەگـەیەنێت کـە (رۆبن)ە شـــەلی ئامـــۆزای (واتە ئامۆزای بینیـتۆ) توانیـویەتی لە کانە زێوێکی نزیک بەشوێنی (سان مارینۆ) وشـکە رەنگی شین دروست بکـات، بۆیە (ئۆزبیـا)هانی بینیـتۆ دەدات بۆ ئەو شوێنە سەفەر بکات.

ئەوجا لە پاش سەفەرێکی سەخت و دژوار کـە لە مـیـانەیدا بینیـتـۆ رێگایەکی دووروودرێژ، بەشـێکی بە شەمەندەفەر، بەشێکی بە ئۆتۆمبیل و بەشەکەی دی بەپێ، دەبڕێت، بەخۆی و چەند قـوتوویەکی بەتاڵەوە دەگـاتە شـوێنی ناوبراو. لەوێ پێی دەڵێن: روبن بەیاوەریی لۆرینسۆ -ی کوڕە خاڵ و هاوکاری بەرەو شوێنێکی شاخاوی دابڕاو لە دەرەوەی شـــاری (ســــان کریستۆیل) چوون و لە وێندەر حاڵی حازر بەرد هاڕێکیان داناوەو لە بەردی کۆنە کـانەزیوێکی شـوێنەکە، وشکە رەنگی شین دروست دەکەن.

دەستـوبرد بینیـتۆ قـوتووەکـانی هەڵدەگرێت و بەرێگایەکی سـەختـدا بەرەو لای روبن ڕوودەنێت، کـاتێک دەگاتە لای روبن بەزوبرییەکی دیارەوە پێشـوازیی لێدەکـات، بەڵام کـە لە مـەبەستی راسـتـەقـینەی هاتنەکـەی دەگـات و، دەزانێت ئۆزبیـــا -ی پووریان ناردوویەتی بۆ لای هەڵوێستی نەرمدەبێت و لای خۆی دەیهێڵێتەوە.

پاشان روبن و لورینسو بەبینیتۆ رادەگـەیەنن کـە دەبێت لەگـەڵیـان کاربکات و یارمەتییان بدات ئەوجا لە بەرامــبـەر هەر بارێکدا بۆ شـاری دەنێـرن، برێک وشکە رەنگی شینی پێدەدەن.

بەهەرحاڵ سروشتی ئیشەکە لەو شـوێنە سـەخت و دابڕاوەدا گـەلێک زەحـمەت و قـورس بووە، چونکە دەبوو بەردی کـانە زیوە کـۆنەکـەی نزیکیـان بشکێنن و پارچەکـانی بکەن بە بەرد هاڕەکەداو دوایی هاڕاوەکە لە بێژەنگ بدەن، ئەوجـــا تێکەڵ بەبڕێک لمی خـاوێنی بکەن کـە لە جـۆگـەلەیەکی نزیکیـانەوە کـۆیاندەکـردەوە، پاشـان تێکەڵەکە بسـووتێنن، سـەرئەنجـام لە پاش سـووتاندنی تێکەڵەکـە، وشکە رەنـگـێکی شین و جـــوان و وردو بریقـەداریان دەکـەوتە بەردەست کـە رەنگەکـــەی کت و مت لە رەنـگی جلێکی بوکـــێنی شین و ئاسک و قەشەنگ دەچوو.

ئیـدی بەدرێژایی رۆژانێکی پڕ لە رەنج و کـۆشش و مـەینەتی، بینیـتـۆ دەتوانێت پەیتـا پەیتـا قـوتووە بەتاڵەکـــانی یەک لە دوای یەک پڕ بکات لە وشکە رەنگی شین، پاشـان بەرەو گوندەکادی خۆی دەگەڕێتەوە سەر لەنوێ دەستە ملانی ماڵ منداڵ و خزم و دۆستـانی دەبێـتـەوەو پیـشـەکـەی جـارانی زیندوو دەکـاتەوەو خـۆشی و شادی بۆ سەنیارو شەیدایانی چینییە نەخش شینەکانی دەگێرێتەوە.

لە کـۆتاییـدا دەڵێین، رۆمـانی (شـــینی. شین) لە روانگەی زۆر لە رۆشنبیرو ئەدیبانەوە وەکو (ئۆدیسە)ی گەلی مەکـسـیکی وەهایە، ئەم رەنگە شـینەش کـە بابەتی سـەرەکـیی شـاکـارەکـەیە خـۆی لە خـۆیدا هونەرو کەلەپوورە، هەروەها هێمایە بۆ واقیعی مرۆڤی مەکسیکی سادەو رەسەنایەتیی ئەو گـەلە کـە ریشـەی لە قـووڵایی مێژوودا داکوتاوە.

**سەرچاوەکان:**

**١- گۆڤاری گولان العربی ژمارە (٧٨).. زیکرز.. سفر حافل بالنضال والعطاء.**

**٢- الأزرق.. الازرق تأليف:أنازيكرز ترجمة:د. سامي الاحمدي، ١٩٨٨ بغداد.**

**٣- Einige Deutsche Erzahlungen مجله كليه الاداب بغداد العدد(٢).**

**٤- مجلة الأقلام العدد(٥) سنة ١٩٨١، زيكرز في سنها الثمانين.**

**٥- قبو البصل وقصص المانية أخرى، ترجمة: د. سامي الأحمدي/ سنة ١٩٨٧ بغداد.**

# پۆست مۆدێرنیزم

و: ئازاد خدر

**پاش هێرشە توندەکەی پۆست مۆدێرنیزم، گشت ئاستەنگ و جیاوازییەکان بەخێرایی روخان.** راستی **نەبووە ئەو** شتە کە بەشێوەیەکی **بابەتییانەو** بەجیا لەدەرەوەی ئێمەدا **بوونی** هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی لەم **گۆڕانکارییە** گەورەیە بگەین، دەبێ لە باکگراوندەکەی(پاشخانەکەی) بکۆڵینەوە. لەم رووەوە(گین ڤیت) دەڵێ. (دیدو بۆچوونە جیهانییەکان یەک بەدوای یەکدا هاتن، لەسەدەی هەژدەمدا بزاڤی رووناکبیری **Enlightenment** بەربەرەکانی تەورات و ئینجیلی دەکرد کە هەژموونیان هەبوو لەسەر کەلتووری رۆژئاوا. لەسەدەی نۆزدەمیشدا رۆمانتیکیزم و ماتریالیزمی زانستی هاتنە ئاراوەو سەدەی بیستەمیش **مارکسیزم** و فاشیزم و پۆزیتیڤیزم- **(الوضعیە)**-و بوونخوازی لێکەوتەوە. **واتە پێش** ئەوەی باسی پۆست مۆدێرنیزم **بکەین** پێویستمان بە گەڕانەوەیەک هەیە **بۆ سەردەمانی** پێش ئەو سەردەمی پێش **مۆدێرن Premodern** و سەردەمی **مۆدێرن. پریمۆدێرن(پێش** مۆدێرن)، ئەو **سەردەمەیە کە لە لەدایکبوونی فەلسەفەو(تالیس)ەوە دەستپێدەکات تا** دەگاتە سەردەمی رینسانس و ریفورمێشن(چاکسازی)و رووناکبیری. پریمۆدێرنیزم وەک مۆدێرنیزم، فێستێکی گرنگ بووە لە کەلتووری رۆژئاواداو(گین ژیت) دەڵێ: (سەردەمی ئاڵۆزیی و دینامیکییەت و توندوتیژی بوو، سەردەمی میتۆلۆژیاو پاگانیزم- بتپەرستی-و رێشنالیزمی (عەقلانییەتی کلاسیکی و ئینجیل بوو). لەلایەکی دیکەوە(ستیفن کۆنەر) دەڵێ(دەستەواژەی پۆست مۆدێرنیزم تا ئاوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی رابردوو بەتەواوی ساغ نەبووبۆوە). مۆدێرنیتی، هەندێ رەخنەی توندی بەرکەوت و وردەوردە بەهێز بوو تا گەیشتە ئەو ئاستەی کە بتوانێ بڵێ، پۆست مۆدێرن بۆ ئەوە هات تاکو پرۆسەکە بەرفراوانتر بکاتەوە، بەڵام لەم خاڵەدا گرنگ ئەوەیە پۆست مۆدێرن جیاکەینەوە لە پۆست مۆدێرنیزم. پۆست مۆدێرن ئاماژە بۆ ماوەیەکی دیارکراو دەکات، کەچی پۆست مۆدێرنیزم ئاماژە بۆ ئایدۆلۆژیایەکی دیارکراو دەکات (گین ڤیت) دەڵێ: (گەر سەردەمی مۆدێرن بەسەر چووبێ، ئەوا هەموومان پۆست مۆدێرنین هەتا ئەگەر بیروباوەڕەکانی **پۆست مۆدێرنیزم** رەتبکەینەوە). **کەواتە** پۆست مۆدێرنیزم **چییە بەڕاستی** پێناسەکردنی زۆر **ئاڵۆزو تەمومژاوییە،** بەڵام هەروەک باوە، پۆست **مۆدێرنیزم** مانای ئەنتی فاوندیشنالیزم (**antifoundationalsm**)ە- **دژی** دەزگاو دامەزراندنە-یان **دژی** گۆشەنیگای جیهانە **antiword-view**، واتە بوونی هەر **ڕاستییەکی** جیهانی یان ستاندارد رەتدەکاتەوە (ژان فرانسیۆس لیۆتارد) **کە** رەنگە کاریگەرترین نووسەر بێت لەنێو هزری پۆست مۆدێرندا، بەم جۆرە پێناسەی پۆست مۆدێرنیزم دەکات: (گومانێکە بۆ میتانارلێتیڤ- **Metanarrative**- ئەودیوی گێڕانەوە- ماوراء السرد) بۆ هەر مەبەستێک و پێشیارێک بێت، (میتانارێتیڤ) بۆچوونێکی جیهانییە تۆڕێکە لە چەندین پێشبینی **و** پێشنیار کە لەنێویدا ئاکاری ئە**زموون و** مەعریفەکەمان دەناسرێتەوە **و راڤە** دەکرێ). میتانارێتیڤ **بە بۆچوونی** پۆست مۆدێرنی سکۆ**لار (مەدرەسی)،** (پاتریشیا **واگ)، (لێکدانەوەیەکی** گەورەی **تیۆرییە بۆ ئەزموونی جیهانی).** **پۆست مۆدێرنیستەکان وا دیارە،**

بۆچوونێکی جیهانی بەهێزیان هەیە، بەڵام ئەم بۆچوونە لە پراکتیزەکردنیدا نابێتە شتێکی جیهانی. ئامانجی پۆست مۆدێرنیزم تەنیا رەتکردنەوە میتاناریتیڤ نییە، بەڵکو رەتکردنەوەی باوەڕیشە بە بەهێزی. مەرج نییە هەر بۆچوونێکی جیهانی کە خۆی بە (دامەزرێنەری) هەموو جۆرە چەوساندنەوەیەک دادەنێ باوەڕی بەوەبێ کە تەنانەت هەر کەسێک بۆچوونێکی بەهێزی جیهانی هەبێ، رەتدەکرێتەوە. ئیمرۆ چەندین بۆچوونی جیهانی هەیە و پۆست مۆدێرنیزمیش خۆی بە بەرپرس دەزانێ لە رەخنەلێگرتنیان یان (هەڵوەشاندنەوەیان). بەپێی پۆست مۆدێرنیزم هیچ یەک لەم بۆچوونە جیهانیانە (راستتر) نییە لە ئەوانی دیکە. کەواتە راستی بەگوێرەی باوەڕی هەر کەسێک دەگۆڕێ. بیرمەندی پۆست مۆدێرن بڕوای راستی رەها، یان رەچەڵەکی رەها نییە. واتە پۆست مۆدێرنیزم بۆچوونێکی جیهانی نییە و هەوڵنادا بۆ (سازدانی) مۆدێلێک یان نموونەیەک لە راستی بەرێوەببا: راستی لای پۆست مۆدێرنیست، هەوڵ و کۆششەکان رێکدەخا بۆ گەلاڵکردنی راستییەک، بۆیە ئەو پۆست مۆدێرنیستە هەموو هەوڵ و کۆششەکان (هەڵدەوەشێنێتەوە)، کە بۆ دامەزراندنی راستی لە ئارادان. مۆدێرنیستی و کریستیانیتی (مەسیحیەت) مشتومڕیان لەسەر ئەوەیە کە دیدو بۆچوونی کامیان (راستە)، بەڵام پۆست مۆدێرنیزم دژی کریستیانیتی و مۆدێرنیتییە لەبەر ئەوەی بانگێشتە بۆ (راستی) دەکەن. پۆست مۆدێرنیزم ئۆرسۆدۆکسیەت (سیستەمێک یان بۆچوونێکی جیهانی بۆ باوەڕێکی پۆزەتیڤانە) نییە، بەڵکو پتر ئۆرسۆ پراکسیەتە **orthopraxy** (کۆمەڵە میتۆدێک بۆ شیکردنەوە). پۆست مۆدێرنیزم لە هەوڵە بەردەوامەکەیدا بۆ نەهێشتنی ئەگەر سەرهەڵدانی هەر مەعریفەیەکی رەها، جیاوازییە ترادشنەکەی (تەقلیدیەکەی) نێوان وەرگری مەعریفەکە و بابەتی مەعریفەکە (واتە ئەو شتەی کە دەبێ بزانرێ)، دەشێوێنێ. ئەم شێواندنەی (خود) و (بابەت)ە وای لە پۆست مۆدێرنیزم کردووە، نیهیلیزم **hihilism** (عدمیة) و رێل تیڤیزم (النسبیة: رێژەگەرایی) بەیەک بنووسێنێ. دەمەوێ بڵێم، لۆژیک و زانست و مێژوو مۆرالیتی (ئەخلاق) شتی جیهانی و رەهانین، بەڵکو پێکهاتەی ئەزموون و راڤەی ئێمەن بۆ ئەو ئەزموونە. (شۆرشە کۆپەرنیکانەکەی) کانت لە فەلسەفەدا تاوتوی ئەوە دەکا کە عەقل (هەندێ شت دەهێنێتە نێو ئەو بابەتەی کە ئەزموونی لەسەر دەکا و عەقل رێگەی خۆی بۆ مەعریفە دەسەپێنێتە سەر بابەت). بابەت بەدوای عەقل دەکەوێ، عەقل بەدوای بابەت ناکەوێ. هۆی تاوتوێ کردنی ئەم پرسە لەلایەن پۆست مۆدێرنیزمەوە دەگەرێتەوە بۆ ئەم راستییە، بوونخوازی (الوجودیة- **Ex-istentialist**) لەگەڵ رەتکردنەوەی رێشنالیزم (عقلانیة) و ئیمپریشنیزم (انطباعیة)، فەلسەفەی چۆڕاندە نێو بوونی مرۆڤ بەتایبەتی لەنێو زمانەوە. زمان رێگەی دەربڕینی مرۆڤە لە ئەزموونەکەی لە جیهاندا، کەواتە بۆ تێگەیشتن لە جیهان بە باشترین شێوە، دەبێ بزانین چی دەربارەی راستی دەگوترێ، بەڵام تەنیا خودگەرایی (الذاتیة- **Sub-jectivism**)مان لێرەدا بەردەستە لەبەر ئەوەی باشترین شت کە دەتوانین بیکەین بریتییە لە ئەزموون و راڤەکردنی ئەزموونی خەڵکی دیکە و راستی دیکە. بۆیە پۆست مۆدێرنیزم هەر پێداگرتنێک لەسەر مەعریفەی رەها بە توندی رەتدەکاتەوە بەم شێوەیە مێژوو دەبێتە زنجیرە میتافۆرێک (مەجاز) و


لیوتارد

**پۆست مۆدێرن ئاماژە بۆ ماوەیەکی دیارکراو دەکات، کەچی پۆست مۆدێرنیزم ئاماژە بۆ ئایدۆلۆژیایەکی دیارکراو دەکات.**

**پۆست مۆدێرنیزم ئەگەرچی هەوڵدەدا تێگەیشتنی لە فرە جۆری خەڵک جێگیر بکات، بەڵام لە ڕاستیدا جۆرە خێڵەکییەی نوێ دەخولقێنێ.**

کۆمەڵە ڕووداوێک (وەک ئەوەی کە بە ڕاستی ڕوویاندابێت). واتە هەر کەسێک دەتوانێ ڕووداوەکان تۆمار بکاو ڕاڤەشیان بکات وەک ئەوەی کە (بە چاوی خۆی) بینیبێتی. پۆست مۆدێرنیزم لەگەڵ ڕەتکردنەوەی بیرۆکەکانی مۆدێرنیتی، جۆرە ڕاستییەکی توندڕەو پێشنیار دەکات: هەرچەندە نیمچە نیهیلیستانە سەرجەم شێوەکانی (ڕاستی ڕەها) و (ڕەچەڵەک) ڕەتدەکاتەوە، بەڵام خودی خۆی لە شوێنێکدایە کە پرسیار دەوروژێنێ. لەسەر چ زەمینەیەک گۆشەنیگای پۆست مۆدێرنیزم وەک ڕاستییەک وەردەگیرێ؟ ئایا سووربوونی لەسەر مەحاڵبوونی (ڕاستی ڕەها) خۆی لەخۆیدا شتێکی ڕەهایە **absolute**؟ بە مانایەکی دیکە، پۆست مۆدێرنیزم چۆن دەتوانێ بڵێ تێڕوانینی ئەو بۆشتەکان (ڕاستە) بێئەوەی جۆرێک لە میتاناڕێتیف دروست نەکات؟ لەمبارەوە (جێمس هاریس) دەڵێ (چی دەبێ گەر هاتوو چەند ئەندامێکی گرووپی هیترۆمۆرفۆس- **Heteromorphous**، پێدابگرن لەسەر ئەوە کە لیۆتارد دەتوانێ بیرۆکەکانی خۆی لە بارەی ڕەزامەندی و بڕواپێبوونی ئەو ئەندامانە بە گرووپی ناوبراو بسەلمێنێ؟ و چی دەبێ گەربێتو ئەندامانی گرووپی ناوبراو و بیرۆکەکانی (لیۆتارد)یان بە عەقڵانی (ئاوەز پەروەری) نەزانی و وەک میتاناڕێتیڤێکی پارالۆژیکی- **Paralogi-cal** (لۆژیکی یەدەگ) مامەڵەیان لەگەڵدا کرد؟)، هەر تێزێکی فەلسەفی ڕاست ناکا گەر بڵێ بۆچوونێکی یان تێڕوانینێکی جیهانی پێشنییەو ئۆرسۆپراکسی (**orthopraxy**)یەتەکەشی لەبەر ئەوە نییە کە ئۆرسۆپراکسیەتی دەبێ بۆچوونێکی پێبێ بۆ ڕاستی و مەعریفە و مۆرالیتی بۆ ئەوەی میتۆدەکانی (مەنهەجەکانی) خۆی پێ ڕوونبکاتەوە. و بسەلمێنێ، بەڵام پۆست مۆدێرنیزم بۆ ئەوەی ڕێگە لە گوتاری تۆتالیتاری بگرێ، دەبێ بیروبۆچوونەکانی خۆی ڕەها بکات تاکو سیستەمەکەی بەڕێوەببات. ئەم جۆرە ڕێژەگەراییە توندڕەوە **-extremerelativisn**، هەبوونی مەحاڵە: پێدادەگرێ لەسەر ئەو شتە کە ڕەتیدەکاتەوە. بە هەمان شێوە، گەر بێتو و تەنیا زمان بۆ نزیکبوونەوە لە ڕاستی لە ئارادا هەبێ و هەموو لێکدانەوەکان (خودی) بن، ئەوا بۆچی پۆست و مۆدێرنیستەکان کتێب دەنووسنەوە؟ بۆچی بڕوایان بەوە هەیە کە شێوەی شیاو هەیە بۆ (گواستنەوەی) بیرۆکەکانی پۆست مۆدێرنیزم؟ چۆن دەزانین لێکدانەوەکەی خوێنەر دەگونجێ لەگەڵ مەبەستەکەی نووسەر؟. ئەم پرسیارانە لەوەوە هاتووە کە زمان و تێڕوانین لە زمان دەبنە بەندیخانەی هزری پۆست مۆدێرن. بە واتایەکی دیکە، پۆست مۆدێرنیزم چۆن دەتوانێ خۆی بپارێزێ لە (هەڵوەشاندنەوەی تێزی هەڵوەشاندنگەرایی **-deconstsructing decon strution**) لە ڕوانگەی سۆسیۆلۆژییەوە، پۆست مۆدێرنیزم ئەگەرچی هەوڵدەدا تێگەیشتنی لە فرە جۆری خەڵک جێگیر بکات، بەڵام لە ڕاستیدا جۆرە خێڵەکییەی نوێ (**New tribalism**) دەخولقێنێ. بیرۆکەی فرە کەلتووری (**Multiculturalism**) دەڵێ، دیدگا تەقلیدیەکەی ئەمریکا- بۆ نموونە- لە مەڕ هاوشێوەبوونی کەلتوورەکان شتێکی درۆیە. ئەمریکا (مەنجەڵی تاواندنەوە) نییە، بەڵکو وەک (قاپی زەڵاتەیە). کەواتە پەروەردەو مۆرالیتی و سیاسەت... هتد بەپێی بەرژەوەندییە کەلتوورییەکان پێناسە دەکرێن. بۆ نموونە مێژوو وەک دەستەبەرکردنی مەعریفەیە لە بارەی ڕووداوەکانی ڕابردوو وێڕای ئەوەی کە پێداچوونەوەی بۆ دەکرێ بۆ ئەوەی بزانرێ کام گروپ و چین و توێژێکی تایبەتی

سەرکوتکراوە) تێیدا. (ڤیت) دەڵێ: سکۆلارە هاوچەرخەکان دەیانەوێ ئەستووری رابردوو بسڕنەوە و پەراوێزکراوەکان بێننە بەرچاو، مێژوو لە بەرژەوەندی فەرامۆشکراوەکانی وەک، ژنان و هۆمۆسێکسەکان- شذودجنسی و رەشپێستەکان و ئەمریکاییە ئەسلییەکان و قوربانیانی دیکەی چەوساندنەوە، دەنووسنەوە. سکۆلارەکان - مەدرەسیسیەکان- بیرۆکە دەستکردەکان پووچەڵدەکەنەوە و ئەلتەرنێتیڤی نوێ بەچاوێکی سکێپتیکیزم (Skepticism) رۆژئاوا دەکەن بە بیر تەسکی مەرکەزیەتی ئەوروپی (Euro Centrism)یەوە تومەتبار دەکرێن. ئەم بۆچوونە لەلایەن مەرکەزیەتی ئەفریقاییەوە (Afrocentrism) رەتدەکرێتەوە و ئایینی پاتریارکی دەگۆڕدرێتەوە بە ئاینی ماتریارکی و (نێربازی) واتە هۆمۆسێکسیش نەک وەک کێشەیەکی سایکۆژی بەڵکو وەک هۆمۆفۆبیا (homophobia) یەک دێتە پێشەوە). لێرەدا گرنگ نییە چی بەراستی روویداوە، چونکە مەحاڵە زانینی... وردبینی ئارەزووی پۆست مۆدێرنیزم نییە، بەڵکو هێز لەوانەیە یەکەم پێغەمبەری هەلومەرجی پۆست مۆدێرن (فردریک نیتچە)- (١٩٠٠-١٨٤٤ز) بووبێ. نیتچە پێشبینی سەرهەڵدانی نیهیلیزم (العدمیە)ی لە کەلتووری رۆژئاوادا کردووە. نیتچە پێیوابوو ژیان شتێکی سەخیفە (absurd)، چونکە نە راستی و نە هێما و نە گرنگی هەیە، ئەوەی ماوەتەوە بریتییە لە (ویستی هێز) کە پترە لە ویستی رزگاری... پاڵنەرێکی ناوەکی هەیە بۆ دەربڕین لە جەختکردنی بەهێز لەسەر هێزی مرۆڤ. پۆست مۆدێرنیزم نیتچە ناسا بڕوای بەوە نییە کە مانایەکی رەها لە ئارادا هەیە، هەر تاکێک و گروپێک دەبێ هێزی خۆی تاقیبکاتەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ستەم و زۆرداری خەڵکی دیکە. گاڵتەجاری (irony) لێرەدا ئەوەیە کە لە کاتێکدا پۆست مۆدێرنیزم هەر مۆرالیتیەک رەها رەتدەکاتەوە کەچی ستەم و زۆرداری بەشتێکی (خەراپ) لە قەڵەمدەدا. بڕواپێهێنان بە (کەس نابێ یەکێکی دیکە بچەوسێنێتەوە) خۆی لەخۆیدا شتێکی ئەخلاقییە، بەڵام لە گۆشەنیگای پۆست مۆدێرنستەوە، بۆنا؟ بۆ دەبێ هەوڵبدرێ لە پێناوی قەرەبووکردنەوەی ستەمەکانی رابردوو؟ ئەگەر مۆرالیتی بەشێوەیەکی رەها پەیوەندی بە کەلتوورەکانەوە هەبێ، ئەوا بۆچی پۆست مۆدێرنی فرە کەلتووخواز (Multicultura) رِقی لە هەر شتێک دەبێتەوە کە هەوڵدەدا بۆ قەرەبوو کردنەوەی (بۆ نموونە، داپلۆسین و بێدادی و باوکسالاری و تۆتالیزم و دیکتاتۆریەت... هتد)؟

پاش هەموو شتێک، هیچ کتێبێکی پیرۆز یان (میتانارێتیڤ)ێک نییە بتوانێ یان رێگە لە کەس بگرێ کارێکی ناپەسەند بکات.. بینەو بەردەیەکی دیالیکتیکی هەیە لەنێوان کاردانەوە و هەر شتێک کە لە ئارادا هەیە. بەکورتی، فرە کەلتووریی پۆست مۆدێرن، هەوڵەکەی بۆ بەدیار خستنی شارەزایی لەبارەی فرەیی و هەمەرەنگی مرۆڤایەتی و تاکەکانی ئەوەندە بەرین و بەرفراواندەکات بۆ جۆرێک کە خودی مەبەستەکەی بە تەواوی دەڕمێنێ. سەیریش لەوەدایە کە پۆست مۆدێرنیزم و خوا هەمان شت دەپێکن: زمان. بۆیە (دیاگینیس ئالن) دەڵێ (ئیزلۆژیای مەسیحی ئێستا وا خەریکە بیێتە پۆست مۆدێرن).

نیتچە پێیوابوو ژیان شتێکی سەخیفە (absurd)، چونکە نە راستی و نە هێما و نە گرنگی هەیە، ئەوەی ماوەتەوە بریتییە لە (ویستی هێز) کە پترە لە ویستی رزگاری،

سەرچاوە:

لە ئینگلیزیەوە وەرگێردراوە (لە ئینتەرنێت):

**Post Modernism**

**by D. Martin Fields**

**1995.**

# چارەسەری عەقڵانی بۆ هەڵچوون



د. کەریم شەریف قەرەچەتانی

لە دەروونزانییدا چەندەها جۆرەها چارەسەری دەروونی هەیە، هەریەک لەو شێوازانە بەجۆرێکی تایبەتی جیا لە ئەوانی تر هەوڵی چارەسەرکردنی گرفت و نەخۆشییە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکان دەدات. یەکێک لە گرنگترین ئەو جۆرانە چارەسەری عەقڵانی هەڵچوونییە راوبیرو بۆچوونی سەرەکی چارەسەرکردنی عەقڵانی بۆ هەڵچوون ئەوەیە، کە مرۆڤ ئاژەڵ و بوونەوەرێکی عاقڵی بێ وێنەیە هەروەها لە هەمان کاتدا ئاژەڵ و بوونەوەرێکی ناعەقڵانی بێ وێنەیە لەبەرئەوەی زۆربەی شڵەژان و گرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانی بەرهەمی بیرکردنەوەی ناعەقڵانی و نامەنتیقییانەی خۆیەتی. واتە دەتوانرێت لە رێگەی فێرکردن و گەشەپێکردنی عەقڵانییەوە لە زۆربەی گرفت و شڵەژانییە دەروونی و هەڵچوونییەکانی رزگاربکرێن و لە هەمان کاتدا بیرکردنەوە ناعەقڵانی و نامەنتیقییەکانی کەم بکرێتەوە رۆڵی سەرەکی چارەسەرکاری دەروونی لەم جۆرە چارەسەرکردنەدا ئەوەیە کە ئەم خاڵانەی خوارەوە بۆ کەسی خاوەن گرفتی دەروون و کۆمەڵایەتی روون بکاتەوە:

١- هۆکاری سەرەکی تووش بوونی بەو گرفت و نەخۆشییە دەروونییە، بیرکردنەوەی نامەنتیقی و ناعەقڵانییەتی سەرەرای ئەوەش رۆڵی سەرەکی چارەسەرکاری دەروونی ئەوەیە کە یارمەتی کەسی خاوەن گرفتی دەروونی بدات بۆ ئەوەی لەو جۆرە بیرکردنەوە ناعەقڵی و نامەنتیقییە ئەوەش رۆڵی سەرەکی چارەسەرکاری دەروونی ئەوەیە کە یارمەتی کەسی خاوەن گرفتی دەروونی بدات بۆ ئەوەی

ئەو جۆرە بیرکردنەوە ناعەقڵی و نامەنتیقییە رزگاری بێت و دواتر گرفت لەخۆشییە دەروونییەکەی لەکۆڵ بێتەوە.

٢- دەبێت چارەسەرکاری دەروونی کەسی نەخۆش وخاوەن گرفتی دەروونی تێبگەیەنێت کە رێگاو شێوازی گونجاوی تر هەیە بۆ دووبارە رێکخستنەوەی زانین و بیرکردنەوەکانی بۆ ئەوەی بەسەر ئەو بیرکردنەوە هەڵەو نامەنتیقیانەیدا زاڵ بێت و لە دەستیان رزگاری بێت، کە ئەو رزگاربوون و زاڵ بوونەش دەبێتە هۆی چاک بوونەوەی و رزگاربوونی لەکێشەو گیروگرفتە دەروونییەکانی واتە ئەگەر کەسی خاوەن گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەیەوێت بەزووترین کات چاک بێتەوە، ئەوە دەبێت گۆڕانکاری لە فەلسەفەو بیروبۆچوونی ناعەقڵی و نامەنتیقیەکانیدا بکرێت و بەشێوەیەکی واقیعیانەوە مەنتیقیانەتر سەیری ژیان و دیاردەکانی دەوروبەری بکات و بەجۆرێکی تر لێکیان بداتەوە.

بەبۆچوونی رابەرو هزرمەندانی ئەم رێبازە، سەرجەم هەڵچوونەکانی وەک (ترس، توڕەبوون، خەمۆکی، دڵەراوکێ، هەستکردن بەگوناه.. تاد) دەرئەنجامی بیرکردنەوەو لێکدانەوەی هەڵەو نامەنتیقی مرۆڤن دەربارەی دیاردەو گۆڕانکارییەکانی ژیان، لەکاتێکدا دەتوانێت بەسەریاندا زاڵ بێت و لەدەستیان رزگاری بێت ئەگەر مرۆڤ بەشێوەیەکی عەقلانی و مەنتیقی تر بیریان لێبکاتەوەو هەڵیان بسەنگێنێ، چونکە وەک (رەواقییەکان) دەڵێن (ئەو شڵەژان و گرفتانەی، تووشی مرۆڤ دەبن، هۆی سەرچاوەکانی شت و دیاردەکان و جیهانی دەرەوە نین، بەڵکو هۆیەکەی سەیرکردن و تێگەیشتن و خوێندنەوەکانی مرۆڤە بۆ ئەو شت و دیاردانەی جیهانی دەرەوە، چونکە وەک شکسپیر لە شانۆگەری (هاملێت)دا دەڵێت، هیچ شتێکی باش و خراپ نییە، بەڵکو بیرکردنەوە وادەکات باش بێت، یان خراپ).

هەموو مرۆڤێک توانای لەرادەبەدەری هەیە، بەڵام زۆرجار وەک پێویستی سوود لەو تواناو لێزانی و لێهاتووییەی خۆی وەرناگرێت و بەهەڵەو بەنامەعقولیانە بەکاریان دەهێنێ. کەواتە ئەرکی سەرەکی چارەسەرکاری دەروونی ئەوەیە وا لەو مرۆڤە خاوەن گرفتە بکات، کە بتوانێت بەشێوەیەکی عەقڵی و مەنتیقی سوود لەو تواناو لێهاتووە لەبن نەهاتووەی وەربگرێت و لەکات و شوێنی خۆیدا بۆ مەبەستی راستەقینە بەکاریان بهێنێ، ئەویش لەرێگەی:

١- دەستنیشانکردنی رابردووی کەسی نەخۆش و خاوەن گرفت و هێنانەوەی بۆ بواری هەستی و یادکرنەوەیی و دیاریکردنی رابردوو و بەسەرهاتەکانی.

٢- روونکردنەوەی ئەو رووداوانەی رابردوو بۆ کەسی خاوەن گرفت و دۆزینەوەی رایەڵەو داوی پەیوەندییان بەو کێشەو گیروگرفتەی ئێستای کەسی خاوەن گرفت.

٣- دیاریکردنی جۆری بیرکردنەوەی نامەنتیقی و ناعەقلانی ئەو کەسەو پەیوەندیان بەگرفتەکەوە.

٤- فیترکردن و گەشەپێکردنی بیرکردنەوەی عەقڵی و مەنتیقی لەلای ئەو کەسەو هاندانی لەسەر بەردەوامبوونیان.

بەبڕوای زۆر لە زانایانی ئەم رێبازە، زۆربەی زۆری ئەو بیروبۆچوون و لێکدانەوە نامەنتیقی و ناعەقلانییانە هەر لەسەردەمی منداڵییەوە لە رێگەی پەروەردەی هەڵەو نادروستی دایک و باوک و مامۆستاوە لەناخ و دڵ و دەروونی مرۆڤدا چێندراوە. منداڵیش لەبەرئەوەی لەلایەک سەرسام و دڵخۆشە بەدایک و باوک و حەز بەلاسایکردنەوەیان دەکات، لەلایەکی دیکەشەوە هێشتا بیروبۆچوونی مەنتیقی و عەقڵی بەتەواوی لەلای گەشەی نەکردووە و لەلایەن دایک وباوک و مامۆستاوە پاداشتی نەکراوە. لەبەرئەوە زۆر لەو بیروبۆچوون و لێکدانەوە هەڵەو نامەنتیقیانەی سەردەمی منداڵی لە داهاتوودا لەلایەک دەبێت بەبەربەست و رێگر لەبەردەم گەشەکردنی بیروبۆچوونی عەقڵی و مەنتیقی لەلایەکی دیکەشەوە مرۆڤ تووشی چەندەها گرفت و کێشەی دەروونی دەکەن. دەتوانین هەندێک نموونە لەسەر لێکدانەوەو بیروبۆچوونی هەڵەکان بهێنینەوە لەوانە:

١- پێویستە مرۆڤی سۆزو خۆشەویستی هەموو کەسانی چواردەوەری دەستی بکەوێت و ببێتە مایەی رێزیان.

٢- پێویستە بەردەوام مرۆڤ لە ژیاندا سەرکەوتوو و لێهاتوو و بەتوانابێت.

٣- هەندێک کەسی شەڕخوازو خراپ و بەدڕەوشت، لەبەرئەوەی خراپن، دەبێت بەردەوام سزاو سووکایەتیان پێ بکرێت.

٤- هەرچییەک بەدڵی ئێمە نەبێت و وەک ئەوەی ئێمە دەمانەوێت وانەبێت ئەوا کارەساتی لەدوایە.

٥- سەرچاوەو هۆکارەکانی بەدبەختی مرۆڤ لە دەرەوەی ویست و ئیرادەو خۆیەتی و ئێمە ناتوانین هیچ لەگەڵ گرفت و ناخۆشی و خەم و خەفەتەکان بکەین، لەبەرئەوەی لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئێمەن لە چارەمان نووسراوەو هەر دەبێت ببێت.

٦- دوورکەوتنەوە لە هەندێک بەرپرسیاریەتی و کێشەو گیروگرفتی ژیان باشترە لە ڕووبەڕوو بوونەوەیان.

٧- پێویستە مرۆڤ پشت بەکەسانی تر ببەستێت و بەردەوام پێویستی بەکەسێکی بەهێزی لە خۆی گەورەتر هەیە، بۆ ئەوەی ببێت بەپشت و پەنای.

سەرجەم ئەو بۆچوون و بیرکردنەوانەی سەرەوە نامەنتیقی و ناعەقڵانین و ئەرکی سەرەکی چارەسەرکاری دەروونی ئەوەیە، کە کەسی نەخۆش و خاوەن گرفت وا لێبکات کەواز لەو جۆرە بیرکردنەوە هەڵانە بهێنێ و ئاراستە خراپەکانی دەربارەی خودی خۆی بگۆڕێ، بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش پێویستە چارەسەرکاری دەروونی ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

١- دروستکردنی پەیوەندی بەهێز لەگەڵ کەسی نەخۆش و خاوەن گرفت.

٢- چارەسەرکردن بەپشتگیریی دەروونی.

٣- چارەسەرکردن بەتێڕوامانین (تأمل) و درککردنی گرفتەکە.

لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە وا لە کەسی نەخۆش و خاوەن گرفت بکرێت، ئەو بڕوایەی لا دروست ببێت، کە خۆی بەهاوکاری چارەسەرکاری و دەروونی دەتوانێت چارەسەری گرفتەکانی بکات، لەبەرئەوەی هێزو تواناکانی لەبن نەهاتوون، لە هەمان کاتیشدا هێرش دەکرێتە سەر بیروبۆچوونە نامەنتیقی و ناعەقڵییەکانی لە ڕێگەی:

١- لەسەر چارەسەرکاری دەروونی پێویستە بیروبۆچوون و بەڵگەی عەقڵی و مەنتیقی جیاجیا بۆ پووچەڵکردنەوەی ڕاوبۆچوونە نامەنتیقی و ناعەقڵییەکانی کەسی خاوەن گرفت بهێنێتەوەو وای لێبکات کە بڕوایان پێ بهێنێ، بۆ ئەوەی لە ڕێگەیانەوە ڕاوبۆچوونە نامەنتیقی و ناعەقڵییەکانی بن کۆڵ بکات و دواتر نەیان هێڵێ.

٢- دەبێت بەهەر شێوەیەک بێت وا لە کەسی نەخۆش و خاوەن گرفت بکرێت، یەکێک لەو کارو چالاکیانە بکات، کە بڕوای پێیان نییە، یان لە جێبەجێکردنیان دەترسێت، ئینجا دواتر هانبدرێت بۆ ئەوەی لەسەریان بەردەوام بێت، کە ئەمەش وەک هەنگاوی یەکەم دەبێتە هۆی ڕەتکردنەوەی ئەو بیروبۆچوونە نامەنتیقی و ناعەقڵییانەی کە بڕوای پێیانە.

بەم شێوەیە دەبێت چارەسەرکاری دەروونی بەردەوام هێرش بکاتە سەر بیروباوەڕە نامەنتیقی و ناعەقڵییەکانی کەسی خاوەن گرفت، لەبەرئەوەی هۆکارو سەرچاوەی سەرەکی ئەو گیروگرفت و نەخۆشیانەن کە بەدەستیانەوە دەناڵێنن کەواتە زۆر گرنگە کە ئەو بیروبۆچوونە نامەنتیقی و ناعەقڵییانە بۆ کەسی خاوەن گرفت شیتەڵ و ڕوونبکرێتەوە، تا ئەو بڕوایەی لەلا دروست دەبێت کە ئەو بیروبۆچوونە هەڵانە بەرپرسیارن لە بوونی ئەو هەموو (خەم و خەفەت و ترس و گرفت و دڵەڕاوکێیانە) چونکە چاکبوونەوە تەنها لەڕێگەی گۆڕینی ڕاوبۆچوونە هەڵەو کۆنەکانەوەو گەشەپێکردنی هۆشیاری وبیروبۆچوونی عەقڵییەوە دەبێت.

**(پەیوەندی نێوان چارەسەرکردنی عەقڵانی و چارەسەرو ڕێبازەکانی دی)**

١- پەیوەندی نێوان چارەسەرکردنی عەقڵانی و شیتەڵکردنەوەی دەروونی فرۆید:

بنەماکانی چارەسەرکردن لەلای فرۆیدو هاوبیرانی پەیوەستە بەشیتەڵکردن و لێکدانەوەی خەونەکانی کەسانی نەخۆش و گوزارشتکردن و قسەکردنی ئازادیی بێ سانسۆرو شیتەڵکردنەوەی پەیوەندی نێوان نەخۆش و چارەسەرکارو ڕۆچوون و گوزەرکردن بەناو ڕابردوو ڕووداوەکانی سەردەمی منداڵی کەسی نەخۆش و خاوەن گرفت و زانینی ناوەڕۆکی نەستی، بەڵام زۆر بەدەگمەن چارەسەرکردنی عەقڵانی پەنا بۆ گوزارشتکردنی سەربەست و

ێکدانەوەی خەونەکان و ڕابردوو ڕووداوەکانی سەردەمی منداڵی کەسی نەخۆش دەبات، نەک لەبەرئەوەی نەتوانین لە ڕێگەی ئالیەت و شێوازانەوە بگەینە زانینی هۆکارو سەرچاوەکانی نەخۆشییەکە، بەڵکو لەبەرئەوەی زۆربەی ئەو زانیارییانەی لە ڕێگەی ئەو ئالیەت و شێوازانەوە دەستمان دەکەون، پەیوەندیان نییە بەچاک بوونەوەی کەسی نەخۆش و شایانی ئەو هەموو ماندووبوون و کات بەفیڕۆدانە نییە. هەر لەبەرئەوەشە چارەسەرکاری عەقڵانی هەڵچوونی لە جیاتی ئەوە گرنگی بەبنەمای فەلسەفی و بیروباوەڕە نامەنتیقییەکانی کەسی خاوەن گرفت دەدات و بەردەوام ئەوە بۆنەخۆشی ڕوون دەکاتەوە کە سەرچاوەی نەخۆشی و گرفتەکە پەیوەستە بەلێکدانەوەی نامەنتیقی و بیروبۆچوونی ناعەقڵانی، کە بوونەتە هۆی تێکدانی ئامانجەکانی ژیانیان، لەلایەکی تریشەوە بەپێچەوانەی فرۆیدو هاوەڵانی چارەسەرکاری عەقڵانی و هەڵچوونی زۆر بەکەمی گرنگی بەرووداوەکانی ڕابردووی نەخۆش دەدات، بەڵکو زیاتر هێرش دەکاتە سەر فەلسەفەو بیروبۆچوونە نامەنتیقی و ناعەقڵییەکانی پێشووی. سەرەڕای ئەوەش چارەسەرکاری عەقڵانی هەڵچوونی، پەنا بۆ (ئیحاء) و هاندان و ڕێنمایی نەخۆش دەبات و ناچاری دەکات هەندێک کارو چالاکی بەئاکام بگەیەنێت.

٢- پەیوەندی نێوان چارەسەری عەقڵانی و قوتابخانەی یۆنگ:

چارەسەری عەقڵانی وەک چارەسەری یۆنگی بەشێوەیەکی گشتی و یەکپارچەیی سەیری مرۆڤ دەکات نەک سەیرێکی شیتەڵییانەو پارچەپارچەیی، هەروەها لەو بڕوایەدان، کە ئامانجی سەرەکی چارەسەرکردن دەبێت گەشەکردنی تاک و پێش کەوتنی بێت، ئەویش لە ڕێگەی چاکبوونەوەی لە گرفت و کێشەکەی، هەروەها زۆر بەتووندی هانی نەخۆش دەدەن بۆ ئەوەی هەنگاوی بونیاتنەرانەی گرنگ بنێت. واتە چارەسەری عەقڵانی هەڵچوونی زیاتر لە چارەسەری یۆنگی نزیکترە وەک لە چارەسەری فرۆیدی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چارەسەرکاری عەقڵانی هەڵچوونی زۆر بەدەگمەن گرنگی بەسەرنجدان و شیتەڵکردنەوەی خەوو خەیاڵ و خەونەکانی کەسی نەخۆش و خاوەن گرفت یان هێماو بەرهەمەکانی دەدات، بەڵام یۆنگ بەزۆری گرنگیان پێدەدات لە هەمان کاتدا چارەسەرکاری عەقڵانی هەست بە ئەوە دەکات کە نەخۆشەکان بەگەرمی سەرقاڵی بیرکردنەوەی تەموموژاوی خۆیانن کە نزیکە لەخەون و خەیاڵ و ئەفسانە، بەڵام خۆ خەریککردنی چارەسەرکار بەو جۆرە بیرکردنەوە خەیاڵی و ئەفسووناوییانەو هاندانی نەخۆش لەسەر ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە لەکاتی چارەسەرکردندا دەبێتە هۆی بەربەست و ڕێگر لەبەردەم بینین و درکپێکردنی گیروگرفت و سەرچاوەو هۆکارەکانی و گەیشتن بەچارەسەرو چاک بوونەوە. لەبەرئەوە چارەسەرکاری عەقڵانی پەنایان بۆ نابات، بەڵکو لە جیاتی ئەوە چارەسەرکاری عەقڵانی بۆ هەڵچوون، هانی نەخۆش دەدات کە کێشەو گرفتەکانی ئێستای بزانێ و شارەزای ئەو شتانە بێت کە بەردەوام ڕۆژانە بەبێ سوود دووبارەیان دەکاتەوە.

٣- پەیوەندی نێوان چارەسەری عەقڵانی و چارەسەری ئەولەوی.

بەپێی چارەسەری عەقڵانی بیروباوەڕو ئاراستە ناعەقڵی و نامەنتیقییەکانی خەڵکی بەرپرسیارن لە هەڵچوون و نەخۆشی و گرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانیان، بەڵام ئەدلەر بەزۆری جەخت دەکاتە سەر شێوازی ژیانی تاک و لەو بڕوایەدایە کە ئامانجەکانی ژیانی دەروونی مرۆڤ دیاری دەکەن. واتە هەردوولا لەو بڕوایەدان کە هەردوو (بیروباوەڕو ئاراستەکانی) تاک لەلایەک و ئامانجەکانی ژیان لەلایەکی دی شێوازی بیرکردنەوەی پێک دەهێنن. ئەدلەر دەڵێت (ئەگەر تاک دەمارگیرو هەڵچوو و خاوەن گرفت بوو، ئەوا پێویستە لەسەرمان، کە هەستکردن بەکەمی لەلای کەمبکەینەوە و ئەوەی بۆ ڕوونبکەینەوە، کە ئەو واتە نەخۆش لەواقیعدا لەنرخی خۆی کەمدەکاتەوە)، بەڵام چارەسەرکاری عەقڵانی نەخۆشەکان فێری ئەو دەکات کە ئەو هەست و سۆزو کەم توانایی و لێنەهاتوویەیان لە ئەنجامی بیروباوەڕی نامەنتیقی و ناعەقڵانییەوە دروست بوون، بۆیە پێویستە هەوڵبدەن زیاتر لەکارەکانیاندا لێهاتوو بەتواناتر بن و

ئەگەر نەشیان توانی کارێک بکەن و سەرنەکەوتن ئەوا دەبێت گلەیی لە خۆیان بکەن نەک لەکەسانی دی.
ئەدلەریش ئەو بروایەی هەیە، کە نەخۆش بڕوای بەهەندێک بیروباوەڕی ناعەقلانی و پڕوپووچ هەیە، ئەگینا تووشی ئەو گرفت و شڵەژانییە دەروونییە نەدەبوو. کەواتە چارەسەرکاری عەقلانی بەردەوام بەدوای ئەو بیروباوەڕە ناعەقلی و پڕو پووچانەی نەخۆشدا دەگەڕێ بۆ ئەوەی بەزووترین کات بۆ کەسی نەخۆش دەست نیشان و روونیان بکاتەوەو ناچاری بکات کەوا زیان لێ بهێنێ و لە جیاتی ئەو بەشێوەیەکی زیاتر عەقلانی و مەنتیقی تر بیربکاتەوە.
هەرچەندە زۆر شتی هاوبەش لە نێوان چارەسەری عەقلانی و چارەسەری ئەدلەری هەبێت، بەڵام ئەدلەر کەمتر پەنا بۆ ناچارکردنی نەخۆش دەبات بۆ ئەوەی واز لە بیرو باوەڕە کۆنەکانی بهێنێ، بەڵکو لەو بڕوایەدایە کە نابێت چارەسەرکار بەنەخۆش بڵێت ئەم بیروباوەڕە هەڵەیەو ئەو بیروبۆچوونە راستە، بەڵام چارەسەرکاری عەقلانی بەزۆری پەنا بۆ هێرش بردنە سەر بیروبۆچوونە ناعەقلی و نامەنتیقییەکانی نەخۆش دەبات و لایەنە باش و خراپەکانی بیروبۆچوونەکانی بۆ روون دەکاتەوە.

٤- پەیوەندی نێوان چارەسەری عەقلانی و چارەسەری ناڕاستەوخۆ.

تارادەیەکی زۆر زەمینەیەکی هاوبەش لە نێوان ئامانجەکانی چارەسەرکردنی ناڕاستەوخۆی (رۆجەرز)و چارەسەری عەقلانی هەیە. بۆ نموونە رۆجەرز لەو بڕوایەدایە کە لە ئەنجامی چارەسەرکردنەوە کۆمەڵێک گۆڕانکاری لەلای کەسی نەخۆش روودەدات لەوانە:

١- کەمبوونەوەی گرژی و دڵەڕاوکێ شاراوەکانی نەخۆش.
٢- کەمبوونەوەی هەرەشەکانی سەرنەخۆش، هەر لە بەرئەوەشە نەخۆش کەمتر پەنا بۆ خۆپاراستن دەبات.
٣- باشتر خۆ گونجاندنی نەخۆش لەگەڵ ژیان و دەوروبەر.
٤- زیاتر کۆنترۆڵکردنی خود.
٥- زیاتر رازیبوون لەکەسانی ترو کەمتر پەنابردن بۆ شەڕخوازی و توندوتیژی دژی کەسانی تر.
٦- زیاتر رازی بوون لە خودو کەمتر گلەیی کردن و نارەزایی لە خود.

هەروەها سەرجەم ئەو ئامانجانەی سەرەوە ئامانجی سەرەکی چارەسەرکردنی عەقلانی هەڵچوونیە، ئەمەش هاوبەشی نێوان ئەو دووجۆرە چارەسەرکردنە دەردەخات، کەواتە ئەرکی سەرەکی چارەسەرکاری عەقلانی ئەوەیە کە نەخۆشەکەی تێبگەیەنێ کە لەراستیدا ئەو (واتە چارەسەرکار) رقی لە نەخۆشەکان نییەو بەچاوی سووک سەیریان ناکات و لەنرخیان کەم ناکاتەوە کاتێک کە نەخۆشەکان بەشێوازێکی هەڵەو نادروست هەڵسوکەوت و رەفتار دەکەن. بێگومان ئەم رێزگرتنی کەسی خاوەن گرفت و قبوڵکردنی هەڵەو رەفتارەکانی بەشێکە لە چارەسەرکردنی رۆجەریش.

**٥- پەیوەندی نێوان چارەسەری عەقلانی و چارەسەری وجودی:**

لە هەندێک لایەنەوە پەیوەندی لە نێوان چارەسەری عەقلانی و چارەسەری وجودی هەیە، ئامانجە سەرەکییەکانی چارەسەرکردنی وجودی بریتییە لە یارمەتیدانی کەسی نەخۆش و خاوەن گرفت بۆ ئەوەی سەربەستی ئازادی خۆی دیاری بکات، لە هەمان کاتیشدا یارمەتی نەخۆش بدات بۆ ئەوەی لەگەڵ کەسانی دی بەکامەرانی بژین و گفتوگۆی بەرهەمهێنەریان لەگەڵدا بکات و بگەنە ئەو بڕوایەی، ژیانی تایبەتی خۆیان بەرزترین دەسەڵات و لە رێگەی کاروچالاکیەکانیەوە بگاتە راستیەکان و فێری ئەوەش بکرێن، کە توانای قبوڵکردنی هەندێک سنووری هەبێت لەژیاندا. چارەسەرکارانی عەقلانیش بەشێوەیەکی گشتی بەو بۆچوونەی سەرەوە رازین. ئەوە ماوە بڵێین کە چارەسەر عەقلانی چارەسەرێکی (عەقلانی لێکدانەوەیی فەلسەفی هەڵچوونی ناڕاستەکراوی پۆزەتیڤەو لە چواردەوری خودو کەسایەتی نەخۆشدا دەخولێتەوە).

**پەراوێز**

**(الطيب، ١٩٨٩، ص١١٦-١٢٨)**
**الطيب، محمد عبدالظاهر (١٩٨٩) تيارات جديدة في العلاج النفسي دار المعرفة الجامعية، اسكندرية.**

# جیهانی ئەرنستۆ ساباتۆ

حەسەبەڵلا یەحیا
و: سەڵاح عومەر

لەو سێ ڕۆمانەی ڕۆماننووسی ئەرژەنتینی ئەرنستۆ ساباتۆدا کە کراونەتە عەرەبی، خوێنەر ناچار دەبێ بەرامبەر دەست ڕەنگینی نووسەر لە ڕۆمانووسی و ئەو ڕۆشنبیرییە ناوازەو سەرسوڕهێنەرە قوڵەی دۆشدا بمێنێ، دەست ڕەنگینیەکەشی خۆ لەو ئاراستانە دەنوێنێ کە ئەم هونەرمەندە گەورەیە بڕیویەتی بۆ داهێنانی ڕۆمانێکی شمولی پڕ ئەزموونی مرۆڤایەتی ڕەگ داکوتراو، تژی ڕۆشنبیری نازادە. ئێمە ڕۆمانی مەزنمان خوێندۆتەوە کە جیاوازیان لە ڕۆمانەکانی دی هەیە وەک ئەو ڕۆمانەی پشت بەشیکردنەوەی کەسایەتیەکان دەبەستێ، یا هەستکردنمان بەکەسایەتی و ڕووداوەکان قوڵ دەکاتەوە، یاشا ڕاوەو نادیارمان بۆ بەمێژوو دەکات، یا زمانێکی دەلالیمان بۆ دەخوڵقێنێ.

بەڵام هەموو ئەم لایەنانە لەکارێکی هونەری بێ کەموکوڕی پێشکەش بکرێ ئەمە کەم ڕوودەدات. ساباتۆ پێ دەنێتە ناو مەنلوف و ئەو جگە لە پسپۆڕێتی لە فیزیاو خاوەنێتی بڕوانامەی دکتۆرا لەم بوارە، ڕۆمانووسیشی کردۆتە بەشێکی دیکەی ژیانی، تا هێزی پێ ببەخشێ و ڕەهەندی ڕۆشنبیری و خەیاڵەکەی خۆی پێ بەئەنجام بگەیێنێ. هەروەها سنووری هەموو ئەو شتانەی لە ڕۆماندا هەیە ببەزێنێ. ساباتۆ لە ڕۆمانی (مەلائیکەتی دۆزەخ / ئەبرۆن)دا تۆ لەو کاتەی لەسەفەرکردندای سەراسیمەت دەکات و مەنلوف تێکەڵ غەرائیبی و هەستپێکراو بەخەیاڵ دەکات بەدەست ڕەنگینیەکی لێ وەشاوە ئەنجام دەدات، وەک (د. خالد محی الدین البرادعی) لە پێشکەش کردنی ڕۆمانەکەدا دەیڵێ و پێی وایە زەحمەت وەسف و بەگشت دەکرێ. جاران ئەرکی داهێنەر نووسینی ساکارو ئاسان و شتی ڕوون بوو تارادەی زاڵ بوونی ئەم لایەنانە.

ئێمە ڕاهاتووین هونەریی چاک بەڕادەی تێگەیشتنمان لێی هەڵسەنگێنین نەک بەڕادەی ئەو ئامادەییە هەڵاوێرەی لامان، ئێمە بەپێی خوێندنەوەکانی پێشوومان شتی تازە دەخوێنینەوەو حوکم لەسەر سەنگینی بەرهەمەکە دەدەین، بێ ئەوەی لەژێر ڕۆشنایی دەرهاوێشتەکانی خۆی مامەڵەی لەگەڵ بکەین .ساباتۆ خولاسەی ئەزموونی



زانایەکی فیزیاوی یا سیاسیەکی چالاک یا رۆشنبیرێکی ئاگادار بەزۆر شت نییە، بەڵکو ئەو خولاسەی کۆتا نەهاتووی مەعریفەو داهێنان هەمووەیەتی. لەم رۆمانەدا ساباتۆ پەلیکشی رۆمانەکانی پێشوو و ئەو کەسایەتیانەی پێشتر گرنگی پێداون و ئەو رووداوانەی تیایاندا روویانداوە دەکات، لە چاکی بەخششیان ئەم رۆمانانە کراونەتە عەرەبی و لەبەردەستمانن. بەتایبەتی رۆمانی (تونێل)و (پاڵەوانەکان و گۆڕ) کە ناوی لە (مەلا ئیکەتی دۆزەخ) دێ و بۆمان هەیە وەک بەرهەمێکی ئەزموونگەری قوڵی ئاست بەرز دایبنێین.. کە بۆ پاڵکەوتن و ئیسراحەتی رووت ناخوێندرێتەوە، ئەگەر ئەم مەبەستە لە مێشکمدابێ ئەوا وا چاکە هەر لەبنەڕەتدا نەخوێندرێتەوەو خراپە لەگەڵ نووسەرەکەی نەکرێ. چونکە رۆمانەکە پشت بەزنجیرەیی رووداوەکان و کەسایەتیەکان وەک تەقلیدی ۆمانی کۆن نابەستێ. بەڵکو زنجیرەیەک بەش و پەرەگرافە بەیەکەوە بەستراوەو لێک دەبنەوەو تێکەڵ یەک دەبن و یەکتر دەبڕن. هەندێ جار لێی بێزار دەبین، بەڵام دەوڵەمەندی و قوڵی وا لە خوێنەری جددی دەکات خۆی لەکاری وا زەحمەت بدات ،ئەم خۆ لێدانەش خۆی لەخۆیدا بۆ ئەو کەسەی بیەوێ لەزەت لەسەرچاوە دەوڵەمەندەکەی ژێرەوەی ببینێ چێژە. ساباتۆ خۆشی لە سروشتی ئەم نووسینەی دەگات و دەزانێ چ ئازارێک بە خوێنەرێکی ئاسایی دەگەینێ کە لە خوێندنەوەی رۆمانی واقیعی و رۆمانسی راهاتووە. بۆیە ئێمەی خستۆتە بەردەم ئەو دەستەواژەیەی لە (رؤيا القديس يوحنا)دا هاتووە کە دەڵێ: ترس رەگوریشەی زۆر قوڵی هەیە، هەرچەند قوڵتربێ، ژمارەی کەمتر دەبێتەوە، نوێتریشیان رەنگە تەمومژاوی ترینیان بێ. باشتر درێژەی پێدەداو دەڵێ: بابەت مرۆڤ هەڵدەبژێرێ، ئەو مرۆڤەش ئابێ یەک دێر بنووسێ ئەگەر لە بارەی ئەو ترسە نەبێ کە پاڵی پێوە دەنێ و لەتاریکترین شوێنەوە دێ و بۆ ماوەیەکی درێژ ئازاری پێ دەگەینێ، خۆت راگرەو سەبر بگرە، ئەم دەسخەرۆییە بکە ئەزموونێک کە دەسخەرۆییەکی ئاسان نییە... بەڵکو ترسناکترین دەسخەرۆییەکە دەبێ رەتی بکەیتەوە».

ساباتۆ تەواو درک بەسروشتی نووسینی رۆمانەکانی دەکات و وەک رۆشنبیرێک و رەخنەگرێکی بەئاگا لە وردەکارییەکانی وتوێژی لەگەڵدا دەکات. ئا لەوێدا تایبەتمەندیەکانی ساباتۆ خۆ دەنوێنێ و لە تەمومژاوی و قوڵیەکەی دەگەیت، لەمەشدا هۆکاری خۆی هەیە. ئەو پێی وایە بابەتەکانی هونەر رۆح دەیخولقێنێ وەک (فیختە) دەیڵێ: بەم مانایە بودلێر هونەر بەو سیحرە دادەنێ کە یەخەگیری زاناو داهێنەر دەبێتەوە..» هەروەها باوەڕی وایە نووسەرە ئاساییەکان دەتوانن ژیاننامەیەکی ئاسایی بنووسن و وەسفی واقیعی دەرەکی قۆناغێک یا نەتەوەیەک بەئەمانەت بکەن، بەڵام نووسەرانی ئاناسایی ئەوا توانیان لەرادەبەدەرەو ناتوانین ئەمە بکەن، هەتا ئەگەر داواشیان لێ بکرێ..!!

کەواتە ساباتۆ لە سروشتی نووسینەکانی لە (مەلائیکەتی دۆزەخ) دەگات و ئەم لایەنە درێژە پێدەدا بۆ ئەوەی خوێنەر وا لێبکات وابزانێ زنجیرەیی رۆمانەکەی لە دەست دەرچووە وەک چۆن لە دەست رۆمان نووس دەرچووە. ئەمەش کەموکوڕیەک نییە، بەڵکو جۆرێکە یا شێوازێکە لە نووسین کە ساباتۆ گرنگی پێدەداو حەزی پێدەکات، تا خوێنەر پاڵنەکەوێ و تەنیا بۆ کات بەسەربردن نەیخوێنێتەوە، وەک چۆن گۆڤارێک یا کتێبێکی رووکەشی بێ ناوەڕۆک دەخوێنێتەوە.

بۆیە نووسەری گەورە دروستکەری وشە نییە. بەڵکو مرۆڤێکی گەورەیەو دەنووسێ..» لەبەرئەوەیە ساباتۆ هەوڵدەدات گفتوگۆی مەزنان لەگەڵ خودی ساباتۆ خۆی بکات. لەمەشدا مەبەستی ئیدانەکردنی ئەدەبی (الاستبطان)ە و هۆکاری خۆشی لەم ئیدانەکردنە هەیە. چونکە (الاستبطان) مانای قوڵبوونەوە لە (من)دا دەگەینێ. منی گۆشەگیریش خۆپەرستییەو لا لە جیهان ناکاتەوە یا دوژمنکاری ئەو شۆڕشە دەکات کە دەیەوێ باوەڕمان پێ بێنێ گرفتی هۆش لەناو دەروونە نەک لە سیستەمی کۆمەلایەتی. لێرەدا دەبینین ئەو رۆمانانە وەسفی مانگرتنی کرێکارانی شەمەندەفەر لەبراگ ناکەن، بەڵام ئەم مان گرتنە بەیەکێک لە شاهیدە زیندووەکانی مرۆڤی تازە دەمێنێتەوە. لەگفتوگۆیەکی باشتردا کە وەک رەخنە لە رۆمانی (پاڵەوانەکان

ڕقەبر) گیراوە بەسەر سوورمانەوە ئاماژە بەلێکۆڵینەوەیەکی لیلیا ستروت)دەداو پشت بەپەرەگرافێک دەبەستێ کە لە (العهد والقديم)دا هاتووەو دەڵێ:

لەوە مەگەڕێ کە بەچاوەکانت جوانن و لەوەش مەگەڕێ کە لەتوانای تۆ بەدوورە. هەروەها ساباتۆ ڕیپۆرتاژێکی ڕۆژنامەوانی دەخاتەڕوو کە تێیدا هاتووە:

- ئایا تۆ لەوەی دەینووسی ڕازی؟

- تا ئەو ڕادەیە (پیاوێکی خراپ نیم).

- **ئەرنستۆ ساباتۆ کێیە؟**

- کتێبەکانم هەوڵێکن بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە. من هەوڵنادەم ناچارت بکەم نووسینەکانم بخوێنیتەوە، بەڵام ئەگەر دەتەوێ وەڵامەکە بزانی، ئەوا ئەوکاتە لەسەرتە ئەم کارە بکەی».

کاتێ دەچینە سەر ڕۆمانی (پاڵەوانەکان و قەبر» ساباتۆ هەر لەسەرەتاوە دەمانخاتە بەردەم ئەوەی کە زۆرجار نووسەر بەهۆی خەیاڵەوە دەیەوێ خۆی لەو ترسە دووربخاتەوە کە لای خۆشی ئاشکرا نییە». ئەوەی دیکەش هەر چۆنێ بێ، یەکێکە لەم جۆرانەی من دەتوانم بینووسم، جگە لەمە من هەر لەوکاتەی کە گەنج بووم پەلکێشی ژیاننامە شاراوەکان بووم.

ئەم ترسانەشی (هاجس) لەرۆمانی (مەلائیکەتی دۆزەخ) دووپاتکردۆتەوە، بەڵام لە پاڵەوانەکان و قەبردا دەمانخاتە بەردەم دیمەنی زۆر کارەساتاوی (فەزیع) و خوێنەر ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ئەوە دەکات:

تەرمەکە بۆگەن دەکات و بۆنەکەشی بێزارکەرە، گۆشتەکەی تا دێ بۆگەن دەبێ و تەنیا ئێسقانی دەمێنێ. یەکێ دەڵێ هەروەها دڵیشی، بەڵام بەر لە هەموو شتێ کەللە سەری: ئۆریبی هیچ کاتێ نابێتە خاوەنی کەللەسەرو مێشک، هیچ کاتێ بەسەر جەنەڕاڵدا سەرناکەوێ.

لەناو جەرگەی شەڕو قوڵترین شوێنی کارەساتدا، لەرەگوریشەی خۆش و وەلاتدا.. ئەمە حاڵەتێکی فەریعەو پەیوەندی بەرنینەوەی کۆشتی کەسێ هەیە کە خۆشت دەوێ تا بۆگەن نەکات!!.

ئافرەتێکی نابیناش هەیە، پشت بەشێوازێک بۆ ئازاردانی هاوسەرەکەی دەبەستێ بەوەی دۆستەکانی دێنێتە ژووری نووستنی خۆی و مێردەکەی و بەئامادەبوونی ئەویش لەگەڵیان جووت دەبێ، چونکە پیاوکە کوێرەو شەپرە لێی داوەو لەسەر کورسیەکی بەپێچکە دادەنیشێ، ئەو پیاوە یەخەگیری ئازاردانێکی ڕێکخراو دەبێتەوە کە ئافرەتەکە دایهێناوە.

ئەم دیمەنە و دیمەنی دیکە لە (پاڵەوانەکان و قەبر) وامان لێدەکەن بەرامبەر حاڵەتێکی نائاسایی بوەستین. تاکاتی ئەوەی سەیر دەکەین ئێمە خۆشمان لێیان ڕاهاتووین، چونکە ناکرێ مرۆڤ بۆ ماوەیەکی درێژ لەگەڵ دوژمنێکی بەهێز شەڕ بکات و لەکۆتاییدا وەک ئەوی لێ نێ. هەروەها ئێمە لە جیهانێک دەژین ڕۆژانە مرۆڤی تێدا وردوخاش دەبێ کە بەڕاستی ڕووبەڕووی باندێکی خراپەکار دەبێ ئەوە. بۆ ئەوەی باوەڕ بە مرۆڤێک بێنین کە پێویستی بەوە هەیە بەئاگر بیسووتێنن. بەڵام لە ڕۆمانی (تۆنێلدا) دەکەوینە بەردەم دادگایەک و حاڵەتێکی تەنەمولی کە تەنیایی بەمرۆڤ دەبەخشێ. ساباتۆ پێی وایە حەقیقەت شتێکی ئاسان نییە وەک ئێمە تێی دەگەین. ئەوکاتەی شتێکی تەواو ڕوون هەبێ، وەک ئەوەی ڕووداوێک ئاڕاستەیەکی ئاسان وەربگرێ، ئەوا پاڵنەرێکی ئاڵۆز لەناوەوەدا هەیە. نموونەیەک بەو کەسانە دەهێنینەوە کە خێر بەهەژاران دەکەن و خۆیان بەچاکەخواز دەزانن، کەچی وەک دەزانرێ لە توانادا نییە چارەی گرفتی هەژاری (هەژاری حەقیقی) بەپارەدان یا پارچە نان بکەین. بەڵام لە بەرامبەر ئەمەدا گرفتی دەروونی ئەو کەسە ئاسوودەیی ڕۆحی و سیفەتی چاکەخوازی لەڕێی.

بەرامبەر ئەم بڕگانەی لەبەرهەمەکانی ساباتۆ هێنامانەوە ئایا دەکرێ بەرۆمانی ئەخلاقی ڕۆشنبیری دایانبنێین. خوێندنەوەیەکی لەسەرخۆی کارەکانی ئەو نووسەرە. ئەوە دەردەخات کە ئەوەی ئەو دەینووسی بەهایەکی فیکری و ئەخلاقی داهێنەرانە، یان هەیەو هەوڵی بۆ دەدات بەدی بێنێ، ئەو نموونەیێکی ئاوازە پێشکەش دەکات تا سنووری ئاسایی بە بەزێنێ و ڕێگایەکی تاک ڕەهەندی داهێنەرانە. بکرێتەوە.

**سەرچاوە:**

**جريدة الصباح العدد: ٣٦٤: الاحد/ ايلول ٢٠٠٤.**

# شێوازگەرایی و دەقی ئەدەبی

و/ د. هیمدادی حوسێن



بۆ لێکۆڵینەوە لە (شێوازگەرایی) و چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ دەقی ئەدەبیدا سەرەتا؛ دەبێ چەمکی شێوازگەرایی وەکو میتۆدێکی رەخنەیی روون بکەینەوە، بێگومان دیارە هەر لە زووەوە لێکۆڵەران سەرنجی جوانناسی زمانی ئەدەبی یان ئیستاتیکایای دەقی ئەدەبیان داوە و، هەوڵیان داوە خاسیەت و پێکهاتە و ئاستە جیاوازەکانی دیاری بکەن لەپێناو دەرخستنی توانای شاراوەی زمان و دیاریکردنی شێوازەکانی دەقی ئەدەبی لەوەی تا چەند دەتوانێ کاریگەریی و ئەرکی ئیستاتیکی ببەخشێت.

(شارلبالی) دامەزرێنەری شێوازگەرایی، یان زانستی شێواز وەها دەناسێنێ؛ کە ئەو زانستەیە لە رەگەزەکانی زمان دەکۆڵێتەوە، کە تا چەند ناوەرۆکەکەی دەربڕ و کاریگەرە.)

ئەو وای دەبینێ کە زمان لە ئاراستەی خۆیدا بارگاوی کراوە، هەر بۆیەشە واقیعی زمانەوانی یان خیتاب بەسەر دوو جۆردا دابەش دەکات؛ یەکەمیان ئەو خیتابەیە کە خودی خۆی هەڵگرتووە و بارگاوی نەکراوە بەهیچ، ئەوەی دیکەیان هەڵگری سۆزو وروژاندنە؛ لە شێوازگەراییدا مەبەست لە لایەنی سۆزداری لە خیتابدا ئەوەیە، چڕی ئەو سۆزەی کە قسەکەر لە خیتابەکەی خۆیدا بەکاری دێنێ.

شێوازگەرایی بەلای (بالی)یەوە لە بنچینەدا «دیاریکردنی وزەی شاراوەی دەربڕینی زمانە لای تاک، کەوابێ بابەتی شێوازگەرایی، بە پێی ئەم بۆچوونە؛ لێکۆڵینەوەی بەهای سۆزداری زمانە، یان لێکۆڵینەوەی کایەکانی دەربڕینی زمانە لە ڕووی ناوەرۆکی ویژدانیەوە، کەوابێ مەبەستی سەرەکی (بالی) تەنیا ناوەرۆکی ویژدانییە لە دەربڕین یان لە خیتابدا، بەڵام لیۆر سپیتزەر مەبەستی: لێکۆڵینەوەی سروشتەکانی، یان جۆرەکانی شێوازە لەکاری ئەدەبیدا، کە رەنگدانەوەی کەسایەتی خاوەن دەقە.

بێگومان ئەوەی کە ئەو دوو ڕێباز یان ئەو دوو بۆچوونە جیاوازەی شێوازگەرایی لە یەکتر جیادەکاتەوە؛ ئەوەیە؛ کە یەکێکیان گرنگی بە ناوەرۆکی ویژدانی و سۆزداریی دەربڕین دەدا و لایەنی ئیستاتیکی فەرامۆش دەکات، ئەم ڕوانینە لای (شارل بالی) رەنگی داوەتەوە و ئەم ڕێبازە بە (شێوازگەرایی دەربڕین) ناسراوە و، ئەوەی دووەمیان گرنگی بە زمانی ئەدەبی دەدات و ئەو خاسیەتانەی لە نووسەردا دەردەکەون و بەم ڕێبازەش دەوترێت «شێوازگەرایی تاکخوازی». (الاسلوبیه الفردیه).

نووسەرێکی دی، کە (بیار جیرۆ)یە لە پێناسەی شێوازگەراییدا دەڵێت: لێکۆڵینەوەی گۆڕانکارییەکانی زمانە بەرامبەر بە پێوانەکانی دەستوور...، لێرەدا دەستوور مەبەست کۆمەڵە یاسایەکە؛ یان کۆمەڵە دەروستبوونێکە کە سیستەم و ئاستەکانی زمان دیاری دەکەن، شێوازگەرایی جۆری ئازادییەکانی نێو ئەم سیستەمانە دیاری دەکات. دەستوور ئەو زانستەیە کە نووسەر ناتوانێ دروستی بکات، بەڵکو ئەرکی شێوازگەراییە ئەم کارە بکات.

شێوازگەرایی بەپێی ئەم بۆچوونە ئیستاتیکای بزاڤی نووسەر دەگرێتەوە، کە تا چەند دەتوانێ داهێنان و دیاردەکانی زمان بەشێوەیەکی تازە بەکاربێنێ، هەربۆیەشە بە (شێواز)

دەگوترێت، «بواری کارکردن- مجال التصرف».
جاکۆبسن لە ناساندنی (شێوازگەرایی)دا وەهای بۆ دەچێ کە لێکۆڵینەوەیەکی وتەو گوفتارە جیا لە ناستەکانی دیکەی خیتاب لەلایەکەوە، لەلایەکی دیشەوە، لەگەڵ سەرجەم هونەرە مرۆڤاتییەکانی دیکەدا جیاوازە، کەوابێ شێوازگەرایی و مەیدانی لێکۆڵینەوەکانی بریتییە لە ئاستی هونەر خیتاب کە لەنێوان هەموو گروپەکانی دیکەی خیتابدا جیایە و بەمە لەگەڵ هونەرەکانی دی جیادەبێتەوە؛ کە لەدەربڕیندا لەگەڵ ئەدەبدا یەک دەگرنەوە، بەڵام لە هۆکار و شێوەی دەربڕیندا لە هەموویان جیایە.
بەڵام (عبدالسلام الحسدی) دەڵێ شێوازگەرایی گرنگی لێکۆڵینەوەی ئەو خاسیەتانەی زمان دەدات، کە وتە و قسەکردن بە تەنیا بەهۆکارێک نازانێ بۆ ڕاگەیاندن بەڵکو دەیکات بە ئامرازێکی کاریگەریی هونەریی، لەو خاسیەتانەی زمان دەکۆڵێتەوە کە ئەرکی جوانی (ئیستاتیکی) بەخیتابی ئەدەبی دەبەخشن، هەروا لەو نهێنییەی کەوا دەکات خیتابی هونەری ئەرک و مەبەستی دوو لایەنە ببەخشێت، ئەوەک بە تەنیا وتەی ئاسایی، کە گەیاندنی پەیامێکی دەلالییە، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کاریگەرییەی وتە لەسەر بەرامبەردا دەینووێنێ و تا چەند وروژاندنی لەلا دروست دەبێت.
بەپێی ئەو پێناسانەی لەسەرەوەدا ئاماژەمان پێکرد، زانستێکە لەو دیاردە ئەدەبییە دەکۆڵێتەوە کە بەهۆی ڕەگەز و خاسیەتە تایبەتییەکانی زمان دەکۆڵێتەوە، کە ئەرکێکی دوولایەنەی لە ئەستۆدایە، کە (گەیاندن و کاریگەرییە).

**بوارەکانی لێکۆڵینەوەی شێوازگەرایی و ڕێگاکانی پیادەکردنی:**

شێوازگەرایی هەوڵدەدات لە هەڵبژاردنەکانی نووسەر (اختيارات الكاتب) بکۆڵێتەوە، کە لە هەموو دەقێکی ئەدەبیدا دوو لایەن بەرجەستە دەکات، چێژ و بەهای جوانناسی. دەق دەوڵەمەند دەکات و گرنگی پێدەدات، بە پێچەوانەی ڕێبازە ڕەخنەییەکانی دی کە هۆکارێک بەکاردەهێنن بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دەرەکی پەیوەند بە بارودۆخێکی مێژوویی یان بەخششێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی یان هەر هۆکارێکی دی کەوا دەکات کە کارتێکردنەکە تەنیا لە ڕێگەی ئەوەوە بێت، بۆیە یەکێک لە لێکۆڵەرەکان دەڵێ ڕەخنەی شێوازگەرایی، ڕەخنەیەکە سیفەتێکی زانستی هەیە، چونکە لە دەق خۆی و لە ناوەوەی دەق دەکۆڵێتەوە، ئەوەش لە ڕێگەی جەخت کردن لەسەر ڕەگەزە شێوازگەرایییەکانی دەق خۆی، و پێوەندی نێوان ئەو ڕەگەزانە و ئەرکی شێواز و جوانناسییان.
کەوابێ هەروەکو دەردەکەوێت بواری لێکۆڵینەوەی شێوازگەرایی تایبەتە بە دەق و پێکهاتە ناوەخۆییەکانی و پەیوەندی کردە دەرەکییەکانەوە نییە کە لە دەرەوەدا کار لە دەق دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە تەنیا سەرنجی پێوەندی ڕەمز و هێماکانی زمان لەگەڵ یەکتر نادات، بەڵکو سەرباری ئەوە پێوەندی پتەوی نێوان (بیرکردنەوە و دەبڕین) دەدات، بەشێوەیەک کە پێوەندی نێوان بیرو دەربڕین تا چەند کاریگەریشیان بەسەر یەکترەوە هەیە، بەم هەنگاوەش تۆژینەوەی شێوازگەرایی لە ئاستی وەسفییەوە بۆ ئاستی بە ئەدەبی بوونی دەق و دەلالەتە شاراوەکانی شێواز دەگوازرێتەوە.
شێوازگەرایی، لێکۆڵینەوەی لایەنە شێوازگەرایییەکانی دەقی ئەدەبییە، بەهۆی هۆکارە جیاوازەکانی دەربڕینی و پێکهاتەکانیان، وەکو وشە وێنە و باری گرامەر و مۆسیقییەوە، کە لێکۆڵەر لە ڕێگەی ئەمانەوە دەتوانێ هۆکار دەروونی و کاریگەرییە ئیستاتیکییەکان دیاری بکات.
لێکۆڵینەوەی شێوازگەرایی

شێوازگەرایی، لێکۆڵینەوەی لایەنە شێوازگەرایییەکانی دەقی ئەدەبییە، بەهۆی هۆکارە جیاوازەکانی دەربڕینی و پێکهاتەکانیان، وەکو وشە وێنە و باری گرامەر و مۆسیقییەوە.

بۆ خـــۆ نزیک کـــردنەوە و راڤـــەی دەقی ئەدەبی پشت بەو چەمکانە دەبەستێت: هەڵبژاردن- ڕۆنان- لادان.

**هەڵبژاردن:**

هەڵبـــژاردن پەیوەندی بە چەمکی شـێـوازەوە هەیە و بەخاڵێکی گرنگ و بەرچاو دادەنرێت لەنێـــوانی (ئیـــستـــاتیکی) و (نائیـــستـــاتیکی)، وتە سیـفـەتی شـێـوازگـەرایی وەرناگـرێت تەنیـا ئەوکـاتە نەبێت، کە کۆمەڵێ دیاردە و ڕەفتاری دەربڕینی کاریگەری لەلایەن شاعیر یان ئەدیبەوە پێ دەبەخـشـرێت، کـە بە بۆچوونی یان دیدی خـــۆی ئەوەی هەڵـــبـــژاردووە ئەلتەرناتیڤێکی دیکەی نییە و ئەوەی هەڵـــبـــژاردووە لوتکەی کـــاریگەرییـــە بۆ دەربڕینی هەڵوێســـتـێکی دیاریکراو. دیارە لێـــرە مـــەبەست لە هەڵبـــژاردن، هەڵبژاردنی شێوازگەراییە، کە بە (هەڵبژاردنی ڕێزمانی) ناسـراوە، بەواتای هەمـــوو ئەوشـتـانە دەچێـتـە خـانەی دەنگ و وشـەسازی و دەلالە (سیمانتیک).

کەوایە هەڵبژاردنی وشە یان دەســـتـــەواژەیەک لەلایەن داهێنەرەکەیەوە بە راسـتـرین و چاکـــتـــرین زانراوە بۆ گـــەیاندنی مـــەبەست بۆیە هەڵبژاردراوە، ئەمەش وامان لێ دەکات کە بڵـێین شێواز پرۆسەیەکی هۆشمەندانە و بە قەسدەوەیە و داهێنەر دەزانێ هەمـوو نیـشـانەو هێـمـایەکی زمان لە شوێنی خۆیدا بەکار بێنێ و شـێـوازی خـۆرسک و خـــوورپە یان ئیلهـــام ڕەت دەکاتەوە، کە پێشتر هەندێ ڕێبـــازی ئەدەبی و ڕەخنەیی ئامـــاژەیان بـۆ دەکـــرد. (هەڵبـژاردن)یش لە چەندین وێنەدا خـــۆ دەنوێنێ، لە ئاســـتـی گـــوتەیەک یان فــــەرهەنگـــــازیدا، پەســەندکـردنی گـوتەیەک بەسەر گوتەکانییدا دیکەدا)، هەیانە لەسەر ئاستی ڕۆنانی ڕێزمـــانی) بەشـێـــوەیەک پەســەندکـردنی شـێـوەیەکی ڕۆنان بەسـەر ئەوانی تردا بۆ گەیشتن بە بنەچەی واتا.

چەمکی ئەو (هەڵبـــژاردن= اخـــتـــیـــار)ە لە تیـــۆری چۆمـسـکی لەبارەی (ڕۆنانی سەرەوە- ڕۆنانی ژێرەوە) لەو بارەوەیە و بەو شـــێـــوازە دەگـوترێ، کـە هەڵبژاردن بۆ مـەبەسـتی بەرهەمـهـێنان و بەکـــــارهێـنـانـی توانا شاراوکانی زمان بەکاردێنێ. هەر ئەو تیـۆرەی چۆمـسـکی هەوڵ دەدات ئەو توانـایـانە دیاری بکات و مـەوداکـانی دەربخـات بەهۆی (ڕێزمـانی گـوێزانەوە)، لە ئاکـامـدا بۆمان دەردەکەوێت، (سیمای شێـوازگەرایی)، وێنەیەکی هەڵبژاردەیە لەنێـوان گوێزانەوەیەکی هەڵبژاردندا کە لەگـەڵ دەلالەتەکـەیدا دەگـونجێ و لە هەمـوویان گـونجـاوترە. بۆ زیـاتر ڕوون کـردنەوە دەکـرێ بڵـێین لەمـیـانەی وێنەکـــانی هەڵبـــژاردندا دەربڕینە ڕەگـەزدۆزییـەکـان یان مـەجازییـەکـان هەموویان دەچنە ئەو خانەیەوە، چونکە هەڵبـژاردنەکـە لەم جـۆرە یان وێنەیەدا لەسەر ئاستی تاکە گوتەیەکدا دەچێتە دەرەوە و دەبێتە ڕۆنانێکی جیا، بەوەی دارشتنەوە و ڕۆنانێکی تازەی وشەیە بۆ وێنەیەکی ئەدەبی ئەرکی کارتکردنێکی گەیاندن و جوانناسی لە هەمان کاتدا بگرێتەوە.

**ڕۆنان:**

لێکۆڵینەوەکانی بواری شـێـوازگـەرایی نـرخ و بـەهـایـەکـی زۆر بـۆ (ڕۆنـانـی شـێـــوزاگـــەرایی) دادەنێن، تەنانەت بەلایەنێکی کـــاریگەری پرۆســـەی ئەفـــراندنی ئەدەبی دەزانن و بەهۆیەوە وێنەی دەربڕینی زمـانەوانی لە مـەودای بوونی بەزۆرە ملێ بۆ بوونی ڕاستەقینە دەگـــوازرێتـــەوە، ڕۆنان ڕووخـــســـاری ئەدەبییـە، چونکە ئیستـاتیکا لەدەقی ئەدەبیـــدا پەیوەندی بە تێکچـــڕژان و کـارلێکراوی ڕەگـەزە بنیـادییـەکـانی دەقەکە خۆیەوە هەیە.

لە دەقی ئەدەبیـدا ڕۆنان دەبێـتـە هۆی ڕێکخستنی وشە هەڵبژاردەکان بەهۆی هەر دوو کرداری ئامادە و نائامادەیی. یان بە واتا یەکی دی لە دەقی ئەدەبیـدا وشەکان لەسەر هەردوو ئاستی ئامادەیی و نائامـادەیی دادەڕێژرێن و لەسـەریەک هێڵ لە سـیـاقـدا دادەڕێژرێن بۆ ئەوەی کـــاریگەرییـــەکی دەلالی و دەنگی و

شارلبالی دامەزرێنەری شێوازگەرایی، یان زانستی شێواز وەها دەناسێنێ، کە ئەو زانستەیە لە ڕەگەزەکانی زمان دەکۆڵێتەوە، کە تا چەند ناوەڕۆکەکەی دەربڕ و کاریگەرە.

ڕۆنانی بنوێنێ.
بەپێی ئەم بۆچوونەمان بۆ ئەفراندن یان داهێنانی ئەدەبی لە هەمان بازنەی بۆچوونەکانی جاکبسۆن ناچینە دەرەوە، کە دەڵێ ڕووداوی شێوازگەرایی ڕۆنانی دوو پرۆسەی یەک بەدوای یەکە، کە بریتین لە هەڵبژاردنی ماددەی تەعبیریی لە زماندا پاشان ڕۆنانی ئەو ماددە زمانەوانییە، کە لەگەڵ دەستوورەکانی ڕێزماندا بگونجێ و ئەوەی لە بەکارهێناندا ڕێگەپێدراوە.
بەم شێوەیە شێواز لای جاکبسۆن گونجان ئەو دوو پرۆسەیە؛ یان ڕێکەوتنی خشتەی هەڵبژاردنە لەگەڵ خشتەی دانان.
وانەی شێوازگەرایی لە دەقی ئەدەبیدا بەتەنیا وەسف کردنی بنیادی ڕۆنانەکە نییە، بەڵکو گرنگیدانە، بەمەودا دەلالییەکان و ئەو لقانە لێی دەبێتەوە لە بەکارهێناندا، وەکو پێشخستن و دواخستن، هێنان و لابردن، ناساندن و نەناسیاوی، واتا هەموو ئەو وردەکارییە زمانەوانییانە خەسڵەتی شێوازگەراین، لێرەوە دەڵێین؛ ڕۆنانی زمانی دەقێکی ئەدەبی وا دەکات ئەو دەقە قەوارە و خاسیەتی تایبەتی خۆی هەبێت، هەر بۆیەشە میشال ریڤاتیر جەخت لەسەر دەق خۆی دەکاتەوە و لە هەموو بارێکی خودی و کۆمەلایەتی دایدەبڕێ، خیتابی ئەدەبی ڕۆنانێکی ئیستاتیکی یەکەکانی زمانە، ڕۆنانێکی ئەوتۆیە لەمیانەی سیاقی شێوازگەراییەکەیدا واتاکانی ڕێزمان دەردەکەوێت ئینجا ئەرکی ئەدەبی دەقەکە بەرجەستە دەبێت، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا نهێنییەکە لە نهێنییەکانی خەسڵەتەکانی ڕۆنانی بنیادگەری و ئەرکەکەی.

لە کورتەی ئەم قسانەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە ڕۆنان لە دەقی ئەدەبیدا ئاماژەکانی زمان بەشێوەیەکی تایبەتی بەکاردەهێنێ و ئەو بەکارهێنانەیش بەهۆشیاری و بە قەسدەوەیە بۆ بەرهەم هێنانی دەلالەتی ئەدەبی.

## لادان:

لادان بە ئاماژەیەکی بە ئەدەبی بوونی دەق و شیعرییەتی دەق دادەنرێ، چونکە لادان و دەرچوون لە دەستوورە ئاساییەکانی زمان، لە هەر یەکێک لە ئاستەکانی دەنگی، ڕۆنانی، شێوازی، ڕەوانبێژی خۆی لەخۆیدا ڕووداوێکی شێوازگەراییە.
(لادان) پێوەندی خۆی لەگەڵ دەق لە ڕێگەی (پەیام) دەردەبڕێ، هەربۆیەشە پێناسەی (شێواز) بە (لادان) لە دەستوور باوەکان دەکرێت، یان جیاوازی نموونەیەک لە نموونەیەکی تر لە دووانەی سیستەمی ڕۆنانی زمانی دەقی ئەدەبی لەگەڵ سیستەمەکانی تر.
ڕایەک هەیە پێی وایە پێوانەی لادان لە زماندا پشت بە (توانست)یان توانای زمان دەبەستێت، کە حاڵەتێکی نموونەییە لە زماندا، ئەم نموونەییە بەڕای چۆمسکی و لایەنگرانی، لەلای کەسانی سەر بەیەک زمان دەتوانن سێ ئاست لە ڕۆنانی زماندا لە یەکتر جیابکەنەوە: ڕۆنانی تەواو و مانا دەبەخشێ، جۆرێکی دیکەیان ناتەواوە و هیچ نابەخشێ، ئەوەی سێیەمیان سەر بەهیچیان نییە، لەلایەکەوە زۆر تەواو دروست نییە، لەبەر ئەوەی بنیادی ڕۆنانەکەی جیاوازە یان لایداوە ڕستەی نا ڕێزمانی یان ڕستەی هاوشێوە. بەپێی بۆچوونی ئەوان بەکارهێنانیان لەزماندا لە سێ ئاستدا پیادە دەبێ؛ ئاستی ڕێزمانی نا ڕێزمانی و ئاستی ڕەتکراو، مەبەستیان لە ئاستی نا ڕێزمانی دیاردەی شێوازگەراییە، بەو پێیەی لادانە لە نموونە میسالی توانستی زمانە، چونکە پێوەرێکە بۆ پێوانەی ئەوەی کە تا چەند ڕستە لەیەک نزیک یان هاوشێوە و نا ڕێزمانییەکان لایانداوە.
هەندێ بیروڕای تر پێیان وایە (لادان) دیاردەیەکە پێوەندی بە ناوەوەی دەقەوە هەیە و شتێکی دەرەکی نییە، ئەو بۆچوونەشە وای لە میشال ریڤاتیر کردووە، کە لەدەست نیشانکردنی (لادان) بڵێت لادان دیاردەیەکی شێوازگەراییە لەسەر کەسی بەرامبەر و پێوەرێکە لە معیارەکانی شێوازگەرایی، دیاردە شێوازگەراییەکان بە بۆچوونی (ریڤاتیر) لە ڕێگەی بنیادە تایبەتییەکانی زمانەوە دیاری ناکرێت کە دەبنە هۆی لادان (الانحراف)، بەڵکو بە وردبوونەوە و ڕوانین لەوەی ئەو بنیادە تا چەند لای کەسی بەرامبەر ورووژان دروست دەکات و وەریدەگرێ.

* * *

* ئەم لێکۆڵینەوەیە لەوە درێژتر بوو، بەڵام لە وەرگێڕاندا کورتم کردەوە، بەشێوەیەک چەمک و ناوەرۆکی خۆی بگەیەنێ. ڕەنگە وەرگێڕانی بابەتی ڕەخنەیی بنیادگەری و شێوازگەرایی ڕەق بێت، بەڵام سروشتی ئەم لێکۆڵینەوانە، کە زاتر پشت بە گەمەی زمان دەبەستێ قورس بێت و بوونی کۆمەڵێ زاراوە و ڕۆنانیش بە ناوەندی ئەدەبیی کوردیی نامۆین.

سەرچاوە:

**حسين بوحسون، الاسلوبية و النص الادبي، مجلة الموقف الادبي، اتحاد الكتاب العرب بدمشق، ع٣٧٨، ٢٠٠٢.**

# ئایا شیعر گرنگە

## واقیعی شیعری ئەمەریکی و پاشەڕۆژی نادیاری

و: تاهیر عوسمان

نووسەری ئەم وتارە(دانا جیویا) شاعیرو وەرگێڕو وتارنووسێکی ئەمەریکییە، چەند کۆمەڵە شیعرێکی هەیە. لەوانە(کەڕووی ڕۆژانە)،(خواوەندی زستان) بەوەرگێڕانی شیعری ئیتاڵی بەناوبانگە، بەتایبەتی شیعرەکانی(یۆجینیۆ مۆنتال)، وتارەکانی لە زۆربەی گۆڤارە ئەدەبییەکانی ئەمەریکا بڵاودەکاتەوە. لەوانە(ئەتلانتیک مینتلی)،(نیش)، (نیو یۆرکەر) ئەم وتارە یەکەمجار لە مانگی ئایاری ساڵی(١٩٩١) لە گۆڤاری (ئەتلانتیک مینتلی) بڵاوکراوەتەوە، ئەوکاتە هەراو کێشەیەکی وای بەدواداهات، بە رادەیەک کە هیچ **وتارێک** ئەو بایەخەی پێنەدرابێ. چەندین وتار لایەنگری خۆیان بۆ دەربڕی و چەندانی دیکەش رەخنەی توندیان ئاراستەکرد.

**سەرباری هەزاران نامەو پەیوەندی تەلەفۆنی، نووسەر بۆ وەڵامی ئەم هەموو نارەزایی دەربڕینەش لە هاوینی ساڵی(١٩٩٢) وتارێکی دیکەی لە گۆڤاری (بویتری ریڤیۆ) بڵاوکردەوە، ئەو گۆڤارە لەلایەن کۆمەڵەی شیعری بەریتانی بڵاودەکرێتەوە، تائێستاش ئەم وتارە لەبارەیەوە دەنووسرێ و لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجام دەدرێ. دوای چەندین ساڵ لە بڵاوکردنەوەی وتارەکە نووسەر جارێکی دیکە لەشێوەی نامیلکەیەکیش بڵاوی کردۆتەوە ئەمەی خوارەوە بەشێکە لەو وتارە:-**

شیعری ئەمەریکی ئێستا دەچێتە خانەی رۆشنبیرییەکی مامناوەندی، شیعر هەنووکە وەکو بەشێک لەژیانی فیکریی خەڵکدا دەرناکەوێ، چونکە تەنها کۆمەڵە کەسێکی پسپۆری، لە کۆمەڵ دابراوی مژوڵ کردووە، کە برێکی کەمی چالاکییەکەیان لە بازنە تەسکەکەی خۆیان دەرددەچێ، هەرچەندە وەکو توێژێکیش شاعیران پایەی رۆشنبیری خۆیان لەدەست نەداوە، بەڵام کتومت لە کۆمەڵە راهیبێک دەکەن، کە خۆیان لەناو کڵێسایەکی دوورە ئاوەدانی حەشاردابێ، دیاردەی گەشەسەندنی شیعر، لەدیاردەیەکی گەمارۆدراو دەچێت، کەچەندین ساڵە توێژێکی پیشەگەری بنکە فراوان بۆ بەرهەمهێنانی شیعری تازەو خوێندنەوە دروستی کردبێ. ئەم توێژە کۆمەڵێک مامۆستاو قوتابی خوێندنی باڵاو دەزگاکانی بڵاوکردنەوەو بەڕێوەبەرەکانی لەخۆگرتووە، چونکە ئەمانە لەبنەڕەتدا

لە زانكۆكاندا جێگیرن. ئەم دەستانە بەتێپەڕبوونی كات بوونە وەرگری هۆنراوەی نوێ، هەر لەسەر ئەم بنەمایەش هەموو وزەكانی شیعری ئەمەریكی ئاراستەی ناوەوەكرا، بە پێچەوانەی سەردەمی زوو كە تواناكان زیاتر رووی لەدەرەوە دەكرد، بۆیە ناوبانگ دروستكراو خەڵات لە ئاستی رۆشنبیرییەكی شیعری ئاست ناوەند دابەشكرا. ئەگەر مرۆڤیش توانی(پێناسەكەی- رۆسل جاكۆبی-) بۆ ناوبانگی ئەكادیمی هاوچەرخ پیادەبكات- كە لەكتێبی رۆشنبیرانی دواتر- دا هاتووە، ئەوە شاعیری(بەناوبانگ) لەلای شاعیرانی دیكە بە راستی ناوبانگی دەبوو، ماوەیەك لەمەوبەر گۆتەی(شاعیران هەر تەنها خۆیان شیعرەكانیان دەخوێننەوە) بە رەخنەیەكی توند بۆ شیعر بەگشتی لە قەڵەم درا، بەڵام ئەمڕۆ ئەم گۆتەیە شتێكی ئاساییەو ستراتیژیەتێكی گەرم و گوڕو بەهەرمێنی تاقیكراوەیە. بارودۆخەكە ئێستا گەلێك جیاوازە، لەنیوەی سەدەی رابردوودا، كە سنووری خوێنەرە شارەزاو پسپۆڕەكانی شیعر رووی لە فراوانبوون دەكرد، لەهەمان كاتدا سنوورەكە لەڕووی خوێنەری ئاسایی بەرتەسكتر دەبۆوە. لەمەش پتر ئەو ئامرازانەی كاریان بۆ سەركەوتنی شیعری(دەزگایی) دەكرد وەكو زۆربوونی بەرنامەكانی نووسینی ئەكادیمی، تەشەنەكردنی گۆڤارو دەزگا بلاوكەرەوەكان، كۆچكردنی رۆشنبیری ئەدەبی ئەمەریكی بەرەو زانكۆكان، هەر هەموو ئەم فاكتەرانە بوونە هۆی ونبوونی شیعر لە مەیدانە گشتییەكانی خۆیدا. سەبارەت بە خوێنەری ئاسایی یاخود ئاست مامناوەندی وا پێدەچی ئەگەری كەمبوونەوەی ژمارەی خوێنەرانی شیعر تەواوبێ، لە نیشانەكانی گۆشەگیری هونەریش ئەم چەشنە هزرانە لە چوارچێوەی رۆشنبیرییە ناوەندییەكەدا بەتەواوی رەتدەكرێنەوە، نموونەكەش وەكو نوێنەرانی ژووری بازرگانی دەردەكەوێ، لایەنگرە سەرگەرمەكانی شیعر بەرهەمەكانیان وەكو نموونەیەك بۆ زۆربوونی ژمارەو بلاوكراوەكان و بەرنامە شیعرییەكان و مامۆستا بەڕێزەكان دەخەنە روو، ئەم سەرژمێرییە پڕ لەهەرایەش هەر تەنها بۆ فراوانكردنی رووبەرە مادديەكەی شیعرە، رۆژنامەكان بەدواداچوون و پێداچوونەوەی شیعرەكان بلاوناكەنەوە، بە ژمارەیەكی زۆركەم نەبێ لێكۆڵینەوە لەسەر شیعرو شاعیران لە رۆژنامە گشتییەكاندا بەرچاوناكەوێ، لەوەتەی ساڵی ١٩٨٤ تا نووسینی ئەم وتارە (مەبەست نووسینی وتارەكەیە لە لایەن نووسەر خۆیەوە) شیعر لەلیستی(خەڵاتەكانی كتێبی نەتەوەیی) دەرهێنراوە، خەریكە بڵێین هیچ كۆمەڵە بەرهەمێك بلاونەكراوەتەوە بچێتە ریزی شیعری هاوچەرخەوە. تەنها ئەوانە نەبن، كە دەیانەوێ بگەنە دەست خوێنەرە ئەكادیمییەكان، بۆ نموونە وەكو(هەڵبژاردەكانی نۆرتۆن). بە كورتی خوێنەران زیاتر چاو بەچیرۆكەكاندا دەگێڕن نەوەك شیعر، بۆ نموونە خوێنەری رۆمانەكانی(جۆیس كارۆل ئۆتس)،(جۆن ئەبدایك)،(جۆن بارث)، لەوانەیە تەنانەت ناوی شاعیرانی وەكو(جۆبندۆڵین رۆكس)،(جیری سنایدەر) یا(دەبلیودی، سۆند جراس) یان هەرنەبیستبێ. هەر سەبارەت بە بەدواداچوونی شیعر رۆژنامەكانی دیكەش لە(تایمز) باشترنین، بەڵكو زۆر ئالەبارترن، نیویۆرك تایمز- تەنها رەنگدانەوەی ئەم بۆچوونەیە، كە دەڵێ سەرباری زۆری شیعر لە دەوروبەرمان، بەڵكو ئەو هەموو شیعرە لای خوێنەران و دەزگا بلاوكەرەوەكان بەهیچ ناچێت، تەنها لەلای



ویلسۆن كربوون و مردنی شیعر بۆ (سێ) سەدە لەمەوپێش دەگەڕێنێتەوە، بەڵام ئەبستاین ئەم بارودۆخە بۆ تەنها(سێ) ساڵ و كەمتر دەگێڕێتەوە،



شاعیرانی دیکە نەبێ، شیعر لەلای تێکڕای ڕۆژنامەو گۆڤارەکان چەشنی کالآیەکی ئەدەبی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ. بۆ ئەوەنییە بخوێندرێتەوە، بەڵکو تەنها بۆ تێبینی کردن و خۆ دەربڕین و دان پیانانە، زۆربەی بلاوکەرەوەکان و شیعرەکان و تەنانەت بەدواداچوون و ڕەخنەکانیش بەشێوازێک بلاودەکەنەوە، هەروەک خاوەن کالآیەک بن و نموونەی کالآکانیان بخەنەڕوو، ئەگەر بۆ ڕابردووش بگەڕێینەوە دەبینن گفتوگۆیەکانی تایبەت بە گرنگی شیعر تازەنین، بەڵکو ئەم دیالۆگانە بۆ سەدەی (١٩) دەگەڕێنەوە، بەڵکو دەکرێ بگوترێ گفتوگۆیە تازەکان لەساڵی(١٩٣٤) دەستیان پێکردووە، کاتێک(ئەدمۆند ویلسۆن) بۆ یەکەمجار وتارێکی بەناوی (ئایا هۆنراوە تەکنیکێکی مردووە؟) بلاوکردەوە، ویلسۆن تێبینی ئەوەی کردبوو ڕۆڵی شیعر لەسەدەی هەژدەوە بەرەو کزی دەچێ، هەروەها هەستی بەوەکردبوو پێداگرتنی ڕۆمانسییەت لەسەر(نیگەرانی) شیعری

زیاتر بەرەو هەڵدێر برد، بەرادەیەک شیعر تەنها بووە نێوەندێک بۆ گۆرانی گوتن، کاتێک کە شیعریش ڕووەو گۆرانی گوتن دابەزی و پێشتریش شیعر نێوەندێک بوو بۆ گێڕانەوەو داشۆرین و دراما، تەنها بۆ تۆمارکردنی مێژوو و، پێشبینییە زانستییەکان، لێرەدا پەخشان ڕووبەرێکی فراوانی لە گۆڕەپانە ڕۆشنبیرییەکە لەشیعر زەوت کرد، بۆیە نووسەرە ئارەزوومەندەکان هیچ بوارێکیان بۆ نووسین بەدەستەوە نەما ڕووی تێبکەن تەنها پەخشان نەبێ، هەروەک ویلسۆن پاشەڕۆژی ئەدەبێکی مەزن لە پەخشاندا سەقامگیر بێ، ویلسۆن توێژەرێکی چالاکی شێوازە ئەدەبییەکان بوو، بەڵام لێکدانەوەکانی سەباردت بە پایەی شیعر لە ئەدەبدا بەتایبەتی لە ئەدەبی نوێدا هێرشێکی زۆری کرایەسەرو بۆ ماوەی نیو سەدە دژایەتی کرا، بەڵام کەس نەیتوانی بە بەڵگە خاڵە لاوازەکانی بۆچوونەکەی ئاشکرا بکات و بۆی ڕاست بکاتەوە. تا ساڵی ١٩٨٨ کاتێک (جۆزێف ئەبستاین) لە وتارێکی ڕەخنەییدا بە

ناوونیشانی -کێ شیعری کوشت- وەڵامی دایەوەو بۆ یەکەمجار لە گۆڤاری کۆفتری بلاوکرایەوە. ڕێککەوتیش نییە ناوونیشانی وتارەکەی لە دوو سەرەوە قەرزارباری وتارەکەی -ویلسۆن- بێ لەلایەک بەشێوەی پرسیار کردنەکەی، لەلایەکی دیکەش بە بەکارهێنانی وشەی مردن لە ناوونیشانەکەدا. ئەبستاین بەڵگەکانی(ویلسۆن) بە شێوەیەکی تازەتر دەخاتە ڕوو، بەڵام بەشێوازێکی جیاواز ویلسۆن کزبوون و مردنی شیعر بۆ (سێ) سەدە لەمەوپێش دەگەڕێنێتەوە، بەڵام ئەبستاین ئەم بارودۆخە بۆ تەنها(سی) ساڵ و کەمتر دەگێڕێتەوە. ئەگەرچی دەستکەوت و داهێنانی تازەگەرەکانی هاوشێوەی (ئەلیوت)و(ستیفنسن) بەتەواوی ڕەت دەکاتەوە. ئەبستاین دەڵێ: تازەگەرەکان هونەرمەندبوون و لە دیدێکی ڕۆشنبیری ئازادەوە دەستیان پێکردبوو، بەڵام نووسەرە هاوچەرخەکان (پیشەگەری شیعربوون)و تەنها لەچوارچێوەی تەسکی زانکۆدا کاریان کردبوو، لەلایەکی دیکەدا(ویلسۆن) لێپرسراویەتی تەنگژەی شیعری خستبووە ئەستۆی هێزە مێژووییەکان، بەڵام (ئەبستاین) پەنجەی تۆمەتباری بۆ شاعیران و دەزگاکانی بلاوکردنەوە درێژ دەکا بەتایبەتی بەرنامەکانی (نووسینە داهێنەرەکان) بە کورتی وتارەکەی (ئەبستاین) تەقینەوەیەکی گەورەی لە بواری ڕەخنەدا بەرپا کرد. هیچ وتارێکیش سەباردت بە شیعری ئەمەریکی بە قەد ئەم وتارە وەڵامی بە پەلەو بەدواداچوونی لە ڕۆژنامە و

لە نیشانەکانی گۆشەگیری هونەریش ئەم چەشنە هزرانە لە چوارچێوەی ڕۆشنبیرییە ئاوەندییەکەدا بەتەواوی ڕەتدەکەینەوە لایەنگرە سەرگەرمەکانی شیعر بەرهەمەکانیان وەکو نموونەیەک بۆ زۆربوونی ژمارەی بلاوکراوەکان.

گۆڤارە ئەدەبییەکان لەسەر ئەنووسراوە. ئەمەت ژمارەیەکی زۆری شاعیران هەتوانەتە دەنگ و بەلای کەم (٣٠) شاعیر وەڵامی وتارەکەی (ئەبستاین)یان داوەتەوە. شتێکی سروشتیشە شاعیران بەرامبەر ئەو دەنگانە هەراسان بن چی تاقەت بن کە بانگەشە بۆ کەمبوونەوەی گرنگی شیعر دەکەن، بەتایبەتی ئەم دەنگە لەلایەن توێژەرو رەخنەگرێک ناسراوەوە و بەشێوەیەکی تیروتەسەل راگەیاندرابێ، چونکە جاران رۆژنامەنووسان و خوێنەران چەندین بەنگەیان بۆ ناگرینگی شیعر نووسیبوو، بەڵام بەم شێوەیە کاریگەری لەسەر شاعیران دروست نەکردبوو، پێشم وایە هیچ رێکەوت نەبێ کە دیارترین دوو وتارێک کە سەبارەت بە مردنی شیعر نووسرابن بە قەڵەمی دوو رەخنەگری چیرۆک نووسرابن. نەوەک لەلایەن رەخنەگرانی شیعرەوە. هێشتا کاتی ئەوەش نەهاتووە بڕیارێکی یەکلاکەرەوە لەسەر وتارەکەی (ئەبستاین) دەربکەین، بەڵام مێژوونووسانی ئەدەب ئەرێکییەک لە کاتی بڵاوکردنەوەی وتارەکەدا بەدی دەکەن، چونکە هەر لەگەڵ تەواوبوونی وتارە بەناوبانگەکەی (تی ئێس ئەلیوت) ئیزرا پاوەند) (مارین مۆ) (رۆبێرت جرێفز) (دەبلیو ئیتش ئۆدن)... هتد. هەندێک لە جوانترین هۆنراوەکانی خۆیان نووسی، کە سەرجەم بوارەکان: مێژوو سیاسەت- ئابووری- ئایین و فەلسەفەشیان گرتبۆوە. کە بە تۆکمەترین هۆنراوە دادەنران لە مێژووی زماندا. لە هەمان کاتدا ئەوەیەکی نوێ کە لە شاعیرانی وەکو (رۆبێرت لویل) (ئەلیزابێس بیشۆب) (فیلیپ لارکن) (راندال جاریل) (دیلان تۆماس) و چەندانی تر پێک دەهات، تازە لە دەرگای دەزگاکانی بڵاوکردنەوەیان دەدا، سەرباری گشت ئەوانە، ئەگەر پێشبینییەکانی (ویلسۆن) زۆر راستیش دەرنەچن، ئەوە هەستکردنی بە پاشەکشێی کردنی شیعر زیرەکانە بوو، چونکە تەنانەت ئەگەر نووسینی شیعری گەورە و نەمریش بەردەوام بوو، بەڵام شیعر بە گشتی لە ژیانە ئەدەبییەکە پاشەکشەی کردووە، یا شیعر لەلایەن کۆمەڵێکی دڵسۆزەوە پشتگیری بکرێ، بەڵام متمانەی ئەوانەی لە دەستدا گوێی بۆ شل دەکەن و شیعر لە نێوەندە رۆشنبیرییە گشتیەکەدا کزبووە. بەڵگەش بۆ ئەم کزبوونە ئەوەیە مرۆڤ هەست بە بوونی چەند گەمارۆیەک دەکا لە دەوری شیعردا، جا لە خوێندنەوە راستەوخۆیەکانی شیعردابێ یا لە گۆڤارو بڵاوکراوەکاندا، مرۆڤ بۆی هەیە بپرسێ بۆ شیعر بە دەگمەن نەبێ بە مۆسیقا و سەماو شانۆوە ئالکیندرێ؟

یاخود بۆ بەرنامەکانی شیعر خوێندنەوە تەنیا بە خوێندنەوەی چەند هۆنراوەیەک تەواو دەکرێ، جاری واش هەیە شاعیرەکە هۆنراوەیەکی کۆنی خۆی دەخوێنێتەوە کە چل ساڵ لەمەوبەر نووسیویەتی، لەلایەکی دیکەدا کە (دیلان تۆماس) شیعر دەخوێنێتەوە نیوەی کاتی بەرنامەکە بۆ خوێندنەوەی شیعری شاعیرانی دیکە تەرخان دەکرا. هەرچەندە زۆر شانازیشی بەخۆی دەکرد، بەڵام تا بڵێی بە هونەرەکەی بێ هەواو نەفەس بوو، ئەگەرچی ئەمرۆ زۆربەی خوێندنەوەکان بۆ خۆ هەڵکێشان و (خۆ) دەرخستنە وەک دەرخستن و خستنەرووی (شیعر)ی چاک و سەرکەوتوو، بۆیە هیچ دوور نییە گوێگرانی ئەم چەشنە شیعرانە تەنیا هەندێک لە شاعیران خۆیان بن یا ئەوانەی حەز دەکەن لە داهاتوودا ببنە شاعیر یاخود چەند هاورێیەکی شاعیر دەکەن و هیچی تر. ئێستا کۆمەڵە گۆڤارێک هەن کە تەنیا شیعر بڵاودەکەنەوە، بەڵام بەدوادا چوونە ئەدەبییەکان بڵاوناکەنەوە، لاپەڕە لەدوای لاپەڕە شیعرت بەرچاو دەکەوێ، لەپاڵ

**پیشەی شیعر بۆ بەرزەوەندی بەرهێنەرانی شیعر داهێندرا نەوەک بەکاربەرانی، لەمەشدا خیانەت لەگەڵ پیرۆزی هونەردا کرا**

ئەوەشدا هەوڵ و توانایەکی زۆری دەوێ تا ئەو گۆڤارە بچکۆلانە بە وردی بخوێنیتەوە، کەم کەسیش هەن ئەو بایەخەی پێ بدەن. لە راستیدا گوێ پێ نەدانێک لە دەزگاکانی راگەیاندن بەرامبەر بە شیعر پەیدا بووە. بۆ نزیکەی (٣٠) ساڵ دەچێت زۆربەی شیعرە بڵاوکراوەکانی گۆڤارەکان ئاراستەی پسپۆڕان کراون و بەس. شیعریش لەم بوارەدا کێبڕکێی لەگەڵ سیاسەت و کۆمیدیا و چیرۆکەکان کردووە، تا سەرنجی خوێنەران رابکێشێ. ئەو شیعرەی سەرنجی خوێنەران پێش رانەکێشێ بە شیعر لە قەڵەم نادرێ. بڵاوکراوەکانیش زیاتر ئەو شیعرانە یان هەڵبژاردووە کە دەزانن خوێنەری تایبەت دەیان قۆزێتەوە، تەشەنەکردنی گۆڤارو رۆژنامە ئەدەبیەکان لە سی ساڵەی رابردوودا، رەنگدانەوەی زۆریی خوێنەرانی شیعر نەبوو، بەڵکو پێویستییەکی توندی مامۆستایانی زانکۆ بووە بۆ شیعر، کە نووسینیان کردبووە پیشەکییەک و بەس بەجۆرێک سەیری شیعر دەکرا هەروەک پیشەی کشتوکاڵ بێت، پێویستی بە نەمام چەندن هەبێ بۆ بەردەوام بوون و مانەوەی، کەواتە پیشەی شیعر بۆ بەرژەوەندی بەرهەمهێنەرانی شیعر داهێندرا نەوەک بەکاربەرانی، لەمەشدا خیانەت لەگەڵ پیرۆزی هونەردا کرا. گومانی تێدانییە رێگا نادرێ هیچ شاعیرێک لەبەردەم جەماوەردا دان بەم راستییانە دابنێ. مایەی خۆشحاڵیشە هیچ کەسێک لەدەردەوەی بوارە رۆشنبیرییەکە بایەخێکی تەواو بەم مەسەلەیە نادا، شاعیری تازە داهاتەکەی لە بڵاوکردنەوەی کارێکی ئەدەبی-دا دەست دەکەوێ. یا لە خزمەتکردنی لە بوارێکی فێرکردنی تایبەتدا، کەواتە دەبێ لە گۆشەنیگایەکی ئابوورییەوە لە مەسەلەکە بڕوانین و زۆربەی شاعیرە هاوچەرخەکان لە وەزیفە رۆشنبیرییە رەسەنەکەی خۆیان دابڕان. هەروەک (مارکس)یش ئاماژەی پێکرد و زۆر لە ئابووریناسان قسەکەیان رەت کردەوە. هەر گۆڕانکارییەک لە ئەرکی توێژێکی ئابووری بەهاو رەفتاری ئەم توێژە بە تەواوی سەراوبن دەکا، سەبارەت بە شیعریش لە ئەنجامی گۆڕانکارییە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری و ئەدەبییە

لەتکراوەکان، زۆر بوونێکی بەرچاوی (شیعر) لە چوارچێوەی توێژێکی بچووکدا سەری هەڵدا. کەواتە دەکرێ بگوترێ شیعر و جەماوەری خوێنەرانی لە یەکتردابڕان و دیوارێکیان لەنێواندا قیت کرایەوە. بێ گومان کۆمەڵیش بەم لە یەکتر دابڕانە رازی نابێ و داوا دەکات ئەم دوو پۆلە بەزووترین کات تێکەڵ بکرێنەوە، هەرچەندە لەگەڵ یەکیشدا ناکۆک بن. دەکرێ لە مەسەلەی لە یەکتر دوورکەوتنەوەی (شیعر) و (خوێنەرانی) ئاماژە بە خاڵێکی گرینگی تریش بکەین، کە زۆربەی خوێنەرە پێشکەوتووەکان لەوانە (جۆزیف ئەبستاین) پێیان وایە کەوا زۆربەی شیعرەکان نەوەک هەر بڵاودەکرێنەوە و بەس، بەڵکو زیاد لە پێویست پێیان هەڵ دەگوترێ، ئەم شیعرەش دەگاتە کۆمەڵێک گۆڤارو بڵاوکراوەی ئاست نزم، گومانی خوێنەران لە ئاستی ئەم جۆرە شیعرانە دیوار بەندێکی بڵندتر لە نێوان شیعرو خوێنەران دروست دەکات و، شیعر بە تەواوی لە جەماوەر دادەبڕێ. شاراوە نییە شاعیر بەبێ رۆشنبیرییەکی بنکە فراوان ناتوانێ ئەو متمانەیە بەخۆی بکات گوتارێکی جەماوەری دابهێنێ، کەمجاریش رووی داوە نووسەر پەیوەندی بە بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی یا سیاسییەوە هەبووبێ. بۆ نموونە (ڕیتش) رەگەزی مێیایەتی خۆی بۆ ئەوە بەکارهێنا قووڵتر لە مەسەلەکان بڕوانێ. (ڕۆبێرت بلای) جوانترین شیعرەکانی بۆ نارەزایی دەربڕین لە دژی جەنگی ڤێتنام هۆنیەوە و توانی بە هەستێکی ناسک روو لە جەماوەرێکی زۆر بکات و جموجۆڵ و ریتمێکی مرۆییانە بخاتە شیعرەکانیەوە، کە شیعرەکانی پێشووتری ئەم جۆرە گوروتینەیان نەبوو، بەبێ ئەوەی ئەم دوو شاعیرە سەر بەهیچ بزووتنەوە یا پارت و گروپێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بن.

سەرچاوە:

**گۆڤاری (الاقلام)، ژ(٤)، سالی (٢٠٠٠)، ل٧١-٨٧.**

# ناولێنان وەک ستراتیژێک

## بۆ بەپەراوێزکردنی تەوتەمەکانی شیعری کوردی



محەممەد رەنجاو

دۆگماو بازنە ژەنگاوییەکانی دووبارەبوونەوە، ئەو چەمکە قێزەونانەن، کە گوزارشت لەسەردەمێکی نامۆ بەقۆناغ و پێداویستییە ژیارییەکانی ئەمڕۆ دەکەن و، وەک ترسێک لە ناوو، گومانێک لە ستراتیژییەتی ناونانەوە(استراتیجیة التسمیة)، هێڵە داخراوەکانی خۆیان درێژ دەکەنەوە، لەمەشدا مەبەستیانە (ناونان)ی هەوڵەکانی رابوردوو، وەک وێناندنەوەیەکی پیرۆز بهێڵدرێتەوەو ناونانەوەی تاقیکردنەوەکانی رابوردوو وەک قۆناغێکی جێگیر، سێبەری بەسەر هەوڵەکانی هەنوکەماندا چڕتر بێتەوە، بێ ئاگا لەوەی کە هەوڵە جددییەکانی شیعری کوردی، لە توانایدا هەیە بەو گشتگیریەو، مەودا بەرینەی خۆیەوە کە هەیەتی و سەرجەم تاقیکردنەوە پەرتەوازەکان نموونەی بەرز بەرهەم بهێنێ، ئەمەش بەو ئەزموونە فیکریە دەکرێت کە بەرهەمهێنەری شیعری کوردی لە پرۆسەی کارەکانیدا ئەنجامی دەدا. ئەمەش هەمووی بەسڕینەوەی ئەو تەوتەمانەوە دەکرێت کە بوونی کۆنی لە خۆیدا پێچاوەو، وەک کاژێک جەستەی شیعری ئێمەی سڕکردووەو، بەردەوام وەک شمشێرەکەی دیمۆکلێتیش لە بەرامبەر هەر پرۆژەیەکی مۆدێرنەش سامناکی خۆی دەخاتەڕوو، لە هەولی سڕکردنی هەر هەوڵێکی نوێخوازانەدایە.

ئێستاش هەندێ برادەری ناو جولە فیکریەکەی پانتایی روناکبیریی کوردی، بێ ئاگا لە ئەزمونە تاڵەکانی رابوردووی روناکبیریی ئێمە مەبەستیانە تەوتەمێکی ترمان بۆ بەرهەم بێنن و هەموو ئەزموونەکان لەناو هەوڵێکی پەرتکەردا قەتیس بکەن، بێ ئاگا لەوەی ئەم هەوڵە بەهەموو مەوداکانی خۆیەوە، وورد کردنەوەو پیاچوونەوەیەکی فەقیر حاڵانەی ئەزموونێکی بەمەوداتری دەروو جیرانی ئێمەمانان بووە. بێ ئاگا لەوەش کە لەو راستییە بگەن کە ئەم نەوە نوێخوازەی ئێستا کە زیاتر ئێش لەناو زماندا دەکەن میراتگرێکی شەرعی تری ئەزموونەکانن لە ناو پانتاییەکی شمولی تردا، تەهمیش کردنی ئەو هەوڵە نوێخوازیەی ئێستاو قەتیس کردنی ئەزموونەکە لەناو پێناسەی تاکە هەوڵێکدا کلۆلیەکە بۆ خوێندنەوەی سەرجەم تاقیکردنەوە شیعریەکە، بۆ جیاکردنەوەی ئەزموونەکان، دەبێ هەر لە سەرەتاوە دان بەوەدا بنرێ، کە شاعیری ئەمڕۆ وەک کارکردنێک لە پرۆژە



نوێخوازییەکانی خۆیداو، لە پرۆسەی نیشە جددییەکانیەوە، کار لەناو دابڕان و بونیاتنانەوەدا دەکا، واتە ئیش لەناو ئەو ئەپستمۆلۆژیە ڕەوشەنگەریەکەدا دەکا، کە دابڕانێکی جەوهەریان بۆ فەراهەم دەکا، دابڕان لەو مێژوو زەمەنە هەڵتەکاوانەی زمانی ئەفرەتیان بۆ جێهێشتوون و، بونیاتننانەوەی ئەو زەمەنە وون بوانەی، وەک ئاماژە خۆیان دەخەنەوەروو سیماکانی لەناو تەپ و تۆزی تەوتومانێکدا دەردەکەوێ کە ئایندەکەی هەر لە سەراب دەچێ و، بەهەموو هێزێکیەوە دژ بەواقیعی دۆگماکان دەجەنگێ، چونکە ناکرێ جارێکی دی ئەفراندنە شیعرییەکان بگێڕینەوە بۆ ناو دۆخەکانی واقیع ئەو ئەفراندنانەی هەمیشە دژ بەواقیعی موجەڕەد کار دەکا.

نوێخوازی
ئەمرۆ لە
سەریەتی لەناو
ئامارەکاندا کار
بکاو خۆی
بخاتەڕوو، دان
بەوەدا بنێ کە
واقیع وەک
کات و شوێن
لەناو
بازنەیەکی
سڕبوودا
خولدەخوا

* * *

نوێخوازی ئەمرۆ لە سەریەتی لەناو ئامارەکاندا کار بکاو خۆی بخاتەڕوو، دان بەوەدا بنێ کە واقیع وەک کات و شوێن لەناو بازنەیەکی سڕبوودا خولدەخواو، شاعیری ئەمرۆ بەدروستکردنی فانتازیاو تقوسە سیحر ئامێزەکانی کردەی نووسینەوە، ئەو واقیعە بخاتە پەراوێزی ئیشەکانییەوەو، بەمەش کارامانە کەرەسەو کایە بزۆزو پڕ لە جولەکانی شیعری نوێ بەرهەم دێنێ ئەوە فانتازیاو خەون و سیحرو بابەتە سرکەکانی بیرکردنەوەی کە هەروا بە سانایی خۆیان نادەنە دەست و، وەک جەستەیەکی میتۆلۆژی لە دەرەوەی واقیعدا دەژین و لەناو فەزای میتافیزیکدا کار دەکەن، چونکە ئەم نوێخوازیە ئێستا بەقوڵی هەست بەوە دەکا کە موتەلەقی ئەمرۆ، وەک دەرنجام و دەرهاویشتەی سڕبوونێک لەناو واقیعدا، داوای ڕاچەنینێک دەکا لەناو خەونە قوڵەکانی میتافیزیکدا، داوای تەهمیش کردنی واقیع و عەقڵی موجەڕەد دەکا، داوای بەپەراوێزکردنی هەر پرۆسەیەکی عەقلانیەت دەکا، کە لەگەڵ پرۆسەکانی بەفانتازیاکردنی شیعر نایەتەوەو، وەک مۆتەکە خەونی ئێستای جەستە شەکەت بووەکانمان دەڕزێنێ.

زۆربەی موتەلەقی ئێستا، وەک بۆچوون، لەسەر ئەوە کۆکن، کە دەقی ریالیستی دەقێکی مردووەو وزەی ئەوەی تیا نەماوە وەڵامدەرەوەی ناوەوەی مرۆڤی دەرەوەی ئاین و بیروباوەڕو حیزبەکان بێ و لە ناو وەڵامە حازر بەدەستەکانەوە کار دەکاو وزەی بەرهەم هێنانی پرسیاری لە دەست داوە، هەموو ئەوانە وایکردووە کە فەرمانی شیعری نوێگەری ئەم سەردەمە، وەک بەشێک لە مەعریفە کاری فڕێدانی پرسیارە زۆڵەکانی لە ئیشکردنەکانی خۆیدا پێ بسپێردرێ، ئەو پرسیاردی کە گومان لە هەموو باوەڕەکان ددکا، بەگومان کردن لە خودی نوێخوازی خۆشیەوە، گومان لەو تەوتەمانە دەکاو ئەو پیرۆزیەشیان لێ دادەماڵێ کە سەردەمەکانی رابوردوو گێلانە پێی بەخشیبوون.

شاعیری ئەمرۆ دوای ئەوەی زمانی ریالیستی دەخاتە پەراوێزەوە تەنها زمانی خەوناوی و فانتازیا ئەو بۆشاییەی بۆ پڕدەکاتەوە، چونکە ئەمە کارێکی شمولییە شاعیری نوێخواز ئەنجام دەداو کودەتایەکە لە گشت بوارەکانی نوسین و داهێنان و دروست کردنەوەدا ئەنجام دەدرێ، ریالیزم زمان و دەستەواژەو چەمکی تایبەت بەخۆی هەبووە کە گەشەیان بەم ڕێبازە داوەو شاعیری نوێخواز ناتوانێ بەو زمان و چەمک و دەستەواژانە ئەرکە نوێخوازیەکان بەفانتازیاکردنی ریالیزم ئەنجام بدات، شاعیرە دیارەکانی سەردەمە لێک ئەچووەکانی ئێمەش هەروایان کردووە، رامبۆو مەحوی و ئەلیۆت و مالارمیە، دوورە پەرێزیان لە واقیع و عەقلانیەت مانەوەیان مسۆگەر کردووە، شیعری ئەمرۆی کوردی، کەوەک کردەیەکی نوێخواز وەڵامدەرەوەی سەردەمەکەیەتی، بۆ ئەوەی بۆشایی پرۆسەی دۆگماکانی عەقلانیەت تێپەڕێنێ و چیتر



ووشەو زمان و فۆم بەرەهایی نەکاتە پردی پەرینەوەی فیکر، چیتر ئیستاتیکاو ئامانجە سروت ئامێزەکان بەگوتاری ئامانجدار پڕ نەکرێن، بۆ ئەوەی وشەو زمان و ستایل خۆیان فەرمانی خۆیان بەرهەم بێننەوە، دەبێ تەکنیکی شیعری، زمانی شیعری، خۆیان بینە ئامانج لەهەر پێکهاتەیەکی شیعریدا، سەردەمی ئەمڕۆمان ئەو گەمەیەی گەرەکە کە لەگەڵ تەکنیکی شیعردا دەکرێ، لەگەڵ زماندا دەکرێ بۆ بەئامانج بوونی خۆی، دەبێ ئامانجی شیعر لەناو هارمۆنیکای تەکنیکی شیعردا بزربێ و چیتر نەبێتە کۆیلەی واقیع و بەگواستنەوەی فیکرەکان بارگاوی بکرێ، بەمەش پێویستی و پێداویستی خولقاندنی دەقی (دریدی)ی خۆی دەخاتەڕوو، بەمەبەستی پێکهێنانی فەزایەک لە زمان و ووشەو تەقینەوەو خۆ دەربازکردن لە فەرمانی هۆشمەندانەی کۆمەڵایەتی.

دەقی (دریدی) پرۆسەی نووسین دژ بەواقیع بەکاردێنێ لە زۆربەی تەئویلاتەکانیدا، ئەو پرۆسەیەی ئەوەندەی لەواقیع دووردەکەوێتەوە، ئەوەندە لێی نزیک نابێتەوە، دوورکەوتنەوەیەک کە وای لێدەکا خۆی ببێتە بەدیلی واقیعەکە، لەو ناوەندەدا زمان وەک قەوارەیەکی سەربەخۆ لە دۆخی پێکهاتەکانی هۆشمەندیدا خۆی دەخاتەڕوو، دوور لەو واقیعەی تیایا سەری هەڵداوە، زمانی شیعر کە بەشدارییەکی کاریگەرو سەرەکی لەو فەزا بەردینەی پێکهاتەی خۆیدا دەکا، هەمیشە لەو گەمە ئامانجداردا بەشدارە کە سیمۆلۆژیا وەک وزەیەکی زناک ئامێز خۆی بەرهەم دێنێ، ئەویش بەهۆی ئەو تێکشکانە بەردەوامەی لەناو گەمەی هەڵوەشاندنەوەو دروستکردنەوەی دەقێکدا خۆی دەخاتەڕوو، کە زیاتر لە تەشریحێک دەچێ لەناو جەستەی دەقدا.

* * *

ئەمە تێکشکاندنی زمانە، ئەم گەمە بەردەوامەی کە لە پانتایی هەر دەقێکدا لەگەڵ پرۆسەی زماندا دەکرێ، بەرهەم هێنانەوەی گەشەو بزاوتی رۆشنبیرییە جیاوازەکانە، چونکە بەرهەم هێنانی داهێنانەکان هەمیشە دەرەنجامی کردەی جیاواز بوون بووە، هەر ئەم جیاواز بوونەشە بەهەڵپەوە باوەش بەئایندەی شیعری کوردیدا دەکا، لەو چەقبەستنە وێکچوونەی دەرباز دەکا کە سەردەمەکانی رابووردوو میکانیزمی ئیشکردنی لێ سەندبۆوەو، شیعری کوردیشی تووشی جۆرێک لە عوزلە کردبوو، گیرۆدەی زەمەنێکی چەقبەستووی کردبوو، هەر ئەوەشە وای کردووە کێشەی تێپەڕاندنی لە زەمەن، هەمیشە جەدەلییەتی خۆی لە تێپەڕاندن لە نەفراندن و ئەزموونەکاندا ببینێتەوە، هەر لێرەوەیە دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە دەرباز بوون لە زەمەن، دەرباز بوونە لە ناوە داسەپاوەکان، کە لە شێوەی دیکتاتۆرێک خۆیان دەخەنەڕوو، ئەمەش هەمووی لەناو موغامەرەیەکی بەردەوامدا دەکرێ بۆ گەڕان لە مەجهول، گەڕان لەو مەلە پەرتەوازانەی وشە کە دەستی رام بوونیان نەگەیشتۆتێ و بەپاکیزەیی ماونەتەوە، چونکە فەرمانی داهێنان هەمیشە فەرمانی گەڕان بووە لە شتە پەنهانەکان، لە پێگە نەدۆزراوەکان شیعری سەرکێش و کەشفکەر، لە نێو بونیادی خۆیدا کۆمەڵێک ناوازو سرووت و مەنەلۆژیای جیاجیا دروست دەکاو، هارمۆنیای ئیقاعەکانی هەمیشە لە گۆڕاندان و گەمەیەکی شکڵ ئامێز لە پرۆسەی نووسیندا دروست دەکا، کە جۆرە تێکەڵاوبوونێکی شێوەکاری تیا بەرجەستە دەبێ.

ئەمە تێکشکاندنی زمانە، ئەم گەمە بەردەوامەی کە لە پانتایی هەر دەقێکدا لەگەڵ پرۆسەی زماندا دەکرێ، بەرهەم هێنانەوەی گەشەو بزاوتی رۆشنبیرییە جیاوازەکانە

* * *

هەوڵە جددیەکانی شیعری کوردی، چیتر لە توانایاندا نییە بەواقێکی ورمانەوەوە لە دنیا رامێنێ و دەستکاری موعادەلە لە قالب دراوەکانی کێش و سەرواو، موعادەلە **بابەتییەکان** یەکیەتی رەوش و **پێکهاتەکانی بونیادی** شیعری نەکەن،

**شاعیری کوردو شیعری کوردی** وزەی **ئەوەی تیا نەماوە بەلۆژمێکی**

دۆگماو زەلیلی ڕێسا باوەکان تەجاوزێک لە پێکهاتەی ئیش کردنەکانیدا فەراهەم بکات. بونیادی شیعری نوێ هەموو ڕێسا لە قالب دراوەکانی کردەی کۆن دەسڕێتەوە، ئەو لە چرکە ساتێکدا قسە دەکات کە کۆدو زناکە مانا پەرتکەرەکانی ئەو چرکە ساتەی هەڵگرتبێ، ئەو هەرگیز لەگەڵ یاسا نەگۆڕەکان سازش ناکاو لەناو گومانێکی موتڵەقدا مەعریفە بەرهەم دێنێ ئەو هەرگیز پێویستی بەو یاسا ماتماتیکیە نەگۆڕە نییە کە فێری کات ٣×٣= هەمیشە بکاتە ٩ شیعری نوێخوازی کوردی لە ستراتیژیەتی کارکردنی خۆی هەوڵێکی بەردەوامە بۆ هەڵگرتنی ئەو جفرەو نهێنیە شاردراوانە لە بونیادو پێکهاتەی خۆیدا، تا شتە مەجهولەکانی پێ کەشف کاو، ئەو دەرگا کلۆم دراوانە بکاتەوە کە نهێنیە سیحر ئامێزەکانی لە ناوەوەی خۆیدا هەڵگرتووە، بۆ کاری جدی ئەم هەوڵەش، بۆ کەشف کردنی ئەو دنیا مەجهولەش، شاعیری نوێگەر پێویستی بەئامرازە بەکارنەهاتووەکانی ئەزموونی خۆی هەیە، پێویستی بەو جفرەو کۆدە هێماکارانە هەیە پرۆسەی تێپەڕاندنەکان بەکراوەیی بهێڵنەوە، ئەمەش تەنها لەناو ئەو پانتاییە جیوەییەدا جێبەجێ دەکرێت، کە گەمەیەکی بەردەوامی تیا ئەنجام بدرێت، وەک ئەوەی کە پێکهاتەی بونیادی شیعری هەمیشە خۆی لە تەکنیکی پڕ لە جوڵەی شیعرەکەدا دەبینێتەوەو لە بیناسازی و کارە ئەندازەییەکانی ئیش کردنەکاندا ئەنجام دەدرێت و ئامادەبوونی خۆی ڕادەگەیەنێ. ئامادەبوونێک کە ئاوێتەبوونی لایەنە هونەرییەکانمان پێ دەڵێ و وەک پرۆسەیەکی شیمیایی شیعر لەگەڵ سەرجەم هونەرە سروشتیەکان تێکەڵ دەکا.

شاعیری نوێخواز کە زمان و فۆرم وەک گەمەیەکی بەردەوام دەخاتەڕوو، لە ئاکامدا زمانێکی سیمۆلۆژی زناکیمان بۆ بەرهەم دێنێ، زمانێک کە هەموو جفرەکان وەگەڕ دەخاو وەک بەرهەم هێنراوێکی سەردەمە جیا جیاکانیش، زمان لە هەموو دۆگما سڕکەرەکان خۆی پاراستووەو چرکەساتی دەقەکانی پێکهێناوە، ئەو دەقانەی کە سیمایەکی دیالێکتیکانەی سیمۆلۆژی پەرت دەکەن و ئاماژەکانیش پێکهاتەی ئەو سیمۆلۆژیانەیە، لەمەشدا زمان جارێکی تر بەفەرمانە سەرەتاییەکەی خۆی ڕازی نابێت، کە تەنها زنجیرەی گەیاندنی فیکرو بۆچوونەکان بێ، بەڵکو زمان وەک یەکەیەکی سەربەخۆ کاردەکاو، هەر لێرەشەوەیە کە زمان ستراتیژیەت و بوونی ئازادانەی خۆی ڕادەگەیەنێ، ستراتیژیەتی بەئامانج بوون، ستراتیژیەتی بەدیل بوون بۆ هەموو فیکرو ئامرازە تەواوکەرەکان و، دەرەنجامیش سەربەخۆیی خۆی لە پێکهاتەکانی ئاوەزو هۆشمەندیدا ڕادەگەیەنێ، ئەمەش وادەکا شیعر وەک بەرهەم هێنراوێکی مەعریفی خۆی پێناسە بکاو، لە کایە جیاجیاکانی خۆیدا، زمان، ستایل، ئیقاع، فانتازیا، سروتە سیحر ئامێزەکان و پێکهاتە ئەستیەکان لە فۆرمۆڵە بونێکی بەردەوام دابن و وەک سیستەمێک لە بونیادێکی سەربەخۆدا وەگەڕ بخرێت و، دابڕاویش بێ لە پێگە لەرزۆک و لەق بووەکانی کردەی ڕابووردوو هەموو ئەو هەوڵانەش کە لە چوارچێوەی ئاولێناندا گوتارو خوێندنەوەکانی لێدەکەوێتەوە، بەردەوامی مەرگی دەقمان بۆ دێنن.

* * *

ئێمە هەمیشە خەون بەگۆڕانکارییەکانەوە دەبینین و هەزار ساڵیش زیاترە کە (هیراقلیتس)ی یۆنانی ووتویەتی کە گۆڕانکارییەکان، سیمای بنچینەی هەر بوونێکن، ووتە بەناوبانگەکەی (ئەبیقۆریش) کە دەڵێ تەوتەمەکان هەموویان بۆش و بێ مانان، دابڕانێکی جەوهەری دروست کرد لە جەمسەرە دژەکانی نێوان زەمەنەکان و دەستکەوتێکی هونەری گەورەش بوو لە بواری هۆشمەندی و پراکتیزەکردنی و ئاسۆگەی مێژوویەکەی موژدە بەخش و نوێش بوو بۆ دەرخستنی دۆخی ڕاستیەکان، ئەبیقۆر سوور بوو لەسەر سڕینەوەی تەوتەمەکان لە هزری چەقبەستووی مرۆڤەکانداو، بەپێویستی زانی مرۆڤەکان ئازاد کات لە ترس و ڕاڕایی بەرامبەر ئەو تەوتەمانە میتشێل فۆکۆش بەتێڕوانینەکانی خۆی کە لە دابڕانێکی ئەبستمۆلۆژیدا بەرجەستە بووە، شتەکان لەبەردەم دابڕانێکی مەعریفیدا دەبینێتەوەو لە هەوڵەکانی خۆیدا بۆ ڕزگاربوون لە شێوازەکانی فیکری ئاوو داسەپاو بەسەر کۆمەڵگاو سەردەمەکەیدا، ئەمەش لەڕێگەی پرۆسەی هەڵکۆڵینی ئەو ئەپستمۆلۆژییەوەیە کە لە ڕێگەی ئەستەکانەوە کە ئەو خۆی وەک وەهمێک دەیخاتەڕوو، لە پێناوی ڕزگارکردنی مرۆڤ و، دۆزینەوەی مرۆڤ لەناو بوونی مرۆڤ خۆیدا. هەر ئەوەشە وادەکا، چرکە ساتی هەنوکەیی ئێمە، چیتر وەنەوزی خەو نەیباتەوەو، لە ناو ڕابوونێکی سەرتاپاگیرا هەست بەو مەترسییە بکات کە بەهۆی کوێری کردنی ئەو تەوتەمانەوە، خەریکە بیرکردنەوەکانمان سڕ دەکاو بەبیانوی خوازراوو لە بارچوی

بەپراکتیک کردنی عەقڵی کوردییەوە، جرکەساتی پڕ لە جولەی ئێستا دەکوژێ و دەقە داهێنراوەکان لە بۆتەی ئیفلیج بونێکی کوشندەدا دەسڕێتەوە، ئەو زاڵ بوونەی دۆگما بەسەر ئەندێشەو بیرکردنەوەکانی ئێمەیدا سەپاندووە، وایکردووە شتێک لە سڕبوونی عەقڵ لە پێکهاتەی خۆیدا بەرهەم بێنێ و وەک رەنگدانەوەی ئایدیاو بیرە چەقبەستووەکان دەقیش لەناو بازنەیەکی ژەهراوی داخراودا بخاتە بەرچاوان و لە قاڵبێکی لەمەوپێش ئامادەکراودا بیخاتەڕوو، هەر ئەوەشە وامان لێدەکا لە پاڵ خۆشنودی رابوونەکانی هزری فەنتازی ئێمەدا کە هەموو عەقڵەکانی دۆگما دەخاتە پەراوێزەوەو نومێدێک بۆ نوێگەری شیعری ئێمە لەسەر جەستەی عەقڵی تێکشکاوو بیرکردنەوەی باودا خۆی نمایش بکا،

* * *

ئەمانە هەموو ئەو خۆزگانەن کە هەڵپەدەکەن بۆ ئەوەی چیتر مۆتەکەی ئەو تەوتەمانە سیمای شیعری نوێمان لێ تەڵخ نەکەن و لە رێگەی دووبارەبوونەوەی ناوەکان و هەرەمی نەیەقۆنە پیرۆزکراوەکان خەونی شیعری نوێمان لێ هەڵنەبزرکێنن، کە جێگەی کەسەرە تائێستاش فەرامۆش کردن و بەپەراوێزخستنیان وەک بەشێک لە گوناه خۆی دەخاتەڕوو ئەو وزانەش دەکوژێ کە کاژداماڵین و تازەکردنەوەی ناو بەزیندوویی دەهێڵێتەوە، چونکە ئەو تەوتەمانە هەمیشە بێ ئاگا بوون لەوەی کە نوێخوازی تەنهاو تەنها لەناو شمولیەتێکی ئۆرگانیدا گەشە دەکاو وزەکانی خۆی پەرت دەکا. ئەمە لەکاتێکدا تەوتەمەکان زیاتر ئینتیمایان بۆ پارچە لێکهەڵوەشاوەکانی کەلتوری رابوردوو هەیەو بەحەنینەوەی بۆی دەکڕوزێنەوە.

* * *

ئەوە چ وەهمێکە (وەهم دوور لە چەمکە فۆکۆییەکە) کە دەخوازێ شیعری کوردی بەهەمان ناوو شێوازی سواوی رابوردوو بێت و لە ئێستادا مەودای هەناسەدانێک بۆ خۆی برەخسێنێ، ئەمە وەهمێکە لە کردارو ئەنجامدەرانیشی وەک کاهینێک خۆیان دەخەنەڕوو زیندە خەونەکانیشیان لە خەڵوەتگای جەهلدا پوچگەراییەک بەرهەم دێنن، شاعیری ئەم سەردەمە بۆ ئەوەی بەتووڕەیی بیر بکاتەوەو بەتوڕەیی بنووسێ و لە دواجاردا بە توڕەییش ئاوڕ لە رابوردوو بداتەوە لەسەریەتی ریالیزم توڕداو دیدێکی میتافیزیکیانە بەجولە شیعریەکان ببەخشێ و نەخشەیەکی تر بۆ جوگرافیای شیعری بکێشێ، ئەو پێویستی بە سەرلەنوێ داڕشتنەوەی دیموگرافیای جەستەی شیعری هەیە، کە ئەمەش پێویستی بەوە هەیە چیتر لەناو کردە مەنلوفەکاندا هەنگاو نەنێ و خۆی لە تاک مانایی و تاک خوێندنەوەی شتەکان دەربازکاو بەتێڕوانینێکی نوێ وە شتەکان ببینێ وەک ئەوەی بۆ یەکەم جاری بێ ئەم دنیا کۆنە بەو ستایلە نوێیەوە دەبینێ، چونکە شاعیری نوێخواز لە هەموو سەردەمەکاندا عەودالی سومبولە تایبەتیەکانی خۆی بوو، کە سومبولەکانی رابوردووی ئەوناچن و لەناوەڕۆکیشدا خاوەن دنیایەک جیاوازین، شاعیری نوێگەر ئاوڕ لە فۆرم و تایتڵە سواوو بەتاڵبووەکانی رابوردوو ناداتەوە، ئەو دێ لەناو مەودای ستراتیژیەتی ئاماژەو ئەست و زناک و کۆدەکانەوە فەرمانی شیعریەتی خۆی مەیسەر دەکاو، بەئاقارێکدا کار دەکا کە زۆر لەواقیعی نزیک ناکاتەوەو زیاتر هەوڵی دابڕانی لەگەڵ دەکا.

* * *

وەک دەرەنجامێک بۆ ئەو رایانە لەم نووسینەماندا خستمانەڕوو ئەو ئیشکالیەتانەی پەرتمان کردن دەکرێ کۆتاییەکان بەو ئاراستەیە بکەونەوە، کە ئەوەی ناعەقڵانیەت (بەشێوازە ریالیستیەکەی) دەماندانێ لە پرۆسەی بەرهەم هێنانی شیعریدا عەقڵانیەت (دیسانەوە بەشێوازە ریالیستیەکەی) ناماندانێ.

ئەوەی نامەئلوف دەماندانێ، مەئلوف لێمانی زەوت دەکا.

ئەوەی لە مەجهولدا دەستمان دەکەوێ، لە مەعلومدا گومی دەکەین.

ئەوەندەی رابوردوو دەمانباتەوە ناو کەلاوەی تەوتەمەکانەوە، ئایندەگەرایی بەهانامانەوە دێ بۆ دەربازبوون لەو تەوتەمانە.

ئێمەش هەر لە سەرەتاوە دانمان بەوەدا نا کە ئەمە خەونێکە بۆ تێکشکاندنی تەوتەمەکان و چنگەکرێ بە ئاسۆگەکانی ژیان و شیعری نوێوە، ئەمە هەوڵێکە بۆ دەست بەردارنەبوون لە گۆڕانکاری سەردەمەکان، چونکە ئێمە دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئێمە سوپەرمان نین هەرگیز توانای گۆڕانکاری و هەوڵەکانمان نییە، ئێمە تەنها خەونمان هەیە بۆ هەوڵەکان و خەون بەگۆڕانکاریەکانەوە دەبینین، چونکە ئێمە لەناو خەونەکاندا بیر دەکەینەوەو شیعریش هەمیشە ئاسۆگەیەک بووە بۆ خەونانی کردنی ژیان و بوونەوەرەکان.

# دەوڵەت:
## وەک بناغەی خواستی ئیرادەی رەها

د. کەمال پووڵادی
و: یوسف خزر چویان

١ - ٢

لەو بەشەدا سێ بابەتی سەرکی باس دەکەین، یەکەم ئەوەی کە چۆن لە بیرۆکەی سیاسی مۆدێرندا ئیرادەی مرۆڤ (جا چ ئیرادەی تاک یان ئیرادەی گشتی) وەک سەرچاوەو دامەزرێنەری کۆمەڵگای سیاسی و دەوڵەت شوێنگەیەکی سەرەکی لە فەلسەفەی سیاسیدا بۆ خۆی تەرخانکردووە. دووەم ئەوەی بۆچی هەر لەبەرئەو هۆیە دەوڵەت بەبەرهەمی دەستکردنی مرۆڤ بەژماردێت و لە ئەنجامدا چۆن توماس هۆبز لەسەر ئەو بنەمایە تیۆرێکی لە بارەی ئەرکی سیاسی خستەروو کە بوو بە بناغەی تیۆری گەلی بیرمەندانی دیکەو جوڵێنەری پەرسەندنی بیرۆکەی سیاسی مۆدێرن. هەروەها هەوڵ دراوە نیشان بدرێت کە چۆن لە فەلسەفەی سیاسی هۆبزدا بەش و رەگەزەکانی زۆربەی فەلسەفەو تیۆریە سیاسییەکانی دیکە کۆکراوەتەوەو چۆن راڤە کردنە جیاوازەکان لە فەلسەفەی ئەو بوو بەسەرچاوەی لق و پۆپ و پەرەسەندنی بیرۆکەی سیاسی ئەو لەسەردەمەکانی دواتردا.

لە بەشە سەرەکییەکانی تیۆری هۆبز کە بیرمەندانی دوای ئەو ئیلهامیان لێ وەردەگرت و هەروەها بوو بەمیحوەری بیرۆکەی سیاسی مۆدێرن دەتوانرێت باس لە بنەمای ئیرادەو رێکەوتن و پەیمانی کۆمەڵایەتی لە دامەزراندنی دەوڵەت و دامەزراندنی ئەرکی مۆراڵی لەسەر دامەزراوی سیاسی بکرێت، گرنگترین بنەمایەک کە هۆبز تیۆری سیاسی خۆی لەسەر داڕشتووەو لە تیۆری سیاسی بیرمەندانی دیکەی دوای ئەو بەشێوەی جۆراوجۆر پەرەی سەندوو ئەساسی ئیرادەی مرۆڤ لە دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی دابووە. چەمکی ئیرادە لەو چەمکانەبوو کە لە بیرۆکەی رۆسۆ، کانت و هیگڵدا بەشێوەیەکی نوێ خۆی نیشان داو بوو بەمیحوەری زنجیرەیەک تیۆری و فیرکاری فەلسەفی و سیاسی. چەمک گەلی وەک «ئیرادەی ئازاد» و «ئیرادەی عەقڵانی» بوونە چەمکی کلیلی فەلسەفەو تیۆری سیاسی لە ماوەی سەردەمەکانی دوای پەرەسەندنی خۆی.

## ئیرادەی مرۆڤ ئەساسی دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی

بیرۆکەی سیاسی مۆدێرن خاڵێکی جیاوازی گرنگی لەگەڵ بیرۆکەی سونەتی یان بیرۆکەی پێش مۆدێرن هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لە بیرۆکەی سیاسی مۆدێرندا دەوڵەت بەدامەزراوەیەکی مرۆڤییەو پەیوەندیدار بەئیرادەی مرۆڤەوە دەژمێردرێت. لە بیرۆکەی سیاسی سونەتیدا بەشێوەیەکی گشتی دەوڵەت یان بەشێکی سروشتی و ئەنجامی سروشتی مرۆڤ دەژمێردرا یان ئەوەی کە بەئیرادەی خواوەندەوە نیسبەت دەدرا«١». لە بیرۆکەی سیاسی مۆدێرندا کە بۆ یەکەم جار بەشێوەی سیستەمێکی تیۆری ڕێکخراو لەلایەن هۆبزەوە بونیاد نرا دەوڵەت وەک سامانێک هەڵدەسەنگێندراو شرۆڤە دەکرا کە مرۆڤەکان بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانی خۆیان دروستیان کردووە. بیرۆکەی مۆدێرن ماکیافیلی بناغەکەی دامەزراندو هۆبز بینایە گەورەو شکۆدارەکەی بەرز کردەوە، کەوتە بەرامبەری بیرۆکەی سونەتی کە دەتوانرێت ئەو بەسونەتی عەقڵ، سروشتی وەسف بکرێت. هۆبز دروستکەری ئەو بینایە بەشکۆو گەورەیە لە جێگەی ئەوەی کە وەک شێوازی نووسراو لێکۆڵینەوەی خۆی لە یاساوە دەست پێ بکات لە ئیرادەوە دەستی پێ کرد، کە ئەوە بوو بەسەرچاوەی ئاڵوگۆڕییەکی گەورە لە تەواوەتی بیرۆکەی سیاسی مۆدێرندا هەتا ئەوەی کە لە ئاکامدا بەتیۆری «ئیرادەی عەقڵانی» هیگڵ کۆتایی پێ هات.

هۆبز لە بنەڕەتدا فەلسەفەی سیاسی خۆی لەسەر دوو بابەتی ئیرادەو ئەفراندن بونیادنا. ئەو بنەمایەی کردە دەست پێکی تیۆری سیاسی خۆی کە ئەوە مرۆڤە ئۆتۆریتەی مەدەنی خۆی دروست دەکات ملکەچیشی دەبێت. لە پێش بونیادنانی ئۆتۆریتەی مەدەنی ئەوا ئیرادەی مرۆڤە کە ئیرادەیەکی ڕەهایە. ڕەهایە بەو واتایە کە بەهیچ پێوەرو ڕێسایەک سنوردار ناکرێت. مرۆڤ لە باروودۆخی سروشتیدا ملکەچی هیچ ئەرکێک نییە نەبوونی ئەرک لەلایەکەوە هەمان مافی سروشتی و مافی سروشتیش مافی ڕەهایە (موتلەق)،چونکە ئەنجامی سروشتی ئیرادەیە نەک یاسایەکی بەرزتر. کۆمەڵگای مەدەنی باروودۆخێکی دروستکراوە ئەفراندنی ئازادی ئیرادە ڕەهایەکانە. ئەو کۆمەڵگایە بەگواستنەوەی مافی تاک بۆ حوکمڕان لە میانەی پەیمانێکی کۆمەڵایەتییەوە دروست دەبێت. بەو پەیمانە دەسەڵاتێکی حوکمڕانی دروست دەبێت کە ئیرادەی ئەو جێگەی ئیرادەی دروست کەرەکانی دەگرێتەوە.

ئەو بیرۆکەیە واتە شوێنگەی ئیرادەی مرۆڤ لە پێکهێنانی هێزی دەسەڵاتدار بوو بەفەلسەفەی دەسەڵاتداری ئەورووپا و بیرۆکەی سونەتی کە سیما گشتیەکەی بیرۆکەی عەقڵی سروشتی بوو وەلاوەنا. هۆبز وەک بەرز کەرەوەی بیرۆکەی نوێ بەنوێبەی خۆی کەڵکی لە سونەتی نۆمینالیزمی نیسکۆلاستیک وەرگرتبوو. نۆمینالیستەکانی سەدەی سێزدەو چواردەیەم کەسانێک بوون کە حەقیقەتی شتەکانیان لە تاکییەتی ئەوان دادەدیتەوە ئەوان هەروەها ئەو بابەتەیان خستەڕوو کە ئیرادە لە پێشەوەی عەقڵە. ئەو بیرۆکەیە لە بەرامبەر فەلسەفەی نوسراوی سەدەکانی ناوەڕاست دابوو کە لە کەسایەتی خودناکامی مرۆڤ وەک زەمینەی کەسایەتی مرۆڤدا، ئەو تیۆرییەی کە پێشڕەوایەتی مرۆڤدا قابیل بەدوو ڕەگەزی عەقڵانی و جەوهەری تاک بوو ئەو سیمایە لە عەقڵانیەت بوو کە لە قۆناغەکانی دواتردا بەتیۆری دیکارت کۆتایی پێ هات، تیۆرێک کە لەودا پێشڕەوایەتی بە مەعریفەو ئیرادە لە کەسایەتی مرۆڤدا

لە بیرۆکەی سیاسی مۆدێرندا دەوڵەت وەک سامانێک هەڵدەسەنگێندراو شرۆڤە دەکرا

پێ هات، تیۆرێک کە لەودا پێشڕەوایەتی بە مەعریفەو ئیرادە لە کەسایەتی مرۆڤدا دەدا کەوتە بەرامبەر تیۆری دیکارت، لەو تیۆریەدا گوتراوە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی دابڕاو، جیابۆوە، خود میحوەرو قابیلی تێگەیشتن نییە. نۆمینالیستەکانی سەدەکانی ناوەڕاست جەختیان لەسەر ئەو بابەتە دەکردەوە کە مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەن ئیرادەو فەنتازیا توانایی یەکیەتی دەروونی نییە و پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دیکە تەنیا پەیوەندییەکی دەرەکییە. مرۆڤەکان مومکینە لەگەڵ یەکدی کۆببنەوە، ببنە جێنشین یان نوێنەری یەکدی، بەڵام هیچ کات گشتیەتێک پێک ناهێنن کە لەودا تاکیەتیەکەیان کەم ڕەنگ ببێتەوە، تەنانەت عەقڵی تاکیش لەهەر لایەنێکەوە تەنیایە (منفرد) کاتێک کەکەسێک بەقەناعەت دەگەیەنێت لەگەڵ ئەو بەتێگەیشتنێکی هاوبەش ناگەین بەڵکوو تەنیا عەقڵی خۆت دەکەیە جێنشینی عەقڵی ئەو لە کۆمەڵگای سیاسیشدا ئەو تاکیەتیە لە جێگەی خۆی دەمێنێتەوە. هیچ کۆمەڵگایەک پێک نەهاتووە مەگەر بەکردەی ئیرادە تاکەکان. مانای ئەو قسەیە ئەوەیە کە ئیرادەی تاکەکان ڕووی لە یەکدی نییە بەڵکوو ڕووی لە بابەتی ئیرادەکانە واتە پەیمانە جەوهەری پەیمان ئیرادەی هاوبەش نییە بەڵکوو بابەتی هاوبەشی ئیرادەکان. سەرنج دان بەو خاڵە بۆ تێگەیشتن لە تیۆری هۆبز بەتایبەت تایبەتمەندی دەسەڵاتدار لە ڕوانگەی ئەو گرنگی زۆری هەیە. کارێک کە دەسەڵاتدار ئەنجامی دەدات وەک کاری تاکەکان و پەسەندکردنی ئەویش وەک پەسەندکردنی تاکەکان نییە کاری ئەو کاری خۆیەتی و پەسەندکردنی ئەو پەسەندکردنی خۆیەتی. ئەو تێڕوانینەی هۆبز تیۆریەکەی ئەوی، سەرەڕای ئەوەی کە لایەنی هاوبەشی هەیە، لە تیۆری ئیرادەی گشتی ڕۆسۆ هیگڵ جیادەکاتەوە.

تیۆری هۆبز بوو بە محوەری بیرۆکەی سیاسی مۆدێرن، کە باس لە بنەمای ئیرادەو پەیمانی کۆمەڵایەتی دەکات.

هیگڵ ستایش کاری هۆبز دەکات لە دانانی ئیرادە وەک بناغەی سیستەمی سیاسی، بەڵام بەبۆچوونی ئەو، لەوەی کە هۆبز ئیرادەی بۆ پلەی ئارەزووهێناوەتە خوارێ ڕەخنەی لێ دەگرێت هیگڵ دەڵێت ئیرادە ناچارە ئاماجی کۆتایی خۆی بەشێوەی عەقڵانی هەڵبژێرێت. هیگڵ لە ئیرادەی ڕەهاوە ڕوو لە چەمکی «ئیرادەی عەقڵانی» دەکات و، دەڵێت ئیرادە ئەگەرچی لە شێوەدا بێ کۆتاییە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا کۆتایی هەیە. کاتێک کە تاک بەپێی چەمکە گشتییەکان هەڵسوکەوت دەکات ئیرادەکەی «ئیرادەیەکی عەقڵانییە».

### دەوڵەت وەک بوونیادێکی دەست کردی مرۆڤ

ئەگەرچی باسکردن لە عەقڵانییەتی دەوڵەت لەهەر شوێنێکی کە فەلسەفە هەبێت قابیلی خستنەڕوویە بەڵام لە بنەڕەتدا ئەوە بەقەبوول کردنی بیرۆکەی دەستکردبوونی دەوڵەتە کە بابەتی عەقڵانیەتی دەوڵەت بەتەواوی ڕەهەندەکانیەوە دەخرێتەڕوو. بابەتی عەقڵانیەتی دەوڵەت لەگەڵ تیۆری دەستکردبوونی دەوڵەت پەیوەندی نەپچڕاوی هەیە. هەڵبەت ئەو هزرەی کە دەڵێ: ڕێگە خۆشکەرێکی مرۆڤییە بەشێوەیەکی خاو لەلایەن سوفیست و ئەپیکۆریەکان خرابوویەڕوو، بەڵام لەپێش هۆبزدا ئەو بیرۆکەیە زۆر فراوان نەبوو پێش لەسەدەی حەڤدەیەم بیرۆکەی دەسەڵاتدار ڕوانگەی عەقڵی- سروشتی بوو، کە دەوڵەتی بەشتێکی سروشتی دادەنا، نەک شتێکی دەستکرد، لەسەدەی حەڤدەیەم دابوو کە ڕوانگەی سونەتی بەتوندی کەوتە بەرگومان. بزوتنەوەی هیوومانیزم و سەرهەڵدانی مەعریفەی

نوێ لەوگۆڕانکاریەدا ڕۆڵی گرنگی هەبوو.

بیرمەندانی سەدەی حەڤدەیەم بەپێچەوانەی سونەتی فەلسەفەی یۆنانی جیهانیان بەتێکەڵاویەک لە ئۆرگانیزمە زیندووەکان وێنا نەدەکرد. هەنووکە سروشت بەجۆرێک ماشێن دادەندرێت. ئەو تێڕوانینە نوێیە بۆ سروشت و بۆ عەقڵ بوو بەسەرچاوەی تیۆری گەلی نوێ لە بارەی دەوڵەتدا وەک ئەنجامی ئیرادەو دەست کردبوونی مرۆڤ. بەهەمان شێوە کە سروشت وەکوو ئامێرێک وێنادەکرا دەوڵەتیش وەکوو ئامێرێک لەبەرچاو دەگیرا کە مرۆڤ ئەوی بەئیرادەی خۆی دروست کردووە. هەڵبەت لەو لایەنەوە کە ئیرادە چۆن مانا دەکراوە (مەیل و ئارەزوویان ئیرادەی عەقلانی) سیستەم گەلی هزری جۆراوجۆر پەیدابون، بەڵام ئەوەی کە ئیرادەی مرۆڤ سەرچاوەی سیستەمی کاروبارەکانە میحوەری تیۆری زۆربەی بیرمەندەکان بوو. سەرەڕای ئەوە بیرۆکەی مۆدێرن نەتەنیا مرۆڤی بەدروستکەری دەوڵەت دادەنا بەڵکو جەختی لەسەر ئەو خاڵەش دەکردەوە کە مرۆڤ ئەوی لەسەر بنەمای هەڵگرتنی نموونە لە شوێنێکی دیکە یان پشت بەستن بەعەقڵێک لە دەرەوەی عەقڵی خۆی دروستی نەکردووە.

هۆبز هەوڵی دا کە بەرگری لە مەبەستی عەقلانی بوونی دەوڵەت بکات و نیشانی بدات کە ئوتوریتەو گوێڕایەڵی پاساوی عەقلانیان بۆی هەیە. سەرەڕای ئەوە پێی دادەگرت کە نیشان بدات حکومەت بوونیادێکی خواوەندی و لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی پشکنین نییەو مرۆڤ ناچار نییە کە بەشێوەی هەڵچوون (انفعالی) بەرگری لە دەسەڵاتداریەتی بکات، بەڵکو دەبێ لەسەر بنەمای عەقڵ ئەو قەبووڵ بکات هەروەها بەشێوەی چالاک ملکەچی بێت.

بەسەرنج دان بەو تێڕوانینەو بەگرنگی دان بەو ڕوانگەیە کە مرۆڤ بەخاوەن دەسەڵات لەسەر چارەنووسی خۆی بەئەژمار هات ئەو پرسیارە دەخرێتەڕوو کە مرۆڤەکان چۆن و لەسەر چ بنەمایەک ئەو دەوڵەتەی کە لە هزریان دایە دەیانهەوێ دروستی بکەن. ئەو پرسیارە پرسیارێکی بوونیادنەرانەبوو. وەڵامی ئەو بیرمەندانەی کە بناغەکانی بیرۆکەی دەوڵەتی مۆدێرنیان دانا، ئەوەبوو کە دەوڵەت ددبێ ئەنجامی ڕێککەوتنی ئەو تاکانە بێت کە دروستی دەکەن بەوەها ڕێککەوتنێکە کە دیسپلین و یاسا دادەمەزرێت و کۆتایی بەبێ سەروەری دێت. هەڵبەت ئەوەی کە وەها دەوڵەتێک بەشێوەیەکی دیار دەبێ چ تایبەتمەندی گەلێکی هەبێت و چوارچێوەی ئوتورینەو دەسەڵاتی یاساییەکەی (Autharity) هەتا کوێ دەبێ ببێت چیرۆکێکی دیکەیە کە ڕوونتر دەکرێتەوە.


هیوم



پێش گفتوگۆکردن لە بارەی هەندێک لە ڕەگەزەکانی کلیلی فەلسەفەی سیاسی هۆبز کە بناغەی فەلسەفەی مۆدێرن و میحوەری پەرەسەندنی ئەو لە تیۆری فەیلەسوفەکان دواتریشدا پێک دەهێنێت خەراپ نابێت ئەگەر لە بارەی کۆڵەکەکانی دامودەزگای هزری هۆبزەوە چەند ئاماژەیەک بهێنینەوە، پەیکەری تیۆری هۆبز لە دەربڕینێکی زۆر چڕو ئاخنراودا دەتواندرێت بەو شێوەیەی خوارەوە کورت بکرێتەوە:

١- ئەوەی کە مرۆڤ بەرەو بوونیادنانی کۆمەڵگایەکی سیاسی ڕادەکێشێت پارێزگاریکردن لە حەزو ئارەزوو مافی سروشتی پاک ڕاگرتنی نەفسە.

٢- پاک ڕاگرتنی نەفس کە مافی سروشتی هەر تاکێکە تەنیا بەپێکهێنانی


هێگڵ

کۆمەڵگای مەدەنی دەوڵەت مسۆگەر دەبێت.

٣- لە پێش دامەزراندنی دەوڵەت (و کۆمەڵگای مەدەنی) «بارودۆخی سروشتی» زاڵە کە لەودا مرۆڤەکان لەگیان و ماڵی خۆیان دڵنیا نینە. ئەوانەی کە بەردەوام لە گوماندا دەژین بۆ بردنە سەری زۆرتری ئاسایشی خۆیان لە هەوڵی زۆرکردنی دەسەڵاتیان دانەو رەکابەری دەسەڵاتیش کۆتایی پێ نایەت.

هێگڵ ستایشی کاری هۆبز دەکات لەدانانی ئیرادە وەک بناغەی سیستەمی سیاسی و. لە ئیرادەی رەهاوە روو لەچەمکی (ئیرادەی عەقلانی) دەکات.

٤- ترسان لە مردنی ناسروشتی وا لە مرۆڤەکان دەکات هەتا بچنە ناو پەیمانێکی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگای مەدەنی (دەوڵەت) پێکبهێنن.

٥- لەو پەیمانەدا هەر تاکەی لەگەڵ تەواوی تاکەکانی دیکە بەڵێن دەدات کە تەواوەتی مافی سروشتی خۆی لەمەڕ دادوەری بەنیسبەت پارێزگاری کردن لە نەفسی بە تاک یان کۆمەڵێک لە تاکەکانی دیکە بسپێرێت.

٦- بەو شێوەیە کە لویتانێک (دەوڵەتی بەهێز) لە دایک دەبێت.

تیۆری هۆبز کە بەو شێوەی سەرەوە خرایەڕوو هەم چەمک گەلی کلیلی نوێ لەخۆوە دەگرێت و هەم کۆمەڵە پرسیارێک دەوروژێنێت کە شێوەی وڵام دانەوە بەئەوان چ لەتێگەیشتنی فەلسەفەی سیاسی هۆبزو چ لە ناراستەی دواتری بیرۆکەی سیاسیدا گرنگی زۆری هەیە. لە تۆژینەوەکانی دواتردا باس لەو مەسەلەو پرسیارانە دەکەین.

**عەقلانییەتی گوێڕایەڵی و ئەرکی سیاسی**

یەکێک لە پرسە سەرەکییەکانی فەلسەفەی سیاسی لەسەردەمی ئەفلاتونەوە هەتا سەردەمی هاوچەرخ پەیوەندی ماف و دەسەڵاتی سیاسییە ئەو پرسە لە پرس گەلی سەرەکی فەلسەفەی سیاسییە کە بۆچی دەبێ گوێڕایەڵی لە دەوڵەت بکەین. بابەتی پەیوەندی ماف و دەسەڵات و عەقلانیەتی گوێڕایەڵی لەسەدەی حەڤدەیەمەوە بە ئەوپەڕی فراوانییەوە خرایەڕوو.

تیۆری ئەرکی هۆبز و بنەماو گریمانەکانی هۆبز دەست پێکی بیرۆکەی سیاسی مۆدێرن لە جیدی ترین روخساری خۆیدا بووە هەربۆیە دەبێ باسکردنی بیرۆکەی مۆدێرن لە جیدیترین روخساری خۆیدا، لە تیۆری ئەرکی هۆبز یان بەشێوەیەکی گشتی بنەماو گریمانەی لە فەلسەفەی سیاسی هۆبز دەست پێ بکەین.

تیۆری ئەرکی هۆبز بەهەمان رادە کە باس هەڵگرترین بەشی فەلسەفەی سیاسی ئەوە، بەهەمان رادەش بنەمای فەلسەفەی سیاسی هۆبزو سەرچاوەی زۆربەی تیۆریە سیاسیەکانی دواتر بووە، تیۆریەکانی هیووم و لایەنگرانی قوتابخانەی سودگەرایی (یوتیلتیاریزم) لەلایەک و کانت و رۆسۆ لەلایەکی دیکە هەر کامیان، بەئاوێنەیەکی جیاواز لە راکێشان و پاڵنان، ئیلهامیان لە تیۆری ئەرکی هۆبز وەرگرتبوو. ئەو بیرۆکەیە هەنووکەش سەرەڕای راڤەکردنی نوێش سەرچاوەی ئیلهامی تیۆری سازانی سیاسییە. لە نوێترین راڤە لە تیۆری ئەرکی هۆبز (کە لەرەوتی لۆژیکی خۆیدا بۆ دەسەڵاتداریەتێکی بێ سنوری حاکمێکی بەهێز کۆتایی پێ دێت) جۆرێک لە بنەمای پلۆرالیزمی سیاسی دۆزراوەتەوە.

لەو گەڕان و زیتەڵیەدا سەرەڕای چاو لێ کردنێک لەراڤە جیاوازەکانی کە لە تیۆری هۆبز کراوە ئاماژە بەلایەنە جۆراوجۆرەکانی، هەروەها ئەو خاڵە پەیوەندی دەرانەی کە لەگەڵ تیۆری سیاسی بیرمەندە گەورەکانی دواتر هەیبووە، دەکەین و بەتایبەت باس لەو خاڵە دەکەین کە چۆن بنەماو

گرێمانە سەرەکییەکان هۆبز دەیتوانی هەم سەرچاوەی ئیلهام و هەم سەرچاوەی نێک جیابوونەوەی تیۆری سازە گەورەکانی دواتر بێت.

تیۆری ئەرکی هۆبز لە دەوری ئەو بابەتە دەسوڕێتەوە کە ئەرک چییە، چۆن پێکدێت و بۆچی هەتا چ رادەیەک دەبێ گوێڕایەڵی لە دەسەڵاتداران بکردرێت و چ کەسانێک خاوەنی شەرعیەتی سیاسین، بەواتایەکی دیکە لێرەدا ئەوەی کە باسی لێ دەکرێت ماهیەتی دەسەڵاتداریەتی و چۆنیەتی نوتوریتەیە کە لە واقیع دا میحوەری فەلسەفەی سیاسی هۆبزە. لە بابەت ئەوەی کە لە روانگەی هۆبزەوە پێوەری شەرعیەتی دەسەڵات چییەو دەسەڵاتی شەرعی دەسەڵاتی نا شەرعی چۆن بناسینەوە جیاوازی بۆچوون هەیە.

تیۆری ئەرکی هۆبز بەو جۆرەی کە لە کتێبەکانی هاووڵاتی (دوسیرە)و - لویتان - داهاتووە شوێنی گرنگترین بۆچوونە ناکۆکەکانە ئەو جیاوازی بۆچوونانە لە دەوری دوو پرس دەسووڕێنەوە کە بەوشێوەی خوارەوەن:

١- ئایا تیۆری ئەرکی هۆبز تیۆریەکە لە بارەی هۆشیاری و هەروەها مەیلی بۆ لای هۆشیاری (Prudential) هەیە.

٢- یان تیۆریەکە لە بارەی مۆراڵ و فەریزەناسی مۆراڵ.

بەواتایەکی دیکە ئایا ئەو ئەرکەی کە هۆبز لەبەرچاویەتی پشت بەبەرژەوەندی گەلی عەقڵانی تاک دەبەستێت یان لەسەر بنەمای مۆراڵە؟ بەهەمان شێوە، ئەو پرسیارەش کە دەڵێ ماتریالیزمی هۆبز تا چ رادەیەک لەتێگەیشتن و شیکردنەوەی ئەو لە ئەرک دابەشدارە؟ لویتان بەباسکردن لە فیزیۆلۆژی دەست پێدەکات و پاشان بەدەروونناسی دەگات و پاشان دەپەرێتەوە بۆ سەر سیاسەت، بابەتی سەرەکی فەلسەفەی هۆبز ئەوەیە کە هەرچییەک هەبێت مادە لە حاڵی جووڵە دایە. پرسیار ئەوەیە کە ئەو تێڕوانینە تا چ رادەیەک رەنگی بەسەر تیۆری ئەرکی ئەودا هەبووە؟

تیۆری ئەرکی هۆبز لە ماوەی چواردەیەی دواییدا روانگەی گەورەترین زیتەڵ و توێژەرە سیاسیەکانی بۆ لای خۆی راکێشاوو. لەو زیتەڵ و توێژەرانەش دەتواندرێت ناوی هواردوارند، ئەرنێست کاسیرر، ئەی. ئیی، تایلوور، میخانیل ئووکشات، سی بی، مەکفرسۆن و لئوسەتروس بهێنین. هەریەک لەو توێژەرانە تەفسیرێکی تایبەتیان لە تیۆری هۆبز بەدەستەوەداوە کە ئێمە بەکورتی باسیان دەکەین و پاشان دەڵێین کە لەواقیعدا دووپرسی هۆشیاری و ئەرکی مۆراڵی لە تیۆری هۆبزدا لەگەڵ یەکدی قابیلی کۆبوونەوەن. بەڵام ئەوەی کە ئەو تەفسیرانە سەرنج راکێش دەکات ئەوەیە کە هەرکامیان هۆبز لەگەڵ ئەو بیرمەندە گەورە سیاسیانەی کە لێرەدا باسی لێ دەکەین نزیک دەکاتەوە بۆ نموونە تەفسیری وارندو تایلوور، هۆبز بۆلای کانت، خوێندنەوەی ئووکشات هۆبز بۆ لای رسۆو تەفسیری کاسیرر ئەو بۆ لای هیوم و لایەنگرانی قوتابخانەی سودگەرایی نزیک دەکاتەوە. بەبۆچوونی ئێمە تیۆری هۆبز لایەنی هاوبەشی لەگەڵ هەرکام لە ئەوانە هەیە.

«بۆ لێکۆڵینەوە لە تیۆری ئەرکی هۆبز دەبێ لێکۆڵینەوەکە لەبنەماو گریمانەکانی فەلسەفەی سیاسی هۆبزەوە دەست پێ بکرێت، هۆبز لە هاوشاری لویتان - دا وێنەی جۆرێک لە بارودۆخی سروشتی دەدا بەدەستەوە کە لەودا هێزێکی هاوبەش چاودێری بەسەر تاکەکاندا ناکات و لەودا بەهۆی رەکابەری بۆ بەدەست هێنانی سەرچاوە دەگمەنەکان و یەکسانی تواناییەکان (ناتوانایی جەستەییەکیان لەگەڵ توانایی عەقڵی ئەوی دیکە

ئەرک بە بۆچوونی هۆبز دانی ماقێکە، گوێڕایەڵی کردن لە فەرمان ئەنجامی گواستنەوەی مافی سروشتی تاک بۆ فەرمانڕەوایە.


ڕۆسۆ

قەرەبوو دەبێتەوە) شەڕی هەموویان بەدژی یەکدی ڕوودەدات.

بەڵام یاسای سروشتی وا لەمرۆڤ دەکات کە واز لە بارودۆخی سروشتی بهێنێت و لەژێر دەسەڵاتێکی هاوبەش یان هێزی دەسەڵاتدارێک و لە پەنای کۆمەڵگایەکی سیاسی بێت.

هەر بۆیە هەرکەسە لەگەڵ کەسانی دیکە پەیمان دەبەستێت کە بەشێک لەمافی حکوومەت کردن بە سەرخۆیدا تەسلیمی فەرمانڕەوایەک بکات لە ئاکامی ئەو بەڵێن و پەیمانە ئەو کەسەی کە لە کۆمەڵگای سیاسیدا دەژێت ئەرکی سەرشانیەتی هەتا ئەوکاتەی کە فەرمان ڕەوا سەقام گرتوویی و دەسەڵاتی لەدەست دایە گوێڕایەڵی بێت. ئەگەر وابێت ئەوا بابەتی بەڵێن و پەیمانی سیاسییەکە ماهیەت و سەرچاوەی ئەرکی سیاسی ڕوون دەکاتەوە.

تیۆرەکانی هیووم و لایەنگرانی قوتابخانەی سوودگەرایی( یوتیلیتاریزم) و ڕۆسۆ، ئیلهامیان لە تیۆری ئەرکی هۆبز وەرگرتووە.

،بەڵام پرسەکە لەسەر یاسای سروشتی و یاسای سروشتەو هەروەها ئەوەی کە ئایا یاسای سروشتی فەرمانی عەقڵەیان فەرمانی خواوەندەو ئەگەر فەرمانی عەقڵە چۆن لەگەڵ شیکردنەوەی هۆبز لە یاسا قابیلی جووت کردنەو ئەگەر فەرمانی خواوەندییە لەبەرهەمەکانی هۆبز دا چ بەڵگەخوازییەکی دەتوانین بۆ بدۆزینەوە؟ پێویست بەوەبیرهێنانەوە دەکات کە بەنیسبەت یاسای سروشتی ڕوانگەگەلی جیاواز هەیە. کۆنترین تێگەیشتن ئەوەبوو کە یاسای سروشتی یاسایەکی بەرزە کە لەسەرووی یاسا تایبەتی و جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا جیاوازەکانەوە بوونی هەیەو پێوەری عەدالەت و تەرازوی بونیادە سیاسیەکانە.

ئەو پرسیارە دەخرێتەڕوو کە بنەمای گشتی بوونی یاسای سروشتی چییە. وڵامێک ئەوەبوو کە عەقڵ بنەمای یاسای سروشتییە. وڵامێکی دیکە ئەوەبوو کە یاسای سروشتی فەرمانی خواوەندە. بەڵام هۆبز لە بەرابەر ئەو بۆچوونەدا ڕاپەڕی.

پرسێکی دیکە پێکهاتەی بەڵگەخوازی هۆبزبوو، لەوبارەوە هەر بەو جۆرەی کە ئاماژەی پێدرا، دوو تێڕوانینی گشتی لە یەکدی قابیلی جیاوازن لە تێڕوانینی یەکەم دەگوترێت کە لەنێوان تیۆری فیزیۆلۆژی، دەروون شیکاری و سیاسی هۆبزدا پەیوەندی لۆژیکی هەیە. بەڵام لە تێڕوانینی دووەم دەگوترا کە لە نێوان تیۆری سیاسی و تیۆری ئەرکی هۆبزدا لەگەڵ تیۆری ئەو لە بارەی فیزیۆلۆژی و دەروون شیکاری پەیوەندییەک نییەو لێرەدا پچڕانێکی مەعریفەناسی ڕووی داوە.

«لایەنگرانی تێڕوانینی یەکەم، بەڵگەی پەیوەندی لە نێوان فەلسەفەی سیاسی و فەلسەفەی گشتی هۆبز بەو بەڵێنە توندە دادەنێن، کە هۆبزی بەزانست و ڕەوتە پەرەگرتووەکانی سەردەمی خۆی بەتووندی پابەند بە شروڤە زانستییەکان کردبوو لەو تێڕوانینەدا گوتراوەکە تیۆری هۆبز تیۆریەکە لە بارەی هۆشیاری و یان هاندەری دەروون شیکاریانەیەو هیچ واتایەکی مۆڕاڵی ڕوونی نییە هۆبز پڕەنیسبی پشکنین و لێکۆڵینەوەی زانستی کە لە پێش ئەوو هەروەها لە دوای ئەویشدا هەموو بۆ ڕەفتاری مرۆڤی گواستەوە.

پرۆفیسۆر مەکفر سۆن کە یەکێک لە بیرمەندانی ئەو گروپەیە لە نێوان فیزیۆلۆژی و دەروونناسی هۆبزو تێگەیشتنی ئەو لە حقووق و بەڵێنیەکانی مرۆڤ بەردەوامیەتی لۆژیکی دەبینێت، ئەو تێگەیشتنە لە تیۆریەکانی هۆبز سەرەتا بەنووسینەکانی ڕیچارد پترز لە کۆبوونەوە زانستیەکاندا خرایەڕوو.

ـەگـەر بۆ چوونە قـەبووڵ ـکەین ئەوکات دەبێ بڵێین ـەرکی سیاسی لە تیۆری هۆبزدا لە ئەنجامی پێش گـرێمانە نیـمـچـە ئەزموونیەکانی ئەو لە بارەی ـسروشتی مرۆڤدا بەدەست دێت. لە تێڕوانینی دووەم دا دەگوترێت کە پێکهاتەی بەڵگە خوازی هۆبز زیاتر لەگەڵ لۆژیکی سیاسیدا پەیوەندی هەیە. لەو بەڵگە خوازیەدا پەیمانی کۆمەلایەتی وەک بازنەیەکی پەیوەندییە لە نێوان بارودۆخی سروشتی و بارودۆخی مەدەنی یان کۆمەڵگای سیاسی. دەسەلاتداری سیاسی بەپەیمان دێتەبوون. یاسای سروشتی پێش زەمینەیەکە بۆ ئەوەی تاکەکان بێنە پاڵ پەیمانی کۆمەلایەتی پرسیاری گرنگی پەیوەندی دار بەو تێڕوانینە ئەوەیە کە بۆ پەیداکردنی بناغەی ئەرکی سیاسی دەبێ هەتا کوێ بۆ دواوە بگەڕێتەوە؟ ئایا ئەرک لە کۆمەڵگای سیاسیدا ئەرکێکی نوێیە کە پشت بەدەستەلاتداریان پەیمانی کۆمەلایەتی یان هەردووکیان دەبەستێت یان ئەوەی کە شێوەیەکی تایبەتی لە ئەرکە کە لەژێر یاسای سروشتیدا بوونی هەبووە؟

لێرەدا ئێمە لەگەڵ دوو پرس ڕووبەڕوودەبین. پرسی یەکەم پێناسەکردنی یاسای سروشتی و بەراوردکردنی ئەو لەگەڵ پێناسەکردنی هۆبز لە یاسایە.

هۆبز یاسا بەو جۆرە پێناسە دەکات کە فەرمانی کەسێکە کە مافی دەرکردنی وەها فەرمانێکی هەیە لەو حاڵە کە لە بارودۆخی سروشتیدا کە فەرمان ڕەوایەک نییە چ کەسێک مافی دەرکردنی فەرمانی هەیە؟

بەو پێیە چۆن دەتواندرێت یاسای سروشتی بەیاسایەکی بەمانای گووتە دروست دابنێین؟ تایلۆر لە وڵامی ئەو پرسیارەدا یاسای سروشتی بەدەرمانی خواوەند دەژمێرێت. ئارلتۆن دەڵێت یاسای سروشتی فەرمانی خواوەندە و فەرمانی خواوەندیش دەبێ گوێڕایەڵی بکرێت. داخوازیەکانی عەداڵەت جێبەجێ نابێت مەگەر ئەوەی کە تاکەکان گوێڕایەڵی لە فەرمانی خواوەند بکەن.

بەو شێوەیە بەو هەڵسەنگدانەوە، یاسای سروشتی تەنانەت پێش لە پێکهاتنی کۆمەڵگای مەدەنیش ئەرک دەخاتە سەرشان. ئەو یاسای سروشتی بەخۆی ئەرک دەخاتە سەرشانی دەسەلاتدار، هەرچەندە کە فەرمانیڕەوا هیچ ئەرکێکی لە بەرامبەر ژێر دەستەکانیدا نییە. هێزی ئەرک دەری یاسای مەدەنی لە خودی یاسای سروشتی سەرچاوە دەگرێت ئەو خوێندنەوەیە لە هۆبز هەروەک گوترا لە تەفسیری هوارد وارند پەیدابووە. وارند بەگێڕانەوەی گوتەیەک لە لویتان دەڵێت لە ڕوانگەی هۆبز ئەگەر ئێمە یاسای سروشتی لە بارودۆخی سروشتیدا وەک فەرمانی خوداوەند بژمێرین دەتواندرێت ئەو وەک یاسا بەمانای گووتە بژمێردرێت کە ئەوەش هۆکاری چۆنایەتی ئەو کەسەی کە یاسا دەکاتە ئەرکێک ئاشکرا دەکات. تەفسیری تایلور لە هۆبز ئەو زۆر لەکانت نزیک دەکاتەوە. تایلور دەڵێت مۆراڵی هۆبز بەشێوەیەکی کامڵ لەسەر بنەمای واجب ناسی (Deontology) مۆراڵی بە بەبۆچوونی تایلور هۆبز لە نێوان عادیلانەبوونی کردەیەک و عادڵ بوونی تاکێک جیاوازی دادەنێت. کردەی عادیلانە کردەیەکە کە لەسەر بنەماو ماف ئەنجام بدرێت، بەڵام کەسێک کە بەپێی مافێک هەڵسوکەوت دەکات خۆی لە خۆیدا نابێت بەتاکێکی عادل ئەو هەمان ئەو جیاکارییە کە کانت لە نێوان کردەیەک بەپێی یاساو کردەیەک کە لە یاساوە سەرچاوە دەگرێت دادەنێت. لە تیۆری

فەلسەفەی مۆراڵی دواجار پشت بە عەقل دەبەستێت، عەقل تواناییەکە تاک بە سیستەمێکی مۆراڵی دەرەوە دەلکێنێت.

کانتدا «ئیرادەی چاک» ئیرادەیەکە کە تەنیا خوازیاری هاوجووتی لەگەڵ یاسای گشتییە بەپێی لێکدانەوەی تایلۆر هۆبز پێشرەوی کانت بووە. بەڵام هەڵە کردەیەکە کە هەردووک لایەن خوازیاری جیاوازێکی لۆژیکی بێت. کردەی دروست کردەیەکە بکەر بیهەوێت ئەو کردەیە ببێتە یاسایەکی گشتی. تایلور دەڵێت هۆبز شتێکی تارادەیەک وەک «گەشتێکی ڕەها»ی کانت بۆ یاسای مۆراڵی هێناوە. بەبۆچوونی تایلۆر هۆبز کرۆکی یاسای وەک پرسێکی ماتماتیک بەئەژمار هێناوە کە عەقڵی مرۆڤ ئەوی دەرهێناوە. بەڵام جیاوازی وردی کانت لەگەڵ هۆبز ئەوەیە کە هۆبز دەڵێت ئەو پرسە ماتماتیکیە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بەفەرمانی فەرمان ڕەوا دەبێتە یاسا.

تایلور بەهەمان شێوە دەڵێت کە بەبێ مەرج ملکەچ بوون لە بەرابەر فەرمان ڕەوادا تەنیا پێویستی ئاشتی و ئەمنیەت نییە، بەڵکو ئەرکێکی مۆراڵییە کە ئەو ئەرکەش لەگەڵ یاسای ئەزەلی (بێ کۆتایی) هاوجووتە کە کاتێک کەسێک دەبێ ئەنجامی بدات و ئەو بەڵێنییەش لە پێش سەرهەڵدانی کۆمەڵگای مەدەنی پێکهاتووە.

**تێپەڕین لە فیزیۆلۆژی و دەروونناسی هۆبز بۆ تیۆری سیاسی هۆبز دژوارە، ناتوانرێت پشت بە پەیوەندی فەلسەفەی گشتی ببەسترێت.**

ئەرکی گوێڕایەڵی کردن لە یاسا، تەنانەت ئەگەر کەسێک بە ناعادیلانەشی بزانێت لە واجب ناسی مۆراڵییەوە سەرچاوە دەگرێت، بۆیە لێرەدا ئەگەر دەروونناسی هۆبزیش وەلاوە بنێین دیسان بەمەرج دان بەگریمانەکانی هۆبز لەمەڕ پشت بەستنی کۆمەڵگای مەدەنی بەپەیمان و ئەرکی تاک بۆ لەبەرچاوگرتنی و جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە مۆراڵیەکان هەروەک خۆیان دەمێننەوە ئەو جوان ناسیە بەپێویستی دەزانێت کە فەرمانڕەواش پرەنسیپی عەدالەت و ئینساف بەپێی یاسای سروشتی یان یاسای مۆراڵی خواوەند جێبەجێ بکات. بەڵام گومانێکی جیدی لەو بارەیەوە هەیە کە هۆبز بۆ پاساودانی ئەرک لە بارودۆخی سروشتیداو بەردەوامیەتی لە بارودۆخی وەک فەرمانێکی خواوەندی پشتی بەیاسای سروشت بەستبێت. جیا لەوەی ئاتە ئیزم بەهۆبز نیسبەت دراوە، بەڵام ئەگەر هۆبز وەها بۆچوونێکی هەبوایە دەبوایە بەتووندی لەلایەنی خواپەرستەکانی سەردەمی خۆی ستایش کراباو پێیدا هەڵگوترا؛ نەک ئەوەی کە بەتوندی بکەوێتە بەر نەفرەتی ئەوان.

بریابا باری بۆچوونی وارندو تایلۆر لەمەڕ تیۆری ئەرکی هۆبزو پشت بەستنی بەیاسای سروشتی وەک فەرمانی خواوەند ڕەت دەکاتەوەو لەسەر بنەمای لویتان ڕاڤەیەکی دیکە لە ئەو بەدەست دەدات کە لە جێگەی خۆی سەرنج ڕاکێشە. باریش لەسەر ئەو باوەرەیە کە ئەرک لە بارودۆخی سروشتیدا هەیە بەڵام بەشێوەیەکی جیاواز لە وارندو تایلور پاساوی دەدات. ئەو دوای پێناسەکردنی ئەرک لە لویتانی هۆبز و ئەوەی کە هۆبز ئەرکی بەملکەچی مافێک یان گواستنەوەی مافێک بۆ ئەوی دیکە وەسف کردووە، وەها بەڵگەخوازی دەکات کە ئەرک بەو شێوازەی کە هۆبز پێناسەی کردووە لە بارودۆخی سروشتیشدا هەیە واتە لە هەلومەرجێکدا تاک لەوانەیە تەنانەت لە ماوەیەکدا کە دەسەڵاتێکی هاوبەش لە سەرووی هەموویان نییە لە ئەنجامی ملکەچ بوون یان گواستنەوەی مافی خۆی ئەرکێک بەئەستۆ دەگرێت. لەو حاڵەدا حەقیقەتی ئیرادەی تاکیش دەردەکەوێت و قەبووڵ کردنی وەها ئەرکێکیش بەشێوەی سەپێنراو نییە. کاتێک کە دەڵێین کەسێک ئەرکی لەسەر شانە بەو مانایە کە مافێکی لە خۆی ئەستاندۆتەوە بەواتایەکی دیکە

بەشێک لە مافی خۆی بەنیسبەت شتەکان واز لێ هێناوەو یان ئەوەی کە ئەوانی بۆ کەسێکی دیکە گواستۆتەوە. گواستنەوەی بەرامبەری ماف بەپەیمان دەناسرێت.

ئایا لە بارودۆخی سروشتی واتە لە هەلومەرجێکدا کە دەسەڵاتێکی هاوبەش لەسەرووی لایەنەکانی پەیماندا نییە دەتواندرێت ئەرک بێتەبوون؟ هەڵبەت ئەو پرسیارە نابێت بەو شێوەیە بگەیەندرێت کە ئایا ئەوانە کە بەڵێنیان داوە ئەرکیان لەسەر شانە یان نا.

پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا هیچ شێوەیەک لە ستاندنەوە یان گواستنەوەی ماف دەتوانێت لە بارودۆخی سروشتیدا ئەرک دروست بکات؟ ئەو پرسیارە بەو هۆیەوە دەخرێتەڕوو کە لە حاڵەدا پەیمان تەنیا بەشێوەی مەرجدارکارایی دەبێت. ئێوە کاتێک لە ئەنجام دانی بەڵێنی خۆتان سوودمەند دەبن کەلایەنی بەرامبەریش بەڵێنی خۆی بەجێ بگەیەنێت بەڵام ئەگەر گومانێکی مەعقوول هەبێت کە لایەنی بەرامبەر بەڵێنی خۆی ئەنجام بدات ئێوەش لە جێبەجێکردنی بەشی خۆتان، خۆ دەبوێرن ئەگەر وابێت پرسی کەسێلی لێرەدا باوەڕ بوونە. لە هەلومەرجێکی وا کە دەسەڵاتێکی هاوبەش لەسەر لایەنەکانی پەیمان نییە هەرچەندە ڕەگەزی باوەڕبوون لە پەیماندا زیاتر بێتە بەرچاو ئیمکانی ئەوەی کە یەکێ ئەرک پێک بهێنێت کەمترە، بەو حاڵەش هۆیز دەڵێت تەنانەت لە بەشێکدا کە لایەنێک دەبێت بەڵێنی خۆی ئەنجام بدات و لایەنەکەی دیکە لە

قۆناغی دواییدا بەڵێنەکەی جێبەجێ بکات دیسانیش لایەنی دووەم ئەرکی سەرشانێتی و دەبێ بەڵێنی خۆی ئەنجام بدات، بەڵام هێشتاش دەبێ وەڵامی پرسیارێک بدرێتەوە: ئەگەر ئێوە یەکەم جار بەڵێنی خۆتان ئەنجام بدەن چ گرێنتییەک هەیە کە لایەنی بەرامبەریش بەڵێنی خۆی ئەنجام بدات؟

پێش وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارە دەبێ خاڵێک وەبیر بهێنینەوە بەڵێن دان بەگوێڕایەڵی کردن لە فەرمان و یاساکان خۆی شێوەیەکی تایبەت لە ئەرکی وەفاکردن بەبەڵێنە.

فەرمانڕەوا بەفەرمانەکانی خۆی بەڵێن گەلێ نوێ دەئەفرێنێت، بەڵام ئەو بەڵێن گەلە جۆرێکی (هەموو قسەکان لەسەر جۆرە) نوێ لە ئەرک نییە. کاتێک کە ئەمن بەڵێنم دا ڕۆژێک بەفەرمانی خاوەن کارێک بۆ ئەو کار بکەم ئەگەر ئەو فەرمانی بەئەمن کرد کە بۆنموونە باخچەکەی بۆڕیکوپێک بکەم ئەو ئەرکە نوێیە جۆرێکی تازە لە ئەرک نییە بەڵکوو درێژەی هەمان بەرپرسیاریەتیی ئەرکەکەی پێشوویە، ئەرک هەر بەو جۆرەی کە گوترا بەبۆچوونی هۆبز دانی مافێکەو ئەرکی گوێڕایەڵی کردن لە فەرماندا ئەنجامی گواستنەوەی مافی سروشتی تاک بۆ فەرمانڕەوایە. تاک تەواوەتی ئەو شتەی کە دەتوانرێت بەپەیمانێک بەدەستەوەی بدات (لێرەدا جیا لەبەرگریکردن لەگیان) دەیدات بەفەرمانی ڕەوا هەتا ئەو لە بەکارهێنانی مافی سروشتی خۆی

بەسەر کاروباردا بەربەستی کەمتری لەسەر ڕێگەدا هەبێت. مەبەست لەوکارە سەقامگیری ئاشتی و هێمنییە. تەنانەت ئەگەر فەرمان ڕەوا زاڵم و ستەمکاربێت دیسانەکە بارودۆخی مەدەنی باشترە لە بارودۆخی سروشتی و لەلایەکی دیکە داواکردنی هەرگرێنتییەک لە فەرمانڕەوا کە پێش لە دەست درێژی کردنی ئەو بگرێت لەواقیعدا بانگەشەکردن بۆ گەڕانەوەیە بۆ بارودۆخی سروشتی.

ئێستا بەو پرسیارەی سەرەوە دەگەین کە بۆچی پەیمانی گواستنەوەی مافی سروشتی بۆ فەرمانڕەوا لەلایەن بەڵێنی دەرانەوە بۆ ئەوان ئەرک پێکدەهێنێت بەواتایەکی دیکە چۆن پرسی باوەڕبوونەکە نەبوونەکەی ئەرک لێ دەسێنێتەوە چارەسەر دەکرێت؟ وەڵام ئەوەیە کە فەرمانڕەوا بەشێوەیەک دەجوڵێتەوە کە بیانگەیەک بۆ جێبەجێ نەکردنی بەڵێن لەلایەن، لایەنەکانی پەیمان (کە ئەگەری هەیە لە نەبوونی دەسەڵاتێکی هاوبەشدا) لە ئارادا نامێنێت. هەنووکە دەسەڵاتێکی سەقامگرتوو دامەزراوە کە پێشێل کەرانی پەیمان بەسەزا دەگەیەنێت و گومانێکی مەعقوول بوونی نییە کاتێک کەلایەنی یەکەم بەڵێنی خۆی ئەنجام دەدات ئەوانی دیکە لە ئەنجام دانی بەڵێنی خۆیان، خۆببوێرن و هەڕەشە لە ئەو بکەن.

مایکل ئۆکشات خوێندنەوەیەکی جیاوازی لە هۆبز بەدەستەوەداوە کە ئەو لە ڕۆسۆ نزیکی دەکاتەوە بەو حاڵەش لە لێکدانەوەی ئۆکشاتیشدا تیۆری

ئەرکی هۆبز وەک تیۆریکی مۆراڵی خوێندنەوەی بۆکراوە. بەواتایەکی دیکە لە لێکدانەوەی ئۆکشاتیشدا تیۆری هۆبز بەپلەی یەکەم تیۆریەکە لە بارەی ئەرکی مۆراڵی نەک تیۆریەک لە بارەی هۆشیاری. بەپێی بەڵگەخوازی ئۆکشات هۆبز ئەرکی مۆراڵی بەفەرمانی دەسەڵاتدار پێناسەکردووە. هۆی پێکهاتنی دەسەڵاتی فەرمان رەواش ترسی سروشتی مرۆڤ لە مردنەو یاسای سروشتی مرۆڤەکانی ناچار کردووە کە فەرمانڕەوایەک دابنێن. ئەرک لە بارودۆخی سروشتیدا ئەرکی مۆراڵی نییە، بەڵام دامەزراندنی فەرمانڕەوا دەبێتە ئەرکی مۆراڵی. ئۆکشات دەڵێت کە تەواوی ئەرکە مۆراڵییەکان لە یاسا وەردەگیرێت و لە جێگەیەک کە یاسا نییە ئەرکێکیش بوونی نییە. یاسا دانەریش کەسێکە کە رەوابوون و مەرجەعیەتی گوێڕایەڵی کردن لەخۆی بەدەست بهێنێت. پێکهێنانی ئەو مەرجەعیەتەش کردەیەکی دەستکردە. بەواتایەکی دیکە هیچ جۆرە مەرجەعیەتێک و ئۆتۆریتەیەکی سروشتی بوونی نییە. ئۆتۆریتەی یاسایی یان مەرجەعیەتی هەمان تاکە (یان کۆیەک لە تاکەکان) کە خەڵک دەسەڵاتی ئەویان بەرەسمیەت ناسیوەو لە بەرامبەر ئەودا ئەرکیان لەسەر شانە. کۆمەڵگای سیاسی یان شار بارودۆخێکی ساختەییە لە پێگەی مرۆڤدا لە بارودۆخی ساختەییدا یاساگەلێک هەنە کە یاسادانەر بە هۆی بەدەست هێنانی ئۆتۆریتەو پێگەی مەرجەعیەت. دایناون. یاسای کۆمەڵگای سیاسی یان شار (Ciritas). ئەرک دانەرە. بەڵام ئەو ئەرکە رەنگدانەوەی هیچ یاسایەکی سروشتی دیکە نییە. ئەوەی کە بۆچی ئەمن ئەخلاقەن پێویستە گوێڕایەڵی لە دەسەڵاتدار بکەم ئەوەیە کە هاوڕێ لەگەڵ کەسانی دیکەو بەکردەی یەکسان و مافی بەرابەر بەڕێوەبردنی وەها کارێکم بەئەوداوە، بەو شێوەیەو بەبۆچوونی ئۆکشات هۆبز تیۆریەکی بێ پێشینەی لە بارەی چاوگی مۆراڵی هێناوە بەو واتایەکە ئیرادەی تاکەکان سەرچاوەی ئیرادەی فەرمانڕەواو چاوگی یاساکانە. بۆیە ئیرادەی فەرمانڕەوا هێنانەبوونی دروست یان نادروست، حەقیقەت یان هەڵەیە. و بەو شێوەیە هۆبز بەو لێکدانەوەیە پێشڕەوی رۆسۆیە، چونکە بەو جۆرەی کە پاشان دەیبینین رۆسۆ لە «ئیرادەی گشتی»دا کۆمەڵەی مەدەنی بەپێوەری حەقیقەت دەژمێردرێت و لەسەر ئەو باوەڕەیە کە پێش لە دروست بوونی کۆمەڵگای سیاسی مرۆڤەکان لەسەروی مۆراڵ (یان مۆراڵیان نییە) ئیرادی و لێکدانەوەی ئۆکشات ئەوەیە کە یاساکان و مافی سروشتی بەشێوەیەکی گشتی لەبەرچاو ناگرێت، لە خاڵێکدا کە هۆبز روونی دەکاتەوە کە حقووقی سروشتی لەسەر بنەمای ئیرادەی فراوان و بێ سنور نییە و یاسای سروشتی دەتوانێت حقووقی سروشتی سنووردار بکات. زۆربەی شتەکان تەنانەت لە بارودۆخی سروشتدا لەلایەن یاسا سروشتیەکانەوە یاساغ کراوە.

**ئایا بوونیادی کۆمەڵگای سیاسی عەقڵانییە، یان مۆراڵی؟**

دوای ئەوەی کە بەتێروتەسەلی لەسەر لێکدانەوەو خوێندنەوە جۆراوجۆرەکان لەتیۆری ئەرکی هۆبز دواین دواجار دەبێ وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، ئایا لە تیۆری هۆبزدا بونیادی کۆمەڵگای سیاسی عەقڵانیەیان مۆراڵی؟ بەدەربڕینێکی دیکە ئایا تیۆری هۆبز، تیۆرییەکە لە بارەی عەقڵ یان تیۆریەکە لە بارەی مۆراڵ؟ ئایا هۆبز زانای زانستی مۆراڵە یان دامەزرێنەری شرۆڤەکردنی ئەزموونی کۆمەڵگا؟ بەبۆچوونی نووسەر لە نێوان ئەو دوو تێڕوانینە لە تیۆری هۆبزدا درزی پڕ نەبۆوە بوونی نییە. بەواتایەکی دیکە دەتواندرێت ئەو لایەنە لە تیۆری هۆبز لەگەڵ یەکدی بەگونجاو داندرێ و ئیدعا بکرێت کە هۆبز لە نێوان لایەنی عەقڵ و بەرژەوەندی ومافی یان بەواتایەکی دیکە لە نێوان لایەنی عەقڵانی و مۆراڵیدا بەشێوەیەکی ورد پەیوەندی بەرقەرار کردووە. بەو پێیە دەتواندرێت بگوترێ کە مرۆڤەکان هەم بەهۆی عەقڵ و بەدوای ئەودا بەهۆی ئەو بەرژەوەندییەی کە بیریان لێکردۆتەوەو دواجار لەسەر بناغەی ئەرکێک کە بەهۆزی گواستنەوەی مافی پارێزگاریکردن لە نەفس لەئەستۆیان گرتووە (کە ئەو کارەش، کارێکی مۆراڵییە) بەردو دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی (دانانی فەرمان ردواو گوێڕایەڵی کردن لە ئەو)

هەنگاویان هەڵێناوە.

بەبۆچوونی نووسەر هەر کام لەو تەفسیرو راڤانە رەگەز گەل و لایەنە جۆراجۆرەکانیان لە بیروکەی هۆبز لەخۆوەگرتووەو ئەویان بەزەرەرمەند بوونی لایەن و رەگەزەکانی دیکە گەورەکردووە. ئەوەیە کە ئاراستەی هەندێک لە تەفسیرەکانی هۆبزیان بۆ لای قوتابخانەی سودگەرایی و گروپێکی دیکەیان بۆ لای بۆچوونەکانی رۆسۆو تاقمێکی دیکەشیان بۆ لای مۆراڵی کانت نیشان داوە. دەستەیەکی دیکە لە تەفسیرەکانیش تیۆری هۆبزیان نەگونجاو لەگەڵ یەکدی وەسف کردەوەو بۆ شیکردنەوەی ئەو بۆ دنیای دەرەوە، یان بۆ قەڵەمرەوی دەرەوەی لۆژیک گەڕاونەتەوە. «یەکێک لەوانەش مەکفرسۆنە کە هەوڵی داوە تیۆری هۆبز لەگەڵ پێویستی کۆمەڵگای بازاڕو سەرمایەداری لە حاڵی گەشەدا شی بکاتەوە.

پێش لە هەموو شتێک دەبێ بڵێین کە بەبۆچوونی ئێمە تێپەڕین لە فیزیۆلۆژی و دەروونناسی هۆبز بۆ تیۆری سیاسی هۆبز دژوارە و لەو زەمینەیەدا ناتواندرێت زۆر پشت بەپەیوەندی داریەتی فەلسەفەو سیاسی و مۆراڵی هۆبز لەگەڵ فەلسەفەی گشتی ئەو لە بارەی جووڵە ببەسترێت بەتایبەت کە رەتبوونی لە داتاکانی ئەزموونی لە بارەی فیزیۆلۆژی و دەروون ناسی تاک بۆ فەرمانە فۆرمیەکان لە بارەی ئەوەی کە مرۆڤ دەبێ ئەنجامی بدات (پێکهێنانی پەیوەندی لە نێوان ناچاربوون و ئەرکدا) دژواری زۆری هەیە. بەتایبەت سەرنج دان بەو بابەتە زۆر گرنگە کە هۆبز لە نووسینەکانی خۆیدا چەندەها جاری ئاماژەی بەحقووقی سروشتی و یاسای سروشتی داوە.

بەو حاڵەش گومان لەوەدا نییە کە هۆبز حقووقی سروشتی بەچەمکێکی نوێ بەکارهێناو حقووقی سروشتی مۆدێرنی بوونیادنا کە لە جێگەی پشت بەستن بەئامانجی کۆتایی (Telos) پشت بەئارەزوو گەلی مرۆڤ بەتایبەت بەهێزترین حەزی ئەو واتە حەزکردن بەپارێزگارکردن لە نەفس دەبەستێت.

هۆبز لەسەر ئەو باوەڕەبوو کە یاسای سروشتی کاریگەری نابێت ئەگەر پرەنسیپەکانی بەپێی ئارەزووەکان نەبێت. دەبێت یاسای سروشتی لە بەهێزترین ئارەزووەکان دەربهێندرێت کە ئەو ئارەزوویە بریتییە لە ئارەزووی پارێزگاریکردن لە نەفس. لە بارودۆخی سروشتیدا مافێکی بنەڕەتی هەیە کە هەموویان لە بارەی ئەو رێککەوتوون و ئەویش ئەوەیە کە ئەوانی دیکەش وەک ئەوان مافی خۆیانە لە بەرامبەر دەستدرێژی کردندا بەرگری لەگیانی خۆیان بکەن. بەڵام لەبەرئەوەی کە لە شێوەی کەڵک وەرگرتن لەو مافە هەرکەسە بەدادوەری خۆی بەئەژمار دێت بۆیە ناتواندرێت لە سەرهەڵدانی جیاوازی و پەرەسەندنی ناسەقامگیری دووربێت. تەنیا باوەڕی هاوبەش لە ناو مرۆڤەکاندا خوازراو بوونی پارێزگاری کردن لە نەفسە. دەتواندرێت عەقیدەی تاک لەهەر بارەیەکەوە کە مومکین بێت بگۆڕدرێت بەڵام هیچ کات ناتواندرێت قەناعەت بەکەسێک بهێندرێت کە خۆی بکوژێت. بۆیە مافی پارێزگاری کردن لە نەفس بۆ هەمویان شتێکی بەدیهییە هۆبز کە دەیهەوێت فەلسەفەی خۆی وەک ماتماتیک لەسەر پرەنسیپی بەدیهی دابنێت لەو بابەتە بەدیهییەوە دەستی پێکرد و پێش گریمانەی خۆی لەسەر ئەو دانا. دەتواندرێت بەو شێوەیە درێژە بە بەڵگەخوازەکە بدرێت: سەرەڕای ئەوەی کە مافی پارێزگاری کردن لە نەفس شتێکی سروشتییە بەڵام لە بارەی ئەوەی کە ئەو مافە لە کوێوە دەست پێ دەکات و لە کوێ کۆتایی پێدێت هیچ بۆچوونێکی هاوبەش نییە.

وەها هەڵومەرجێک بارودۆخی شەڕ پێکدەهێنێت، و لەبەرئەوەی کە بارودۆخی شەڕ بۆ پارێزگاری کردن لە نەفس سەرەکی ترین مەترسییە هەموو کەس بۆ دەربازبوون لەو هەڵومەرجە دەبێ هەوڵ بدات.

بەو شێوەیە دەتواندرێت لە بارەی ئەولانی کەمە واتە ئارەزوو هاوکات لەگەڵ مافی پارێزگاریکردن لە نەفس وەک بناغەی هەوڵدان بۆ ئاشتی رێککەوتن هەبێت. بەڵام ئەوەی کە چۆن هۆبز لە ئارەزووگەل و رەغبەتەکان بۆ هەوڵدان بۆ بەشی ئاشتی پەیوەندی دروستکرد؟ بابەتێکی دیکەی جێگەی گفتوگۆیەو لەو بابەتانەیە کە لەبارەی ئەوان دەیان کتێب نووسراوە. پرسیار ئەوەیە کە بۆچی لە بارودۆخی سروشتیدا، تاک دەبێت بۆ ئاشتی هەوڵ بدات؟ بۆچی نابێت زیاتر لە

بەشی خۆی داوا بکات؟ وڵامێک بۆ ئەو پرسیارە ئەوەیە کە هەرکەسێ لە بارودۆخی سروشتیدایە، یان دەبێ بۆ پارێزگاریکردن لە نەفس هەوڵ بدات یان شتێکی زیاتر لە نەو، بۆنموونە پێشکەوتن و خۆ باشترکردن لە کەسانی دیکە. لە دەرەوەی ئەو دوانە هیچ شتێک مومکین نییە، چونکە بەواتای زیندوو نەمانە.

بەڵام هەوڵدانی مرۆڤ بۆ پارێزگاریکردن لە نەفس کردەیەکی باش و پاداش دارەو زیاتر لە ئەوە باش نییەو خێری تێدا نییە، لەلایەکی دیکە دەتواندرێت بگوترێ کە هەوڵدان بۆ پارێزگاریکردن لەنەفس هەوڵ دانە بۆ ئاشتی و زیاتر لە ئەوە هەوڵدانە بۆ راگەیاندنی شەڕ، بۆیە هەوڵدان بۆ ئاشتی کارێکی «عەقڵانی»یەو هەوڵدان بۆ ئاشتی بەوپێیەی عەقڵانییە ئەرکێکە کاری عەقڵانیش کارێکە کە لەناوخۆیدا جیاوازی لۆژیکی نییەو هەر بۆیە پێک گونجاوە.

بەو شێوەیە هەوڵدان بۆ ئاشتی و لەگەڵ رەفتاری عەقڵانی و خۆپارێزەرانە (لەسەر بنەمای عەقڵ) بەیەکسان دانراوە. لە هەمان حاڵدا ماف لە دەسەڵات و هێز شێوەگرتوو نەبووە. چونکە لەنێوان بیاڤی ئارەزووەکان و ئەرکدا هێڵێک کێشراوە بەڵام هێشتاش پرسیارێکی دیکە ماوەکە دەبێ وڵام بدرێتەوە. بۆچی رەفتارێکی عەقڵانی واتە رەفتارێک کە لە ناوەکی خۆیدا خۆ گونجێن بێت دژایەتی لۆژیکی تێدا نەبێت بەرەفتارێکی ئەرک پێکراو دەژمێردرێت؟ یاسای سروشتی لە تیۆری هۆبزدا لەسەر بنەمای عەقڵە نەک ئەرک، ئەگەر یاسای سروشتی لەسەر ئەرک دابنێین ئایا ناچار نابین بۆ تیۆری وارند و تایلۆر بگەرێینەوەو بۆ بەدواداگەرانی بناغەی ئەرک بۆ یاساو یاسادانەر و لەوێشەوە بۆ خواوەند وەک یاسادانەری یاسای سروشت بگەرێینەوە؟

بەو جۆرەی کە ئاماژەمان پێدا لەتیۆری هۆبزدا ئەرکەکان لە یاساوە سەرچاوە دەگرن و یاسا فەرمانی کەسێکە کە دەسەڵاتی دەرکردنی وەها فەرمانێکی هەیە. ئێستاکە تیۆری وارندو تایلۆر مان رەت کردەوە دەبێت چ کەسێک وەک کەسێکی کە دەسەڵاتی فەرمان دەرکردن و دانانی یاسای هەیە لەبەر چاوبگرین؟ ئایا دەتوانین لەگەڵ نۆکشات هاورابین و لە جێگەی تەفسیری کانت لە هۆبز واتە بەو مانایە دەرهێنانی ئەرک لە رەفتاری عەقڵانی واتە رەفتارێک کە لە ناوەکی خۆیدا دژایەتی لۆژیکی تێدا نییە (وەک ئەمری رەهای کانت) بگەرێینەوە سەر تەفسیری رۆسۆ لە هۆبزو بڵێین کە یاسا فەرمانی دەسەڵاتدارێکە کە لە کۆمەڵگای سیاسی یانی لە بارودۆخێکی ساختەدا خاوەن رەوابوونی دەرکردنی فەرمانە لەبەرابەر وەها تێگەیشتنێک لە ئەرک هێشتاش ئەو پرسیارە گرنگە دەخرێتەروو کە ئەگەر لەپێش پێکهاتنی کۆمەڵگای سیاسی (دامەزراندنی فەرمان رەواو یاسا) ئەرکێک بوونی نییە چۆن تاک گەلێک کە لە یەکدی دڵنیا نینە پەیمان دەبەستن و هەروەها بەو پەیمانەی خۆیان وەفادار دەمێننەوە؟ هۆبز لەبەشی پازدەمی لویتان لەلایەن (دەبەنگێک)ەوە ئەو شێوانەی خستۆتەروو کە بۆچی تاک لەبەر خاتری بەرژەوەندییەکانی پەیمان نەبەستێت و پاشانیش بەپێی بەرژەوەندی پێشێلی نەکات؟

لەپێکهاتنی کۆمەڵگای سیاسی یان بارودۆخی ساختە دەبێ جۆرێک لە ئەرک هەبێت کە مرۆڤەکان بەبەڵێنی خۆیان وەفادار بن و لە ئەنجامدا توانای بەستنی پەیمانیان هەبێت، هۆبز باوەڕی بەوەها ئەرکێک هەبوو ئەو ئەرکە لەسەر بنەمای یاسای سروشتییەو یاسای سروشتیش بەنۆبەی خۆی «ناچاری عەقڵ» و «خوازیاری عەقڵ»ە (نەک فەرمانی خواوەند) بەڵام بۆ ئەو پرسیارە کە ئەرکی مۆراڵی دەبێت لە یاسا یانی فەرمانی فەرمانی رەوا سەرچاوە بگرێت وڵام ئەوەیە کە هۆبز لە نێوان دوو ئەرک دا قایل بەجیاکاری بووە. جۆرێک لە ئەرکی بەئەرکی In foro interno (بەهێزی دەروونی) ناسیوە. مرۆڤ ئەرک پێکراوە بەهێزی دەروونی» گوێڕایەڵی لە یاسای سروشت بکات ئەوان ئەگەر بۆ خۆیان بەباش بزانن ئامادەنە کە پەیڕەوی لە یاسای سروشت بکەن، بەڵام ئارەزووی مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە بەتێبینی پەیوەندیدار بە سەلامەتی و ئەمنییەتەکەی کەم دەبێتەوە. ئەگەرچی هەموو کەس دەتوانێت لەوپەرەنسیپانەی کە ژیان بەسەربردن لە ئاشتی و هێمنیدا

پێویستە تێ بگات، بەڵام پەیڕەوی کردنی یەک لایەنە لەو مومکینە بەدژنی ئەمنیەت بێت. تاکێک دەبێ بەپێی لێکدانەوەی عەقلانی بڕیار بدات کە ئایا لەبەرژەوەندی و پێویستی ئەمنیەتی ئەو دا هەیە کە بەپێی یاسای سروشت هەڵسوکەوت بکات؟ لەکاتێکدا هەر دەم هۆیەکی نەبێت کە گریمانە بکات ئەوی دیکەش وەها دەکات لەو حاڵەدا خۆی دەخاتە بەر مەترسییەوە. بۆیە بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتە دەبێ پەنا بۆ پەیمان ببردرێت. بەڵام خەڵکانێک کە لەیەکدی دڵنیانینە ناتوانن بێنە ناو پەیمانێک کە پێویستی بەئەوە دەکات بەڵێنەکە ئێستا ئەنجام بدەن کە سوودەکەی لە داهاتوودا لەلایەنی بەرابەرەوە پێیان دەگات، چونکە وەها پەیمانێک لەوانەیە لایەنی بەرامبەر بۆ خۆ بواردن لە ئەنجامدانی بەڵێنەکە هان بدات. «گریمانەی ئەوە بکەن کە کەسێک لەگەڵ دیلێک پەیمان دەبەستێت کە دیلەکە دوای ئازادبوونی بڕێک پارە بەو کەسە بدات، لێرەدا ئەو پرسە هەیە کە ئەگەر کەسی یەکەم بەڵێنەکەی خۆی ئەنجام بدات (دیلەکە ئازاد بکات) چ گرێنتیەک هەیە کەدیلەکە بەڵێنی خۆی بەئەنجام بگەیەنێت؟ (کە ئەو برە پارەی لەسەری پێکهاتبوون بیدات). بۆیە پەیمان دەبێ بەشێوەیەک بێت کە هەردووک بەڵێنەکە هاوکات جێبەجێ بکرێن. هۆبز دەڵێت پەیمان گەلێک کە لە بارودۆخی سروشتیدا هاوکات نیمکانی ئەنجامدانی ئەوان نییە لە بارودۆخی مەدەنیدا وەها نیمکانێک بۆ ئەوان پێکدێت. ئامادە بێن دەسەڵاتدارێک کە هێزی ناچارکردنی کەسانی دیکەی بۆ جێبەجێ کردنی پەیمانەکە هەیە؛ بوونی فەرمانڕەوایەک بیانگەی خۆبواردن لە پەیمان لەناو دەبات. بۆیە فەرمانڕەوا ئەرک «بەهێزی دەروونی» لەگەڵ ئەرک بەهێزی دەرەکی پەرەپێدەدات. بەڵام لێرەدا پرسێکی نوێ دەخرێتەڕوو. وا دیارە ئەو بەڵگە خوازیە پێویستیەتی سوڕان و زنجیرەیە (بەدوای یەک داهاتن)، ئەگەر ئامادەیی فەرمان ڕەوا یاسایەکان ناچار بەجێبەجێ کردن دەکات و یەکێک لەمەرجەکانی ئەو یاسایە ئەوەیە کە مرۆڤەکان وەفادار بن بە بەڵێنەکانیان و لەلایەکی دیکە فەرمان ڕەوا خۆی ئەنجامی پەیمانە بۆیە کاریگەر بوونی فەرمانڕەوا مەرجی بوونی ئەرکێکە کە خۆی دەبێت ئەنجامەکەی بێت. لەو حاڵەدا لە نێوان ناچاربوون (بەواتای ناچاربوون بەئەنجام دانی کردەیەکی تایبەتی بەهۆی فەرمانڕەوایەکی کارتێکەرەوە)و لە ئەستۆگرتنی ئەرکدا چ جیا کاریەک هەیە؟ ئایا ئەرک پێدراوبوون هەمان ناچاربوون نییە، ناچاربوون سیمایەکی مۆڕاڵی نییە لە حاڵێک دا ئەرک سیمای مۆڕاڵی هەیە. ولام ئەوەیە کە ئەرک لەروانگەی هۆبز دان وگواستنەوەی مافە. هەر بۆیە کاتێک مرۆڤ مافێکی لە بارودۆخی سروشتیدا هەیەتی لەمیانەی پەیمانێکدا دەیگوازێتەوە بۆ فەرمانڕەوا ئەرکێکی مۆڕاڵی لە ئەستۆگرتووە بەو شێوەیە لێرەدا لە نێوان ئەرکی مۆڕاڵی **واتە** دانی مافێک و کردەیەک کە **پارێزگاری** کردنی خودی (کردەی عەقلانی) هاوجووتیەک هەیە.

هەر بۆیە هۆبز سێ هۆی بۆ گوێڕایەڵی کردن لە فەرمانی دەسەڵاتدار هێناوە:

١- ئەرکی سەرشانی تاکە گوێڕایەڵی لە فەرمانەکانی فەرمانڕەوا بکات چونکە لەمیانەی پەیماندا وەها بەڵێنیەکی داوە (٢) فەرمانڕەوا نوێنەری کەسەکەیەو تاک ئەو دەسەڵاتەی بە ئەو داوەو کردەی فەرمانڕەوا وەک کردەی خۆی وایە. تاک ناتوانێت سکاڵا بکات کە کردەوەی فەرمانڕەوا ئازار بەئەو دەگەیەنێت یان مافی ئەو پێشێل دەکات (٣) عەقڵ کە خێر بە کەسەکە نیشان دەدات بەو دەڵێت کە یەکەم بێتە ناو پەیمانی دامەزراندنی فەرمانڕەواو دووەم ئەوەی کە بەبەڵێنەکەی خۆی وەفادار بمێنێتەوە، ئەو سێیە پەیوەندیان لەگەڵ یەکدی هەیە، گشتیەتێکی یەکگرتوو دروست دەکەن، ئەرکی پێوەلکاو بەخاڵی دووەم و خاڵی دووەم ئەنجامی خاڵی یەکەم و خاڵی سێیەم جەخت ردنە لەسەر بەرژەوەندی تاک لە ئەستۆگرتنی ئەرک بەو تێروتەسەلیە دەتواندرێت ئەرکی مۆڕاڵی لەگەڵ کردەی عەقلانی هۆبزدا گونجاو بن.

هۆبز لەهەر حاڵەتێکدا عەقڵ بەلانی کەمێک دادەنێت کە بیروباوەڕو **پرەنسیپی** مۆڕاڵی دەبێت لەسەر ئەو بونیاد بنرێن. یاسای سروشتی لەلایەک **یاسای عەقڵە** بەسەرنج دان بەئەوەی کە **هەرکەسێک** خۆشی لە هەرشتێک بێت بە «**باش**»و **خۆشی** لەهەر شتێک

نەیەت بەخەراپی دادەنێت، بۆیە لێرەدا تەنیا عەقڵی تەندروستەکە دەتوانێت ئاشتی و هێمنی دیاری بکات. بەو جۆرەی کە دیترا ئەرک هەر لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. هۆبز پێی وابوو کە فەلسەفەی مۆراڵی دواجار پشت بەعەقڵ دەبەستێت، سەقامگیرکردنی ئاشتی و بارودۆخی مەدەنی پشت بەئامانج گەلی درێژخایەنی پاکیەتی خود دەبەستێت. عەقڵ تواناییەکە کە تاک بەسیستەمێکی مۆراڵی دەردەوە دەلکێنێت لەتیۆری هۆبزدا پارێزگاری کردنی خود ئامانجێکە کەنەلۆژیکییەو نەنالۆژیکی، بەڵام هیووم دواتر گوتی کە عەقڵ شتێک جیا لە کۆیلەی شەهەوت نییە و بەو شێوەیە فەلسەفەی هۆبزی بۆ لای قوتابخانەی سودگەرایی گەڕاندەوە. بەو شێوەیە هیووم بەتەواوەتی عەقڵی خستە خزمەت ئارەزوو نەفرەت کردن بەو شێوەیە بوو کە هیووم تووشی شەکاکیەتێک (گوماتن کردن) بوو کانت بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو هەوڵیدا بەتەواوەتی مۆراڵ لە ئارەزوو نەفرەت بپچڕێنێت. کانت بۆ ئەو کارە ناچاربوو مۆراڵ لە پەیوەندی بەسروشتەوە رزگار بکات و بەعەقڵی کردەکییەوە بلکێنێت.

بەو شێوەیە هیوم بەجەخت کردنەوە لەسەر ئارەزووەکان لەلایەک و کانت بەپچڕاندنی مۆراڵ لە ئارەزووەکان و پشت بەستنی ئەو بەعەقڵ لەلایەکی دیکە هەرکامیان بەشێوەیەک نزیکایەتیان لەگەڵ بۆچوونی هۆبز هەیە.

تیۆری ئەرکی هۆبز بەهەمان شێوە لەگەڵ پێوەری ئیرادەی گشتی رۆسۆش خاڵی هاوبەش گرنگی هەیە. هەر بەو جۆرەی کە زانیمان هۆبز گرنگترین مەرجی ئەرکی سیاسی بە سەقامگیری فەرمانڕەواو سەرهەڵدانی دەسەڵاتێکی هاوبەش دەزانێت بەو روونکردنەوەیەی کە هێنامان تەنانەت ئەگەر ئەرک بەشێوەیەکی ناتەواو لە بارودۆخی سروشتیدا بوونی هەبێت. کاتێک بەچەمکێکی کامڵ دەبێت بەئەرک کە کۆمەڵگای سیاسی پێکبێت هەتا گرەنتی جێبەجێکردنی بەڵێن و پەیمان بەهۆی لایەنەکانی پەیمان بدات. بەو پێیە لە ئاراستەیەکەوە ئەرکی سیاسی پەیوەندی بەپێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسییەوە هەیە. لێرەدا کە تیۆری ئیرادەی گشتی رۆسۆ سیمای هاوبەشی زۆر لەگەڵ تیۆری هۆبز پەیدا دەکات. هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کە یەکێک لە توێژەرەوان بەو جۆرە بۆچوونی خۆی دەردەبڕێت کە لە پێشەکی ئۆکشات بۆ لویتان رەنگدانەوەی لێکۆڵینەوەی تایلۆری پێوەدیارە. چونکە بۆ یەکەم جار تایلۆر بوو کە هێمای بەبەهای تیۆری مۆراڵی هۆبز بەجیا لە دەروون ناسیەکەی ئەو کرد. ئۆکشات لە پێشەکی نووسین بۆ لویتان تیۆری مۆراڵی هۆبز لە دەروون ناسیەکەی جیادەکاتەوەو پەیدابوونی ئەرک لەسەر بنەمای پەیدابوونی کۆمەڵگای سیاسی دادەنێت. رۆسۆش ئیرادەی گشتی بەچاوگی هەر ئەرکێکی سیاسی و بەهایەکی مۆراڵی ئەژماردووە. بەو حاڵەتەش ئەوە پێشەکی ئۆکشات بۆ لویتان بوو کە زیاتر لە هەموویان روانگەی رەخنەگرانی بۆ ئاراستەیەکی هزری نوێ بۆ لای هۆبز راکێشا، دوای ئەوەبوو کە زۆربەی زانایان بەقەناعەت گەیشتن کە راڤەکردنی هۆبز تەنیا لەسەر بنچینەی عەقڵ و بەرژەوەندی تایبەتی و بونیادی دەروون ناسیانە بەس نییە. پێش ئەوە ئەو ئاراستە هزریە باوە بۆ تیۆری ئەرکی هۆبز خوێندنەوەی ئەو لەسەر بنەمای بنچینەی عەقڵ بوو.

سەرەڕای ئەوە دەبێ ئاگامان لە جیاوازیەکی گرنگ لە نێوان تیۆری هۆبزو رۆسۆ هەبێت. لەتیۆری هۆبزدا تەنانەت پێش لە دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی تاکیەتی کەسەکان وەک خۆی دەمێنێتەوە. ئەو تاکیەتیە کە لەسەر بنەمای مەعریفەناسی نۆمینالیستی هۆبزە لەهیچ حاڵێکدا لەناو ناچێت. ئیرادەی رەعیەتەکان تێکەڵ بە ئیرادەی گشتی نابێت بەڵکوو تەنیا لە ئیرادەی فەرمانڕەوا رایەک دەگرن. بەڵام ئەو بۆچوونە کە دەڵێت سەقامگیری دەسەڵاتی هاوبەش مەرجی کۆتایی پێکهێنانی ئەرکە زۆر لەو هزرە نزیکە کە دەڵێت «ئیرادەی گشتی» مەرجەعی ئەرکی سیاسییە.

-

**سەرچاوە:**

**از دولت اقتدار تا دولت عقل**

# میکافیللیزم

## لە شانۆگەری هاملێتدا

ئا/ و: ئەمیر ئیسماعیل



**١:١ کێشە:**

ئەوەی تێبینی کراوە پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوان (شازادە- **The Prince**)ی میکافیلی و (هاملێت- **Hamlet**)ی شکسپیر، واپێدەچێت شکسپیر لە شانۆگەری هاملێت ڕەخنە لەمیکافیلی بگرێت. میکافیلی چەند لایەنێکی بەهێزی داوە بە (شازادە) کە دەتوانێت وڵات بەڕێوەببات. میکافیلی دەڵێت: دەبێت شازادە دیکتاتۆرێکی بەهێز بێت و پشت بەهیچ کەسێکی تر نەبەستێ و ڕازیش نەبێت کەس ڕاوێژکاری بۆ بکات، لە بەدەستهێنانی ئامانجەکانی شازادە بۆی هەیە هەموو کارێک بکات بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی.

**١:٢ بایەخی کێشەکە:**

ئەو لێکۆڵینەوەیە سوودمەندە بۆ هەر کەسێک کە شانۆگەری هاملێت دەخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی زانیاری زیاتر دەربارەی شانۆگەرییەکە بەدەست بێنێت، هەروەها یارمەتیدەریشە بۆ قوتابیان (بەتایبەتی قوتابیانی بەشی زمانی ئینگلیزی) بۆ ئەوەی زیاترو چاکتر لە کەسایەتی هاملێت و کلۆدیەس تێبگەن. هەروەها یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتن لە میکافیلیزم و ئامانجەکانی میکافیلی و ئامۆژگاری شازادە، کە چۆن دەتوانێت حوکمی وڵات بگێرێت، لەگەڵ چۆنیەتی ڕەخنەگرتنی شکسپیر لەو بۆچوونانە.

**١:٣ ئامانجی لێکۆڵینەوەکە:**

زۆربەی نووسەرە ئینگلیزەکان لەنێویشیاندا شکسپیر، ڕەخنە لەبیروباوەڕی میکافیلی دەگرن، کارەکانی شکسپیر زۆر ناوازەن، کاتێک کارەکانی شکسپیر دەخوێنینەوە هەست دەکەین زۆربەی کارەکانی باس لە چینی بەرز(سەرو) دەکەن. بەتایبەتیش کارەتراژیدییەکانی زیاتر باسی پاشاکان و ژیانیان و چۆنیەتی حوکم گێڕانیان دەکات. چارەنووسی ئەتەوەیەک بەندە بە چارەنووسی کەسێکەوە ئەویش پاشایە. کتێبەکەی میکافیلیش(**The prince**- شازادە) هەر دەربارەی ئەو باسەیە، کە چۆن دەبێت بە سەرکردەیەکی بەهێزو چاک بۆ گەلەکەت.



پەیوەندی بەهێزی نێوان (هاملێت)ی شکسپیرو بنەماکانی میکافیلی وایکرد ئەو لێکۆڵینەوەیە بێتە بەرهەم، بەتایبەتیش کاتێک سەیردەکەین خوێنەرانی ئێمە زانیارییەکی ئەوتۆیان نییە دەربارەی ئەو بابەتە، تەنانەت هەندێکیان هەر گوێبیستی نەبوون، ئەو لێکۆڵینەوەیە لەداهاتودا دەبێتە یارمەتیدەرێکی چاک بۆ ئەوانەی ئارەزوو دەکەن لەبارەی یەکێک لە گەورەترین شانۆنووسانی ئینگلیزی و جیهانی شارەزابن.

> رووداوەکان بەشێوەیەکی شەپۆلئامێز لەگیان و زەینی هێمنترین و هێمەوباترین کاراکتەری رۆمانەکە هەڵدەقوڵێن کە گێڕەرەوەی سەربوردەو بەسەرهاتەکانە

**١:٤** لەو لێکۆڵینەوەیەدا ئاماژە بە پێشەکییەکی کورت و سادەیی میکافیلی و کتێبەکەی کراوە، ئەو کتێبەی جیهانی سیاسی هەژاند(**The prince** - شازادە). لەپاشاندا لە لێکۆڵینەوەکە ئەوە نیشاندراوە چۆن شکسپیر رەخنە لە گەورەپیاوانی دەگرێت. لە شانۆگەری هاملێت چەند گوتەیەکی گیردراوە (**quotations**) هێنراوەتەوە بۆ پاڵپشتی و بەهێزکردن و شیکردنەوەی بۆچوونەکان دەربارەی بابەتەکە، چونکە هەندێک لە قسەکانی هاملێت زیاتر دەنگی شکسپیری تێدا بەدی دەکرێ کە دەربارەی میکافیلی دەدوێ.

**٢:١ پێشەکی:**

لێرەدا هەوڵدەدەین ئەو بابەتە سەرەکیانە بخەینە روو کە پەیوەندییان بە میکافیلیزم هەیەو شکسپیر بۆ رەخنەگرتن لە میکافیلیزم دەریان دەبڕێت. بیروباوەڕی میکافیلی جیهانی سیاسەتی هەژاند. هەروەها شکسپیر لە شانۆگەرییەکانیدا ردخنەی لە زۆربەی لایەنەکانی مرۆڤایەتی گرتووە.

لە راستیدا ئەوان هەردووکیان دوو پیاوی زۆر گرنگن لەمێژووی مرۆڤایەتیدا. یەکێکیان لە سیاسەتدا، هەروەک خۆشەویستییەکەی بۆ نیشتمان وایکرد هەموو شتێک بکات بۆ یەکخستنی وڵاتەکەی لەژێر یەک سەرکردایەتی، هەروەها هەوڵیدا هەموو ئەو بابەتانەی لەمێژووی سیاسەتدا بەدەستی هێنابوو لەکتێبێکدا بەناوی (**The prince** - شازادە) بینووسێتەوە، کە کتێبێکی زۆر بەناوبانگەو تا ئەمڕۆش لەلایەن زۆربەی سیاسەتمەداران دەخوێندرێتەوە. دووەمیشیان گەورە درامانووسێکە، کە زۆربەمان بەزیرەکی و کارەکانی ئاشناین. تەنانەت زۆرجار کە دەمانەوێت منداڵێکی بلیمەت مەدح بکەین ئەو بەراوردی دەکەین و دەڵێین(دەڵێی شکسپیرە!).

لە **شانۆگەری(هاملێت)** دووپیاوی مێژوویی پێکەوە کۆکراونەتەوە، هەر یەکەیان بە بیروباوەڕی تایبەتی خۆیەوە. لەو لێکۆڵینەوەیە هەوڵدراوە بیروباوەڕی هەر یەکەیان نیشان بدرێ بەرامبەر بەهەمان شت، ئەویش بریتییە لەوەی(**چۆن دەگەیت بە دەسەڵات و چۆنیش پارێزگاری لەو دەسەڵاتە دەکەیت؟**).

**٢:٢ شازادە-**

**The prince :-**

میکافیلی ئەو کتێبەی نووسیودو پێشکەشی یەکێک لە پاشاکانی خێزانی(مێدیسی **Medicie**) کردووە بەناوی(**Lorenzo Medicie**)، کە لەوکاتەدا حوکمڕانی ئیتالیا بوو. میکافیلی دەڵێت کتێبەکە بریتییە لە پوختەی مێژوو، بۆچی هەندێک شازادەو پاشای مەملەکەتە جیاوازەکانی جیهان سەرکەوتوو دەبن، یان بۆچی هەردەس دێن لە حوکمڕانیکردنی وڵاتەکەیان. میکافیلی هەموو ئەو

...کتەرانە پێکەوە کۆ ...کتەوە، کە یارمەتی ...زادەی وڵات دەدەن و ...نێدەکەن، کە بەبێ ...رمەتی هیچ کەس ...ەڵاتێکی بەهێزیان ...ەبێت. هەروەها ئەو ...ۆنەشی دیارکردووە کە ...ەبەرچی هەندێک لە ...شاکانی جیهان سەرکەوتوو ...بن لە حوکمڕانیکردنی ...ڵاتەکەیان، میکافیلی چیرۆکی مێژووی هەموو گەورە نەتەوەکانی جیهانی خوێندۆتەوەو بە وردی دیراسەی کردوون بە ڕێگەیەکی شیکاری و رەخنەگرانە، ئەوەش بۆ ڕوونکردنەوەی هۆکاری سەرنەکەوتنیان، هەروەها پێشنیازیش دەداتە ئەو پاشایانە بۆ دوورکەوتنەوە لەو هەڵانە لەداهاتوودا، ئەوەش لەپێناو یەکخستنی هەموو ئیتاڵیا لەژێر حوکمڕانی یەک سەرکردە. ئامۆژگاری شازادەش دەکات بەوەی ئەگەر سەرکەوتنی دەوێت پێویستە کارە رەوشتییەکان وەلابنێ، ئەویش بۆ قازانجی خۆی و ولاتەکەی.

میکافیلی دەڵێت بۆ پاشەڕۆژێکی چاک و بۆ قازانجی ولات، شازادە ناچار دەکات هێز بەکاربهێنێ و داواشی لێدەکات واز لە ئایین و رەوشت بێنێ لەپێناو هەندێک بنەمای سەرووتر کە بریتین لە قازانجی گەل و ولات. لەبەر ئەو هۆکارانەو چەند هۆکارێکی دیکەش کتێبەکە ترسی خستە دڵی خەڵکێکی زۆر و وایلێکردن کە رقیان لە میکافیلی ببێتەوە. میکافیلی بەدبەختانە لەو کتێبە هیچ شتێکی بەدەست نەهێنا تەنها ناوبانگی خراپ نەبێت، لەگەڵ هێرشکردنەسەری لەلایەن پیاوانی ئەدەبەوە، وەکو شکسپیر لە(The merry wivesof windsor) کاتێک یەکێک لە کارەکتەرەکان دەڵێت «چی... من درۆ دەکەم؟! من میکافیلیم؟» لە کتێبی(شازادە -The prince) کاتێک میکافیلی ئامۆژگاری ئەو پاشایە دەکات کە تازە حوکمی گرتۆتە دەست و پێی دەڵێت کە پێویستە پلان دابنێت بۆ کوشتنی دوژمنەکان و ئەوانەش کە هاوکاریانن. هەروەها دەڵێت «ئەوە باشترین و جوانترین ڕێگەیە ئەگەر ڕێگەم بدەن بەکاری خراپ بڵێم جوان، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی سەقامگیری و هێمنی. نابێت ئەوە بەردەوام بێت و دووبارە بێتەوە، پێویستە لەشێوەی یەک تاوان بن. پاشان بەکارە چاکەکانی خەڵک دەگۆڕێن بۆ ئەوەی قەناعەتیان پێبهێنێ کە تۆ کەسێکی جوان و باشی».

بەڵام ئەگەر پاشا ئەو تاوانە بە بەردەوامی ئەنجام بدات، ئەوا دەبێتە هۆی تێکشکان و لەناوچوونی خۆی. لەبەشی هەشتەمی کتێبەکەیدا (شازادە-The prince) میکافیلی دەربارەی ئەوانە دەنووسێ کە(ئەوانەی لەڕێگەی کوودەتاو چەپەڵ دێنە سەرکورسی دەسەڵات، واتا کوشتنی مەلیک بە فێڵێک و خۆشی دەبێتە دەسەلاتی هێز لە ولات).

هەروەها ئاماژەشی بە ناوی چەند مەلیکێک کردووە، کە سەرکەوتوو بوونە لە گەیشتن بە کورسی دەسەڵات و بەردەوامیش بوونە لە حوکمڕانیکردن بەسەرکەوتوویی، لەگەڵ ناوی هەندێک مەلیکی دیکەش، کە شکستیان هێناوە. باسی ئەوە دەکات بۆچی ئەوانەی یەکەم توانیان پارێزگاری ولاتەکەیان بکەن و کەسیش لە دژیان ڕانەپەڕی، لەکاتێکدا هەندێکی دیکە هەر زوو لەناوچوون. میکافیلی هەندێک هۆکاری ئەوە نیشاندەدات، کە پاشا چۆن تاوانەکانی ئەنجامداوە؟ ئایا تاوانەکان بەچ ڕێگەیەک ئەنجامدراون. میکافیلی دەڵێت

لێکدانەوەی بوون و هەبوون و ڕووداوەکان لەدیدو گۆشە نیگای خودێکی پارچەپارچەکراوی ئێو فەزای دەقەوە سەرچەڵدەداو کە تێڕوانینی خەفەتبارترین کۆرێتۆی شیعر و پرۆسەی نووسینە.

«حەزدەکەم ناوی بنێم ڕێگەیەکی جوان ئەگەر ڕێگە بدرێت بەکاری خراپ بڵێم سەرکەوتوترن و لەلای خوداش باشتر دێنە بەرچاو لەوانەی ڕێگەی دووەم دەگرنەبەر، ئەوانەی ناتوانن پارێزگاری سەقامگیری و ئاساییشی وڵاتەکەیان بکەن». واپێدەچێت کلۆدیەس- (claudious) بەڕێگەی دووەم تاوانەکانی ئەنجام دابێت هەروەکو میکافیلی باس دەکات. کلۆدیەس تەنها مەلیکی کوشت، بەڵام هاملێتی نەکوشت و وازی لێهێنا، چونکە ئەو وای گومان دەکرد هاملێت ناتوانێت هیچ بکات. کلۆدیەس هەموو تاوانەکانی بەیەکجار ئەنجامدا. لەسەرەتادا هاملێتی نەکوشت و لەکۆتاییشدا نەیتوانی بیکوژێت، چونکە بارودۆخەکە گۆڕا.

**٢:٣ دووبارە کردنەوەی هەڵەکانی کلۆدیەس لەلایەن هاملێت:-**

ئەو هەڵانەی کلۆدیەس ئەنجامی دان، هاملێت هەمان ئەو هەڵانەی دووبارە کردەوە. هاملێت بەهەمان شێوە پلانێکی باشی دانەنا بۆ کوشتنی مەلیک کلۆدیەس. کاتێک هاملێت زانی مامی بکوژی باوکیەتی، ئینجا ویستی کلۆدیەس بکوژێت و کورسی دەسەڵاتی دانیمارک وەربگرێتەوە، بەڵام سۆزی بۆ باوکی مردووی تەواو کۆنترۆڵی کردبوو بۆیە پلانەکەی بەشێوەیەکی باش دانەنابوو کە کارەکە بەیەکجار ئەنجام بدات. کاتێک هاملێت (پۆلۆنیەس- polonious)ی کوشت دەبوایە لەهەمان کاتدا مامیشی بکوژێت، بەڵام کارەکەی دواخست بۆیە کلۆدیەس هەستی بەوەکرد کە هاملێت دەیەوێت ئەویش بکوژێت و لەوانەیە ئەوکارە بکات هەرکاتێک حەزبکات. ئەوە هۆی سەرنەکەوتنی هاملێت بوو هەروەکو میکافیلی ئاماژەی پێکردبوو. هاملێت سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام کلۆدیەسیش سەرکەوتوو نەبوو، چونکە توانی کورسی دەسەڵات وەربگرێت، بەڵام نەیتوانی پارێزگاری لێبکات.

**٢:٤ پۆلۆنیەس، دەسەڵاتدارێکی نەگونجاو:-**

میکافیلی پاشاکان بۆ سێ جۆر دابەش دەکات. یەکەمیان ئەوانەن کە دەتوانن بەبێ یارمەتی و پاڵپشتی هیچ کەسێک هەست بەهەموو بارودۆخێک بکەن. دووەمیان ئەوانەن، کە بەهۆی یارمەتی و ڕێبەرایەتی کەسانی دیکەوە دەتوانن لەبارودۆخەکان تێبگەن. سێیەمیان ئەوانەن کە ناتوانن هیچ شتێک بکەن بەیارمەتی و بێ یارمەتی کەسانی دیکە. جۆری یەکەمیان باشترینیانە، دووەمیان باشە، بەڵام سێیەمیان بێ سوودو کەڵکن واپێدەچێت کلۆدیەس لەجۆری دووەم، یان سێیەم بێت، چونکە ناتوانێ بێ یارمەتیدان و جاسوسیکردنی پۆلۆنیەس هیچ کارێک بکات، هەروەها ڕۆسن کوانتسی و گیلدن ستێرن، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە پۆلۆنیەس دەبەستێت.

خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە پۆلۆنیەس کەسێکی شیاونییە بۆ شوێنەکەی خۆی هەوڵدەدات هەموو هەوڵێکی خۆی بۆ کارەکانی مەلیک بخاتەگەڕ، بەڵام ئەو پیاوە زیرەکە نییە، چونکە ئەو بەهۆی هاملێت هەڵخەڵەتاوە. ئەوەش وایلێکردووە لەلایەن میکافیلییەوە ڕەفز بکرێتەوە، چونکە ئەو ناتوانێت بەو شێوەیە خزمەتی مەلیکەکەی بکات کە ئەو دەیەوێت.

**٣- ئەنجام:-**

لەو لێکۆڵینەوەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە شکسپیر لەدەقی شانۆگەرییەکەیدا لە گەڵ هەموو بیروبۆچوونەکانی میکاڤیلی هاوڕا نییە، بەڵام ئەویش بەهەڵە دانانێت. میکافیلی پەرتوکەکەی دژی مرۆڤایەتی نەنووسیوە، بەڵام ئەو لایەنی خراپی سروشتی مرۆڤی باسکردووە. ئەو گەیشتۆتە ئەوەی کە پێویستە خراپە بەخراپە وەڵام بدرێتەوە، پێویستیشە مەلیک و شازادەکان زۆر زیرەک و بەهێزبن تاکو بەهەر شێوەیەک بێت ڕێگەی بەدەستهێنانی ئامانجەکانیان بدۆزنەوە.

**سەرچاوەکان**

١- د. کمال مظهر، میکافیلی والمیکافلیه، مکتبة بیروت، لبنان.
٢- فاروق سعد، تراث الفکر السیاسی قبل الامیر وبعده، دار الافاق الجدیدة، بیروت.
٣- میکافیلی، الامیر، ت. خیري حماد، منشورات دار الافاق الجدیدة، بیروت.
**4-Shakes peare (1972), Hamlet the prince of Denmark longman, London**
**5- website, 123 helpme. com, essay, Shakespeare and mechavellism.**

# ❖ دادگاییکردنی سەدام دەبێتە مایەی سەرەتایەک بۆ لەنێوبردنی کەلتوری دیکتاتۆرییەت و سیاسەتی تاکڕەوی و پاوانکردنی گۆڕەپانی سیاسی؟

# ❖ کێشەی گەلی کوردستان لەگەڵ کێدایە ؟

**هەراو هۆریای دادگـــایکردنی ســـەدام و دەست و پێوەندییەکانی چ سوودێکی بۆ گەلی کوردستان و کێشەکەی دەبێ؟ ئایا مەترسی سەرهەڵدانەوەی پاشماوەی فیکری سەدام و ئایدیای شۆڤینستی نەتەوەی باڵادەست چەند لە گۆڕێ دایە؟ چۆن بتوانین بەرەنگاری ئەو ئایدیایە ببینەوە کە لە دوای روخانی رژێم رەنگ و شەکلی دیکەی بەخۆوە بینیوە؟ بۆ ئەوەی ئێمەش بتوانین لەو گفتوگۆیە یاسایی و ئەخلاقییە بەشداری بکەین روومان لە چەند رۆشنبیرێک کرد ئەوانیش بەم شێوەیەی خوارەوە وەڵامی پرسیارەکانیان دایەوە:**

*** ئایا دادگـــایی کـــردنی ســـەدام و سەرانی رژێم دەبێتە مایەی دادگایی کردنی ئەو کەلتوورو واقیعەی سی و پێنج ساڵ ئەو رژێمەی قبوڵکرد؟**

**کاکەڕەش نەقشبەندی**

- بەتەنکید دادگاییکردنی سەدام تەنیا دادگاییکردنی دیکتاتۆرێکی بێ وێنە نییە، بەڵکو دادگاییکردنی کەلتوورێکی پڕ کارەسات و ناخۆشییە، وەک ئەنفال و جینۆسایدو زیندە بەچاڵکردن و گۆڕی بەکۆمەڵ و کیمیابارانە.



**سوبحی مەهدی**

- گەیشتنی حزبی بەعسی رووخاو بەهۆی کودەتای ٨ی شوباتی (١٩٦٣) بۆ سەر کورسی حوکمڕانێتی لەعێراقدا خاڵێکی وەرچەرخان بوو بە ئاراستە نیگەتیڤەکەی، چونکە ئەم حزبە هەڵگری پەیام و رێبازێکی دیکتاتۆری شوفێنی بوو و هەڵقوڵاوی ناخی گەل و بوونی پێداویستی مێژوویی دروستی نەکردبوو، بۆیە لەسەردتاوە بەربووە گیانی ئازادیخوازان و تێکۆشەرانی گەلی عێراق بە کورد و عەرەب و نەتەوەکانی دیکەو هەموو ئاراستە سیاسی و پشکەوتنخوازەکانییەوە.. هەمیشەش توندوتیژی وەک ئامرازێک

بەکاردەهێنا بۆ بەرگریکردن لە بوون و مانەوەی لەم دەسەڵاتەدا، نرخەکەی هەرچییەک بێت لەخنکاندنی ئازادییە سیاسییەکان و پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤەوە بگرە تا گرتن و کوشتن و دەربەدەریکردن و ئانەوەی شەڕو ململانێ لەگەڵ دراوسێکان و کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا.. و مێژووی رابردووی عێراق و ناوچەکە لەم شێوازە حوکمڕانییەتییەی بەخۆیەوە نەبینیبوو... نموونەی کردەوە دڕندانەکانی بەرامبەر مرۆڤی عێراقی بە هەموو پێکهاتە مەزهەبی و نەتەوەیی و سیاسییەکانییەوە دەگمەنە، گۆڕە بەکۆمەڵەکان و لیستی بێ سەرو شوێنکراو و پاشماوەی زیندانەکانی ژمارەیان بەقەد پێکهاتەی مرۆیی هەندێک لە دەوڵەتانی جیهانە، کە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکانن، کردەوە و رەفتارە دزێوەکانی ئەم رژێمە بەهاتنەسەر کاری سەدام حوسێن بۆ لوتکەی دەسەڵات لە حزب و دەوڵەتدا ئەوەندەی دی بەرەو توندی و دژە مرۆڤی پەرەی سەند.

ئەگەر ئەمە تابلۆیەکی بچوککراوەی کردەوەکانی سەدام و رژێمەکەی بوو بێت، کە شەخسی سەدام بڕیاردەری یەکەمی بوو بێت، دەبێت لەپرسینەوە و سزای پلە یەک بەرامبەر ئەم وەربگرێت، ئینجا هەموو ئەوانەی لە دارشتن و جێبەجێکردنی فەرمانەکان و کردەوە قێزەونەکانیان لەسەرانی بەرپرسیار لەحزب و دەوڵەتدا هاوبەشیان کردووە.



**عەدالەت عەبدوڵلا**

- ئەگوتراوی ئەم پرسیارە، هەرخۆی هەڵگری وەڵامێکە بۆ راستییەکی حاشا هەڵنەگرو بەڵگەنەویست.. من ئەو وەڵامە لە یەکە یەکی پرسیاردا دادەڕێژمەوەو دەپرسم: بەچ پێوەرێک دادگایی کردنی دیکتاتۆرێک و چەند هاوبەشێک لە خولقاندنی دیکتاتۆرییەتدا، بەمانای دادگایی کردنی کەلتورێک دێت، کولتورێک کە تا ئەوساتە وەختەی هێزێکی دەرەکی زەبەلاح بەماشێنێکی گەورەی تەکنەلۆژیای سەربازییەوە هات و ئەو دەموچاوانەو رژێمەکەیان دوورخستەوە، نەیتوانی و دەردە کوشندەکانی دنیای ناوەکی خۆی چارە بکات، ئاخر بە چی بزانین لەگەڵ دادگایی کردنی سەدامدا ئیدی ئێمە لەبەردەم دادگایی کردنی کەلتورێکی تەقلیدی وەک کەلتوری عێراقیداین لەکاتێکدا کەلتور شتێکی تەواو جیاوازە لەبوون و نەبوونی چەند کەسێکی خوێنڕێژ؟.. کولتور لەسەرچاوە گەورەکەیدا ستراکتۆری عەقڵ و کۆی ئەو سیستمە ترادسیۆنی و بۆ ماوەیی و کەلەپوورییەیە کە لەناوەوەڕا هێزو سیماو تواناو دەسەڵات بەکەلتور دەبەخشن. ئەم ستراکتۆرو سیستمەش هەرگیز لەدایکبووی پرۆسەیەکی لەناکاو و راگوزەرو کاتی نییە، بەڵکو بەرهەمی دروستکراو و بەرهەمهێنراو و کەڵەکراوێکی مێژوویی، درێژخایەن و پێکەوە گرێدراو و سیستماتیزە کراوە، کە بەئەندازەی درێژەکێشانی رەگی خۆی لەناو قووڵاییەکانی کەلتوردا دادەکوتێ و جڵەو و ئاراستەی دەکات، ئەمە لەکاتێکدا مرۆڤ بوونەوەرێکی کاتی و کۆنترۆڵکراو و بەرجەستەیەو، لەگەڵ زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکاندا دەبێتە مادەیەک بۆ پشکنین و زانین، ئێمە دەتوانین بەکەمترین ماوەو ئەزموون کەشفی بکەین و لەسەر بنەمای ناسین و رەفتارەکانی و ئەو پێوەرە ئەخلاقی و یاساییانەی لەسەریان رێک دەکەوین بەچاک و خراپ دادگایی بکەین.



**شەپۆل فەتحی کەریم**

- دادگاییکردنی سەدام و سەرانی رژێمی گۆڕکراو چارەنووسی هەموو دیکتاتۆرەکانە لەدنیا درەنگ یان زوو دەبێت دووچاری ببنەوە، دادگاییکردنی ئەو کەلتورە نە سەرەتایەو نە بە ئاسانیش کۆتایی دێ نە بەدادگایی کردنی سەدامیش کەلتوری دیکتاتۆریەت، شەرەنگێزی بە کۆتادێت، هەڵبەت ئەم کەلتورە بە تایبەت لە خۆرهەڵاتی ناوین بە قۆناغی جیاجیادا تێپەڕیوە، ریشەی لەهەناوی **کۆمەڵگاو** تەواوی تاکەکان داکوتیوە،

کۆتاییهێنان، یان کۆتایی هاتنی ئەم کەلتوورە پرۆسەیەکی درێژخایەنە، پێویستی بە زەمینە رەخساندن هەیە بۆ هۆشیار بوونەوەی تاکەکان لە هەموو بوارەکانی سیاسی کۆمەلایەتی کەلتوری بەتایبەت تێگەیشتن لە چەمکی دیموکراسی و پراکتیک کردنی لەمەیدانی عەمەلیدا، ئەم پرۆسەیەش بە سالێک، دەیان سالیش نایەتە واری جێبەجێکردنەوە، ئەگەر تەواوی ئەو رژێمانە نەیەنە گۆرین، کە دەسەلاتیان لە دەستدایە. ئەو رژێمانە رژێمی نادیموکراسی، توتالیتارین، کاریگەری راستەوخۆیان هەیە لەبەرهەمهێنانی کەلتوری دیکتاتۆریەتدا کە ئەم کەلتورە رەنگدەداتەوەو شۆردەبێتەوە بۆ ناو هەموو کایەکانی ژیان، پانتاییەکی بەرفراوان لە هزرو بیرکردنەوەو کاروکردەوەی تەواوی کۆمەلگا داگیر دەکات بە ئاراستەی سرینەوەی بەرامبەرو بەرجەستەکردنی هەموو حەقیقەتەکان لەخوددا، بەهەند هەلنەگرتنی را جیاوازەکان، سەپاندنی رای دەسەلات بەسەر تاکەکانی کۆمەلگادا ئەگەر مەرگی هەموانیشی لەگەلدابێت. شەرە خوێناوییەکان، ئەنفال و کیمیاباران و جینۆساید، کوشتنە بە کۆمەلەکان، گوللەبارانکردن، زیندانی کردن دیارترین سیمای ئەم کەلتورە دژە ئینسانییەن کە لەهەناوی دەسەلاتە دیکتاتۆرییەکان رەنگیداوەتەوە، کۆمەلگای بەرەو جەهەندەمێک بردووە تا هەنوکە ئاگرەکەی جەستەی گەلانی بەرنەداوە، لەهەمان کاتدا راستەوخۆ، ناڕاستەوخۆ تاکەکان دەکەونە بە کاریگەری ئەم کەلتورە بەشێوەی جیاجیا لەکات، شوێنی جیاوازدا بەهەمان کەلتور لە ئاستە جیاجیاکاندا کاری پێدەکەن، پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان لەنێوان تاکەکاندا شێوەیەکی ناسروشتی بەخۆیەوە دەگرێ، جگە لەوەی ئەم کەلتورە لەئەدەب، هونەرو بوارەکانی تری ژیان رەنگدەداتەوە تەنانەت بەرامبەر نەیارەکانیش کە ناکۆکن لەگەل دەسەلات بە جیاوازییەکی کەمەوە وەکو خۆیان بەرهەم دەهێنا، سەقامگیربوونی کۆمەلگاو سەرهەلدانی کێشەو گرفتەکان، نەبوونی دادی کۆمەلایەتی، پێشێلی مافەکانی مرۆڤ، دیاردە ناتەندروستەکانی کۆمەلگا لە بچووکیانەوە تا کارەساتە گەورەکان بەرهەمی ئەم کەلتورەن، ئەم کەلتورەش تەنیا بەرهەمی ئەم (٣٥) سالەی دەسەلاتدارێتی بەعس، سەدام نییە بەتەنیا، بەلکو پێشینەیەکی کۆنتری هەیەو لەسەردەمی دەسەلاتدارێتی سەدامی دیکتاتۆر چرتر بۆتەوەو ماهیەت، روخساری بەعسیانەی وەک سەدامی دیکاتۆر خۆی نمایش کردو ریسوایی ئەم دیکتاتۆرە گزگلەی دەرخست، چانسی گەلی عێراق، کوردانیش لەگەل کەلتورێکی فاشیانە کە لە زەمینەیەکی مادی کۆمەلایەتی دوواکەووتوی خێلەکی هاتۆتە بەرهەم، ململانێی خوێناوی بووەو سەرەتاترین مافی سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابووری، کەسایەتی نەسەلماوە.



**لەتیف فاتیح فەرەج**

- ئەشێ پشکێکی کەمی دادگایی کردنەکە، دادگای کردنی ئەو مێژووە تاریکەش بێت، بەلام بیرمان نەچێت سەدام ئەوەی مێژووی کەلتورێکی درێژترە، ئاوەزی عەرەبی هاوشێوەی سەدام زۆر بەرهەمدێنێ، بۆیە سەیر نییە ئەگەر بلێین لەپشت عەقلی هەر عەرەبێکەوە سەدامێک هەیە، یان روونتر لەهەر عەرەبێکدا سەدامێکی مت بوو هەیە، ئەمە تاوانبارکردنی جیهانی عەرەبی نییە، ئەمە حەقیقەتەو هەندێک لە رۆشنبیرە عەرەبەکان بۆخۆشیان دان بەو راستییەدا دەنێن، بەشێک لەو کەلتووری ٣٥ سالەیە درێژەکراوەی عەقلی عەرەبییە، ئەو عەقلەی هەمیشە شەڕ لەسەروی شتەکانی دیکەوە دەبینێ، هەلوەشانەوەی ئەو کەلتورە تەنیا بەدادگایی کردنی سەدام و سەرانی رژێمەکەی کۆتایی نایەت.

*** ئایا ئەم دادگایی کردنە دەبێتە مایەی سەرەتایەک بۆ لەنێوبردنی کەلتوری دیکتاتۆرییەت و سیاسەتی تاکڕەوی و پاوانکردنی گۆڕەپانی سیاسی؟**

**سوبحی مەهدی**

– ئەم دادگـــــایـیکـردنە بەرای من ڕاستـیـەک دەخاتە پێش چاوی هەموو ئەوانەی هەوڵی بەدەست هێنانی کورسی حوکمڕانێتی دەکەن لەم وڵاتەدا ئەویش ئەوەیە، سەدام و ڕژێمەکەی ئەوەی لەدەستیان هات و لەتواناباندا هەبوو دریغیان نەکرد لەبەکارهێنانی هەموو شێوازو کەرەستەیەکی توندوتیژی لە ئاگروئاسن و چەکی جۆراوجۆر لە ناویشیاندا چەکی کۆمەڵ کوژی بەکارهێنا، بەڵام دەرئەنجام سەرانی ئەو ڕژێمەی گەیاندە ئەوەی ئێستا لەچوارچێوەی دیواری زینداندا ڕۆژگار بەسەر دەبەن و بەدەست و پێ بەستراوی لەبەردەم دادگا خۆیان دەبیننەوە.. وانەیەک کە زوڵم و ستەمکاری و چەوساندنەوە دەبێت کۆتایی بێت و، زەنگی هۆشیاری بەگوێی هەموو ئەوانەدا دەدات کە چ وەک ڕێباز یان پراکتیک بیریان بۆ حوکمڕانێتی دەچێت بەشێوازی زەبرو زەنگی دیکتاتۆریانە و سیاسەتی ملکەچ پێکردن. دەبێت بیر لەخۆیان بکەنەوە سەردەمی ئەم بیرە دواکەوتوو و کۆنەپەرستانەیە لە عێراقی نوێدا دەبێت لەگەڵ سەدام و ڕژێمەکەیدا بەرەو پێچانەوە بچێت.. چیتر بواری ئەوە نەماوە بەتاکڕەوی و پاوانکردنی گۆڕەپانی سیاسی بەزەبری هێزو توندوتیژی. ئەوەی دەیەوێت حوکمڕانێتی لە عێراقدا بکات پێویستە سەرچاوەی هێزەکەی لە گەلەوە بێت، دەبێت باوەڕی بە بنیاتنانی عێراقێکی دیموکرات و فیدراڵ و فرە حزبی هەبێت، دەبێت مافی هەموو هاووڵاتیان و مافی هاووڵاتیبوون و ئازادییە سیاسییەکان و مافەکانی مرۆڤ بەرقەرار بکات.. هەموان لەبەردەم یاسادا یەکسان بن، نەگینا چارەنووسی لەسەدام و هاوەڵەکانی باشتر نابێت.

**عەدالەت عەبدوڵڵا**

– ڕەنگە لەسەر ئاستی سیاسی ترسێکی گەورە بخاتە دڵی هەموو ئەو هێزە سیاسییانەی کە چاوەڕوانی ئەو ئاکامە شەرمهێن و ئابڕووبەرەی ڕژێمی بەعسییان نەدەکرد.. من پێموایە پرۆسەی دادگایی کردنەکە تەنها یەکێکە لە ساتەوەختەکانی دادگایی کردنی دیکتاتۆرییەت وەک کۆمەڵێک دەموچاوی سیاسی، یان ڕژێمێکی تۆتالیتار، لەمە بەدەر پێموانییە ئەو بنەما عەقڵی و فکرییانە لەناوبچن، کە کەلتووری دیکتاتۆرییەت پێکدەهێنن، مێژووناسی گەورەی فەرەنسی«برۆویل» پێمان دەڵێت: پرۆسەی گۆڕانی عەقڵ پرۆسەیەکی سەخت و گرانە، چونکە گۆڕانە لەئاستی بونیاددا، لە ئاستی ڕەگە قووڵەکانی بیرکردنەوەدو دنیابینی و حەقیقەتناسی و وجوددا، بۆیە ئەم گۆڕانە، وەک برۆدویل دەڵێت: جاری واهەیە دەیان و بگرە سەدان ساڵ دەخایەنێت، ڕەنگە باشترین بەڵگەش ئەوەبێت ئێمە زۆرجار ڕەنگە فکری و عەقڵییەکانی شەڕی نێوخۆ دنیای خۆمان دەبەینەوە بۆ سەردەمی شەڕی نێوان میرنشینەکانمان، کە دەکەوێتە زیاتر لە چوارسەد ساڵ پێش ئێستا.

**شەپۆل فەتحی کەریم**

– دادگایی ئەم کەلتورەش سانانییە بەم شێوە بەرفراوانەی کە سزای ئەم کەلتورە بدرێ بەقەد ئەوەندەی تەنیا سەدام، سەرانی ڕژێمە گۆڕکراوەکەی دووچاری دەبنەوە، لەهەمان کاتدا هاوشێوەکانیان لەهەموو دنیا بەدادگاییکردنێکی ئاوا ناتوانن دەستبەرداری ئەم کەلتورە بن، کە لەخوێنیاندا تواوەتەوەو پانتایی ڕۆحیانی داگیرکردووە، دەکرێت ئاماژەیەک بێت بۆیان کە کۆتایی هەموو دیکتاتۆرەکان، هەموو کەلتورە دواکەوتووە داخراوەکان بەم شێوە قێزەونە کۆتاییان پێدێت، هەڵبەت ئاسان نییە ئەم کەلتورە بەماوەیەکی کورت کۆتایی بێت کاتێک سەرچاوەی ڕۆحی دەسەڵات، تاکەکانی دەرەوەی دەسەڵاتیش بەم کەلتورە ژەهراوی بوبێت، سیاسەتی تاکڕەوی، پاوانکردنی گۆڕەپانی سیاسی بەشێکی زۆری جەستەی حکومەت و کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی پێکهێناوە سانا نییە بە ئاسانی لەناوببرێ، کێشەو ململانێکانیش لەئاستێکی توند دان و بەڕێوەبردنی ململانێکان ڕۆژهەڵاتیانە بەڕێوەدەچن، کە بەهێز بێ هێز تێک دەشکێنێ، هەموشتێک لەپێناوی سەرکەوتندا بێ گوێدانە بەها ئینسانییەکان، پرنسیپە ئەخلاقییەکان ڕۆژانە تراژیدیاکان دووبارە دەبنەوە بەبێ ئەوەی دەرس و پەندیان لێ وەرگیرێ.

**لەتیف فاتیح فەرەج**

– هەرگیز ئەم دادگایی کردنە ناتوانێ سەرەتایەک بێت بۆ لەناوبردنی کەلتوری دیکتاتۆریەت و پاوانخوازی، لە

راستیدا ئەم دادگایی کردنە گەر سەرکەوتووش بێت دادگایی کردنی کۆمەڵ و ناکارە نەگەتیڤەکانی کۆمەڵگا نییە، تا چیتر دیکتاتۆر دروست نەکات، کۆمەڵی عێراقی زۆر لەبارە بۆ دروستکردنی دیکتاتۆر.. ئێمە کۆمەڵی چەپڵە بازین، هەمیشە کۆمەڵە چەپڵە بازەکان دیکتاتۆر دروست دەکەن، چەپڵە لەدنیاشدا هەیە، بەڵام بەو رادەیە نا...

**کاکەرەش نەقشبەندی**

- بێگومان مرۆڤێک دادگایی بکرێت بەسەر دیکتاتۆرییەت و سیاسەتی تاکرەوی و پاوانکردنی گۆڕەپانی سیاسی هەنگاوێکە بۆ پەسند نەکردنی ئەو کارە نامرۆڤیانە لەسەر زەوی و وردە وردە دەبێتە هۆی لەناوچوونی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی.

*** دەبوایە لە یەکەمین دادگایی سەدام پارێزەرانی کورد بەرفراوانترین ئامادەییان هەبووایە، بەڵام ئەوە نەکرا، بۆ؟ ئایا کەمتەرخەمی پارێزەرانی کورد بوو یان دادگایی عێراق رێگای نەدا؟**

**سوبحی مەهدی**

- لەپاش رووخانی رژێمی دیکتاتۆری لە ٩/٤/٢٠٠٤، عێراق بە قۆناغێکی هەستیارو ئاڵۆزدا تێپەڕیوە، دەسەڵات بەپێی بڕیاری ١٤٨٣ی نەتەوە یەکگرتووەکان لەدەستی داگیرکەردا بووە، تەنانەت لەپاش گواستنەوەی ئەو دەسەڵاتە لە ٢٨/٦/٢٠٠٤دا بۆ عێراقییەکان هێشتا پایەکانی ئەم دەسەڵاتە جێی خۆیان نەگرتوون. لە لایەکەوە ململانێی هێزە سیاسی و پێکهاتە کۆمەڵایەتییە نێوخۆییەکان و لەلایەکی ترەوە رۆڵی دەزگا جاسوسییەکانی دەوروبەر لە پشتیوانی کردنی گروپ و تاقمە تیرۆریستەکان، وای کردووە هێشتا پێویستیمان بەمانەوەی هێزەکانی داگیرکەری پێشوو و فرە رەگەزی ئێستا هەبێت بۆ هاوکاریمان لە رووی ئەمنییەوە، دیارە بەردەوامی مانەوەی ئەو هێزانەش بێ بەرژەوەندی و دەستتێوەردان نابێت لە بڕیارەکاندا... راستە دەسەڵات گەڕاوەتەوە، بەڵام هێشتا سەروەری گشتگیر نییە، پەرلەمان نییە و حکومەتێک و سەرۆکایەتییەک، کە هەڵبژێردراوی گەل بن و هەر خۆشیان (مەبەست گەلە) پشتیوان و پارێزەریان بن نەهاتوونەتە سەر دەسەڵات.. هەموو پێکهاتەکان و ئورگانەکانی حکومەت و دەسەڵات کاتین... بۆیە بڕیاری دەرەکی رۆڵی هەبووە لە دەستنیشان کردنی دادوەرانە پێش گەڕانەوەی دەسەڵات، هەروەها کەمتەرخەمی لەکورد خۆیەوە لە ئەنجامی کاریگەری بارە سیاسییەکە و نەبوونی یەک ئیدارە و یەک گوتاری سیاسی کورد، تای تەرازووی کورد بە هەموو پێکهاتەکانییەوە بەرامبەر لایەنە رکابەرەکانی لاسەنگ کردووە.

**کاکەرەش نەقشبەندی**

- چ پارێزەرانی عێراق و چ پارێزەرانی کورد ئاگادار نەکرابوون بەدادگاییکردنی سەدام، بەڵکو کتوپڕ سەدام لەگەڵ دارودەستەکەی لەبەردەمی دادوەرێک دەرکەوت، ئێمە وائێدەگەین کە ئەمە دادگاییکردن نەبوو، بەڵکو تەنیا ئەوەبوو کە دەسەڵات بەعێراقییەکان درایەوە، چونکە لەگەڵ یەک هاوکات بوون.

**عەدالەت عەبدوڵڵا**

- بێگومان دەبێ پارێزەرانی کورد، رۆڵی خۆیان لەم مەسەلەیەدا بگێڕن و خۆیان بە لایەنێکی پەیوەندیدار لەو دادگاییکردنە لەقەڵەم بدەن.. بەڵام دەبێ لێم ببوورن ئەگەر بڵێم: من باوەڕم بەوە نییە «دادپەروەری» پڕ بەمانای وشە، لەسەر ئەوە رابووەستێت شوناسی پارێزەران چییەو کێیە.. دادپەروەری و مافپارێزی بەهایەکی مرۆیی و شارستانییەو گەورەترە لە پرسیارکردن لە شوناسی ئەو کەس و گروپانەی کە دەیپارێزن و بەرگری لێدەکەن.. ئەگەر دادگاییەکی دادپەروەرت هەبێت لەسەر بنەمایەکی دیموکراتی و ئینسانی و ئەخلاقی و یاسایی بەڕێوە بچێت، هیچ ترسێکیشت لەوە نابێت کێ بەڕێوەی دەبات و بکەرەکانی ناوی کێن.

**شەپۆڵ فەتحی کەریم**

- ئێمە بەتەنێ بۆ دادگایی کردنی سەدام نەتەنیا پارێزەران ئامادەییان لەئاستی پێویستدا نەبووە، بەڵکو ئەم کەلتورە هەموو بوارەکانی گرتۆتەوە، هەرچەندە هەنگاوی بەرایی نراوە بۆ بەجیهانیکردنی کێشەی گەلی کورد وەک کێشەیەکی رەوای ٤٥ملیۆنی، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ تراژیدیاکانی، خەبات، تێکۆشانە سەختەکەی دەکرا بگووترا ئامادەیی کورد لە ئاستێکی نزمدایە، تەنانەت جینۆسایدی گەلی

ئەو ناوچەکانی تری کە کوردستانی سەر دابەشکراوە بە نیمچە داخراوی بووەتەوەو راستییەکان وەکو خۆی دەرکەوتنی نییە لەکۆمەڵگای نێودەوڵەتی، رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ، کۆمەڵگای مەدەنی. ئەمە جگە لەوەی کەمتەرخەمی دەکەن. خەمساردی کوردان لەهەمبەر پرسەیەکی گرنگی وەک دادگاییکردنی سەدام وەک دەیان بۆنەو کارەسات، دەستکەوتی تر راگوزارانە تێدەپەڕن، بێ ئەوەی کەس ئاوڕیان لێ ناداتەوە. جگە لەوەش ئێمە نەتەوەیەکی سادەو ساکارو بەئینساف، مرۆدۆستین، شتمان زوو لەبیردەچێتەوەو لەیادەوەرییەکانماندا نامێنێتەوە، هەر ئەمەش وای کردووە بەرامبەرەکانمان چ دۆست یان دوژمنەکانمان ئەم هەڵوێستە بەمەبەستی بەرژەوەندییەکانیان دژی خۆمان بەکاربێنن، تا ئەمڕۆکەش لەگەورەترین کەسی بەرپرسیارێتی، دیبلۆماسیدا ...مان والآیە، میوانداری کوردان گەورەتر لەکێشەکانی ناوو ناوبانگی هەیەو دۆستە ئازیزەکان لەسنوری سەرەکانمان تێناپەڕێ، چانسی ئێمەش لەکەمان بۆ خۆییەو هەم لەبیرمان دەکەن هەم غەدریشمان لێ دەکەن. ئێمە نەک سەدام و رژێمەکەی گەورەترین زەرەرن لێنەداوین، دەکرا بپرسین کام حکومەت، وڵات، گەل هەیە زەبری کوشندەی مێژووییان لەگەڵی کورد دا بێ راستەوخۆ لە رێگەی حکومەتەکانیان یان ناڕاستەوخۆ، رووداوە یەک لەدوایەکە مێژووییەکان، کارەساتە پڕ تراژیدیاکانی کە بەسەر گەلی کورد هاتووە ئەگەر دادگایەکی دادپەروەرانە هەبێت ئەوە تەواوی (مرۆڤایەتی) لەناو قەفەسی تاوانەو کوردان لەمافی خۆیان داکۆکی دەکەن، کارەساتە خوێناوییەکان بەچەک و جبەخانەی جۆراوجۆری ئەو دەوڵەت و گەلانە ئەنجام دراوە. ئەوان سوارو ئێمە ئاوارەو دەربەدەرو پیادە بەدوای پەنایەکدا گەڕاوین شەرەف و کەرامەتی خۆمانی تیا بپارێزین، چیاکانی کوردستان باشترین دۆست، راستگۆترین شایەتی مێژوون، کە زەبری کوشندەی مێژوویی دژی گەلی کورد هەموو ئەو دەوڵەت و گەلانە دەگرێتەوە، کە رۆژێک لەرۆژان، بۆساتەوەختێک پشتیوانیان لەسەدام کردووە، یان لەهەرکات و ساتێکی مێژوویی پشتیوانیان لە مەسەلە رەواکەی گەلی کوردستان نەکردووە.

**لەتیف فاتیح فەرەج**

– وەڵامی ئەم پرسیارە پەیوەندی بەسەرانی سیاسی کوردو پارێزەرانی کوردەوە هەیە، ئەوان دەتوانن راستی وەڵامەکە بدەنەوە، بەڵام لەو بابەتانەدا هەمیشە هۆشیاری نەتەوەیی رۆڵی گەورە دەگێڕێ، بەداخەوە ئێمەی کورد هۆشیاریی نەتەوەییمان وەک پێویست نەرسکاوە.

*** سەدام و رژێمەکەی گەورەترین زەبری مێژوویییان لە نەتەوەی کورد داوە، ئایا پێت وانییە گوتاری سیاسی کورد لەمبارەیەوە لە ئاستی پێویست نییە؟**

**کاکەڕەش نەقشبەندی**

– بەڕای من سەدام کۆتایی هات و کەلتوورەکەشی نەماو، شتی زۆر لەسەدام گرنگتر هەیە کە کورد پێوەی خەریک بێت، وەکو گەڕانەوەی ئەو ناوچە کوردستانیانەی کە کەوتوتە دەرەوەی هەرێم و چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوک، چونکە سەدام ئەوە ناهێنێ کورد ئەوەندە پێی خەریک بێت و شتە سەرەکییەکانی خۆی لەبیربکات.

**سوبحی مەهدی**

– کورد بەرووخاندنی رژێمی دیکتاتۆری لە بەغدا، هەلومەرجێکی لەبارو گەورەی بۆ هەڵکەوت، بەوەی گەورەترین هەڕەشە و مەترسیدارترین دوژمن بە هەبوون و مافی کۆتایی پێهات، عێراق و کوردستانیش بە قۆناغێکی نوێدا گوزەر دەکات، هەرچەندە ئەرکەکانمان و رۆڵمان وەک گەلی کورد لە رووبەڕووبوونەوەی ئەو رژێمەی رابردوو و تێکۆشانمان بەرامبەری قورس و گران و پڕ قوربانی بوو، بەڵام ئەمڕۆ کورد لەبەردەم ئەرک و تێکۆشانێکی مەزنتردایە بە مەبەستی چەسپاندنی مافەکانی لەرووی یاسایی و دەستوورییەوە، و ئێستا ململانێ لە شێوازی توندوتیژییەوە بەرەو ژیانی دەستووری بە هێواشی هەنگاو دەنێت، دیارە هەموو پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە عێراقدا دۆستی گەلەکەمان و دۆزە رەواکەی نین، هەندێکیان رێگر و لەمپەر دادەنێن لەبەردەمماندا، بۆ ئەوەی نەتوانین زۆرترینی مافەکانمان لەدەستووردا جێگیر بکەین. هەربۆیە

لەم قۆناغەدا پێویستی هێزێکی کاریگەری یەکگرتووی کورد هەیە، تا نوێنەرانی بە پشتیوانی ئەم یەک هێزییە، بە گوتارو کردارێکی هاوبەشەوە بچنە مەیدانی ئەم ململانێیە و کێشەکان بە قازانجی گەلەکەمان ساغ بکەنەوە.....، دیارە ئەگەر خەمخۆرانە هەڵسەنگاندنی رۆڵی گوتاری سیاسی کورد بکەن، دەبێت بڵێین بەداخەوە لە ئاستی قۆناغەکەدا نییە.

**شەپۆل فەتحی کەریم**

- گوتاری سیاسی دەرهاویشتەی واقیعێکی تاڵی داسەپاو بووە چ لە رووی ناوخۆیی، یان دەرەکی، ئەگەر حاڵی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردستان لەپارچەکان جیاوازو پارچە پارچەو پەرتەوازە بووبێ؟ چۆن دەتوانرێت گووتاری سیاسی یەک بخرێت، ئەگەر پەلەکانی ئەم بزووتنەوەیە هەریەکەی گەمە لەسەر وەتەرێک بکات، چۆن ئاوازەکان چوون یەک دەبن، ئەگەر واقیعی پارچەکان کەشوهەوای تایبەتی خۆی هەبێ باران بەئاراستەی بەرژەوەندییەکان ناباریێ و تۆوی (نەتەوەیی) گوڵی جیاواز دەردەکات، یان هەر شینیش نابێت. گوتاری سیاسی چ بە یەکگرتوویی چ بە پەرەتەوازەیی رەنگدانەوەی سەردەم و واقیعێکی تاڵە، کەس خۆی لێ بەخاوەن ناکات تەنیا ئەو کاتانە نەبێت، کە دەبێتە تیرو ژەهر بەرامبەر بە سەردڵی ئەوانی دی، مێژووی کوردو کوردستان لەگرتنی سەدامەوە دەست پێ ناکات، بەڵکو هاوشێوەو هاوبیرو ئەوانەش کە ئیلهامیان لەو بیردۆزە توندوتیژە وەرگرتووە، کە ئەوانی دی پێبسڕنەوە، ئێمەش لەوبوارەدا بەشێکمان بەردەکەوێ کە لاسایی ئەوان دەکەینەوە بۆ سڕینەوەو تەفرو توناکردنی بەرامبەرەکانمان، ئەگەرچی پەیامی لەئێمەی راستریان هەڵگرتبێ و میکانیزمەکانمان بە ئاراستەیەکی پڕگرێ و گۆڵە تەنانەت لە ستراتیژیشمان لەداهاتوودا بەرژەوەندی کەسایەتی خاوەن دەسەڵات و مەسەلە رەواکەشمان ناگرێتەوە. رێرەوی بەرژەوەندی دادگایی کردنی سەدام بەرژەوەندی تەواوی گەلانە، بەخودی عەرەبەوە، تەنانەت عەرەبە عێراقییەکانیش ئەوانەش کە بەعسی و سوود مەندبوون لەو رژێمە، چۆن ئەو راستییە لەهەموو لایەک حاڵی کەین، مەگەر راکێشان و ئامادەکردنی تەواوی پیاوکوژو بەرژەوەندیخوازەکان و ئەنجامدەرانی تاوانەکان و سەیرکەرانی لە دیکۆمێنت و بەڵگەنامەو کارەساتەکان، کە لەمێژووی حوکمڕانیاندا قەوماندوویانە، ئەنجامیان دەدا؟ تۆبڵێی بڕوابکەن یاخود چۆن باوەڕ بەخۆیان دەهێنن، یان کە بەرامبەر دەسڕنەوەو گوللەبارانی دەکەن، چۆن بیردەکەنەوە؟ ئایا ئەو سەدامە بێ رەوشتە چۆن بە موهیم دەزانن؟ یان ئەوانەی لەو موهیمترن چۆن لەئاستێکی نزمدا لەگەڵ گەلێکی موهیمی وەکو (گەلی کورد) مامەڵە دەکەن؟ چۆن چارەنووسێک چاوەڕوانیان دەکات؟ خەمی گەورەی ئێمە خەمێکی پیرۆزی نەتەوەییە؟ خەمەکەی ترمان چەواشەبوون، چەواشەکردنی راستییە مێژووییەکانمانە بەرامبەر پرسێکی گەورە، پرسی گەلێکی زوڵم لێکراو، پرسێک کەس پرسی پێ ناکاو کردوویانە بە پارسەنگی پرسە پڕ پرسیارەکانیان.

**عەدالەت عەبدوڵلا**

- راستە لە ئاستی پێویستدا نییە، بەڵام ئەم کێشەیە تەنها بەم عیبارەتە سادەو ساکارانە چارەسەر ناکرێت، دەبێ ئێمە بەردەوام گوتاری سیاسی کوردی بخەینە ژێر چاودێرییەوە و قسەی خۆمان بکەین لەم بارەیەوە، لەبەرامبەردا دەبێ کەم ئەندامێتیی سیاسییەکانمان رەخنەبکەین و بە بەشێک لە کەم ئەندامێتیی کۆمەڵگای لەقەڵەم بدەین. مەبەستم لە بێ گوێی و «کەڕ»ێتی و هیچ نەبیستنمانە.. چونکە پێم وانییە هیچ نەتەوەیەکی بێ دەوڵەتی وەک کورد هەبێت ئەو هەموو مینبەرانەی قسەکردن و کەناڵانەی دەربڕینی هەبێت و کەمترین کارنەکەنە سەر نوێنەرە سیاسی و هێزە سیاسییەکانیان.. ئێمە بەسەدان رۆژنامەو کەناڵمان لە بواری میدیا هەیە بەبێ ئەوەی کاریکەنە سەر ئەو گوتارە سیاسییەی کە تەنها سەرکردەو ئەندامەکانی نووسینگە سیاسییەکانمان بڕیاری لێ دەدەن نەک کۆمەڵگا، بۆیە لەدواجاردا گوتاری سیاسی کوردی کەم خوێن و تەنگەنەفەس و بێ جەدوا دەبێت..

**لەتیف فاتیح فەرەج**

٤- تا ئەمڕۆ شتێک نییە ناوی گوتاری سیاسی یەکگرتووی کوردی بێت، ئەوەش کاریگەری خۆی هەیە، کورد یەکێکە لەو نەتەوانەی زوو

ک ڕەساتی لەبیر دەچێتەوە، ئێمە ..دۆزەرێان کاڵە، سیاسەتکارانی ئێمە ..مەرێن لەم حەقیقەتە. ئەنفال تەنیا لە ..١ی ٤و هەڵەبجە تەنیا ١٦ی ٣دا ..بیرە دەکەنەوە.

*** ئایا ڕای گشتی عەرەبی و ئیقلیمی چ کاریگەرییەکی دەبێت لەسەر ڕێڕەوی دادگای کردنەکە؟**

**کاکەڕەش نەقشبەندی**

- بەڕای من سەدام دادگایی دەکرێت، بەڵام کەی و چ عەرەب و چ دەوڵەتە ئیقلیمییەکان ناتوانن ئەم دادگاییکردنە ڕابگرن و هەوڵ و تەقەلایەکی زۆریش لەمبارەیەوە هەیە، ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر پەیڕەو نەکردنی دیموکراتیەت لەم ناوچانە، چونکە ئەوەی بیروباوەڕی بەدیموکراتییەت هەبێت بەرگری لە سەدام ناکات.

**شەپۆل فەتحی کەریم**

- ڕای گشتی عەرەبی بە پێشکەوتنخوازو دوواکەوتووەکەی نابێ کورد پشتی پێ ببەستێ، کەم عەرەب هەیە شۆڤێنی نەبێ کەم عەرەب هەیە دژی کورد نەبێ، سەرەڕای حزبی شیوعی عێراق، کە لەکورد زیاتر داکۆکی لەو مەسەلەیە دەکات کە تا هەنوکە میدیای کوردی ئاماژەی پێنادات کەس باسی لێوەناکات تا هەنوکەش تێنەگەیشتم حیکمەتی ئەمە بۆچییەو لەچی دایە؟.

ڕای گشتی، عەرەبی ناتوانێ کاریگەری هەبێ لەسەر ڕێڕەوی دادگایی کردنەکە بەقەد ئەوەندەی گەمەکانیان لەپێناوی بەرژەوەندییەکانە. ئاساییە تا دوێنێ گەورەترین پشتیوانی و هاندەر بوون بۆ خولقاندنی کارەسات، شەڕە گەورەکان، ئەمڕۆ پشتی تێ بکەن، دەعوای لەسەر تۆمار بکەن، بە گۆشەی ١٨٠له هەڵوێستەکانیان پەشیمان ببنەوە، ڕای گشتی عەرەبی و ئیقلیمی هەمیشە دوو قاقیانە مامەڵەیان کردووە لەگەڵ مەڕ شێتیان کردووە لەگەڵ گورگ برا بەش بوون، هەمیشە دۆستی نزیک و ئەلقە لەگوێی ئەمریکا بوون. هاوکات هات و هاوارو شین و شەپۆریانە بۆ کێشەی فەلەستین، لەسەروبەندی لێدان، گۆڕکردنی سەدام و ڕژێمەکەی لەسەرچەندان پەت گەمەو یاریان دەکرد بێ باک لەبەردەم دادگای مێژوو هەڵوێستی بێ هەڵوێستییان تۆماردەکردو، ئەمڕۆش کە سەدام و ڕژێمەکەی گۆڕکراون بەهەموو شێوەیەک دژایەتی حکومەتی کاتی عێراقی دەکەن، دەست لەکاروباری ناوخۆ وەردەدەن لەوەهەمی بەرگرتن بەو گۆڕانکارییەی لەعێراق ڕوویداوە تا وڵاتەکانی خۆیان نەگرێتەوە، بەو داخراوییە بمێننەوەو ڕژێمە دەسەڵاتدارەکانیش تا سەر جڵەوی فەرمانڕەواییان لەدەستدا بمێنێت.

**سوبحی مەهدی**

- بەوپێیەی عێراق بەشێکە لەکۆمەڵگای نێودەوڵەتی، لەو کۆمەڵگایەشدا وەک بەرئەنجام کارتێکەرو کارتێکراو دەبێت.. لەو نێوەدا هەر لایەک بۆ بەدیهێنانی ئامانج و بەرژەوەندی خۆی کاردەکات.. دیارە دادگاییکردنی سەدام، ئەنجامە بۆ سیاسەتە دیکتاتۆری و شۆڤینییەکەی، کە بووە هۆی ڕووخاندنی و پێچانەوەی دەسەڵاتی ڕەشی لەعێراقدا، هەریەک لە حوکمڕانانی عەرەب و دەوروبەرمان سەیرکەین ناگەینە ئەو بڕوایەی، کە ئەو ڕژێمانە حوکمڕانی دەستووری و دیموکراسی بن، بە پشتیوانی زۆرینەی گەل و لە ئەنجامی هەڵبژاردنێکی دیموکرات و ئازاددا نەگەیشتوونەتە هەرەمی دەسەڵات، بۆیە هەر گۆڕانێکی ئیجابی لە پێکهاتەی یاساو دەستووری حکومەتی عێراقدا بە ئاراستەی دیموکراسی و دادپەروەری بێتەدی، مەترسی لەسەر ئەوان دەبێت و گەلانی ئەو وڵاتانە کاردانەوەیان بەرامبەریان دەبێت، هەر لەبەر ئەوەش بوو زۆرێک لەو ڕژێمانە داکۆکیان لەمانەوەی ئەو ڕژێمە دەکرد لە ڕابردوودا، چونکە نموونەیەکی خراپتر بوو لەشێوازی حوکمڕانێتی خۆیان، ئێستاش ڕاستەوخۆ یان بەهاندانی کەسان و گرووپی ناوخۆیی و وڵاتەکەیان بە ناڕاستەوخۆ هەوڵ دەدەن ئاراستەی دادگاییکردنەکە بەشێوەیەک بڕوات، کە کاریگەری سلبی لەسەر باری نێوخۆیی ئەوان نەبێت یان کاریگەرییەکەی لاواز بێت.

**عەدالەت عەبدوڵڵا**

- مەسەلەی دادگایی کردنەکە، مەسەلەیەکی یاسایی پەتییە نەک سیاسی، من دڵنیام چ لە کۆمەڵگای عێراقداو چ لە کۆمەڵگای عەرەبیشدا زۆرن ئەوانەی بەهاجس و لۆژیکێکی سیاسی تەماشای پرۆسەی دادگاییکردنەکە دەکەن.. بەمانایەکی دیکە لە کۆمەڵگای عێراقدا زۆرن ئەو دەنگانەی، کە تەنانەت دادگاییکردن بۆ

پیاوێکی خوێنڕێژی وەکو سەدام و داروودەستەکەی بە گوناه دەزانن و پێیانوایە دەبێ دەستبەجێ لەسێدارە بدرێت.. لە کۆمەڵگای عەرەبیشدا بەتایبەتیش لە ناوەندە عەرەبی و شۆڤێنییەکانیاندا زۆرن ئەوانەی دادگایی کردنی سەدام بەدادگایی کردنی رەمزێکی گەورەی ئوممەی عەرەبی لەقەڵەم دەدەن.. بۆیە ئاساییە هەندێ رێوشوێن بگرنەبەر بۆ داکۆکیکردنێکی بێسوود لە دیکتاتۆر بەناوی پاراستنی مافی تاوانبار لە دادگادا.. پێمـوایە شتێکیش نییە ناوی رای گشتی عەرەب بێت، چونکە جیهانی عەرەبی هەمووی هاوسۆزی بەعسی و سەدام رژێمەکەی نین و نەبوون.

**لەتیف فاتیح فەرەج**

- دادگایی کردنەکە لە بنەڕەتدا سیناریۆیەکی ئەمریکییەو دەشێ سیناریۆیەکی حیزبی کۆماری بێت، هەمـوو ئەو هەراو زەنایەی دنیای عەرەبیش دیکەن تۆزقاڵێک بارودۆخەکە ناگۆڕێ، لەبەر ئەوەی عەرەب هەموو ئەمەی کردییان بۆ ئەوەی لەسەدام نەدرێ و لێیدرا هیچیش لە مەسەلەکە نەگۆڕا.

*** ئایا پێشبینی ئەوە دەکرێت سەدام لەو تۆمەتانەی رووبەڕووی دەکرێتەوە ولاتە زلهێزەکان و دەوروبەریش تێوە بگلێنێ؟**

**سوبحی مەهدی**

- دیارە بەشی زۆری تاوان و رەفتارەکانی رژێمی دیکتاتۆری و شەخسی سەدام خۆیان لێی بەرپرسن و لەهەوڵیان بۆ پاراستنی کورسی دەسەڵاتەکەیان ئەو تاوانانەیان ئەنجامداوە و لە هیچ کردەوە و شێوازێکی درندانەو دژە مرۆڤانە دوودڵ نەبوون، بەڵام سەرچاوەکان و کەرەستەی دروستکردن و بەکارهێنانی چەکە کۆمەڵ کوژەکان تەنیا فاکتەری نێوخۆیی رۆڵی نەبووە، بگرە وڵاتان و کۆمپانیای دیکەی بێگانە هاوکاری ئەو رژێمەبوون، سەرەڕای رۆڵی رژێم لە پشتیوانیکردن و داڵدەدانی تۆڕەکانی تیرۆر و هاوکاری کردنی گروپە تیرۆریستییەکان بەبێ هاوکاری وڵاتانی دیکە نەبووە. هەروەک لە دانیشتنی یەکەمی دادگاییکردنەکەدا بڵاوەبێتەوە ئەو تاوانبارانە ئامادەبیان پیشانداوە بە مەبەستی کەمکردنەوەی قورسایی تاوانەکان لەسەرخۆیان هاوکاری دادگا بکەن و بەرپرسایەتی گەورە بخەنە ئەستۆی سەدام، بەو پێیەش کە لەرووی سایکۆلۆژییەوە باسدەکرێت دیکتاتۆرەکان کەسی بوێر نەبوون لە ئەنجامدا بۆ پاراستنی خۆیان و کەمکردنەوەی سزای تاوانەکانیان پەنا دەبەنە بەر هاوبەشیکردنی کەسان و وڵاتانی دی لەو تاوانانەدا لەنێویاندا وڵاتانی گەورە و کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی چەک و بازرگانیکردن.

**شەپۆل فەتحی کەریم**

- زۆر لەو دەوڵەتانە پێش دەستگیرکردنی سەدام ساغ بۆتەوە لە پێشێلی مافەکانی مرۆڤ و زەبرو زەنگ، کوشتن، راوەدوونان هاوشانی رژێمی گۆڕکراوی سەدام تێوەگلاون پێش ئەوەی سەدام حوسێن ئیعترافیان لەسەربکات. پێشم وایە ئەمریکا بەرنامەو پلانی هەیە بۆ گۆڕینی ئەو دەوڵەتانەی مەترسین بۆسەر بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لەناوچەکەدا.

**عەدالەت عەبدوڵڵا**

- دیکتاتۆرەکان بەوە ناسراون هیچ بەربەستێکی ئەخلاقی و ویژدانی و یاسایی و سیاسی رێ لە سیستمی بیرکردنەوەو رەفتاریان ناگرێت، سەدام یەکێکە لەو دیکتاتۆرانەی، کە خاوەن سایکۆلۆژییەتێکی ئاڵۆزە ، بەڵام ئەو - وەک دەرکەوت- هێشتا پێیوایە خەریکی ملمڵانێ کردنە لەگەڵ ئەمەریکادا، بۆیە پێدەچێ بەلۆژێکی بێگوناهکردنی خود و ناشیرینکردنی وێنەی جیهان بەرگری لە خۆی بکات، بەم مانایەش ئاساییە وڵاتانی دیکەش بکاتە بەشێک لەو هێزانەی ئەویان بۆ تاوان و دیکتاتۆرییەت هانداوە.

**کاکەڕەش نەقشبەندی**

- ئەو شتانەی کە پێشبینی دەکرێن، ئایا کاتی رووبەڕووبوونەوەی سەدام بەو تۆمەتانەی کە کـردوویەتی، وڵاتە زلهێزەکان و دەوروبەریشی تێوە بگلێنێ. بەرای من سەدام هەرچی لەکاتی دادگایی کردن بێڵێ کەس بەهەندی هەڵناگرێ و قسەکانیشی کاریگەر نابن لەسەر ئەو تۆمەتانەی، چونکە ئەوەندەی ئەو کـردوویەتی بەرامبەر بە میللەتی عێراق بە گشتی و میللەتی کوردیش بەتایبەتی باوەڕناکەم کەسێک هەبێت ئەو کارانەی سەدام بخاتە پاڵ دەوڵەتە زلهێزەکان و دەوروبەر.

**لەتیف فاتیح فەرەج**

- هەرگیز دیکتاتۆرەکان بۆ دۆکیکردن لەخۆیان دانامێنن، ئێوە بینیتان چۆن وەڵامی ئەندامانی حکوومەتی دەسەڵات و دواتر دادوەرە تیقیەکەشی دایەوە، سەدام ئێستاش خۆی پێ جوان و فریشتەیەو ئەوان دیکە دێو. کەلتوری رۆژهەڵات پڕە لە وێنەی وەو. هەمیشە جەلادەکان خۆیان پێ فریشتەبووە.

*** پێشبینیت بۆ دەرئەنجامەکانی دادگایی کردنەکە چییە؟**

**شەپۆل فەتحی کەریم**

- ناکرێ پێش وەخت قسە لەسەر مەسەلەیەکی ئاڵۆزی تەمومژاوی بکرێ، کە لەدەرەوەی بڕیارو دەسەڵاتی ئێمەی کورد بێت، بەڵام لەهەموو حاڵەتەکان دەرئەنجامەکان دژی سەدام و رژێمەکەی و هەواداران و ئەو سیستەمانەش هاوشێوەی ئەون، بەرژەوەندی گەلی کوردستان و تەواوی ئەوانەش کە بەدەستی ئەو رژێمە زەرەرو زیانیان پێ کەوتووە، دەکرێ دادگایی کردنەکە دەرس و پەندبێ بۆ هاوشێوەی سەدام و تەواوی دیکتاتۆرەکان، سیستەمە داخراوە تۆتالیتارییەکان، کە لاسایی کارو کردەوەکانی سەدام دەکەنەوە، تۆبڵێی لەخۆرهەڵاتی ناوین ئەو ئەقڵییەتە دۆگماو دیکتاتۆرو کۆنەپەرستانە لەوانە تاڵەکانی مێژوو دەرس و پەند وەرگرن؟ ئەگەر سەدان جار سەدام لەسێدارە بدرێ، گەلەکەمان بەوەندە دڵی ناو ناخۆشەوە بەبەراورد لەگەڵ ئەو تاوانانەی کە بەرامبەر گەلی کوردستان ئەنجامی داوە، بۆیە سزای لەسێدارەدان کەمترە لەوەی سەدام بە ملیۆنان مرۆڤی ئەم وڵاتەی قەتلوعام کردووە، بۆیە دەبێت حکومەتی کاتی و حزب و هێزە نیشتمانییە عێراقی و کوردستانییەکان لەو ئاستە بەرپرسیارێتیە دابن، بۆئەوەی جارێکی دیکە کەس بۆی نەبێت مافەکانی مرۆڤ پێشێل بکات و گەلەکەمان و نیشتمانەکەمان دووچاری کارەسات وماڵوێرانی بکاتەوە...

**سوبحی مەهدی**

- لەیاسای کاتی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراقدا هاتووە، کە هەریەک لە دەسەڵاتەکانی یاسادانان... جێبەجێکردن.. و دادوەری لەیەک جیا دەبن و دادگا سەربەخۆ دەبێت. ئەمە سەرەتای هەنگاوە بۆ ئەوەی عێراق بەرەو ئاراستەی دەوڵەتی دەستووری و یاسایی بڕوات و سەربەخۆیی دادگاکان پارێزراوبێت.. ئەمە لەلایەک و لەلایەکی دیکەوە، ئاشکرایی و هەبوونی بەڵگەنامەی پێویست و باوەڕپێکراو کە سەلمێنەری تاوانەکانی سەدام و رژێمەکەین لە پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ، سیاسەتی جینوسایدو بەکارهێنانی چەکی کۆمەڵ کوژ دژ بەگەلەکەی و کۆرە بەکۆمەڵەکان و ئاماری بێ سەرو شوێنکراو و سەدان دیکۆمێنتی دەستبەسەرداگیراوی دەزگا سەرکوتکارەکانی رژێم، هەزاران نموونەی زیندووی شایەتیدانی عێراقییەکان لە قوربانیانی زیندان و ئەشکەنجەدانەکانی سەرانی ئەم رژێمە... **دڵخۆش و** گەشبینم دەکات بەوەی، **کە شایستەی** ئەوەن توندترین سزا دەرهەقیان جێبەجێ بکرێت.

**عەدالەت عەبدوڵڵا**

- بە بۆچوونی خۆم، هێشتا زووە پێشبینی دەرئەنجامەکانی دادگایی کردنەکە بکەین، چونکە ئێمە لەبەردەم قۆناغێکی سەرەتایی دادگایی کردنەکە داین، بیریشت نەچێت پێشبینیکردن بنەماو لۆژێک و یاسای خۆی هەیە، تۆ ئەگەر مامەڵە لەگەڵ پێدراوەکاندا نەکەیت و لەشوێنی خۆتەوە بیربکەیتەوە شتێکی دیکەت پێناکرێت، جگە لە نوقلانەو رمڵ لێدان، واتە پێشبینی بێ بنەما، بۆیە دەبێ بزانین پێدراوەکانی(معطیات) داهاتوو و ئاماژەکانی چین و دواتر لێیان تێبگەین و بەپێی تێگەیشتنی خۆمان پێشبینی بکەین.

**کاکەڕەش نەقشبەندی**

- بەڕای من سەدام دادگایی دەکرێت و حوکمی ئیعدام بەسەریدا دەسەپێ، بەڵام ئایا ئیعدام دەکرێت یان نا ئەمە جێگای سەرنجەو دەبێ بۆ ئەوکات هەڵبگیرێت، لەوانەیە شتی وا دەربکەوێ مرۆڤ بتوانێ زۆر بەراشکاوی رای خۆی لەسەر دەرەنجامەکانی بدات.

**لەتیف فاتیح فەرەج**

- هیچ پێشبینییەک لەخۆوە ناکرێ، زیاتر ئەمەش وەک پێشتر گوتم **سیناریۆیەکی** ئەمریکییەو هیچی تر، **دەشێ ژمارەی** دەنگەکانی بۆش بخاتە **سەر ژمارەی دەنگەکانی** کیریبیەوە.





ئەگەر ئەمرۆ هەر توێژەرێکی فارس زمانی باس و لێکۆڵینەوە لەسەر رۆمان و چیرۆکی نوێی بەفارسی نووسراو بکات، ئەوا هەرگیز ناتوانێ لە شوێنی شایاندا جێگای (عەلی ئەشرەفی دەروێشیان) نەکاتەوە.
چونکە چیرۆک و رۆمانەکانی نووسەر تام و چێژی تایبەتی خۆیان هەیە و پڕن لە هونەرو ئیستەتیکا.
ەلی ئەشرەفی لەسەرتاسەری ئێراندا دەنگێکی ناسراوە و لە گۆشەی ئەدەبیدا جێگای دیاریکراوی خۆی هەیە، زۆرتر بەوە ناسراوە کە تەعبیر لە ژان و ئازارەکانی ژیان دەکات، ئەو ژیانەش لە شارو گوندو رەشماڵەکانی کوردستاندایە، لەناو ئاخی هەژارانو فەلەو لانەوارو بێدەرەتانانی مرۆڤی کورد دایە.
بەرهەمەکانی پڕن لە وێنەی مرۆڤی کورد، تەژین لە دیمەنی رەنگاورەنگی کوردستان، دارماڵن لە گڕی کوێرەکانی تاکی کورد، کە بەچنگە رنە شوێن ژیان کەوتوون و لە پێناوی بەدەستهێنانی بژێویدا هەمیشە ئەشکەنجەو دەردی سەری دەستەو یەخەیان.
عەلی ئەشرەفی دەروێشیان وەنەبێ تەنیا لە بواری رۆمان و کورتە چیرۆکدا باڵادەست بێ، بەڵکو دەتوانین بڵێین نووسەرێکی دەست رەنگینە و خاوەنی چەند ژانری ئەدەبییە. لەوانە (لێکۆڵینەوە، فەرهەنگ نووسین، فۆلکلۆریست، رۆژنامە نیگار) بەم کارانەشە جێگەیەکی دیکەی لە قەڵەمڕەوی ئەدەبدا بۆ خۆی تەرخان کردووە.

* * *

سەرجەم کارە جوانەکانی عەلی ئەشرەفی دەروێشیان لە جوگرافیایەکدا قسان دەکەن کە زۆر بەئاسانی لە نووسەرەکانی دیکەی ئێران جیا دەکرێتەوە، ئەدەبیاتی نەم بەکەش و هەواو کەسایەتییەکان و ئامانجەکانییەوە جیاوازن لە بەرهەمی ئەدەبیاتی باکوورو باشوورو ناوەراستی ئێران. واتە بەهەموو هەناسەکانییەوە تەعبیر لە جوگرافیایەک دەکات کە ناوی وڵاتی کوردانە. تەنانەت لە بەرهەمەکانیدا زۆرجار ناوی کوردی و شوێنی کوردی دیاری دەکات کە لای فارسەکان یا خوێنەرانی فارسی شتی نامۆن، بەڵام ئەوەندە بەشێوەیەکی هونەری جێگایان دەکاتەوە نامۆبوونیان پێوە دیار نییە، تەنیا ئەوەندەیان پێوەدیارە کە لە جوگرافیای ئەوانی دیکە جیاوازە.

* * *

جارێکیان لەکۆڕێکی (یادی مامۆستا هەژار)دا لە تاران کە لەلایەن قوتابییە کوردەکانی زانکۆی تارانەوە بەڕێوەچوو، یەکترمان ناسی. ماوەیەک پێکەوە قسەمان لەسەر بابەتەکانی کرد، ئەو زۆر خۆشحاڵ بوو کە ئێمەی خەڵکی ئەم دیوو ئاوا لەگەڵ نووسینەکانیدا دەژین. لە ئەنجامی باس و خواسەکەماندا پێم گوت کە هەندێ بەرهەمیش بەکوردی بنووسێت. ئەو لەوەڵامدا گوتی:
- رەنگە بۆمن ئێستە زەحمەت ئەبێ فێری ئەو شێوە کوردییەی ئێوە ببم و بتوانم پێی بنووسم. ئەگەر بشمەوێ بەکوردی بنووسم ئەوا دەبێ بەشێوا زارەکەی خۆم بینووسم کە ئەمەش زیان بەزمانە نیوە ئەستاندارەکە دەگەیەنێ کە ئێستە کورد پێکی هێناوە.
من ئەگەر بەشێوە زارەکەی خۆم بنووسم. ئەوا خەڵکی دەڤەرەکەم پەیڕەوم دەکەن و بەو کارەش کۆسپێ لە رێگەی ئەو نیوە ئەستانداردەدا دروست دەکەم. منیش ئامادە نیم بیکەم. وازم لێ بێنن با هەر بەفارسی بنووسم، لای من گرنگ ئەوەیە کە رۆحی بەرهەمەکان کوردین.

* * *

عەلی ئەشرەفی دەروێشیان سەرەتای کاری ئەدەبیی دەگەڕێتەوە بۆ هەرەتی لاوی، واتە دەورەی قوتابخانەی ناوەندی، ئەو دەمە لە کرماشاندا دەستی کردووە بە (ئەتریە) نووسین و ناوبەناو بەدیواری ناوەوەی قوتابخانەکەیانەوە هەڵیواسیوە، هەروەک هاوڕێکانی دەڵێن (قوتابییەکی بزۆز و بزێو بووە و ئەو ئەتریانەی ئەو هاندەربوون بۆ ئەوەی کۆڕی ئەدەبی لە شاری کرماشاندا گەرم بکات و، بۆتە هاندەری چەندین کەس کە ئێستە دەستیان قەڵەمی گرتووە).
هەروەها لەرووی سیاسیشەوە هەمیشە بەهەڵوێست بووەو هەرگیز - تا ئێستەشی لەگەڵدا بێ. قەڵەمە سەر بەرزەکەی نەوی نەکردووە و هەر لە ریزی دەنگی گەلدابووە. بۆیە ئەمرۆ ستایشی گەورە هەڵدەگرێ ئێمەیش لەرێگەی خۆمانەوە وەکو گۆڤاری (کاروان) ئەم فایلە بچکۆلەی بۆ دەکەینەوە بەهیوای ئەوەی کە هێدی هێدی سەرجەم بەرهەمە جوانەکانی بکرێنە کوردی و لەکتێبخانەی کوردیدا بدرەوشێنەوە.

**حەکیم مەلا ساڵح**

# دەروێشیان و فەرهەنگی کوردی کرمانشاهی

حەکیم مەلا ساڵح

لەناو تێکڕای شارەکانی کوردستاندا پێکهاتەی دانیشتوانی کرمانشان لە هەموویان جیاوازە. چونکە جگە لە (کەلڕ)«١»یەکان کە وادیارە دانیشتوانی بنچینەیی شارەکەبن. بەسەدان خەڵکی سەر بەزاراوەکانی دیکەی تێدا نیشتەجێن. وەک (جاف، گۆران، لەک، لوڕ، فەیلی) واتە تەنیا خەڵکی سەر بەزاری کرمانجی باکووری تێدا نییە. هەروەها لەدێر زەمانەوە چەند بنەماڵەیەکی (فارس)ی تێدا نیشتەجێ بوونە. پێم وایە نیشتەجێ بوونی ئەم فارسانەش دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتی ساسانیەکان کە کرمانشان یەکێک لە بنکە گەورەکانی دەستەڵاتدارێتیان بووە. ئەو دەمەش کرماشان جگە لە بنکە بوونەکەی کاروانسەرای گەورەشی تێدا بوود. واتە ناوەندێک بووە لە نێوان (ڕەی) (تاران)و (مەدائین)دا. (مەدائین)، (تیسفون)و (تاقی کیسرا)شی پێدەگوترێ کە لەڕووی ڕۆژئاواوە دوایین خاڵی سنووری دەستەڵاتی ساسانیەکان بووە. (لە بەغداد ئێستەش شوێنەواری ئەو تاقە هەرماوە).

نیشتەجێ بوونی فارسەکان لەم شارەدا وای کردووە کە زمانەکەیان هەندێ کاریکاتە سەر زمانی خەڵکە کوردەکە، چونکە زمانی ئەوان زمانی دەستەڵات و خوێندن و نووسین بووە. هەروەها ئەو پێنج شەش زارو شێوەزارەی کوردی ناو کرماشانیش بەهۆی ئەوەی کە کورد زمانی نیستانداردی نەبووەو بەئاسانی نەیانتوانیوە لە شێوە ئاخافتنی یەک بگەن. زمانە فارسیە زاڵەکە بۆتە زمانێکی هاوبەش لەنێوانیاندا، بۆیە لەناو بازاڕەکانی کرماشاندا پتر هەست بەزمانی فارسی دەکەیت تا کوردی. بەڵام لەناو ماڵەکاندا، لە گەڕەک و کۆڵانە دوور لە بازاڕەکاندا وانیەو زمانی ئاخافتن کوردییە بەهەموو شێوەکانیەوە کە تێیدایە.

نەبوونی زمانی نیستانداردی کوردی وای کردووە کە لە کرماشاندا جافێ لەگەڵ لەکێک یا گۆرانی لەگەڵ فەیلیەک بەزمانی زاڵی فارسی یەک بدوێن. هەروەها نەبوونی دەستەڵاتی کورد وایکردووە کە لە باتی ئەوەی زاراوەی (کەلڕی - کەڵهوڕی) کە زمانی بنچینەی خەڵکی شارەکەیە ببێتە زمانی هاوبەشی شێوەکانی دی، جێگەی بۆ زمانی فارسی خۆش کردووە کە ئەو دەورە ببینێ.

بەڵام هێشتا لەگەڵ ئەمەشدا کرماشانیەکان بەیتە شیعرێکی فۆلکلۆرییان هەیە دەڵێ:

خۆم کرماشانی فارسی نیەزانم
وەزوان کوردی قەزاو لەگیانم

لەمەش گرنگتر ئەوەیە کە لە بەرانبەر فارس و زمانی فارسیدا هەستی کوردایەتیان هەیەو شانازی بەکورد بوونی خۆیانەوە دەکەن. یەکێک لەو



رووناکبیرانەی کە ئەم هەستە پاکە رەگ و خوێنی داگیرکردووە بەرێز (عەلی ئەشرەفی دەروێشیان)ە. ئەم خۆشەویستە جگە لەوەی کە لە چیرۆک و رۆمانەکانیدا بەخەستی تەعبیر لە ژیانی کوردو کەش و هەوای کوردستان دەکات، بەدوو کاری دیکەی گرنگیش هەستاوە کەمایەی زیندووکردنەوەی رۆحی کوردایەتین لە دەڤەری کرماشاندا.

١- لە دوو بەرگدا تەواوی (ئەفسانە و مەتەڵ و یاریەکان و چیرۆکە فۆلکلۆرییەکانی) ناوچەکەی کۆکردۆتەوە و کردوویەتی بەناسنامەیەک لە باخەڵی هەموو کرماشانیەکدا.

با لەوەگەڕێین کە دەروێشیان ئەم کارەی و هەروەها چیرۆک و رۆمانەکانی بەفارسی داڕشتوون ئەمە هێندەی ئەوە گرنگ نیە کە لەهیچ کامیاندا سانتیمەترێ لە کوردستان دوور نەکەوتۆتەوە.

واتە کاکڵەو مەبەستی بابەتەکانی گرنگن کە بەتەواوی رەنگ و بۆی (بێستوون) و (پەڕاو)و چاوگەی (تاقوەسان) یان گرتووە.

٢- نووسینی فەرهەنگی کوردی کرمانشاهی کە لەراستیدا ماندووبوونی پێوە دیارە و بەسەدان وشەی جوان و ناوازەی تێدایە کە بۆتە مەلۆو دەچنە سەر خەرمانی فەرهەنگی کوردی. نووسەر هەموو وشەو دەستەواژەکانی بەرێنووسی لاتینیش داڕشتووە بۆ ئەوەی کەسانی زارەکانی دی بەئاسانی بیانخوێننەوە، هەروەها لە بەرانبەریشیاندا بە (فارسی) لێکیداونەتەوە. واتە فارسی زمانەکانیش بەلای ئەوەدا دێنێ کە سەر لە ئاخافتنی خەڵکی کرماشان دەر بکەن و تەنانەت بۆشیان بسەلمێنرێ کە حەسەن زیرەک واتەنی (شاری گەورەی کوردنشین)ە.

لە بارەی ئەم فەرهەنگەوە تەنیا شتێ کە جێگەی سەرنج بێت ئەوەیە کە (کاک عەلی ئەشرەف) هاتووە هەرچی وشەیەک کە بەسەر زاری خەڵکی ئەو شارەدا دێت هێناویەتە سەر کاغەز، ئەمە بەبێ ئەوەی گەلێ لەو وشانە بتوانن لە فەرهەنگی زمانی کوردیدا جێگەیان هەبێت«٢»، بۆ نموونە لەم بارەوە ئەم چەند وشە دیاری دەکەین (آخر عاقبت، ئەستومبول (ئەستەمبوڵ). ظور (ظهر) (ضفت و رەفت (ضبط و ربط) و صغیر وکبیر، صوب (صبح)، صبر> یا امیرالمؤمنین: واجبی، وامواسی، مەزەکە (مضحکە) مومین (مؤمن)، قابیز (قابض)، فاتە (فاتحە)، غەیز (غیض) گەلێ نموونەی دیکە لەم وشانە دەبینرێن. کەچی دەبینین هەندێ وشەی رەسەنی دەڤەرەکە تۆمار نەکراون، وەک (ئەرا = بۆچی)، (وەگەرد = لەگەڵ) (بەو = وەرە)، (چشت = شت) (دیرم = هەمە، هەیتم)، (بووسیە = راوەستە)، (چویم = رۆشتم)و دەیان وشەی دیکە. کە ئەمەش بۆشاییەکەی لەناو فەرهەنگەکەدا دروست کردووە.

### هەندێ کارتێکردنی زمانی فارسی

لەپێشەوە باسی ئەو زەمینە خۆشکردنەمان کرد کە زمانی فارسی بتوانێت هەندێ کاریکاتە سەر شێوە ئاخافتنی خەڵکی کرماشان، ئێستەش لێرەدا هەندێ وشەی ناو فەرهەنگەکە دێنینەوە کە تەواو لە فارسی دەچن، یاخود لەوەوە نزیکترن تا کوردی. (وشە فارسیەکان بەرێنووسی کوردی دەنووسین).

| کرماشانی | فارسی | کوردی |
|---|---|---|
| ئەناختەن | ئەنداختەن | خستن |
| غەک | غەک | خوێ |
| خونالو | خون ئالود | خوێناوی |
| خەیلی خو | خەیلی خوب | زۆرباش |
| مەکونی | میکونی | دەکەی |
| دومبال | دونبال | بەدوای |
| دلهورە | دلهورە | دڵەراوکە |
| میارم | میارەم | دەهێنم |
| پەرەندە | پەرەندە | باڵندە |
| ئینا | ئینها | ئەمانە |

ئەمانە و هەندێ وشەی دیکە دەبینرێن. ئەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێین کە ژمارەیان لە چاو وشە کوردیەکانی ناو فەرهەنگەکەدا زۆرکەمە.

لەرووی گرامەریشەوە بەداخەوە کاک عەلی ئەشرەف هەڵەیەکی گەورەی لە دەست دەرچووە ئەویش ئەوەیە کە (نیشانەی کۆ)ی بە (ئەلف) دیاری کردووە. بۆ ئەمەش لە پێشەکی فەرهەنگەکەدا کە هەندێ باسی لەسەر گرامەر کردووە لەمبارەوە ئەم خشتەیەی خوارەوەی داناوە.

| فارسی | کرماشانی | کوردی |
|---|---|---|
| زنها | زەنا | ژنان - ژنەکان. |
| مردها | مەردا | پیاوان - پیاوەکان |
| کتابها | کتابا | کتێبەکان |
| اسبها | ئەسپا | ئەسپەکان |
| چوبها | چووا | چیلکەکان |
| گوسفندها | گوسپەنا | مەڕەکان |
| آجرها | ئاجورا | خشتەکان |

بەڵام لەڕاستیدا ئەمە یەکێکە لە کارتێکردنە خراپەکانی زمانی فارسی کە وەک کاک عەلی ئەشرەف هێناویە بەرەوی ئێجگار کەمەو نیشانەی کۆ لەو زارەدا (یل)ە. وەک کەمترین کەس لەو شارەدا دەڵێن (زەنا) بەڵکو دەڵێن (ژنەیل) یا لە باتی (مەردا) دەڵێن (پیاوەیل) یا لەباتی (ئەسپا) دەڵێن (ئەسپەیل) و هەروەها.

ئەم نیشانەیە (یل) لە دەڤەری ئەردەڵاندا بەشێوەی (گەل) دەبێژرێ. وەک (ژنگەل)، (پیاوگەل)، (ئەسپگەل).. هتد.

ئەو چەند نموونەی کە کاک عەلی ئەشرەف هێناویەتی تەنیا لە قوتابخانەو بازاڕی کرماشان و هەندێ دامودەزگادا نموونەی هەیە. ئەوەش (ها)ی نیشانەی کۆی فارسییە و کورت بۆتەوە بۆ (ئەلف).

کاتی خۆی کە ساڵەکەی نازانرێ هەر چوار ئینجیلەکە لەلایەن کەسێکەوە وەرگێڕدراوەتە سەر شێوەی کرماشانی و لە ساڵی (١٩٢٤) لە شاری (لەندەن) چاپ بووە، لەو وەرگێڕانەدا هەرگیز (ئەلف) بەرچاو ناکەوێت کە بەنیشانەی کۆ دانرابێت، بەڵکو هەر (یل) دیاری کراوە. وەک (مەجووسەیل - مەجووسەکان)، (کاهینەیل - کاهینەکان)، (مەلایل - مەلاکان)، (برایل - براکان)، (چشتەیل - شتەکان)، (کیت وەیل - کتێبەکان)و ... هتد.(٣).

هەروەها سەیر ئەوەیە کە کاک عەلی ئەشرەف لەو خشتەیەدا (ئەلف)ی بەنیشانەی کۆ دیاری کردووە. کەچی لەناو فەرهەنگەکەدا نەیهێناوە!!.

**- لایەنە سەرکەوتووەکانی فەرهەنگەکە**

یەکەم: ئەگەر گەشتێک بەناو هەموو فەرهەنگەکەدا بکەین و بۆ وشەی جوان و ڕەسەنی ئەو زاراوەیە بگەڕێین ئەوا خەرمان بەرەکەت هێندە زۆرن شاگەشکەو خەنیمان دەکەن. ئێمە لێرەدا کۆمەڵێ وشە لە پیتی (ئەلف) بەنموونە دێنینەوە بۆ ئەوەی کەسانێک کە شارەزاییان لەو زاراوەیە نییە یا ئەو فەرهەنگەی کاک عەلی ئەشرەفیان نەدیوە شتێک لە بارەی زاراوەکەوە وەربگرن.

- ئاخیە = مێخی ئاخوڕ.
- ئاتەشەک = سوزەنەک.
- ئاتەک و بووتەک = گەورەو بچووک.
- ئارووغ = قوڕقێنە.
- ئازالە = تەپاڵە.
- ئازگار = بەدوای یەکدا.
- ئاژاژگی = باوێشک لێدان.
- ئاشولاش = وردبوون.
- ئاغووز = خرۆ.
- ئامەد = فەڕ.
- ئامژاری = ئازار، نارەحەت کردن.
- ئاو باریکە = تروسکەی هیوا.
- ئاوباز = مەلەوان.
- ئاو زووڵە = تلۆق.
- ئاو کوور = حەق نەناس.
- ئاونگان = هەڵواسراو.
- ئاوێزە = چل چرا.
- ئەبێخ = بەتەواوی.
- ئوینە = خووی ناپەسەند.
- ئەبیر = سەرگەردان.
- ئەپەرە = هەموو، تێکڕا.
- ئوشنار = کونی ژێر دیواری باخ کە ئاوی پیا بڕوات.
- ئوخت = هۆگر.
- ئەختە = ئەزۆک.
- ئورد = خەرمان.
- ئوردەنگ = لەقە.
- ئەزونا = جنۆکە.
- ئەسپار = هەڵپاچین.
- ئەفتاو توونکا = بەرەبەیان.
- ئەنەش = دزێو.

- ئەنوود = سواق.
- ئەفە = هەناسە.
- ئەیاز = شنە.
- ئیز = شوێن پێ.
- ئیوەت = چاودێری.. هتد.

دووەم: ناوی هەندێ یاری و گـەمـەی فۆلکلۆری تۆمارکردووە، کە ئەمەش بۆ لایەنی خـۆی سـوودی تایبـەتی هەیە. ناوەکـان زۆرن و ئێـمـە تەنیـا لە پیـتی ئەلف ئەمانە دیاری دەکەین. - ئاخون.. ئاخون / ئازاڵە.. ئازاڵە/ ئاسارەشیپ شیپ/ ئاسمان چەرەنگە/ ئسیاوبازی/ ئاش وەتەنوورەیی/ ئالنجی کـونجی/ ئامولا قووزیی / ئاوبازی/ ئای تەختە تەختـە تەختـە/ ئەتەل مەتەل/ ئەفتـاو مەتاو / فەلەک دوولەک..

سێیـەم: نووسـەر لە فـەرهەنگەکـەدا زۆرجار دەبینین رستەی هێناوە بەمەستی ئەوەی کـەرستـەکان (کینایە)ن و لەناو خـەڵکی کرمـاشـاندا برەویان هەیە. ئەم کیناییانەش لە فـەرهەنگەکـەدا ژمـارەیان زۆرەو ئێـمـە ناتوانین هەمـوویان بەسـەر بکەینەوە. بەراسـتی شتی باشیـشـە بۆ زمـــانی کـــوردی و هەروەهـا بۆ ئەو کـەســانەی کـە بەدوای بابەتی وەهادا دەگەڕێن. ئەمە نموونەی هەندێکیانە.

- ئەناوی شـاوەنە پەرێز مـەکـونە = کەسی خاوێن و بێخەوش.
- ئافـتـاوە نیـشـان = هەرشـتـێـکی سپی.
- ئاخ و تف دانی = گرتووخانە.
- ئەشکش دەم مەشکە = دڵناسک.
- ئەکوورە دەرەفتەن = تووڕەبوون.
- ئەنتـیـکەی باغی زمـڵــات = ناشیرینێ کە خۆی برازێنێتەوە.
- ئەکـونە ئاسـمـان ئوفـتـا دەن = لە خۆبایی.

- ئەز زیری کــادەراو = تەمــەڵ... هتد.

چوارەم: نووسـەر گەلێ جار وشەکانی لەگـەڵ دەڤـەری (قـەسـری شـیـرین)و (کـولیـایی) بەراورد کـردووە. (قـەسری شیرین) گـەرمەسێرە لەڕووی خۆراوای کرمـاشانەوەو (کولیـایی)ش کوێسـتـانە لەڕووی رۆژهەڵاتەوە. ئەم دوو دەڤەرەش هەندێ وشـەو دەسـتـەواژەی تایبـەت بەخـــۆیان هەیەو هەروەهـا ســـەر بەکرماشـانن. بەم کـارەی نووسـەر هەندێ ئاشنا دەبین بەشێـوە ئاخافتنی ئەو دوو دەڤـەرە کـە ئەمـەش لەڕووی زمـان وشـە ناسینەوە سوودی تایبـەتی خۆی هەیە. هەندێ نموونە:

- ئازاڵە (قـەسری شیرین - تەپاڵە، (کولیایی - لاس).
- ئاشیـخ رووی (قـەسری شـیـرین - کــاروی)، (کــولیـــایی - کــارووا)، فێڵباز.
- ئاکڵە (قەسری شیرین - خۆرە)، کولیایی - گول).
- ئاوسـار (قــەســری شــیــرین - هاوسار)، (کولیایی - لەقاو).
- ئاویەتی (قـەسـری شـیـرین - ئاو خاڵی)، (کولیایی- ئاویەی دەس).
- ئاوخـوڕ (قــەســری شــیــرین - ئاوخاڵی)، (کولیایی - جاوچن).
- ئاوڕ (قـەسـری شـیـرین - ئەوڕ)، (کولیایی - هاوڕ).
- ئاوس (قەسری شیرین- ئاوسەن)، (کولیای - سگ پڕ).
- ئارنگان (قــەســری شــیــرین - قەیدار)، کولیایی - لەدار).. هتد.

پێنجەم: نووسـەر هۆشیـارانە هەوڵی داوە ناوی تەواوی (چێشـتـەکـان)، (باڵندەکــان)، (گـــژوگـیـــا)، (ئەخۆشیـەکـان)، (ناوی شـوێنەکـان - گـوند، شـارۆچکە، چیـا)و ئەمـانەی خستۆتە ناو فـەرهەنگەکـەیەوە کـە هەر هەمووویان پێویسـتـە لەلایەن فـەرهەنگ نووسـانەوە ئاوڕی خۆیان لێ بدرێتـەوە، چونکە لە دروست کـردنی فـەرهەنگی یەکگرتووی زمـانەکـەمـاندا جـێگەی شایانی خۆیان دەگرن.

## سەرچاوەو پەراوێز

١- بۆ زاراوەی (کـەڵهـوڕ) کـە پتـر بەکـاردەهێنرێ ئێـمـە بەشێـوەی (کەڵڕ) نووسـیـومـانە، کـە ئەمـەش راسـتـیی وشـەکـەیەو خـۆیان بەو شـێـوە بەکـاری دێنن. بۆیەکەم جاریش گۆڤاری (ئاوێنە) وشەی کەڵڕی خستە جێگەی کەڵهوڕ.

٢- خـۆزگـە کـاک عـەلی ئەشـرەف بۆ فـەرهەنگەکـەی پشـتـی بەئاخـافـتـنی گـوندەکـانی دەوروبەری کـرمـاشــان ببـەسـتـایە نەک بازاڕو قـوتابخـانەکانی شار. چونکە هەموو دەزانین کە زمان لە گـونددا رەسـەنایەتی خـۆی دەپارێزێ. ئەگـەر ئەمـەی بکردایە ئەوا ئەو چەندان وشـــە فـارســیـــە نەدەخـــزانە ناو فـەرهەنگەکـەوە لە جـێگەیاندا وشـەی کوردیی پەتی دەدرەوشانەوە. ئەگـەرچی هیچ خـەوش نیـیـە بۆ هەر زمـانێ کـە وشـــەی بێگـانەی تێکەڵ ببێ، بەڵام وانەبێت کـە ئەو وشـە هاتووانە وشـە رەسـەنەکـان بمرێنن. لێـرەدا مـەبەسـتم لەسەر ئەم فـەرهەنگەیە و گـەلێ وشـەی ئەو زاراوەیە فـەرامـۆش کـراوەو لە جێگەیاندا وشەی فارسی دانراوە.

٣- گـۆڤـاری ئاوێنە ژمـارە (١٤-١٥).

# دراوێکی کون تێبوو

عەلی ئەشرەف دەرویشیان
و: محەممەد حەسەن رۆژبەیانی

پیرەمێرد لە رۆخ بەردە شکاوەکەی حەوزەکە دانیشت و تەماشای ئاسمانی کردو بەدەنگێکی لەرزۆکەوە وتی:

- وادێن، دەستی لەسەر شانی کوڕەکە دانا، ئێسکی شانی کوڕەکە لەژێر پەنجەکانی پیرەمێرددا بتەوێ و نەتەوێ دەلەرزین.

پیرەمێرد نیمچە هاوارێکی کرد:

- غاردە برۆ حەشارگەکەوە، هەر ئێستا دەگەن و! ئاماژەی بەو بلۆکانەدا کە بۆ دروستکردنی حەشارگەکە لە رۆخی شەقامەکەدا هەڵڕێژرابوون.

کوڕەکە وتی:

- تۆیش لەگەڵ مندا وەرە.

پیرەمێرد بەو شیشە درێژەی کە بەدەستییەوە بوو، دارو بەردەکەی ئەمدیو ئەودیو دەکردو بەدەستەکەی دیکەشی پێستی سپی و خڕی پێنەکەوتووی بن کڵاوەکەی خوراند:

- ئەمین. هەقت بەسەر منەوە نەبێت! تۆ خۆت برۆ زووکە دەی!

کوڕەکە بەدەم خەم و پەژارەوە وتی:

- هەمیشە وام پێدەڵێی. چەندجار بەتۆم وت ناوم ئەمین نییە کەچی هەر دەڵێی ئەمین. پیرەمێرد توڕەبوو:

- خۆ کفرم نەکرد! پێمخۆشە بەتۆ بڵێم ئەمین و، پاشان بەدەم پەژارەوە وتی:

- ئەمین ئەوەی من بوو. ئەوجا تکای کرد:

- تۆ ببەرە ئەمینەکەی من، مەگەر چی دەبێت! کوڕەکە رووی لەدارهەنارە تۆێکڵ سووتاو و هەڵتەقیوەکەی رۆخ حەوزەکە کرد:

- بێگومان تۆیش دەتەوێ ببیتە باپیرم.

- باشە، ئەگەر ببمە باپیرەت، تۆ چ زیانێک دەکەیت. بەسەرسوڕمانەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا:

- باپیری من دەیویست لە بەستەنی فرۆشەکە بێتە دەرەوە، کاتێ فرۆکەکان بۆمباکانیان هاوێشت. لەکاتێکیش تەرمەکانمان دۆزییەوە، سێ قاپ بەستەنی لەناو دەستەکانیدا ببوونە ئاو. من دەزانم بۆ من و خوشکەکانمی کڕیبوو.

پیرەمێرد سەرد گەرم هەڵگەڕاوەکەی خۆی خوراند:

- من دەبمە باپیری تۆ. غەم مەخۆ بەستەنی ناو-قاپیشت بۆ دەکڕم.

- کوڕەکە دارەکەی دەستی بەئاوی حەوزەکەدا کێشا:

- ئەی کێ ببێتە دایکم؟ کێ ببێتە باوکم؟ خوشکەکانم لەکوێ پەیدا بکەم.

- هەموویان پەیدا دەکەین. ئەو ژنانە کە منداڵەکانی خۆیانیان لەدەست داوە، یەکێک لەوانە پەیدا دەکەین و، دەبێتە دایکت ئەگەر لە دایکتیش بکات ئەوە هەر زۆر باشە، کە پەیداشت کرد تکای لێ بکە لەجێی دایکت بێت، بێگومان رازی دەبێت، چونکە ئەویش بەدوای یەکێکدا دەگەڕێت، تا بیکاتە منداڵی خۆی.



کوڕەکە پێکەنینێکی گاڵتەئامێزی بۆ کرد:

- ئەی داپیرەم چۆن؟ خاڵۆم، مامەکانم و خوشکەکانم!

پیرەمێردەکە شیشەکەی دەستی بەرەو ئاسمان هەڵبڕی:

- دیارە تۆیش زۆر تەماحکاری، ئێستا تۆ وا بیر بکەوە کە هەر لەسەرەتاوە ئەوانی دیکەت نەبوون.

- خەیاڵ بکەم؟!

- بەڵێ خەیاڵ بکە.

- کەواتە من خەیاڵی خۆش خۆش دەکەم.

- بیکە، کەسێک دەستی نەگرتووی.

- خەیاڵ دەکەم، خەیاڵ دەکەم لە ئاسمانەوە شرینی و بەستەنی دەبارێت.

- دەمت شیرین بوو؟

- نە هێشتا!

- کاکە من وتم تەنها خەیاڵی ئەوە بکە کە کەست نییە، نەموت خەیاڵی پلاو بکە.

- چۆن کەسم نییە، ئەوان تا مانگێک لەمەوپێش بەپێی خۆیان دەڕۆیشتن بۆ ماڵی ئێمە دەهاتن، لەتەنیشت یەک دادەنیشتین و لە دەفرە گەورەکەشدا تریتی چەلاومان دەخوارد، بەلام ئێستا نە ئەوان هەن و نە دەفری چەلاو.

- منیش وەکو تۆ، ڕەنگە تۆ وابزانی منیش تاک و تەنیام و لە ئاسمانەوە بەربوومەتە خوارەوە!

- کوڕەکە چاوە خڕ و ڕەشەکانی تێبڕی:

- مام و خاڵ و داپیرەشت هەیە؟

- هە.... ها! ئەمین گیان من داپیرەم لەکوێ بوو. وا سەرم لە ڕۆخی قەبر دەلەرزێت.

کوڕەکە لە کەنار حەوزەکە دانیشت، لەودیو دارهەنارەکانەوە بەچکە چۆلەکەیەک بەدەم جیکە جیکەوە دەرپەڕی باڵەکانی خۆی تەکان داو دەنووکی کردەوە. پیرەمێردەکە نوشتایەوەو چوک چوکی بۆ کرد:

- وا خەیاڵ دەکات، کە ئێمە دایکی ئەوین، قوڕبەسەرە برسییەتی. کوڕەکە بەکزییەوە تەماشای بەچکە چۆلەکەکەی دەکردو وتی:

- ئاخر ئەم بێچارەی بێ دایکە، لەکوێ فێری دانخواردن ببێت؟

- ئێمە فێری دەکەین، هیچ گرفتێک نییە.

ئەمەی گوت و: بەنووکی پەنجەی کێشا بەزەویدا، بەچکە چۆلەکەکەش باڵەکانی بەیەک دادان و دەنووکی کردەوەو هاتە پێشەوە.. کوڕەکەش لەتە نانێکی لە گیرفانی دەرهێنا خستییە ناو دەمییەوەو جوی و پاشان پارچەیەکی بچووکی خستە ناو دەنووکە کراوەکەی بەچکە چۆلەکەکەوەو، لە پیرەمێردەکەی پرسی:- - تاکەی دەتەوێت بەناو ئەم وێرانەدا بگەڕێی؟

پیرەمێردەکە بەخەیاڵی پەرت و ئاڵۆزەوە ڕووی لە باڵەخانەیەکی نیمچە ڕووخاوی ئەو بەرەوەی جادەکەی کرد:

- ئەی هاوار مێشکم لەکوێدایە؟ پێویستە ئەوێ بگەڕێم.

کوڕە لەکەنار حەوزەکە هەڵساو دوای پیرەمێرد کەوت:

- باشە.. تۆ پێم بڵێ بەدوای چیدا دەگەڕێیت؟

- ئارام بگرە. ئارام بگرە تا دەیدۆزمەوە. پاشان کوڕەکە پرسی:

- ئەی بۆ پێش بۆمبابارانکردن لەشار دەرنەچوویت؟

پیرەمێردەکە چاوە کزەکانی لە خانووە ڕووخاوەکە بڕی:

- ئازیزەکەم، هەموو شتێک لێرەیە. هەموو شتێک. پاشان ڕووی لە کوڕەکە کردو پرسی:

- ئەی تۆ بۆ دەرنەچوویت؟

- من تا ئێستا نازانم چی بەسەر دوو خوشکە بچووکەکانمدا هاتوون.

پیرەمێردەکە شیشەکەی دەستی بەرەو باڵەخانە نیمچە ڕووخاوەکە درێژکرد.

- من ئەو خانووەم دروستکرد، قوتابخانە بوو.

- وەستابووی؟

- بەڵێ.. وەستابووم.

- نەمدەزانی.

- تۆ زۆر زۆر شت نازانیت. زۆر شت زۆر کەس، زۆرشت نازانن شیشەکەی لەسەر زەوی دانا، جگەرەیەکی پێکرد:

- من پێمگوت بەزگی برسی بۆ قوتابخانە مەڕۆ.

کوڕەکە بەدەنگێکی بەرز پرسی:

- بەکێ؟ بەکێت گوت؟

پیرەمێرد سووتەکەی سەر جگەرەکەی بەسەری پەنجە زبرەکانی گرت:

- بەئەمین، بەگوڵە جوان و ئاسکەکەم، پۆلی یەکەم بوو، هەموو ڕۆژێک خۆم تا بەردەم قوتابخانە دەمبرد. هێشتا ڕێگای قوتابخانە باش شارەزا نەبووبوو.

- ئەی بۆ بەبێ قاوەڵتی بۆ قوتابخانە چوو؟

پیرەمێردەکە چاوەکانی خۆی داخستن:

- ئەو بەیانییە نەمتوانی بڕۆم نانی گەرمی بۆ بکرم. نانی کۆنی بۆ نەدەخورا، لە گەرووی نەدەچووە خوارەوە قورگی زۆر تەنگ بوو. مانگی جارێک دایکی بۆ نەخۆشخانەی دەبرد،

پزشکەکـان وتبـوویان سـیـرنچکی تەنگە. دەیانەوێ بیکەنەوەو فـراوانی بکەن.

پیرەمێردەکە قورگی خۆی خوراند و کەوتە تێفکرینەوە:

- بێگومـان فـرۆکـەوانەکـان نەیاندەزانی کـەروێشکە بچـووک و خرینەکـەی من سـیـرنچکی تەنگ و باریکە. کاتێ کە شیشی پێدادەهێنن زۆر زۆر ئازاری پێدەگات.

کـوڕەکـە بەدەنگێکی پڕ لە ترس و تووڕەبوونەوە هاواری کرد:

- ئەها هاتن.. هاتن! و بەرەو لای بلۆکـەکـان غـاریداو، لەوێ خـۆی شاردەوە، دوو فرۆکـە دەرکـەوتن. دوور رۆیشتن و زوو لە چاوان ونـبـوون، دژەئاسـمـانییـەکـان لە دوورەوە تێـیان بەربوون. پیرەمێردەکە قونگە جگەرەکەی لەپاش رۆیشتنی فـرۆکـەکـان بەتف کوژاندەوەو هەستایە سەرپێ. کوڕەکەش لەژێر بلۆکـەکـانەوە هاتە دەرەوەو بەرەو لای پیرەمێردەکە غاریدا:

- رۆیشتن، بەدڕەفتارەکان تەنها دوو دانەبوون، تەماشایان کرد هیچی وا بۆ تێکدان نەماوەتەوە پێیان پێوەنا.

پیرەمێردەکە ملی بادا:

- هێشتا شتێک ماوە وێرانی بکەن.

کوڕەکە تەماشایەکی دەوروبەری خۆی کرد:

- چ شتێک؟ ئیتر چی ماوەتەوە؟

پیرەمێردەکە دەستی بەسینگی خۆیدا کێشا:

- دڵی من، کـوڕەکـەم، دڵـە شکاوەکەی من.

کوڕەکە پرسی:

- ئەوەکـەت، گـەرووی چاک بووەوە یان نا؟

پیرەمێردەکە دووبارە گەرووی خۆی خوراند!

- پێتیەکانم بشکێن. ئەمتوانی ئانی گـەرمی بۆ بکرم. گـەرووی باریک و تەنگ بوو، بەبێ قاوەڵتی بۆ قوتابخانە رۆیشت.

کوڕەکە دڵی دایەوە گوتی:

- بێگومـان بەو پارەیەی پێی بوو، شتێکی کڕیوە.

پیرەمێردەکە تەماشای زەوی دەکرد:

- لە قوتابخانە جانتایەکی نارنجی بچـووکـیـان پێـدابوو، تا پارەکـانی تێـبکات. ئەو رۆژەم بیـردێتـەوە کـە دراوێکی پێنج تمەنیم پێداو ئامۆژگاریم کرد تا شتێکی پێ بکرێت، پارەکە کون بوو، ماوەیەک لەگەڵمدا مشتومڕی کرد، تا پـارەیەکی سـاغی بدەمێ، بەڵام نەمبوو. ئەمەم زۆر باش لەبیرە.

کـوڕەکـە چوک چوکی بۆ بەچکە چۆلەکـەکـە کـرد. بەچکە چۆلەکـەکـەش دوای کەوت و باڵەکانی بەیەکدا کێشان و ئەوەندەی پێشی کرا دەنووکی کردەوە، کوڕەکە گوتی:

- بەرە بەرە خەریکە فێردەبێت.

پیرەمێردەکە گوتی:

- ئەگـەر دەزانن یەک دەست دیوار بەچی زەحمەتییەک دەکرێت. پاشان دەستەکانی بەرەو کوڕەکە درێژ کرد.

- ئاولەپم ببینە هێشتا بەرد باشترە.

کوڕەکە چوک چوکێکی دیکەی کرد:

- خەریکە فێر دەبێت، پاشان سەیری خانووە نیـمـچە وێرانەکـەی کـرد، چووە ئەوێ و بەناو دارو بەردەکـەدا دەسـتی بەگەڕان کردەوە:

- ئـەوەکـەی تۆ لە کـاتی بۆمبابارانەکەدا بێگومان برسی نەبوو، منداڵان هەر زوو پارەکـانیـان خـەرج دەکـەن. من هەر کـە پارەم **دەست** بکەوێت، چاوەڕێ ناکـەم، **هەر زوو** شـتـێک دەکـڕم و ئاودیوی ناو زگـمی دەکەم. ئەوەکەی تۆش هەر وای کردووە.

زەردەخەنەیەکی تاڵ سەرلێوەکانی پیرەمێردی داپۆشی:

- تۆ.. بێگومان تۆ... زوو خـەرجی دەکەیت؟!

- بێگومان. زوو زوو خەرجی دەکەم، بەدارە کـورتەکـەی دەسـتی بەردو خۆڵەکەی فڕێدایە لاوە، پیرەمێردەکەیش لەپشت ئەوەوە شیشـە ئاسنەکـەی بۆ بەچکە چۆلەکەکە بەزەویدا دەهێناو دەبرد چوک چوکی بۆ دەکرد.

- گـوڵەکـەی من ورگن نەبوو. پارەکەی زوو خەرج نەدەکرد.

کـوڕەکـە لە تەنیـشـت قـەنەفـەیەکی شکاوەوە کۆمەڵە دارو بەردێکی ئەمدیو ئەودیو کـرد، لەژێر دارو بەردەکـەدا، جـانتـایەکی نارنجی دراوی دەرهێنا. لەنێـو پارە پەخـشـوبڵاوبووەکـاندا دراوێکی پێنج تمەنی کـون دەرکـەوت، کوڕە دەست بەجێ پارەکەی هەڵگرت و خستییە گیرفانییەوە، پیرەمێردەکە هێشتا هەر لە پشتییەوە راوەستابوو و خـەریکی چۆلەکـەکـە بوو. کـوڕەکـە بەنەرمونیانی بەپیرەمێردەکەی گوت:

- باپیـرە مـاندوو بووم. با بۆ حەشارگەکە بگەڕێینەوە.

لۆچەکـانی نێـوچەوانی ئەی گـوڵە ئاسک و جـوانەکـەم... ئەمین.. کوڕەکەم.

دەسـتی یەکـیـان گـرت و بەرەو حـەشـارگـەکـە رۆیشتن. بەچکە چۆلەکـەکـەش دەنووکی کـردبۆوە. باڵی **بەیەکدا**داو دوایان کەوت.

* **چوک چوک**: بانگکردنی تەیرو باڵندە.

**سەرچاوە:**

**مجموعه داستان «درشتی».**

# خوێندنەوەی چیرۆکی
# دراوێکی کونبوو

**شوکر سلێمان حەمەد**



چەند وشەیەک بۆ باسێکی گەورە:
هەرچەندە خوێندنەوەی چیرۆکی وەرگێڕاو زەحمەتەو سەختە، رەنگە دووجای ئەو سەختی و ئەو ماندوو بوونە بێت، کە وەرگێڕی دەقێک دوای چەندین گینگلّدان، ئینجا دەستی بەسەر زمانی دووەمدا بشکێ و بتوانێ ئەو دەقە لە دووتووی زمانێک کە خوێنەر لە خوێندنەوەی ئەو دەقەدا هەست بەتام و بۆی واتایەک بکات کە شایەنی لێوردبوونەوەو تێڕامان بێت، بۆیە خوێندنەوەی دەقی وەرگێڕاویش خوێندنەوەی دەقێکە دەکرێ دوو دیو بێت، دیوێک بەلای ئەرێنی و دەرخستنی ئەو لایەنە باش و پۆزەتیڤانەی نووسەر بێت کە وەرگێڕ لە دەقەکەدا وەکو خۆی پێشکەشمانی کردووە، بەدیوێکی دیکەشدا دەشێت خوێندنەوەکەمان دەرخستنی تواناو سەلیقەیی وەرگێڕبێت لەوەی چۆن توانیویەتی فەنتازیا بە وەرگێڕانی دەقەکەوە بکات، هەر لێرەوەش خوێندنەوەکەمان خوێندنەوەی دەقێک بێت کە دەشێ بە کەناری ئەو مەدلولانەوە نەچێت، کە نووسەری دەق مەبەستییەتی. کاتێک ئێمە لە سەرتاوە کەوتووینەتە نێو داوە ئاڵۆزەکانی وەرگێڕەوە دواجار خوێندنەوەی هەر ددقێکی وەرگێڕاو ئەوەندەی بە ئاقاری سەرنجی نەدەبیانەدا دەشکێتەوە ئەوەندە ناکەوێتە دنیای رەخنەوە، چونکە پەینەبردنمان بەو زمانە سەرەکیەی دەقەکەی پێ نووسراوەتەوە، لەو بوارەمان دەترازێنێ، کە ئێمە نەتوانین بەو چاوەوە لەو دەقە بڕوانین و بە ئەرێ یاخود نەرێ. هەڵسەنگاندن و خوێندنەوەی رەخنەییانەی هەر دەقێکیش خیانەتێکی گەورەترە لە ئانەمانەتی وەرگێڕ، بۆیە خوێندنەوەی دەقی وەرگێڕدراو گران و سەخت و زەحمەتە.

**سەرقەڵەمێک بەدەم بای غارەوە:**
پیرەمێردێک و منداڵێک لەناو وێرانەیەکدا، کە شەڕ دوا رق و تووڕەبوونەکانی خۆی بەسەردا باراندوون، بیر لە داهاتوویەکی نادیار

...کەنەوە، پیرەمێردەکە کە لەتەک حەوزێکی نیوە رووخاو و بنەدار هەنارێکی هەڵکرووزاودا دانیشتووە، بە دەنگێکی پڕ لە ترس و بیم و پەژارەوە بە منداڵەکە دەڵێ خۆت لە بۆردوومانی فڕۆکەکان پەنابدە، ئەوکاتەی بانگی منداڵەکەشی دەکات بەناوی کوڕەکەیەوە بانگی دەکات، کە ئەوناوە لای پیرەمێرد برینێکە هێشتا سوێی لێوەدێت، منداڵەکەش وەکو ئەناسینەوەی خۆی بە پیرەمێردەکە دەڵێ: (ئەمگوت من ناوم ئەمین نییە) بەڵام پیرەمێرد ئەو دەقەی بە کوڕەکەی خۆیەوە گرتووە مەحاڵە بەتەنیا نارازیبوونێکی منداڵەکەی وای لێبکات ئەو ناوە دووبارە نەکاتەوە.

لە گفتوگۆی نێوان منداڵەکەو پیرەمێردەکە دەردەکەوێ، منداڵەکە کەسی نەماوەو پیرەمێردەکەش منداڵێکی جوانکیلەی بەناوی(ئەمین) ئاگری شەڕ لولی داوە، ئیتر بۆ دڵدانەوەی یەکتر، پیرەمێرد بە منداڵەکە دەڵێ دەتەوێ من ببمە باپیرەت؟ منداڵەکە راستەوخۆ بیر لەوە دەکاتەوەو دەڵێ، ئەی باوک و دایک و خوشک و براکانم لەکوێ پەیدا بکەم؟

پیرەمێرد بۆ دڵدانەوەی منداڵەکە نموونەی کەسانی دیکەی بۆ دەهێنێتەوە، کە ئەوانیش وەکو ئێمە جگەریان سووتاوە، یەکسەر بە منداڵەکە دەڵێ ئەو ژنانەی منداڵەکانی خۆیان لەدەستداوە یەکێک لەوانە دەکەین بە دایکت؟ منداڵەکە دەکەوێتە دنیای ئەندێشەو خەیاڵ، پیرەمێردەکە بۆ بیرچوونەوەی ئەو ساتە ناخۆش و پڕ لە ئازارانە هانی منداڵەکە دەدات، کە لە دنیای خەیاڵدا مەلەبکات، بەڵام منداڵەکە لە خەیاڵەکانی بەرجەستەی شتێکی واقیعی ناکات، بۆیە پیرەمێردەکە دەڵێ: (خەیاڵ دەکەم لە ئاسمانەوە شیرینی و بەستەنی ببارێت) پیرەمێردەکەش بۆ خۆشکردنی ئەو خەیاڵانە دەڵێ: دەمت شیرین بوو؟ منداڵەکە دەڵێ نا هێشتا)، بەڵام منداڵەکە لە پڕ بیر لەو ساتەی بەر لەئێستا دەکاتەوە، کە هەموو ئەندامەکانی ماڵەوەیان لەگەڵ ئەو بەیەکەوە هەڵساون و دانیشتوون و نانیان خواردووە، بەڵام ئێستا ئەوان کەسیان نەماون، پیرەمێردەکە یەکسەر دێتە وەڵام و دەڵێ: منیش کەسم نەماوە، لەو دەمانە بەچکە چۆلەکەیەک لەنێو ئەو دارو بەردەوە دەردەچێت، پیرەمێردەکە وەکو ئەوەی خۆی بەخاوەنی هەموو ئەو مەخلوقانە بزانێت کە شەڕ ماڵی لێ تێکداون، چیکە چیکی بۆ دەکات و دەیەوێ شتێکی بداتێ، منداڵەکەش وەکو کەسێکی بە تەمەن هەڵسوکەوت دەکات و پارچە نانێک لە گیرفانی دەردەهێنێت و دەیجوێت و هێدی هێدی دەیکاتە دەمی بێچووە چۆلەکەکە.

پاش تاوێک منداڵەکە لە پیرەمێردەکە دەپرسێت: تاکەی دەتەوێ لەنێو ئەو وێرانەیەدا بگەڕێیت؟

پیرەمێردەکە ئاماژە بە ئەپارتمانێکی رووخاو دەکات، کە فڕۆکەکان وێرانیان کردووە، دەڵێ: هەموو شتێک لێرەدایە، پاشان لە منداڵەکە دەپرسێت ئەی بۆ پێش بۆردومان دەرنەچوویت؟

- من بۆ دوو خوشکە بچووکەکەم دەگەڕێم، نازانم چییان بەسەر هاتووە!

پیرەمێردەکە لەو کاتانە منداڵەکەی خۆی بیردەکەوێتەوە، کە ئەو بەیانییە بە برسێتی چووە قوتابخانەو ئیتر نەگەڕایەوە، منداڵەکە پرسیارێکی منداڵانە دەکات، بۆچی بە برسێتی چوو بۆ قوتابخانە؟

پیرەمێردەکە بەداخ و حەسرەتەوە دەڵێ: نەمتوانی بەیانی زوو بچم نانی گەرمی بۆ بکڕم، ئیتر ئەویش نانی سارد ناخوات.

لەو دەمە منداڵەکە بەدەنگێکی پڕ لە ترس و بیمەوە دەڵێ: ئەها هاتن.. لەو دەمە دوو فڕۆکە دەردەکەون و لە ئاسمانی دوورەوە بەرەو لایەکی دیکە دەڕۆن، منداڵەکە دەڵێ: جا چ شتێک ماوە وێرانی بکەن؟ پیرەمێردەکە بەدەنگێکی پڕ لە قەهرو تینەوە دەڵێ: بەڵێ یەک شت ماوە وێرانی بکەن، ئەویش دڵە کۆستکەوتووەکەی منە! تا دواجار پیرەمێرد بیر لەو ساتە کورتە دەکاتەوە، کە بەیانییەکەی پێش ئەوەی منداڵەکەی بۆ قوتابخانە وەڕێبکەوێ(پێنج تومەن)یەکی کونبووی داوەتێ، ئەمە تاکە یادگارییە کە هەمیشە برینەکانی ناخی پیرەمێرد دەکولێنێتەوە کە داخۆ منداڵەکەی پارەکەی خەرجکردووە، یان نا، دواجار منداڵەکە لەژێر دارو پەردووی وێرانەکەدا جانتایەکی نارنجی دەدۆزێتەوەو سەیردەکات لەنێو کەلوپەلە پەرشوبڵاوەکانی نێو جانتاکە(پێنج تومەن)یەکی کونبوو دەردەکەوێت،، بەڵام بەبێ ئەوەی

پیرەمێرد پێ بزانێ دەیخاتە گیرفانییەوە، ئیتر هەردووکیان دەست لەناو دەست لەنێو ئەو وێرانەیەی کە تەنیا ئەوانی تێدا دیارە بۆ حەشارگەکەیان دەگەڕێنەوە.

**پرۆسەی رامان و جێگرتنەوە لە دراوێکی کونبوودا**

عەلی ئەشرەفی دەروێشیان یەکێکە لە چیرۆکنووسە بەناوبانگەکانی ئێران و لەبواری کورتە چیرۆکیشدا یەکێکە لە کەسە هەرە دیارەکانی ئەو بوارە، لە چیرۆکی(دراوێکی کونبوو) من نازانم وەرگێڕ چەند توانیویەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ دەقەکەدا بکات و، تا چەندیش توانیویەتی لەو دیوی مەبەستی چیرۆکنووسەوە شتێکی جوان فەراهەم بکات و، خوێنەری کورد ئاشنای دەقێکی جوان بکات، کە چێژ ساغڵەمانە هەست بەتامویۆی دەقێکی کوردانە بکات.

لەم چیرۆکەشدا هەندێ ئاماژەی جوان دەبینین، بەتایبەتی کاتێ کە پیرەمێرد بانگی منداڵەکە دەکات بۆ خۆحەشاردان، وەکو ئەوەبێ بانگی کوڕەکەی بکات کە ئەمڕۆ دەمەو بەیانی بەرەو قوتابخانە بەڕێکەوت و ئیتر نەگەڕایەوە، ئەو کارەساتە هەمیشە وەکو تراژیدیایەک لە بەرچاوی مامە پیرە ون نابێت و لەگەڵ بەردەوام دیتنی ئەو شارە وێرانەیەی ئەو کە یەک پارچە خاپوور بووە، کۆستەکەشی هەمیشە دووبارە دەبێتەوە.

بۆیە پیرەمێرد بەوپەڕی هەست و سۆزییەوە باوکانە بانگی منداڵەکە دەکات و دەست دەخاتە سەرشانییەوە وەکو ئەوەی جگەرگۆشەکەی خۆی ڕێنمایی بکات لە ناخەوە بەهەمان ناوی کوڕەکەی بانگی ئەو منداڵە دەکات، کە دواجار نیازی ئەوەیەتی لەم تەمتومانی وێرانەیەدا ئەو منداڵە شوێنی جگەرگۆشە جوانەمەرگەکەی بگرێتەوە، رازیبوونی منداڵەکەش لێرەوە سەرچاوە دەگرێ کە دەبینێ پیاوێک لەنێو تارمایی شەڕدا سەرتاپای سۆزو بەزەییە، دێتە ژێرباری ئەوەی، کە دەکرێ مرۆڤ جێگەی مرۆڤ بگرێتەوە، بەتایبەتیش کاتێ پیرەمێرد بەوپەڕی سۆزو میهرەبانی باسی ئەوەی بۆ دەکات، کە ئەگەرچی ئەو دایک و خوشک و براکانی نەماوە، بەڵام دەکرێ مرۆڤ ئافرەتێک بکاتە دایکی خۆی، کە دایکی نییە، بەڵام ئەوەی خوێنەر سەرسام دەکات هەستی ئەو منداڵەیە، کە بەوپەڕی وردبەرزییەوە ئیش بۆ مانەوەیەک دەکات، کە ڕەنگە زۆر لە گەورەکانیش ئەو هەستەیان نەبێت، بەتایبەتی کاتێ منداڵەکە ئەو بێچووە چۆلەکەیە دەگرێتە باوەش و نانی دەداتێ، جوانترین وەلامیش کە ئاراستەی پرسیارێکی نەشیاو و نەکردەی پیرەمێردی دەکات ئەوەیە کە دەڵێ:(ئێمە فێری دەکەین) ئەوەی لەم دەقەشدا زۆر بەجوانی خۆی دەرخستووە، هەڵسوکەوتی ئەو منداڵەیە کە دواجار پارە کونبووەکە دەخاتە گیرفانی و دەستی پیرەمێرد دەگرێ بۆ گەڕانەوەیان بەرەو حەشارگەکە، ئەمە جوانترین ئاماژەیە کە چیرۆکنووس وەکو بەرچاو روونییەک خوێنەر دەخاتە سەر راستە شەقامێک لە دیتنی ئەو وێرانەیەی شەڕ ڕەنگرێژی دەکات، ئەو چارەنووسە نادیارەی شەڕ بە کوێری تەڕو وشکی بەیەکەوە سووتاندووە، کە چیرۆکنووس لە دنیای وێرانەیەکدا بەردەوامییەک لە دیدی منداڵەکەو بێچووە چۆلەکەکە دروستدەکات، کە شەڕ رۆژێک دێت و بیبڕێتەوەو ئاشتی دووبارە لە دەرگەی ماڵەکانمان بداتەوەو ئاگردانەکان ئاوەدان ببنەوە، دوا مژدەی کوڕەکەش بانگکردنی پیرەمێردە بە وشەی(باپیرە)کە تەواو ئەو نومێدە بە مامەپیرە دەبەخشێتەوە کە ئەوەیەک بە چەشنی (ئەمین)ی جگەرگۆشەکەی پێشکەش بە رۆژگارێک بکات کە دووبارە شەڕ دەبەزێ و لەدوای ئەو دنیایەکی جوان بینا دەکرێتەوە.

ئەم چیرۆکەی عەلی ئەشرەفی دەروێشیان کە کاک محەمەد حەسەن رۆژبەیانی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، دەکرا لە رووی روانین و جوان سەیرکردنی دەستەواژەکان هێشتا کاری بۆ بکرایەو باشتر وەربگێڕدرایە، من لەبەر ئەوەی فارسی نازانم، ئەمتوانی قسە لەسەر ئەو لایەنەی چیرۆکەکە بکەم، کە چۆن وەرگێڕ کاری لەسەر دەقە فارسییەکە کردووە، بەڵام لە خوێندنەوەم بۆ دەقەکە هەندێ لەنگیم بەرچاو کەوت، کە ناکرێ چیرۆکنووسێکی وەک عەلی ئەشرەف ئەو شتانەی بەسەردا تێپەڕبێت.

# سەرانسەری شەو

عەلی ئەشرەفی دەروێشیان
و: لە فارسییەوە: شادی نیکفا

ژنەکە لە تاریکیدا لەناو جێگەکەیدا تلایەوەو لەناو قاچ ئێشان ناڵاندی:

- دیسان دەستی پێکردەوە! چەند دەنگێکی تەزوو هێنەرە، ئەڵێی رەگ و رەچەڵەکی مرۆڤ ئەجوون.

پیاوەکە سەیرێکی تیشکە باریک و زەردەکەی چرای کۆڵانەکەی کرد، کە لە کونجی ژوورەکەدا شکابوویەوە.

- خەریکین بەرەبەرە پێی رادێین.

- من قەت رانایەم هەر کاژێرێک و بەجۆرێکە تاوێک وەکوو دەنگی جووینی قاقەزە، دوایی وەکو دەنگی جووینی داری لێدێت. دوایی مقەباو هەروەها تا گەرەکتە لەگەڵ یەکیان رابێیت، دەنگەکە جۆرێکی تری لێدێت.

ژنەکە، پاش چرکەیەک بێدەنگی، لەپڕ وتی:

- ئاها! بڕوانە! ئیستە وەکوو دەنگی جووینی سابوون یان گۆشتە.

- ئەوە سەرت دا لەو گوێنووانە؟ بەبا مشکەکان شوێنیان هەڵکردبێن. ئەوانە تەنیا شتێکە کە بۆمان ماوەتەوە.

ژنەکە لە نێوان وتن و نەوتندا دوودڵ ماو سەرەنجام بۆوەی قسەیێکی کردبێت چپاندی:

- دوێنێ هەموویانم پشکنی. یەکێ لە گوێنووەکانیان کون کردبوو.

- دەی

- چەند دانەیەکیان جووی بوو.

- کامانە؟

- نازانم.

- حەیفێ!

- بریا ئەمانەشت زستانی پێشوو دەخستە ناو زۆمپاکە.

- سێ مانگەی زستان بەس نەبوو؟ یانێ دەبووا دیسان درێژەمان بدایەتێ؟

- بەهەرحاڵ لە دەست ئەم بارە گرانە رزگارمان دەبوو. گوێنووەکان ئەکەونە بەرچاو. هەر کە ئەمانەوێ ماڵ بگوێزینەوە، کۆستم ئەکەوێ.

دەنگی جووینەکە توندتر بووەوەو هەردووکیان بێدەنگ بوون.

ژنەکە تاقەتی نەما:

- وەک شتێ یەکجار زۆرن.

پیاوەکە دەستی نایە سەر دەستی ژنەکەی کە ئەهۆنی بکاتەوە:

- بابخۆن، سەرەنجام ماندوو دەبن.

- هێشتا هەوەڵیانە.

دەنگی پیاوەکە نەختێک گرژبووەوە:

- ئەڵێی چیبکەم لە بەیانی زووەوە تائێستە لەسەرپێ بووم. ناتوانم پاژنەکانم بنێمە عەرد.

- زستانی داهاتوو خۆت لە شەڕیان رزگار بکە، کوڕم هەر بۆ ئەمەم کڕی.

- نەئەبوا منداڵمان ببوایە.

- ئەو رۆژانە چ دنیایێکمان بوو.

ئێستە ئیتر ئەو دنیایە رووخاوەو تۆ ماویتەوە کە چۆن خەرجی منداڵەکان دەربهێنی.



- بەڵێ؛ بەڵام ئێستە سێیان لەلامان نووستوون و خەریکن هەناسە دەدەن.
- ئەوە چۆنن؟
- دوێشەو مشکەکان، روومەتی سپیێدەیان گاز لێگرتبوو.
- ئەی هاوار! دەرمانت لێدا؟
- نەختێ مەلهەمم لێدا.
- ئەبوا بەسابوونیش بتشۆردایە.
- شۆردم
- بەڕای تۆ باشتر نییە بڕێکیان لێ جیا بکەمەوەو لەسەر شۆستەی بەرامبەر پارکەکە بیفرۆشم؟
- ئەگەر لێت بەگومان بن؟
- مەترسە، خۆشبەختانە ئەم ساڵانە چاک پیربووم. رووالەتم زۆر گۆڕدراوە.
- خۆزگە زووتر پیر دەبووین تا ئەم دڵەڕاوکێیانە کەمتر دەبوونەوە.
- ژیان بۆ ئێمە هەمیشە هەر بەم جۆرەبووە.
- ئەو رۆژانە ژیان جۆرێکی تر بوو.
- لافاو کە دێت، تۆیش لەگەڵ خۆی دەبات.
- لافاو هەموو شتێکی بردو سێ منداڵی بەسەرمانەوە جێهێشت.
- هەر ئێمە نین.
- کەسانی تریش وەک ئێمە کایان بەبا کرد.
- هەر کەسێک چارەنووسێکی هەیە.
- خۆ گۆشتیشمان نییە.
- لەوانەیە بەرِوییێکیان دەست کەوتبێت.
- ئاخر ئاوەها؟
- روویلن پژاوە.
- خۆزگە پشیلەیێکمان ببوایە.
- حەبی خەوت نییە؟
- بۆ مشکەکان؟
- هەی هۆ! بەم نیوەشەوە گەمەت گەییوە؟ بۆ خۆم.
- هەمووم خواردووە.
- بەیانی لە داروخانە بیکرە.
- دەست ناکەوێت.
- هەڵبەت لەبەر ئەوەی زۆر بەکاری دەهێنن.
- باشتر وایە هەمیشە چەند دەنکێکمان بۆ ئەم جۆرە شەوانە لە ماڵەوە بێت.
- ئەو شەوانەت لە بیرە تا بەیانی دادەنیشتین؟
- یادی بەخێر. پەیتا پەیتا دەموچاومان دەشۆرد کە خەوەکەمان بزڕێ.
- مەودا کەم بوو و دەستکەوت کەمتر. ئەگەر چوار پێنج ساڵێکی تر درێژەی ببوایە جا ئەنجامەکەیت دەدی.
- بۆ درێژەی پێنەدرا؟
- نەیانویست.
- ئەنجامێکمان وەرنەگرت.
- هیچ باسێک نییە کە ئەنجامێکی لێ وەرنەیگرێت.
- دەستکەوتەکەشی بوویە ئامەی کە دەیبینی.
- ئەمڕۆ چەند کۆپینێکی فەرمانبەریم کڕی.
- دەی.
- ئەوەی کۆپینەکانی پێ فرۆشتم حەوتووی رابردوو مێردەکەی جەڵدە لێی دابوو.
- بێچارە!
- تەمەنی سی و دوو ساڵ بووە لەسەر کەلاسدا کەوتووە و تەواو. منداڵەکان بەسەر دەستەوە بردویانە بۆ نەخۆشخانە: بەڵام لەناورێدا تەواوی کردووە.
- ئاگات لە خۆت بێت جەڵدە یەکجار زۆر بووە کەمتریش بخۆرەوە.
- نەک وەکو ئێمە.
- دەی برێ کەس وریان.
- ....
- لافاو خەریک بوو دەیبردم و دەرفەتی وریابوونەوەم نەبوو. ئەگەریش دەرفەت ببوایە، من پیاوی ئەم مامەڵانە نەبووم.
- ئێمەش وەک ئەوانی تر دەبوا چارەییێکمان بدۆزیبایەتەوە. ئەوان هیچ نەبێ بەدەست ئەم دەنگی جووینە رزگارن
- ئەگەر لێرە بچووباین، دەمردم.
- بەراست چیبکەین؟
- دەبێ تەڵە بکڕین.
- دەستم نەکەوت.
- دەوا مشک.
- توخنی ناکەون.
- دەی لەبەر کونەکە باندا دانیشین و یەکەیەکە بیانگرین.
- زرت و زیت و وریان.
- خەریکن گوێنووەکان ئەجوون، گوێ گرە!
- ئەبێ چیبکەین؟
- ماڵ گواستنەوە. شوێنێکی باشتر.
- پارەمان نییە. ئەمجا هەموو شوێنێک پڕە لەمشک. سەیرێکی جۆگەلەی لای شەقامەکان بکە هێندە زۆرن، لە یەکتر هەڵدێن. دوێکە دانەیێک هاتبوو لە سووچێکی دووکانی نانەواییەکان بەبەرچاو ئەو هەموو خەڵکەوە، عەدلە ئاردەکانی کون تێدەکرد.
رۆژنامەکان نووسیویانە کە بەکۆمەڵ هێرشیان بردۆتە سەر گوندێک منداڵێکی ساوایان لەناو بێشکەکەیدا خواردووە.
- بێدەنگ بە بزانم ئەو دەنگە چییە؟
- جووین.
- وەکوو جووینی گۆشت و ئێسقان.
- وەکوو جووینی سابوونە، بەڵام خۆ سابوونەکانمان ئەمڕۆ تەواوبوون.

- ئەی ئەمە چییە.
- ژنەکەی ئەیوت چوار منداڵی خوارو ژووری هەیە.
- نازانم ئەم کچە بۆ چ هەر دەناڵێنێ؟
- وابزانم ناڵەی سیاوەشە.
- نا! سپێدەیە.
- نا بزانە یادی نەبێ!
- نە! لەشی گەرم نییە.
- بزانە لێدانی دڵی چۆنە!
- توند لێدەدا.
- کەوابێ یاوی هەیە، هەڵبەت ئەمڕۆ سەرمای بووە.
- چووبووە حەوشەکە و ئەو کورە نازنازییەی خاوەن ماڵەکە تەڕی کردبوو.
- ئەم هەتیوە ئاخری پەنێکمان پێدەدا.
- دوێکەیش سپێدەی ترنجاندبووە کونجی ئەو حەوشەو بەدار ئەیدا بەسەریدا.
- ئەبێ ئەوەندە سەرکوت بکرێت تا ئەگاتە تەمەنی ئێمە.
- دەی
- دەی هەستە حەبی تای بۆ بهێنە! بەڵام حەبی تایش بەتەنیا بەس نییە، دەبێ «ئانتی بیوتیک»یشی بدەیتێ.
- کەپسولمان هەیە، ئاموکسی سیلین دووسەدو پەنجا.
- دوانی بدەرێ، هەر شەش سەعات جارێک.
- زۆر نییە بۆی؟
- نا
- بووە بە دووچڵ ئێسقان.
- ئەگەر دڵت دەسوتێت بۆی، مەهێڵە بچێتە حەوشەکە.
- ناچار غافڵ دەبم، دەڕوانم وا لە حەوشەکەدا.
- ئەمڕۆ ژنێک کۆپینەکانیی ون کردبوو، سرویسێکی تەواو.
- هەر ئەم کۆپینانەی تازە داویانە؟
- نا
- بێچارە!
- وەک ئازیز مردووە، عەباکەی بەستبوو بەدەور کەمەریدا بەهەردوو دەست دەموچاوی خۆی ئەڕنی.
- خوانەیکاتە بەش گورگی بیابانیش!
- هەواڵێکی تر! ئەمڕۆ یەکێک لەو مامۆستایانەم دیت کە جاران پێکەوە لە یەک قوتابخانەدا وانەمان دەوتەوە. لە کارگەیەکدا کاردەکات.
- ئەویش وەک تۆ؟
- ئەرێ، تەواو پیر بووبوو و تێکشکابوو. دەستەکانیشی زبرو قڵیش قڵیش.
- کاری چییە؟
- فیتەری.
- ئەی بۆچی کەلامی فیتەرکاریی تایبەت دانانێت؟
- نا لەم ڕۆژەدا کەس ناکەوێتە شوێن ئەدەبیات. چووبووە دوکتۆر، وتبووی دوو شە وەکوو ژەهری بۆی، نان و کار!
- نان نابێ بخوات و کاری زۆریش نابێ بکات.
- ئەی داماو! چ نەخۆشییەکی سەیرە!
- دەگریاو دەیوت ئەگەر ئەم دوانە نەبن دەبێ سەر بنێمەوەو بمرم.
- ئەم منداڵە چەند دەناڵێنێت!
- هی یاوە.
- کەپسولەت داینێ؟
- ئێستە خەبەری دەکەمەوە، تۆ دەمی هەڵچرە بۆ من.
- وەیش بروانە مشک روومەتی ئەم کچەی تریشی جوویوە.
- ئەی هاوار! دەبێ بەسەریانەوە ئێشک بگرین.
- ئەمەیش مەڵهەم بۆ ئەم یەکەیان.
- حەپی یاویشت پێدا!؟
- پێم دا.
- دەنگی جووینەکە کەمترەوە بووە.
- هەڵبەت هیچ بۆ جووین نەماوەتەوە.
- لە پێناو تۆ یان من؟
- دوو سەعاتی یەکم من ناخەوم.
- باشە. خۆزگە هەر شەو تەواو نەبێت! شەوانە زۆرتر هەستی هێمنایەتی دەکەم.
- بەرۆژدا چوونە دەرەوە بۆ تۆ، هەوا گۆڕینێکە: بەڵام من لە کونجی ماڵەوە دڵم ئەڕزێ.
- چ گۆڕانێک؟ پەستم. دوێکە کابرایێک کە هەر ساکە سامسۆنیتەکەی بیست هەزار تمەن ئەژیا، قەڵەم جافێکی لێدزیم.
- لێت سەندەوە.
- نا. چەند هەنگاوێکیش بەدوایدا چووم، بەڵام تەریق بوومەوە شتێک بڵێم.
- زیاتر ئاگادار بە.
- ئەی ئەویان، سیاوەش، سەرت لێدا؟

ژنەکە لە تاریکیدا دەستی بەرەو کورەکە درێژکردەوە. دەستی بەلەشیدا هێناو لە ناکاو زریکاندی:

- ئەی هاوار منداڵەکەم!... گوێچکەکەی... گوێچکەکەیان خواردووە.

پیاوەکە سەراسیمەو هەڵپرووکاو، لەسەر جێگاکەیدا، دانیشت.

**سەرچاوە:**

گۆڤاری (معیار) ژمارەی ٥٣ی ساڵی ١٣٨١ - تاران.

## کورتەیەک لە ژیان و بەرهەمەکانی

# عەلی ئەشرەفی دەروێشیان

**وا و کورتکردنەوەی شادی نیکفا**

لە کرماشان هاتمە دنیاوە، ستیەمی خەرمانانی ١٣٢٠ی(هەتاوی) باوکم، وەستاسەیفولڵلا، لە (گەراج) ئاسنگەربوو. دوکانەکەی لە کیس چوو، لەگەڵ مامەکانم بوو بەشەریان و دوکانەکەیان لە چنگی دەرهێنا. بەناچار بوو بەشاگردی شوفێر، بوویە باخەوان، قەساب، وردەواڵە فرۆش و چەند جۆرەکاری دیکەش. دوایی کە من گەورە بووم و بووم بە مامۆستا، سەرپەرشتی بنەماڵە حەوت کەسییەکەی خستە سەرشانی من و خۆی هەڵهات چوو بۆ شیراز، ئەویندارى حافزو سەعدی بوو، ماوەیێک بوو بە قاچاخ فرۆش و بەو هۆیەوە کەوتە بەندیخانە کە لەکتێبی«ئاشبووران»و«ساڵە هەورییەکان»دا نووسیومە. ئاخریش لە شیراز، لە غوربەتدا نەخۆش کەوت و لە کەرەج ماڵئاوایی کرد.

دایکم، زەهرا، جگەرەی بە قەڵەم لوول دەکرد. هەڵبەت من لەبیرم نایەت، بەڵام هەرچی چاوی دەهاتە ئێش و ئازاری دەدا دەیوت کە بەهۆی جگەرە قەڵەم کردنەوەیە. زوو جگەرد ئابەم شێوەی ئەمڕۆ نەبوو، پەڕە جگەرەکەیان بەشتێکی وەکو قەڵەم لوول ددکردوو دیاندا بە جگەرەفرۆشەکان، ئەوانیش توتنیان دەکردە ناو پەڕە جگەرەکان.

داپیرم خەیات بوو و مشتەرییەکان لەسەرانسەری کرماشانەوە کاریان بۆی دەهێنا. دایکم ماوەیەک کلاشی دەچنی، پاش داپیرەم خەیاتی دەکرد، بەشێکی زۆری ژیانم لە«ئاشبووران»دا نووسیوە، «لەگەڵ ئاهەنگەکانی باوکمدا» نووسیومە. لە«وەرزی نان»دا نووسیومە لە«ساڵە هەورییەکان»دا نووسیومە. یەکەم کەسێک کە لەگەڵ ئەفسانەو رازەکاندا ئاشنای کردم، داپیرەم بوو. تەنانەت ئەوبوو کە بێ ئەوەی خوێندەوارییێکی ببێت، لەگەڵ ناوی سادقی هیدایەتدا ئاشنای کردم. یەکێک لە چیرۆکەکانی سادیق هیدایەتی لەبەربوو، دەیگێڕاوە بۆم، نازانم ئەو چیرۆکەی چۆن و لە کوێوە بیستبوو. چیرۆکێک بوو بەناوی «داوای لێبوردن».

خاڵۆ گەورەکەم قاڵبڕێژبی بوو، تەمەنم شەش ساڵان بوو کە دەچووم بۆ دوکانەکەی و شاگردیم دەکرد.

سەروازخانەیەک لەپشت ماڵمانەوەبوو، زۆرجار سەروازەکانیان شەللاق کاری دەکرد. هاواری سەروازەکان تا کۆڵانەکەو ماڵی ئێمە دەهات. دەچووینە سەربان ئەفسەرەکان دەوەستان تەپڵ لێدەرەکان تەپڵییان ددکوتاو چەند کەسێکیش بە شەللاق لەو سەربازانەیان دەدا هەڵەو نافەرمانییان کردبوو بۆ ئەوەی کەس دەنگی هاوارەکەیان نەبیسێ، تەپڵییان لێدەدا.

هەر لەو سەردەمی منداڵیمەوە رقم لە هەرچی ئەفسەرو سەرهەنگە هەڵگرت. لەسەر بانەکە لەپاڵ دایکمدا دەگریام بۆ سەروازەکان. وا هەنسکەهەنسکم ددکرد، کە دایکم لێم توڕەدەبوو و دەیقیژاند بەسەرمداو دەیوت:«ئاخۆ مەگەر ئەم سەروازە برای باوکتە کە ئاوەها بۆی دەگریت؟»

کە تەمەنم بوو بە دوازدە ساڵ، کوودەتای ٢٨ی گەلاوێژی شا روویداو من بۆ ئەو ئەفسەرو سەرهەنگە توودەییانەی کە تیرباران کران، شینم کرد.

زیاتر ماڵمان هەر بەکۆڵمانەوەبوو، لە زۆربەی گەڕەکەکانی کرماشاندا، کرێچی بووین، لەوانە گەڕەکەکانی(سەرتەپپەچەنانی- نیمچەی مەلا عەباس عەلی- گوزەری ساحێب جەمع- دەرگای تەوڵە- ئاشبووران- سەنگە مەعدەن- چەند جێگای دیکە).

هەر بۆیە لەساڵە هەورییەکاندا هێندە

گەلاوێژ

ـسی کۆچاوکۆچ و کرێ نشینیم کردووە، هەرچەند بنووسم هێشتا ئەو ئازارانەی لە دڵمدا ماونەتەوە سارێژنابێت، تەنیا کەسێک کەخۆی گیرۆدەی ئەو دەردە بووبێت، دەرکی ئەو کۆچاوکۆچانە دەکات.

لەبەر ئەوەی هەمیشە خەریکی ماڵ گواستنەوە بووین، بەناچار شوێنی قوتابخانەشمان دەگۆڕا سەرەتاییم لە سێ قوتابخانە تەواوکرد. کوورش- پانزەی ڕێبەندان و بەدر.

دوایی چوومە قوتابخانەی ئامادەیی کەزازی. پاشان دووساڵ لە زانستگەی ئامادەکاریی کرماشاندا خوێندم و بوومە مامۆستای لادێ. هاوینان و ڕۆژانی پشوودان بۆ دەرهێنانی خەرجیی بنەماڵەو دەرس خوێندنی خۆم کارم دەکرد، شاگرد بەنایی، شاگرد ئاسنگەری، شاگردی دووکانە جۆربەجۆرەکانم دەکرد، هەرچی باوکم یارمەتی دەویست لەبەردەستیدا کارم دەکرد. جارێک من و باوکم هەردووکمان شاگردی یەک ئاسنگەربووین، سەردەمێک بارکێشی و حەماڵیم دەکردو ئێسقانەکانم لەژێر بارە قورسەکاندا جیڕەی دەهات. بەباشی فێری بەنایی بووم سەردەمێک لام وابوو بەنایی دژوارترین کاری دنیایە، بەڵام ئێستا لەسەر ئەو بڕوایەم کە هیچ کارێک لە دنیادا، لە نووسەری دژوارترین و تاقەت پڕووکێنتر نییە.

لەساڵی ۱۳۳۵ی هەتاوییەوە کە چوومە زانستگای ئامادەکاری، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر حەزم لە خوێندنەوە دەکرد، کتێب لە نانیش لام پێویستتر بوو.

هاوکات، لەزانستگای باڵای تاراندا، لەبواری راوێژکاری و ڕێنوێنی و لەزانکۆی تاراندا لەبواری دەروونناسیی پەروەردەییدا دەرسم خوێندو، هەردوو بوارەکەم تا ماجستێری درێژەم پێدا.

لەهاوینی ۱۳۵۰دا لە کرماشان بەهۆی چالاکیی سیاسی و نووسینی کۆمەڵە چیرۆکەکانی«سەبارەت بەم وڵاتە» گیرام و دوای هەشت مانگ ئازادکرام، دوومانگ دواتر دیسان لە تاران گیرامەوە و حەوت مانگ بەندیخانەم بۆ بڕایەوە، لەسەرکاری مامۆستایی لابرام و لە زانکۆش دەرکرام.

جاری سێیەم لە گوڵانی ۱۳۵۳دا گیرام و یازدە ساڵم بۆ بڕایەوە، لە حاڵێکدا کە سێ مانگ بوو زەماوەندم کردبوو، لە خەزەڵوەری ۱۳۵۷ پاش سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران لە بەندیخانە ڕزگاربووم.

کوڕەکەم بیهرەنگ هەژدە ساڵەیەو خوێندکاری بواری کیمیایە. کچەکانم گوڵۆەنگ و گوڵبەرگ لە قوتابخانەی دوا ناوەندیی. شانازی هاوسەرم مامۆستای ئینگلیزییەو پێکەوە باری ژیانمان لەسەرشان گرتووە.

ئەوانەی تا ئێستا چاپم کردوون بریتین لە کۆمەڵە چیرۆکەکانی:-

١- سەبارەت بەم وڵاتە
٢- ئاشبووران
٣- وەرزی نان
٤- لەگەڵ ئاهەنگەکانی باوکم
٥- درشتی
٦- ئینفیرادیی ١٨ (ڕۆمان)
٧- چیرۆکەکانی بەند
٨- ساڵە هەورییەکان(ڕۆمان لەچوار بەرگدا)
٩- هەڵبژاردەی چیرۆکەکان
١٠- چیرۆکە تازە گەرمەکان
١١- لە[نییەتی]دوە تادارا(هەڵبژاردەی چیرۆکەکان)ئەدەبی منداڵان و مێرمنداڵان
١٢- هەوری چاوڕەش
١٣- گوڵی زێڕ
١٤- ڕۆژنامە دیوارییەکەی قوتابخانەکان
١٥- کەی دێیتەوە کاکە گیان؟
١٦- ڕەنگینە.
١٧- ئاگر لە کتێبخانەی منداڵاندا.
١٨- لێکۆڵینەوەی ئەدەبیات منداڵان و مێرمنداڵان (کەشکۆڵی ئەدەبی و فەرهەنگی لە سێ ژمارەدا).
١٩- کتێبی منداڵان و مێرمنداڵان (کەشکۆڵی ئەدەبی و فەرهەنگی یازدە ژمارە).

هەروەها

٢٠- کتێبی بێستون (کەشکۆڵی ئەدەبی فەرهەنگی ژمارەی یەکەم.
٢١- بیرەوەریەکانی [سەفەر قارەمانی].
٢٢- ڕۆژی یەکەمی پشوودان (چیرۆک و وتار).
٢٣- ئەو چیرۆکانەی خۆشم دەوێن (بەهاوکاریی ڕەزا خەندان مەهابادی).
٢٤- فەرهەنگی ئەفسانەکانی خەڵکی ئێران (بە هاوکاریی ڕەزاخەندان مەهابادی).
٢٥- فەرهەنگی زاراوەی کرماشانی.
٢٦- ئەفسانە و پەندو مەتەڵە کوردییەکان (فەرهەنگی جەماوەر ٢بەرگ).
٢٧- وتارەکان (کۆمەڵە وتارەکان).
٢٨- چەند و چۆن (کۆمەڵە وتار).
٢٩- یادەوەریی سەمەدی بیهرەنگی.
٣٠- هەڵبژاردەی بەرهەمەکانی سەمەدی بیهرەنگی.
٣١- سەمەد تا هەتایی بووەوە (وتار سەبارەت بە ئەمری سەمەدی بیهرەنگی)

ژێدەر:

**گەراج ناوی گەڕەکێکە لە کرماشان.**

سەرچاوە:

**گۆڤاری (معمار) ژ(٥٢-٥٣) ساڵ (١٣٨١).**

# ندارد

ن: عەلی ئەشرەف دەروێشیان
و: لە فارسییەوە: گەلاوێژ تاجەدین (دایکی ژینۆ)

- نیاز عەلی ندارد.
- بەڵێ

یەکەم جار کە دیتم لە تەنیشت ناودانی * قوتابخانەکەدا دانیشتبوو، دەکۆکی، کۆکەکە بە توندی رایدەتەکان، خوێنێکی کەمڕەنگی هەڵهێنایەوە، دەمی بەقۆڵی چاکەتە شڕەکەی سڕی، بەپەلە ڕۆشتە پۆلەکەیەوەو لەسەر مێزەکەی دانیشت.

پۆلی دوو بوو، بچکۆلەو وردیلەو ڕەنگ زەرد. ڕەگەکانی ملی لەژێر پێستییەوە دیاربوو، جارجار وەکو مرۆڤی تادار دەکۆکی.

بەبەنێک قەڵەمەکەی بەستبوو بەکونی قۆپچەی چاکەتەکەیەوە. کاتێ شتێکی دەنووسی لەبەر کورتی بەنەکە سکی دەهێنایە پێشەوە. لە باتی قەڵەمەکە خۆی لە کاغەزەکە نزیک دەخستەوە. کاتێ مەشقەکانیم لێوەرگرت دەستی دەلەرزی. کاغەزی مەشقەکانی لەناو زبڵدانی قوتابخانەکەدا دەدۆزییەوە. کاتێ خەتم بەسەر مەشقەکانیدا دەهێنا وام دەزانی خەت بەسەر ژیانی خۆیدا دەکێشم قوتابییەکان نانی شەومەندیان دەهێناو لە پاڵ دیوارە گڵێنەکەی قوتابخانەدا دەیانخوارد. ئەویش نانی نیوەڕۆی لە باخەڵیدا دەردەهێنا. پێڵاوە لاستیکەکانی خەتێکی سووری ناشرینی بەمووچی پێیەوە کێشابوو، شوێنی برینێکیان بەسەریەوە جێهێشتبوو. وانەکانی باش دەخوێند، بەر لە هەموویان دەیتوانی تیتری ڕۆژنامەکان بخوێنێتەوە.

ڕۆژێ کە هەموومان بێدەنگ دانیشتبووین، خشەخشی ڕۆژنامەیەک کە بەشووشەی پەنجەرەکەدا داکوترابوو سەرنجی هەموو قوتابییەکانی ڕاکێشا. بەنیاز عەلیم وت:

- نیاز عەلی دەتوانی ڕۆژنامە بخوێنیتەوە؟ ها. ئادەی بڵێ چی نووسراوە؟

پاش ئەوەی کەمێ سوورهەڵگەڕاو مینگەمینگێکی کرد دەستی کرد بەخوێندنەوە.

- مامۆستا نووسراوە چاکەتێکی..
- ئافەرین، ڕاستە، بخوێنەوە، باشە.
- دووسەدو پەنجا هەزار تمنی..
- ئافەرین، ئافەرین، زۆرباشە، بەردەوام بە.
- لە تاران هەڕاج کرا.

هەناسەیەکی هەڵکێشا، ڕووی کردە من و وتی:





- مـامۆسـتـا چەند گـەورەو جـوان دەنووسێتەوە.

- بەڵێ، نیاز عـەلی ئەم رۆژانە لە زنجیرەکـاندا شـتی گـەورەو جـوان دەنووسێ.

***

- نیاز عەلی ندارد.

- بەڵێ.

فـامیلی (ندارد) بوو، لە پۆلەکەی منداڵ زۆر لە قـوتابییـەکـان فـامیلیان (ندارد) بـوو، کـــاتێ کــــە ناویم دەخـوێندەوە بەتوندی رادەچڵـەکـا، بەشـەرمــەوە قـــەڵەم و بەنەکـــەی دەشاردەوە تا من نەیبینم: بەنارامییەوە دەیگوت: (بەڵێ)، لەم کـاتەدا دەنگی لە بەچکە قـشـقـارەیەک دەچوو کـە هەندێک بیگوشی.

تەنیـا کـەرەسـەیەک کـە یاری پێبکات تۆپێک بوو کە لەکـاغـەزی رەش کـراوە دروسـتی کـردبوو هەندێ دەزووی لێوە پێچابوو.

کـاتێ کە قـوتابییـەکـان گـەمـەیان دەکـرد ئەو لەتەنیـشـت دیوارەکـەدا دادەنیـشت، تۆپەکـەی لە دەسـتـیـدا دەگوشی و سـەیری ئاسـمـانی دەکـردو بەحـەسـرەتەوە دەیروانییـە گـەمـەی منداڵەکـان، هەر کـاتێ گـەمـەی دەکـرد کـۆکـەکـەی لێـدەهات و خـوێنی هەڵدەهێنایەوە.

حـەزم دەکـرد زۆرتر لەگـەڵیـدا بدوێم.. رۆژێک لەسـەر قـادرمـەکـانی قوتابخانە دانیشتبووم، لەسەرخۆ هات و لە تەنیشت قادرمەکاندا دانیشت، تۆپە کاغەزەکەی بەدەستەوە بوو. ئەژنۆ چڵکنەکـەی لەشـەرواڵە دڕاوەکـەیەوە دیاربوو. پرسـیارم لێکرد «نیاز عـەلی ماڵتان لەکوێیە؟».

- مامۆستا لەپشتی قەڵاوە.

- باوکت ناوی چییە؟

- ریش چەرموو، مامۆستا.

- کاری چییە؟

- هیچ، مـامـۆسـتـا زۆر پیـرە، مامۆستا هەر لە ماڵەوە دانیشتووەو کتێبی دوعا دەخوێنێتەوە.

- دایکت چی دەکات؟

- بێ ئیش بووە. مـامۆسـتا دوێنێ دانەکـانی پێشـەوەی کـەوتن و بێکار مایەوە.

بەڵێ کـە پرسـیـارم کـرد دەرکـەوت دایکی لای مەشەیی * باقری بازرگانی پستەکاری دەکرد کارەکەشی ئەوەبووە کـە بەددان فـسـتـقـەکـانی شکاندووە رۆژی ٢٥ قـــرانی وەرگـــرتووە، پاش چەند ســـاڵێک کـــارکـــردن ئیـــدی ددانەکـانی هەڵوەریوە و لەسـەر ئیش لابراوە. برا گەورەکەشی کرێکاربووە و دووسـاڵ لەمـەوپێش پاش گـەڕانەوەی لەسەربازیی لەکاتی ئیش کردندا خانوو بەسـەریـا رووخـاوەو ئەوانی بەتەنیـا جێهێشتووە.

* * *

زستان هات، قوتابییەکان لە گوندە دوورەکـــانەوە دەهاتن، کـــاتێ کــــە دەگەیشتن لە مرۆڤی سەهۆڵێن دەچوون، برژانگ و برۆوکونە لوتیان دەیبەست، کە چاویان دەپروان چرکەچرکی دەهات وەک ئەوەی دووپارچە شووشە بەیەکدا بهـێـنی، بەدەوری ســۆبای دارەکـــەدا دادەنیـــشتن و وردە ســـەهۆڵیـــان لە لووتیـان دەردەهێنا. ئەوانەی کە پشتی لێـویان مـووی لێـڕوابوو لە پۆلەکـانی باڵابوون، ســمــێــڵی ســەهۆڵینی گـــــەورەیان لێ دروست بووبوو. کەوشەکـانیان دەنووساند بەسۆپاکەوە بۆنی لاسـتیـکی سـوتاوو بۆنی تیـژی نارەقی قـــاچیـــان بەژوورەکـــەدا بڵاودەبوویەوە. بەدەوری کـــەوش و جاشکە وشەکانیاندا ئاو دەچۆڕی و ئەم لاو لای سۆباکەی تەڕ دەکرد.

* * *

ژوورەکەم لەتەنیشت پۆلەکەدا بوو، هەموو رۆژێ سبەینیان لە پەنجەرەکەوە قـوتابییـەکـانم دەبینی کـە دەهاتن بۆ قوتابخانە. نیاز عەلی وەک باڵندەیەک کە دەزوویەک بەپێیـەوە ببەستێ خۆی بەرەو قــوتابخــانە کـێش دەکــرد. کــەوانەکـــانمان تەواو دەبوو داوام لە قـوتابییەکان دەکرد کە هەر کەسێک خـەوێکی باشی دیتـووە بیگێـڕێتـەوە بۆمـان. رۆژێ سـەرە هاتە سـەر نیـاز عـەلی: لە پێشـدا کـەمێک وەسـتـاو پاشان بەقسە هات، لەگەڵ ئەوددا کە رەنگی ســـوور هەڵـگەڕابوو دەنگی دەلەرزی. وتی:

(خــەوم بینی بووم بە چۆلەکــە، هەرفڕیم و هەر فڕیم، لەسەربانەوە فڕیم بۆ ناو حـەوشـەکە، لەوێشـەوە بۆ سـەر رەفـە بچکۆلەکـە. باوکم وتی: هەی دادو بیـداد کـوڕەکـەمـان بۆتە چۆلەکـە، دیتم باوکیشم بوو بە چۆلەکە و رۆشت لەسـەر کـتـێبی دوعـاکـەی نیـشـتـەوە، دایکم لە هەوەڵەوە پێکەنی، پاشـان

گریا، لەپڕ ئەژدیهایەکی گەورە خۆی کرد بەژووردا، دایکم کە ئەژدیهاکەی بینی وتی: وەی وەی خوایە مەشەیی باقر هات، خێرا خێرا پستەی لە کۆشی دەردەهێناو دەمی دەکردەوە. کە دیتم دایکم ددانی نەماوەو خوێن لە دەمییەوە دێت، ویستم چاوی ئەژدیهاکە دەربێنم، پستەیەکیان پێکەنی وتی: دەرهێنانی چاوی ئەژدیهاکە هیچ سوودێکی نییە، ئێمە ئێستە کارێ دەکەین کە لە داخاندا بتەقێت. هەموو پستەکان پێکەنین و پاشان دەمیان نووقاند. ئەژدیهاکە چووە ناو عەمباری پستەکەوە دیتی هەموو پستەکان دەمیان داخراوە، بەتوورەییەوە وتی: ئەی پستەکان ئێستە باوکتان دەگۆڕ دەنێم رۆشت و کوتەکێکی گەورەی هەڵگرت تا بیدات بەسەری پستەکاندا. ژێر پێی پڕ بوو لە ددان، قاچی لەسەر ددانەکان خزاو بەسەر دای بەزەویدا. بەم کارەی ئەژدیهاکە هەموو پستەکان دەستیان کرد بە پێکەنین ودەمیان کردەوە مەشەیی باقر خۆشحاڵ بوو، بەڵام پستەکان بەیەکدیان وت: کوڕینە وەرن با ئیدی پێنەکەنین. ئەژدیهاکە بۆ ئەوەی ئەوان پێبکەنن هەڵسوکەوتی پێکەنیناوی دەکرد. ملی هێندە درێژ دەکرد تا دەگەیشتە ئاسمان و ئەستێرەکانی دەخوارد. تەقڵەی لێدەدا، چاوی لار دەکردەوە و ئەستێرەکانی لە گوێچکەیەوە دەردەهێنا. من پێکەنیم. بەدەنگی پێکەنینەکەی من ئەژدیهاکە

ئاوڕی دایەوە، منی دیت وتی: ها.. کەوا هەموو ئەم کارانە لەژێر سەری تۆدایە. یەکسەر هاشاوڵی بۆ هێنام ویستم لە پەنجەرەکەوە راکەم. پەنجەرەکە گچکەو گچکەتر دەبوویەوە، یەکێک لە پستەکانی نزیکم وتی: وەرە لەسەر من دانیشە تا هەڵێین، پستەکە وەک فڕۆکەیەکی لێهاتوو منیش لەسەری دانیشتم. فڕۆکەکە منی لە کونی سۆباکەوە بردو بردو برد تاگەیشتینە ئاسمان حەزم دەکرد منیش ئەستێرەیەکی جوان بگرم بۆ دایکم تا بیکاتە ملی. بەڵام لەناکاو پێم خزاو بەسەردا کەوتمە خوار. هاتم و هاتم لە دوورەوە بینیم کە باوکم خەریکی قوڕ گرتنەوەیە بۆ سەربانەکەمان. بەسەرداکەوتمە ناو قوڕەکەو لەخەو راچڵەکیم.دیتم بانەکە دڵۆپە دەکات بەسەرمدا.)

هەموو منداڵەکان پێکەنین و چەپڵەیان بۆ لێدا. کاتێ کە رۆشت دانیشێ لە مراوییەک دەچوو کە بەرەو کولانەکەی رابکات.

* * *

زستانی ئەو ساڵە لە هەموو ساڵەکانی پێشووتر ساردتر بوو، پەنجەرەکانمان بەرۆژنامەو مقەبا کونبڕ کردبوو. رۆژێ بەیانی زوو ناوی قوتابییەکانم دەخوێندەوە.

– نیاز عەلی ندارد.

هەندێ لە قوتابیەکان بەهێمنی وتیان:

– نەهاتووە.

راچڵەکیم، جێگاکەی خاڵی بوو، خەمێکی سەیر بەسیمای قوتابیەکانەوە دەبینرا، هەموو سەریان دانەواند بوو، هۆی ئەوەم لە ئەکبەری چاودێری پۆلەکە پرسی، وتی:

– مامۆستا دوێنێ ئێوارە مرد.

لەسەرما مرد. مامۆستا خوێن لە قوڕگی چۆڕەی کردو مرد، هەر دەیگووت ئەستێرەم دەوێ، ئەستێرەم دەوێ، ئەستێرەیەکی جوان بۆ دایکم. قوتابییەکان بێدەنگ بوون. با رۆژنامەی سەر پەنجەرەکەی رادەتەکاندو دەنگێکی لێ دەبوویەوە و دەگەشتە گوێ. وەکو ئەوەی کە نیاز عەلی لە دوورەوە حیکایەت دەکات یان خەونەکانی دەگێڕێتەوە. دەنگی ئەوکاتەی کە رۆژنامەکەی دەخوێندەوە لەگوێمدایە. پەڵە هەورێکی رەش سەر دڵی ئاسمانی گرتبوو، هەموومان بێدەنگ بووین، چاوم کەوت بەرۆژنامەی سەر پەنجەرەکە بەخەتێکی گەورە لێی نووسرابوو.

(چارەسەری نەخۆشی بۆ هەموان)

**سەرچاوە:**

چهل داستان کوتاه ایرانی ل٣٠٦ تا ٣١٠.

* ناودان: بۆرییەکە لەسەربانەوە بەدیواردا دەیهێننە خوارەوە بۆ ئەوەی ئاوی سەربان پێدا بێتە خوارەوە.

** مەشەیی لەناو شیعەدا بەو کەسانە دەگوترێ کە زیارەتی مەشهەد دەکەن

# وتوویژ لەگەڵ عەلی ئەشرەف دەرویشیاندا

## توو مەرگی من ئەم پرسیارانەم لێ مەکە

و: لە فارسییەوە: ئەنوەر هوژمیری

*** وێنەیەکی جەنابت لای منە، وێنەی پیـــاوێکی چاویلکە لە چاوەو (بۆینباخ)ت بەستــوەو لە (ساڵە هەورییەکاندا) رێگە دەبڕێ. پێم خۆشە زیاتر سەبارەت بەجەنابت بزانم؟**

- لەژیاننامەکەدا کە بۆم ناردوون کەم تا زۆر ســەبارەت بەژیانم دوواوم، بەڵام هاوکات لەگەڵ تەواوکردنی بەرگی سێیەمی (ساڵە هەورییەکاندا)«١» واتە هەر لە سەرەتای بەمامۆستا بوونمەوە چاویلکەم بەکارهێناوە پێش ئەوەش پێویستم بەچاویلکە بوو بەڵام دەستکەوتنی ئەستەم بوو پارەشم نەبوو، بۆینباخ (بەستن و نەبەستنەکەی) لە سەردەمی هەر حکومەتێکدا جۆرێ رقە سوویی بووە، لەسەردەمی رژێمی شادا کەسانێکی وەکو من هەوڵیان دەدا جلوبەرگی سادە بکەینە بەر دیارە زیاتر بۆ کتێب و گۆڤارو ئەو بلاڤۆکانەی کە دە زمان لێیـان بوو خەرج بکەین و لە ئەنجامدا پارەیەکمان بۆ خۆ پۆشتەکردن نەدەمایەوە. لەو ساڵانەدا تەنیا یەک یان دوو جار بۆینباخم بەستووە ئەویش هینی وێنەگر (مصور)دکە بوو تەنیا بۆ وێنەگرتن بوو. بەڵام پاش ساڵی ١٣٥٧ی کۆچی (١٩٧٩) هەر کاتێ ویستبێتم بۆینباخم بەستوود.

*** ئەگەر نووسەر نەبویتایەت بەرای خۆت چکارە دەبوویت؟**

- حەزناکەم وەڵامی ئەگەر و ئەگەرەکان بدەمەوە. بەناچار ئەڵێم کە دەوروبەری شەش ساڵ مامۆستاییم کرد پاشان دەستمدایە نووسین. هەر لەسەرەتای منداڵیەوە باوکم کە کرێکار بوو، نیمچە زەوقێکی هەبوو. ئەوینی خوێندنەوەی خستە دڵمەوە. باسی ئەوەم لە ساڵە هەورییەکاندا نووسیوە، دیارە کە حەزو خۆشەویستم سەبارەت بەکتێب و خوێندنەوە چارەنووسێکی حەتمی بوو. پاشتر کە بەسەمەدی بیهرەنگی، جەلالی ئالی ئەحمەد، خاتوو سیمین دانشوەر، دوکتۆر ئەمیر حوسەین ئاریانپوور ، باقر

مۆنمنی، سەعید سوڵتانپوور، سیاوەش کەسرایی و.. ئاشنابووم مەسەلەی خوێندنەوەو نووسینم لاجیددی تر بوودوە. ئەو شتانەی کە من لە ماوەی مامۆستایمداو لەلادێکاندا بینیبووم، بینینی ژیانی خەڵکی بەتایبەت منداڵان و هەروەها ساڵانی بەندیخانە وروژاندمیان و هەموو ئەمانە بەچەشنێ کاریان تێکردم کە درێژە بەنووسین بدەم. من بڕوام بەتوانایی سروشتی و ئیلهام بۆ هاتن و ئەم جۆرە وتەیانە نییە. توانایی سروشتی هەر ئەوەیە کە دەستم هەیە بۆ گرتنی پێنووس (بەمەرجێک مریشک بووایەم ئەو توانایەم نەبوو!) و مێشکم هەیە بۆ بیرکردنەوەو ئیلهام هەر ئەوەیە کە خەڵکی پاڵیان بەزەوییەوە داوەو دەژین، هەر ئەوەو هیچی تر. کەوابوو دیارە ئەگەر نەدەبوومە نووسەر هەر بەمامۆستایی دەمامەوە، ئەو کارەی کە ئەوینداریم بەداخەوە هەردوو رژێمەکە منیان لەو مافە بێبەری کرد.

*** چ پێناسەیەکتان بۆ چیرۆک هەیە؟**

- بێ گومان مەبەستت کورتە چیرۆکە، چیرۆکی کورت دیاردەیەکی نوێیە و ئەم دیاردەیە لە جیهانی نوێدا دەخولقێ واتە ئەو جیهانەی کە تێیدا کەرەستەکانی بەرهەم هێنان گەشەیان کردووەو مێژوو چووەتە قۆناخێکی نوێوە. بۆ نموونە لە سەردەمی فیودالیزمدا چیرۆکی کورت بەو پێناسەیەی کە ئەمڕۆ بۆی دانراوە نەیدەتوانی بوونی هەبێ بەو هۆیەوە کە ئەڵێم چیرۆکی کورت، دیاردەیەکی ئەدەبییە کە پێوەندی بەجیهانی نوێ و ژیانی نوێوە هەیە.

زاراوەی (چیرۆکی کورت) بەگشتی بۆ ناونانی تەشکێکی سەربەخۆی ئەدەبی کەڵکی لێ وەردەگیردرێت، نەک بۆ ناونانی ئەو چیرۆکەی کە تەنیا درێژ نەبێت. چیرۆکی کورت بەشێکە لە ئەدەبیاتی داستانی کە بەپەخشان دەنووسرێت و دەوروبەری دووسەد ساڵ بەسەر هاتنە ئارایدا تێدەپەڕێت ( لە ئێراندا سەد ساڵە). پێناسەگەلێکی جیاوازو جۆراوجۆریان بۆ چیرۆکی کورت پێشنیار کردووە کە هەر کام لەو پێناسەیانە پێ لەسەر تایبەتمەندیگەلێک دادەگرن کە دەستەو گروپێکی تایبەت دەگرنە بەر، چونکە چیرۆکی کورت گێڕانەوەیەکی تارادەیەک کورتە و لەوەدا ئافراندن و خولقکاری دەوری دیار دەگێڕێت و خودی ئەم چوارچێوە چیرۆکییە بەوە بەرگرو بەربڵاوە،کە وابوو هەریەک لەو پێناسەیانە بۆ هەندێ لەم جۆرە چیرۆکانە راست دێتەوە. ئەتوانێ بەشێک لەو تایبەتمەندییانە بەو جۆرەی خوارەوە بن:

چیرۆکی کورتی پشتی بەستووە بە تەوەرەی کردە (Action)یکی تاکی چیرۆکی کە ئەبێتە هۆی کارتێکردنێکی تاک. کەسێتی مرۆڤەکان لە چیرۆکی کورتدا پێگەیشتوون و نووسەر تەنیا لە کەرتێکی تایبەت لە ژیان و ئەزموونی سۆزداردا دەیان نوێنێت.

لە چیرۆکی کورتدا تەنیا بەشێک لەژیان لەلایەن نووسەردوە دەبێتە بابەتی کارەکە چیرۆکی کورت بەپێچەوانەی رۆمان پڕ ئاکرێت لە رووداوی لاوەکی تارادەیەک زەمینەی شوێنی و کاتیی نەگۆڕی هەیە. بەپێچەوانەی گرێچن یان گەڵاڵە (Plot) کە بەتەواوی نەگۆڕەو کردەو پاڵنەرێکی تێدا نییە، چیرۆکی کورت بگۆڕەو پڕە لە کردەو پاڵنەرو هەروەها ئەوەیش کە چیرۆکی کورت بەشێوەی ئاسایی لە هەزارو پێنجسەد (١٥٠٠) وشەوە تا پانزدە هەزار (١٥٠٠٠) وشە دەگرێتەوە.

ئەو تایبەتمەندییانەی کە ژمێردران، سەبارەت بەهەموو چیرۆکە کورتەکان راست نین، بۆ نموونە نووسەرە ناودارو دەرکەوتەکانی وەکوو. چیخۆف، هەمینگوای، جیمس جویز و لەم دواییانەدا ریمۆند کارڤر، پێوەرگەلێکی نوێ و ئافرێنەرانەیان سەبارەت بەچیرۆکی کورت خستەڕوو.

*** وادیارە رۆمانە ئێرانییەکان کۆن و کلاسیکین، رای ئێوە چییە؟**

- وەڵام: پرسیارەکەتان گشتییە، لە چ بوارێکدا کلاسیکی و کۆنەن؟ لە بواری ناوەڕۆک یان فۆرمەوە؟ ئەمجا ئەم دوو وتەزایە ئەتوانن جێگۆڕکێ بکەن، واتە رۆمانێک کە لەڕووی ناوەڕۆکەوە کۆن بێت و لەڕووی فۆرمەوە نوێ و بەپێچەوانەوە ئەم کێشەیە دەگەڕێتەوە بۆ باسی هەڵومەرجی مێژووی ئەو کۆمەڵگەیەی ئێمە تیا دەژین. لەڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتییەوە لەسەردەمی قاجاردا، رۆمان بەو شێوازەی ئێستا ناتوانێ دەرکەوێت. کۆن و نوێ بوونی رۆمانی ئەمڕۆی ئێران بەهۆکار گەلێکەوە

...ــ كە باسم كرد. ئەگەرچی هێرش ...ـێرە (میدیا) دەرەكییەكان، سەتەرلایت ...بــنـتــــــەرنێت و دیاردە نوێیــــــە ...هونەرییــــەكـــان بمانەوێ و نەمــانەوێ ...ڕ ـگەی ئێــمـــە دەگـــۆڕن. بەڵام ئەم ...گـ ـنە ڕواڵەتین، قووڵ نین ئەم ڕوانینە همه ڕەهەندییە و بەمەرجێك سانسۆر ...ـوونی نەبێت، ڕوانگەی ئێــمـــە نوێ ...دەكـــــاتەوە (بەگـــــوێرەی پێگەی كۆمەڵایەتیمان)، كە سـانسـۆر هەبێ، ڕۆمـانی ئێــمــەو چیــرۆكی كـــورتمان و شـیعـرمـان هەر لەو ئاستـەدا دەبێت كە هەیە.

*** ســــەبارەت بەڕۆمـــــانی نوێ بدوێ. ڕۆمـــــــانگـەلی دژە ڕۆمـــــــان، چ ڕۆمانگەلێكن؟**

- ڕۆمــــانی نوێ ناوێكی تازەیە كـــە لەســــەر دژە ڕۆمـــان دایانناوە. ڕۆمـــانی نوێ یان ڕۆمـــانی دەروونناسی نوێ یان بوونی شـەپۆلی زەین بەهێـزی جـەیمز، جیمس جوێز، ڤیلیام فاكنێر ڤیرجینیا ڤۆڵف، لە بەریتانیاو ئەمریكادا دەستی پێكرد.

لیـۆتۆلستـۆی یەكـەم نووسـەرێكە كـە لەسەدەی نۆزدەهەمدا و لەچیرۆكنووسیدا كـارتێكراوی ئەم وتە زایەیە. بەدیهـاتن و بەردەوامــبـوونی لە فــەرەنســەو لە بەرهەمەكـانی مارسێل پرۆست، ناتالی سـارۆت، ئالێن رۆپ گـریە، مـارگـرێت دۆرانی مــیـشــێل بۆتۆر - دایە. ئەم دەســـتـــەیەی دوایی هەوڵــیـــان داوە ئەكنیكی ڕۆماننوسی تەبا بكەن، لەگەڵ ئەو شتەدا كە بەنیازە هەستیارییەكانی كۆتـایی سـەدەی بیسـتـەمیـان دادەنا. هەڵبەت ئەم نووسەرانە قوتابخانەیەكیان پێكنەهێناو ئەوەشیـان وتووە. هەمـوو ئەوانە تایبەتمەندی و جیاكەرەوە گەلێكی ڕۆمانی سوننەتی وەكوو كێشانی تابلۆی كـەسـێـتی. گـێـڕانەوەی ئاسـۆیی و ناوەڕۆكی كۆمـەڵایەتی، یان رامـیـاری داسەپاوە ڕەت دەكەنەوەو ڕایان وایە كە نـــووســـین وردو ڕێــكــوپــێــكـــی وردەكارییەكانی لەش و دەروونی بخەنە بەردەست ئەوان زۆر بەجـیــدی خـۆیان بەپێشـڕەو دەزانێ و ڕایان وایە كـە هەر بەرەیێكی نوێی هونەرمـــەندان دەبێ لایەنگەلێكی نوێی ڕاسـتەقینە ئاشكرا بكـات و بڕوایان وایە كــــە ڕواڵەت و ناوەڕۆك لێـك جیـا ناكـرێنەوە. ڕۆمـانە نموونەو دیارەكانی ئەم شێوازە بریتین لە «بەخـــێـــڵـی (١٩٥٧)ی ئالێن رۆپ گریــە». «میوە زێڕینەكان (١٩٦٣)ی ناتالی سادۆت»: «بەرنامە (١٩٥٧)ی مــــیــشـــێل بۆتۆر»، و هەروەها دوو مـــەســـەلەی تیـــۆریی گــریـگ بەناوی لایەنگری لە چیرۆكی نوێ (١٩٦٣)ی ئالێن رۆپ گـــریــــە» و «ســــەردەمی بەدگـــــومـــــانی (١٩٥٦)ی ناتـالی سادۆت».

*** هۆی بەجـیـهـانی نەبوونی ئەدەبیاتی ئێمە چییە؟**

- بفەرموو چ شتێكی ئێمە جیهانییە؟ هۆكـارگــەلێكی زۆر وزەبەند هەن كــە گــرینگتــرینیــان گــرفـتی زمـــان و سنووردارببوونە جوگرافـیـاییـەكـەیەتی. بەڵام دەبینین لە ترینیـــدادیشـــدا «٣» نووسـەری جیـهـانی دەردەكەوت. بەڕای من گرفـتی ئێمە پتر لە هەمـوو شتێك گرفتی ئەو حكومەتە ملهوڕانەیە كە هەر لەســـەرەتای ژیانمانەوە هەر لەســـەرەتای قـوتابخـانەوە بەربەست دەخـەنە بەردەم گـەشـەو فـڕینی بیـرو هزرو ئەندێشـــە مـانەوەو ڕوانگەو نیگامان دەبەستنەوەو دەیكەنە جەخزێكی داخراوەوە، هەڵبەت بەرهەمی پستەمان جیـهانییە، چونكە وەزارەتێك بەناو وەزارەتی ئیـــرشـــاد (ڕۆشنبیری)ی پستەمان نییە كە ئەگەر ببـوایەو هەزار جۆرە ڕەوت و بۆچوون بۆ چاندن و هەڵگرتنی پستە ببوایەی، ئەوا ئەو بەرهەمــەشـــمــان دەفـــەوتا. هەر كـارتێك بەپێی بەیاننامـەی دیاریكەری بنكەو ناوەندی نووســــەرانی ئێـــران، ئازادیی بیـروبۆچوون و ڕادەربڕین بێتـە ئاراوە (بێگومـان سەرەنجام لە ئاكـامی خەباتی خەڵكیـدا دێنە ئاراوە) ئەوجـار ئەدەبیاتمان دەبێتە ئەدەبیاتی جیهانی و لەو حاڵەتەدا بەئەندازەی ئاجیل فرۆشی كتێب فرۆشیمان دەبێت و خوێندنەوەی كتێب وەكوو خواردنی پستە پێویست دەبێت و كـتـێب و ئەندێشـەی ئێـرانی وەكوو پستەی ئێرانی لە وڵات دەچێتە دەرەوە.

*** جـوانتـرین خـەوێك كـە بینیـوتە كامەیە؟**

- من پتـرِ خـەوی گـەلێ ترسناك و ناشـیـرین دەبینم، بەڵام جـوانتـرین خــەوێك كــە دیومــە خــەوێكە كــە لەبەندیخـانەی ئینفـرادیی كـۆمیـتـەی شـــارەبانی و لە ســـاڵی ١٣٣٥ (ی



هەتاوی)دا بینیومە. شەش مانگ بوو لە بەندیخانە دابووم، شەوێک لە خەومدا لە قەراخ رووبارێکی گەورەدا وەستابووم. رووبارێکی پڕ شەپۆل و بەهاژو هووژەوە، بەڵام روون وەکوو رووباری رێژاوی کرماشان، لەپڕ بینیم کە لە بەرانبەرمەوە.

خانوویێکی چوار نهۆم دیارە، چوومە پێشەوە یەکەم نهۆم پڕبوو لەزلووبیاو لوقمەکازی خواردم، چوومە نهۆمی دووەم پڕ بوو لە لوقمە قازی (بامیە) نهۆمی سێیەم پڕبوو لە باقلاوا (جۆرێ شیرینی)ی برژاوو پڕ لە شیلە. کە گەیشتمە نهۆمی چوارەم بینیم هاوسەرەکەم بەجلوبەرگێکی شینەوە (ئەو رەنگەی کەمن حەزم لێیەتی)، وەستاوە، لێی نزیکبوومەوە کە دەستی بگرم لەپڕ کەسێک هاواری کرد بوەستە (اسیت!) و بیرم هاتووە کە ئەبێ بگەڕێمەوە بۆ بەندیخانە، بەخەبەر هاتمەوە، نگابانێک لە دوورەوە فەرمانی وەستانی دەردەکرد. لە ئینفرادییە خاڵییەکەمدا دانیشتم، سەرم نایە سەر ئەژنۆکانم و لە بێدەنگیدا گریام.

*** سەبارەت بەیەکەمین و دوایین چیرۆکێک نووسیوتە بدوێ.؟**

- یەکەم چیرۆکم ناوی (نیبەتی) بوو کە کۆمەڵە چیرۆکی کورتی (سەبارت بەم ولاتە)و لە ساڵی ١٩٥٣دا لەلایەن دەنگی هاوچەرخەوە بلاوکرایەوە. ئەم جیرۆکەم لە بەندیخانەی کرماشان و لە ساڵی ١٣٥٠ و بەدزیی سیخورەکانەوە نووسی. چیرۆکەکەم دا بەلاوێکی موعتاد (تلیاک کێش) کە ماوەی سزاکەی کۆتایی هاتبوو. بەهەوڵی من موعتادییەکەیش تەرک کردبوو و ئیدی ئەچووە دەرەوە. ئەولاوە چیرۆکەکەی لە نانەکی پانتۆڵەکەیدا شاردەوەو بردیە دەرەوەو دایە دەستی دایکم. دوایین چیرۆکیشم ناوی (ئینا)یە کە پێوەندی بە رۆژی بەرێکردنی تەرمی ئەمر ئەحمەدی شاملووەوە هەیەو هێشتا لە هیچ جێگایێکدا بلاونەبووەتەوە. بەهیوام لە کۆمەڵە چیرۆکەکانی (چیرۆکە تازە گەرمەکان)دا دەری بهێنم.

*** باشترین چیرۆکێک کە نووسیوتە؟**

- دوو چیرۆکم یەکجار خۆش دەوێ واتە ئەم دوو چیرۆکە خۆشەویستی من یەکێکیان بەناوی «هەتاو» ناوی ئەم چیرۆکە کوردییەو هەر هەتاویشە) کە لەکۆمەڵە چیرۆکی (سەبارەت بەم ولاتە) دایەو ئەوی دیکە بەناوی «دروشتی» - بەمانای زبری و تووڕەیی - لە کۆمەڵە چیرۆکێکدا بەهەمان ناوە.

*** بە وشەی مەرگ رستەیێک دروست بکە؟**

- تۆ مەرگی من لەم پرسیارانەم لێ مەپرسە، بۆ چ ناڵێی بەژیان رستە دروست بکەم یان بۆ نموونە وشەی بنکە - ناوەند، کەمنیش بنووسم بنکەی نووسەرانی ئێران یەکێکە لە دیموکراتیکترین دامەزراوە مەدەنییەکانی نەتەنیا ئێران بەڵکوو جیهانیش ناوەندی ژیانی من و ساڵی دووهەم: شانازی دەکەم کە ئەندامێکی بچووکی ئەو ناوەندەم ئەو ناوەندەی کە گیانگەلێکی خاوێن و ئازیزی وەکوو سەعید سولتانپوور، ئەحمەد میرعەلایی، غەفار حسەینی، محەمەد موختاری و محەمەد جەعفەرپوویەندی لە رێگای ئازادیی ئەندێشەو بەیان و قەڵەمدا داناوە.

*** ئەگەر بڕیار بێت جارێکی دی لە دایک بیتەوە حەز ئەکەیت لە چ شوێنێکی چیرۆکەکانتدا دەرکەویت؟**

- وەڵام حەز ئەکەم لە دیمەنی سەمای (بی بی)دا لە بەرگی دووەم لاپەڕەی ٤٣٣ی رۆمانی «ساڵە هەورییەکان»دا لە پەنای دایەگەورەم - بی بی -دا بم و ئەویش حەکایەتی کاک یوسفم بۆ بگێڕێتەوە تا بەدوور لە هەموو زەجرو ئەهانێکی ئەم جیهانە پڕ لە زۆر وشەم نابەرابەرییەوە، دەستەماندووە ئەوینداەرەکانی بگووشم و بەئارامی خەوم لێ بکەوێت.

سەرچاوە:

**١- ساڵە هەورییەکان رۆمانێکی دەروێشیانە کە لە چوار بەرگدا نووسیویەتی، لە ژیاننامەی نووسەردا بەرهەمەکانی ژمێردراون، لێرەدا خۆم لەناو بردنیان دەپارێزم.**

**٢- ترینیدادو تۆباگۆ، ولاتێکە لە ئەمریکای ناوەڕاستدا.**

*** تێبینی ناوی ئەو کەسەی کە وتووێژەکەی لەگەڵ دەروێشیان کردبوو لە گۆڤاری سەرچاوەمان نووسرابوو.**

**** سەرچاوەی ئەم دەقە گۆڤاری (معیار) ژمارە ٥٣-٥٤ی ساڵی، ١٣٨١ لە تاران بلاودەبێتەوەو مانگانەیە.**

# شەو فنجانەکانی حەوەی حەو



شێرزاد ئیبراهیم حەیدەری

«شەوی یەکەم» با تەختی پێکەنینمان بشۆین و بەژنی سێدارەکان ببڕینەوە
لەنێو سەوزبوونی سروشت بژین»
شەپۆلەکان... گۆنا خورییەکانی خۆخەکان گەز دەدەن
بەری بەمەمکی خاوی مانگ دەکەن
مانگ... لەنێو سەلەیەکی قەهواییدا خۆی خستۆتە کۆشی دەریا
دەریا.... لەژێر سێبەری تاتی کانییەک قژی مانگ بە شانەی نەهەنگەکان دادێنێ
شەو... لەنێو رەشماڵی ئەستێرەیا بن کەوشی پەرییەک پڕ دەکا لە فرمێسک
قازو قولینگ... لەوانەی پڕ لە ئاتەشی شەوا ئایەتەکانی دەنگ دەردەکا
بەیانی لەژێر شاتۆوێکا هەناسەی سەبەتێکی پڕ لەگوڵە حاجیلە بوو
شنەبا... قۆزاخەی لۆکە پەڕە کراوەکانی دەخوساند بە ماچی هەناسە سری خونچەکان
لە ساماڵی دەرگا... منداڵێک ناوی بە پێڵووی کانی دەکرد وایدەزانی ماچی دەکا...
مەغریب.. لەروانینی باوێشکی مناڵێک زەمبیلێک لەئاوابوونی کردە دیاری
نیوەڕۆ.... تاسی پڕ لەگوڵی بێ دەنگ ورد دەکاو کوکوختییەکان دەفڕێنێ
بیابان.... فلووتێ لێدەدا و ڕەشماڵەکان لە قیژەیەکا ڕۆحیان لەناو دەنگی دەبابەکان دەردەچێ
ئەجندەکان دەکردە جل....
با هەلالەی میسکاوی دەهێناو هەورەکان خۆیان لێ پڕ دەکرد
بزنە کێوییەکان بێزارن لەساباتی چرووی کوخە خەفەکانی چیا
لەکەنار خەوتوون...
ئاسکەکان... سەرچەفی خەونە پەمۆییەکان دەکەن بەدێم جامەی رۆحی خۆیان
باوەش.... باوەش کەو هەڵدەفڕێنێ...
سنەوبەرەکان لەسەیری سیمای یەکتردا واژی دەبوون گوێچکەکانیان شەوی لێدەچۆڕا

* * *

«شەوی دووەم» «خەون دەبێتە فنجانەی قاوە، شانۆی ژن و قامەتی ماچ دەخوێنێتەوە»
تەبشووەکانت کەوتنە مۆرکردنی گۆنام
منیش سەیری پەنجە پرتەقاڵییەکان ژێر تەبشووم دەکرد
کە پڕ پڕ بوو لەبورجی گۆناهەکانی من... منی تۆبەکار..
سەر ئەم کەپرە فێنکە چۆڵە
سەیری نوێی زەیتوونی تۆ دەکەم
گوێگرتن لە نەعلەکانت چ فیردەوسێک دەسازێنێ لە بەهەشتی چاوەڕوانیدا
ودستان بەرامبەر روونترین جل لە بریقانەوەی بوو کە شووشەکانی بەفرا
چ پەرژینێکە لەبازنەی ئەم کەوسەرەدا؟؟!

گوێگرتن لەهەناسەی مانگە شەوی ئەو پردانە
چ اخدودێکا ؟! بە پەنجەکانی دەڵێ: وەرن... وەرن
با شۆخییەک لەگەڵ یەک بکەین ئەم شەوە
شەوی «لیلە القدرە» با لەناو ئەو ئاگرە یەکتر بگەوزێنین ئەو دۆزەخە بەشی هەموومان دەکات
بۆنی ژیلەمۆی گۆزینگەکان چ مووشکییەکە؟
کە لەبۆنکردن تێر نابین.
کلیلی ئەو ژوورانەی کە لەخەوتنی تێر نابین بەدەستی چ نەفسێکا؟
تائێستا با خەونی چەمی ئەو باخە پەرچەم شۆڕە بووین
کە لەدوورەوە هەناسەمان ئاوێزان دەبوو
وەهمێک بووین لەهەورا
منالآن خانە خانە لە کەنار وێنەیان دەکردین
کە حەزیان لە یاری بوو
لەدوای تەرزەی بروسکەکانا خۆمان لەیەک شاردەوە لەنوێی
نووشتاوەی قارچەکەکان
چیرۆکی مردنی مردنمان نەخوێندبوو لەگۆڤاری گەلاکانا
ئەو دایکە لەکام بورج هات سەری مردنی بڕی؟
من نێو چاوانی ئەو دایکە لەسەر چ تاتە نوێژێک ماچ کەم
کە بمرم
داری ئەم گۆڕانە چ پۆلە کۆترێکن
کە لەسەر شانەکانمان شارێک چێ دەکەن؟
ئەمە سمۆرەی چ مەرقەدێکە خۆی بەگەردنمان وەکردووە
ڕەخرەفەی تەبشووەکان لەگۆنام دەخوێنێتەوە
چین چین ماچم دەکا
بە دوای ئەو دڵۆپانە دەگەڕێ، کە بەسەر پەنجەرە رووتەکانان دێنە خواری
وەرە... با تاوێ لەژێر ئەم بارانە تاوسییە چاو بنوقێنین
سەیری ئەو قرشانە بکەین کە شاگەشەگە بوونە لەبالیای دەرچوونیان لەئاوا
با چەتری گوناو گونی گوناهەکان فرێ دەین
خۆم ئەم بارانە کەزی درێژە قسە لەگەڵ ئێمە ناکا
حەز لەگوشینی دڵی خۆڵ دەکا
باجلەکانی خۆمان لەم ئاقارە شەقار بکەین
بۆ جەستەی ئەم کالیبتۆزەی کە زەمهەریری شەو
ڕۆحە منالەکەی لە پەنجە گەوردەکەی پێی تەکاندبوو
وەرە... با سەیری ئەلبوومی یادگاری ئەو گەلایانە کەین

ئە گاپەلەکان ختووکەیان دەدا و وەک شۆڕەبی دەلەرزین لە حەوشی مردن
«شەوی سێیەم»...
ژنەکان... لەتاو تاوی رامانی گەلاکانی سەرتاتەشۆر
کەفەکان و کراسە قەدیفەکانیان شەق شەق دەکەن
قەتەغی برینە وشکەکانیان لە دار مێوە کووشەکراوەکانا هەڵدەوەرێنن
سەر هاڕاوەی گوڵە وەریوەکان
کەندارەکان لەسەر پەنجەکانیان دەهاتن و دەچوون
مردووەکانیش بە کوڕ ژنێکی حەزین دەخزینە خوارەوە
ئەو کۆترەی کە بەندەری چۆڵەوانی ناردبووی
چنگێک خۆڵی نەدۆزییەوە لە دورگە ئاوییەکانا
چڵە زەیتوونێکی چنگ نەکەوت بیکاتە بسکۆکەی خۆی
ەگەڕایەوە تا بووە چڵە زەیتوونێ
کێییەکان ئەوپەرییانەیان دەبینی کە لە سلسبیلەکان خۆیان دەشوشت
ئەوی ناعووری زەنجەبیلەکانیشیان بەخۆدا ئەکرد
کریلە گوێ ساواکان لەگوێگرتنی رەبابی زەنگوڵی بەرۆکیان کە لەسەر پێ دەوەستان چ حەشرێکیان بۆ شوانەکان دەکرد؟
بەزەکان کەوڵی کەروێشکە خرینەکان دەبەنە مۆزەخانەی شەپۆلە خانمەکان
قۆچی شوورەکانیش دەکەن بەتاسی سەرمینا چۆلەکان
جەرگی واشە کۆلکنەکانیش دەکەن بە خەنەی دەستی با
پشتی ئەم کاریتە سواغ دراوانە چ گۆڕستانێکی تاریکن؟
کە خۆیان بەدایەی ئێمە دەزانن
ئەم قەلەڕەشانە چەند مۆنن کە لەهود هودی باخە هەڵواسراوەکان ناچن
دەترسم قەڵەڕەشێکی کەلۆس سیمای پیاسەکانم لەپشتی کیسەڵێکا بخوێنێتەوە
گەندەمووی سەر گۆنات چ شەڕە بەردێک دەکەن لەگەڵ ڕستە لاڵەکانی مندا؟
چاوەکانت لەسەر پەمۆی باخە هەڵواسراوەکانی لما
چ ژوورێک دروست دەکەن
کە نەخشەکەی قەفەسێکا...
«ئای کە ژوور نییە، قەتارەی سبیلەکانە»
لەسەر گوێچکەی چ فیلێکا لەوحەی یادگارییەکان حەفر کەین
ئەم خاکە لماوییە دار کونێرکەیە کەشتی ژێر پێێک بە کپی کون دەکا
لەدەنگیا خەیاڵ دەکەم
پێش ئەوەی زەوی دەست کا بە شیعر قووتمان بدا
تەورەکان با چیتر نەکەینە مرواری گەردەنی گێوژە گرنی گرنییەکان
کۆشمان پڕە لەشاڵە نەرمەکانی وشە

هەموو سێبەرەکان لە باوەشی دونیای کاجەکانا وەکو کوکوختییەکان
ئاو لە جۆگەکان دەخۆنەوە
«کەچی کوختێک نییە بۆ حەسانەوە»
کلیلی کردنەوەی پشت دەرگا دارینەکانی باخی ئەشکەوتەکانم چنگ نەکەوت بە پێخواسی رامکرد لەسەر
بەردەبازی رووبارەکان لەگەڵ پەیکەری سەگە بەختیارەکە بوومە لاشیپانی دەرگا
خێرا پەندەکانی «ئەنکیدۆ»م بە یاد هاتەوە، کاتێک بە «وی» دەگووت
گەر بزانیت لەو دیو ئەستێلکی باخەکان چ هەیە زۆر دەگریت
زۆر گریام
شەماڵی ئەم باوەشینە هی چ شەیتانێکە؟ هەرکە چاوت لێک نا نیدی لەگەڵت دەدوێ
ئەمە پەنجەی چ شاژنێکا کە گۆنای وردە گیاکانی نێو شانە دارینەکان دەخوێنێتەوە
ئەو لەکوێی دەریا بووە وەهم
من لەکام ئەشکەوتا بگەڕێم کە دەفتەری تاوێرە بەردەکانی کوێێکن
حەرفەکانیان کوشتنی لێوەکانیان لێدەچۆڕێ
لە کەپری کام ئەشکەوت سەرکەوین، کە ئەستێرەکانیان قاسەی گۆرانییە پشوودرێژەکانی دارستانە؟
ئەو «مالکە لحەزینە» فێ گرتووە لە کوێیە
کە بە چەم چەمەی فنجانە چۆڵەکانی بیابانە
گویچکەی سەدەفەکان دەشوا
با تەمەنێک بەسەر دەفتەری فریشتەکانی منا بخوێنێ
پێش ئەوەی باغی عیشقی قەقنەسەکان بێن بەخۆڵ
ئێمە دەبین بە خۆڵ و تریە دەکەین
دۆلفینەکان لەسەیرکردنی یەکتردا مەست ببوون قاپووتی خۆیان نەدەناسی
باڵندە کڕ کەوتووەکا لە پیاسەی تەنکاوەکانا بە شێتی شەیتانیان لەخۆ دەرئەکرد
ورچەکان لە باوەشی دار بنێشتەکان دەخەوتن بێچووەکانیشیان
دار هەڵوژەکان جلی خۆیان لەبەر مناڵانی بەهەشت دەبینی
لە پێکەنینی واژی دەبوونەوە
کەشتی چۆڵەوانی لەچاوەڕوانی بەرۆژووە بانگما دەکا
کەچی ئێمە لە باوەشی یەکتردا گوێمان بە بانگی حاجی لەق لەقەکان گرتووە
دەڵێن: وەرن.... وەرن با برۆین لەنێو ئەم تەمتومانە بگیرسێینەوە
سێبەری ئەم درەختە تەونایانە جێ بێڵێن با برۆین...
لەنێو ئەو تەمانە گوێ لەسەدای شیعر دەگرین
گوێ لە خۆمان دەگرین
گوێ لەخوا دەگرین
دەگرین

# شەوێک بەسەر تۆدا دەڕژێم

ئیدریس عەلی

چونکە دێت و
گوندانی دڵم پڕ دەکات لەتۆوی باران،
چونکە بە حەوت پشت
ـنـزانم کوێی چی شنەو
ـەر لە هەڵوەرینی گوڵە یاسەکانم
ـەگرێت،
شەوێک لەنوکی پێمەوە هەڵدەکات
ـ تەوقی سەرم
چی گۆرانییە پیرۆزەکانی تەنیایی و
شیعرە موقەدەسەکانی نامۆیم هەیە
ـمـاچێک هەپرون دەکات،
ـەو شەوانە وادەی فڕینی منە
ـە کۆڵانە ساماڵەکانی منالی و
ـسمانە بێگەردەکانی گریانا..
شەوی داگیرسانی هەردە پەنجەی دەستی
منە
ـەنێو شەمعدانی سینەی یاردا..
شەوی خۆترنجانی من و گوڵە
ـەنێو ژوورە پڕ لە پەنجەرەکانی ماچدا..
شەوی دەست دانە لەدیواری قەدەرو
پڕ کردنەوەی ئینجانە خامۆشەکانی بەر
پەنجەرەیە
لەفرمێسک و نەرمەنیگاو ناسکە
شیعر..
شەوی رووت بوونەوەی میوەکانی
هەستە
لەبەردەم غەریزە میوانە پۆشتەکاندا
شەوی راکردنی پێکەنینە بەرزەکانی
هەورە
بەشوێن نوکتە خۆشەکانی باراندا و
هەڵکەندنی چاڵێکی قوڵ لەسەراپدا و
شاردنەوەی قسە نەگوتراوەکانی
ئارەزوو..
شەوی بزرکردنی دیوە رووناکەکەی
مانگە
لە ئاوێنە سەختەکانی ژیاندا..
چونکە دەمزانی دێت و کوردانە
دەمکوژێت،
وەک کوشتنی ئەو ژنە تریفەییانەی
لە ئێوارانی ژێر هەتاودا
فەرموویان لەخەمی یەکتر دەکردو
شەوانەش لەماڵی گڵڵەییە رۆشنەکاندا
خۆیان لەدڵڕەقی پیاوە مەستەکان
هەڵدەسوون،
چونکە دەمزانی لەشەوێکدا زەنگی
دەرگاکە لێدەدات
شەوی بەیەک گەشتنی پەروانەو چرایە
لەژوورێکی تاو گرتودابە بە شیعر،
شەوی گوێگرتنە لەهاژەی بێدەنگی و
سەیر کردنی دوو چاوی ئاوس بە
بێڕەنگی،
شەوی دووبارە هەڵدانەوەی ئەلبومەکانی
پایزو
دیتنەوەی وێنە زەردەکانی رابردوو،
ئەو وێنانەی قەول بوو تیایاندا کاڵ
نەبینەوە
قەول بوو تیایادا پیر نەبین
قەول بوو تیایادا دایکمان
بۆنی رێحانەی تەڕ لە سنگیان بێت
نەوەک برین،
قەول بوو تیایادا باران عاشقانە بیارێت
(با) تیایادا شاعیرانە هەڵبکات..
قەول بوو لەپشت هەر وێنەیەکیان
ئیمزایەک بە خەتی کۆتر بکەین و
لەسەریان بنووسین،
پێشکەشە بەتۆ ئەی دۆزەخ..!!
چونکە ئەو شەوە
شەوی تەعاروف کردنی تەنیایی بوو
لەگەڵ گۆرانیەکی هێمندا،
شەوی کەفڕینی ئاوازێک بوو
لە کەنار کەمانێکی خامۆشدا،
شەوی تەوقە کردنی زاهیدێک بوو
لەگەڵ دەستێکی ئالاو لە پەرداخێک
مەی،
شەوی دانیشتنی دوو منالی بێزار بوو
لەسەربانی بەرزی شەرمەوە
کاتێ سەیری تاریکو روونی ئەستێرەکان
دەکەن
شەوی کرانەوەی خەیاڵ
بە رووی رەوە بەعیشوەکانی خەوندا و
تام کردنی زاری ترشی تاریکی..
شەوی تەنیایی درەختێکە
لەسێبەرەکەی نووسیووە، بۆ کرێ
مانگی بەبارانێک جریووەو!!
پێشەکی تەمەنێک ڕاموسان
چونکە دەمزانی شەوێک دێت
نیوەی دڵم مردووە..!!

## ئەو ڤێگەها

# ئەز پێ دبمە زەمبیل فروش

ئەدیب عەبدوللا

ڤێگەها مرۆڤێ ئەڤرو
ڤێگەهەکا هنێرمەندە
بەرەللایێ دکەساتیا
هەمی تەختێن
مروڤاندە
پەیدا دکەتن
برا بنار بخوکێن کافر
حەنەکا دگەل برای دکەتن
هزر هەمی بونە حەزەک
پەیڤێن فهێت و خاپینوک
لدور کریارێن نەوەی دا
دکوچکا مەدا پەیدا دبن
د دیتنا مندا
ل خراباتە گوندێ مەدا
سەد دیمەنێن دویڤێک دویڤێک
ژ دایک دبن
حەمر دبن
کەکو هەڤبەر
برسا فهێتا بێ مەفەر
لنکێن ژنێن
دایکێن زاروکێن شەهیدا
تەواف دبنە
پیسە ملێن هەتک بەرا
بەردللایی
ب ڤولکان و ب پەقە
دەرونێ من
ڤان دیمەنا قەبول ناکەت
دێ روژەکا دی بتردقە

* * *

لهێزی میرێ
پرقوسیرێ
راستی تەهێلایە دکیرێ
وەرە سەحکە ڤێ هنێرێ
سەد هوزان بێژو نڤیسەر
بونە گوری
لویلیا تڤەنگەکا کورد کوژ
چ بێ رگویی نەبم
دڤێت ب بم زەمبیل فروش
بلا من نەبیت ئێک قروش
نەکو لسفرا یارێن پووچ
ب کەڤمە چەرێ
تڤ و سەد تڤ
ل ژین و ژیارێ
زەمین شەقبە
زەمین کەر بە
دێ روناهی بەرەف کوژیێن تاری تاری
وەرە هەلبە
هەیڤێ پەیڤێ
وەرە خوارێ
بەس بکە گری و زێمارێ
وەرە دادە سەرچوکێ من
دا ئاڤاکەین
کەسایەتیا کەسەکێ دی
دا بهەلێتێ
ئەلندا بهارەکا دی.

* ڤێگەه: مەرەم پێ (سلوک)ـە. ١٩٩٥ئامێدی

# تەرمی شار

## لە بەیانییەکی تەمموزدا

سیامەند هادی

ئەوانەی لەو نیوەڕۆ گەرمەی ناوەڕاستی تەمموزدا بەنێو سەرە نوتلکەکاندا دەسووڕانەوەو بەدووی شتدا دەگەڕان، بەشێوەی گەڕان و جوولەو رووخسارياندا وا دەردەکەوت هیچیان نەدۆزریبێتەوە. سەريان شۆڕکردبووەوەو زۆر بەهێواشی بەو ناوەدا دەگەڕان، ئەگەرچی لە ماوەیەکی کورتی تێپەڕبوون بەو شوێنەدا هەست بەبۆنێکی زۆر ناخۆش دەکرا، بەڵام پێدەچوو ئەوان راهاتبێتن و هەست بەو بۆنە ناخۆشە نەکەن، جگە لەوەش فراوانی و بەربڵاوی شوێنەکە لەو دەشتە چۆڵەدا تارادەیەک بەری بەپەنگخواردنەوەی بۆنەکە گرتبوو. ئەوانەی لە پاسەکەدا بوون و بەتەنیشت دەشتەکەدا تێپەڕین، تەنها بەتەماشاکردنێکی کورت هەندێک پرسیار تارادەیەک سەرقاڵی کردن. پێدەچوو هیچیان زانیارییەکی ئەوتۆیان دەربارەی ئەو کەسانە نەبێت. ئەمەش رێگەی لەوروژاندنی ئەو پرسیارانە گرتبوو، بەڵام پیاوێک، کە پشتی لە شوفێری پاسەکە بوو، بەرامبەر زۆربەی ئەو کەسانە دانیشتبوو، کە لە پاسەکەدابوون، دیاربوو زانیاری لەسەر ئەو کەسانە هەبوو، هەربۆیە بەرستەیەکی کراوە، سەرنجی هەمووانی بۆ خستنەرووی بابەتێک راکێشا. ئەو پیاوە دوای تێپەڕبوون بەتەنیشت سەرەنوتلکەکاندا وتی (ئای.. ئەمانە هەر وازیان لەو پیشەیە نەهێنا). بەبێئەوەی کەس وەڵامی بداتەوە، پاش ماوەیەکی کەم دەستیکرد بەقسەکردن. ئەو پیاوە بەچەند رستەیەکی پێکەوە نەبەستراوو پچڕپچڕ دەیویست ئەوانەی ناو پاسەکە لەوە ئاگادار بکات، کە ئەو زانیاریی تەواوی لەسەر ئەو کەسانە هەیە، کە بەنێو سەرە نوتلکەکاندا دەگەڕان، بەبێئەوەی ئەو پیاوە لە پیشەی خۆی بدوێت. بەقسەکانیدا وا دەردەکەوت زۆر لەو شوێنەوە تێپەڕیت. هەموو ئەوانەی لەنێو پاسەکەدا بوون، بەهیچ شێوەیەک نەیاندەتوانی وێنای ئەو پیشەیە بکەن و ئەو شتانە بهێننە بەرچاوی خۆیان، کە ئەوانە دەستیان دەکەوێت.

کوڕێکی گەنج لەناو پاسەکەدا وەک ئەوەی پرسیار ناڕاستەی کەسێکی

ئادیار بکات وتی (باشە ئەوانە لەو گەڕانەدا چییان دەستدەکەوێت؟). ئەو پیاوەی وا خۆی نیشاندەدات زانیاری تەواوی لەسەر ئەو کەسانە هەیە، وەک ئەوەی پرسیارەکە ئاراستەی ئەو کرابێت دەستیکرد بەقسەکردن (بەهۆی ئیشەکەمەوە ماوەیەکی زۆرە لێرەوە تێدەپەڕم، ئەمانە لەوکاتەوە بەهەمانشێوە لەو ناوەدا بەدووی شتدا دەگەڕان. بەیانیان کاتێک لێرەوە دەڕۆیشتم زۆر لە ئێستا قەرەباڵغتربوو، ڕەنگە ئێستا بەهۆی گەرماکەوە تارادەیەک چۆڵ بووبێت. هەموویان کاتی هاتنی سەیارەکانیان دیاریکردووەو دەزانن لە چ کاتێکدا ئەو سەیارانەی خۆڵەکە دێن و لەوێدا هەڵیدەڕێژن. ئەو کەسانە ژن و پیاوو منداڵ و زۆرجار کەسی بەتەمەنیشیان تێدایە. دەڵێن ئەو کەسانە خەڵکی ئەو گوندانەی دەورووبەرن و لەتاو نەبوونی بەنێو ئەو سەرە نوێلکانەدا دەگەڕێن، بەڵام من بڕوا ناکەم، ئەوانە هەموویان خاوەنی زەوی کشتوکاڵی و مەڕوماڵاتن. ئەوانە تازە فێری ئەم پیشەیە بوون و لەو بڕوایەدانیم دەست لەو کارە هەڵبگرن، ساڵێکی ڕێک دەبێت هیچیان نەدۆزیوەتەوە، دەبوایە لە هاوینی ڕابردووەوە وازیان لەم کارە بهێنایە!). ئەو پیاوەی بەهیچ شێوەیەک لە قسەکانیدا نەچۆوە سەر ئەو پرسیارە ئاراستەی کرابوو، هەربۆیە کوڕە گەنجەکە زانی وەڵامی پرسیارەکەی دەستگیر نەبووە، ئەمجارەیان بەشێوەیەکی ئاراستەکراو پرسیارەکەی دووبارە کردەوە (ئەوانە هەموو ڕۆژێک بەنێو ئەو سەرە نوێلکانەدا دەگەڕێن چییان دەستدەکەوێت؟). پیاوەکە ئەمجارەیان بەتەواوی زانی پرسیارەکە ئاراستەی ئەو کراوەو دەبێت وەڵامی بداتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەوە دەچوو یەکەمجاریش گوێی لە پرسیارەکە بووبێت ویستبێتی وەڵامی ئەو پرسیارە دەربخات. بەوەش ئامادەبووانی نێو پاسەکە بۆ چەند بابەتێکی دیکە ڕابکێشێت. هەربۆیە بەخێرایی بەدوای پرسیارەکەدا دەستیکرد بەقسەکردن (من شانزە ساڵە لێرەوە هاتووچۆ دەکەم، ڕێک لەو کاتەوەی باوکم مرد. پێش ئەوەش جاربەجارێک لەگەڵ باوکم دەچووم بۆ ئیش و لێرەوە تێدەپەڕیم). پیاوێکی بەتەمەن کە بەرامبەری دانیشتبوو پرسی (باوکت بەچی مرد؟) پیاوەکە وەڵامی دایەوە (جەڵتەی دڵ لێیدا. ڕۆژێک پێش ئەوە من ئێستا چۆنم، ئەویش ئاوا هاتەوە بۆ ماڵەوەو هیچی نەبوو. شەو وایلێهات، بردمانە نەخۆشخانە ئەو شەوە خۆم لەلای بووم بەیانی زوو لەگەڵ خۆرهەڵاتندا گیانی دەرچوو!).

بێدەنگییەک خەڵکی نێو پاسەکەی بۆ ماوەیەک لەڕوانین و بیرکردنەوە وەستاند، بەڵام دواتر پیاوەکە وەک ئەوەی هەستی بەوە کردبێت باسێکی تری بەجێهێشتووە. گەڕایەوە سەر باسەکەی خۆی و دەستیکردەوە بەقسەکردن (وەک وتم دوای ئەوەی باوکم مرد ناچاربووم بەهۆی ئیشەوە هەموو جارێک لێرەوە بڕۆم، ئەو شتانەی ئەمانە کۆیدەکەنەوە هیچی وا نین بەڵام تازە فێری ئەو کارەبوون و ناتوانن وازی لێبهێنن ئەمانە بەنێو پاشماوەی فڕێدراوی شاردا دەگەڕێن ئەو شتانەی خەڵکی شار بەئاگایی و بێئاگاییەوە فڕێیدەدەن و سەیارەی خۆڵەکەش کۆیدەکاتەوەو لەوێدا، کە بینیتان هەڵیدەڕێژێت ئەو شتانە چین؟ کەوچک و چەتاڵ و پەڕۆو پاتاڵ و پێڵاوی کۆن و پلاکی کارەباو بەلوعە شکاوو کۆمەڵێک پاشماوەی تر هەندێکجاریش شتی بەکەڵکیان تێدەکەوێت، ئەو شتانەی لەلایەن هەندێ ماڵەوە بەبێئاگاییەوە فڕێدەدرێن، دەڵێن جارێک ژنێک ڕادیۆیەکی بچوکی دۆزیوەتەوە ئیشی کردووە، هەروەها دەڵێن هەندێجار پارچە ئاڵتونیشیان دۆزیوەتەوە!) دانیشتوانی شار ئاگاداری ئەوە نین پاشماوە فڕێدراوەکانیان لەلایەن خەڵکانی دیکەوە دەپشکنرێن کەسێک جوتێک پێڵاو بۆ دواجار فڕێدەداتە تەنەکەی خۆڵەکەوە بەبێئەوەی بەوە بزانێت کەسێکی دیکەش بۆ ماوەیەکی تر پێڵاوەکانی ئەو لەپێ دەکات، خەڵکی شار بەهیچ شێوەیەک خەیاڵیان دوای ئەو شتانە ناخەن کە فڕێیاندەدەن، بەڵام ئەوانەی بەنێو سەرە نوێلکەکاندا دەگەڕان بەبەردەوامی وێنای شێوەی ژیان و ماڵ و خانووی ئەو کەسانە دەکەن، کە شتەکانیان دەدۆزنەوە، زیاتر ئەو کاتانەی شتەکانیان بەکەڵک بێت.

ئەو پیاوەی وای نیشاندەدا زانیاری لەسەر ئەو کەسانە لایە، لە سەرەتادا زۆربەی ڕوانینەکانی شێوەیەکی گشتگیرو ڕووکەشانەی لەخۆگرتبوو پێدەچوو هەر لەخۆوە ڕقی لێیانبێت، هەربۆیە کاتێک لێیاندەدواو قسەی پێدەوتن و بەهیچ شێوەیەک بڕوای بەوە

...ـتن ئەو كەسانەی رۆژانە سەرە ...ـكەكـان دەپشكنن هەژار بن و لەبەر ...ی ئەو كـارە بكەن)، ئەو زوو زوو ...ی دەكـردە خـەڵكی ناو پاسـەكـەو ...ـگوت (ئێـــوە لەو بڕوایەدان ئەو ...ـە بەو كـارە بژین؟) هەمـوو ...ێكیش وایدەردەخست ئەوانەی ئەو ... كردووە بەپیشەی خۆیان، خویان ...ـگرتووەو ئەو گـەڕانە بەگـەرمـای ...ـن و سەرمای زستان وەک خویەكەو ...ـجی تر. ئەوانەی لەو نیوەڕۆ گەرمەی ...ـزدا بەنێـو پاشمـاوەكـانی شـاردا ...ـن، هەرگیز بیریان لەوە نەدەكردەوە ...ـنێک هەبن ئەو كـارەی ئەوانیـان ...ـەک خـــویەک وابێت و بەهیچ شێـوەیەک نەیگەڕێننەوە بۆ هەژاریی! ...ـەكانی شار بەتەنها كۆن و پەڕۆو ... و كـەوچک و چەتاڵ و شـتی لەو ...ـە پێكنەهاتبوون. ئەوە دیوێكی زۆر ...ـكـرای ئـەو دیمـەنـەبـوو. ئـەو ...ـكــردنەوەی رێبـــواران دوای ...ـاكـردنێكی خـێرای ئەو سـەرە ...ـلكانە لەلایان دروست دەبێت وەک ...ـە وایە تەمـاشـای جـامی وێنەیەک ...ـەن راســـتــــە دەزانن ئـەو وێنەیە ...ـێكەو رەنگە بزانن چیـــشی ...ـدایە، بەڵام رەنگەكـانی ئەو وێنەیە ...ـن و چۆنیـــتی رووخـــساری ئەو كـەسـەشـیـان بۆ ناخوێنرێتـەوە كـە لە وێنەكـەدایە. هەربۆیە رێبـواران كـاتێک ...ـەر شـەقـامی تەنیـشت سـەرە ...ـلكەكاندا تێدەپەڕن و تەماشای ئەو كـەسـانە دەكـەن، بەتەنهـا روانینێكی ...ـیـان لە بەرامبـەر ئەو كەسـانەدا دەبێت.

كەسێک لەناو پاسەكەدا كە تا ئەو كاتەش هەست بەوە نەدەكرا گوێی بۆ ئەو گفتۆیە گرتبێت وتی (باشە ئەوانە چۆن تووشی نەخـۆشی نابن؟) ئەو پیـاوەی وای دەردەخـــست زانیـــاری تەواوی دەربارەی ژیانی ئەو كەسانە لایەو خۆی كـردبوو بەخـاوەنی گـفـتـوگـۆكـە، پرسـیـارەكـەی قـۆسـتـەوە دەسـتیكرد بەقـسـەكـردن (كـاتی خـۆی مـاڵمـان لە گوندێكی نزیک شار بوو كە ئێستا بووە بەگەڕەكێک لە شار شێوێک بەكەناری شاردا تێدەپەڕی و كەوتبووە نێوان شارو گوندەكەی ئێمەوە. پێش ئەوەی بگەیتە گوندەكە باخەوانەكانی ئەو دەوروبەرە بۆ ئەو زەویانەی سـەوزەیان تیـاداكـردبوو چەند جـۆگـەلەیەكـیـان لە شـیـوەكـەوە راكـێـشـابوو شـیـوەكـە زۆر پیس بوو هەمیشە منداڵانی گوندەكە یاریان تێدا دەكرد، جـارێكیـان بیـرم دێت منالێكی دراوسێمان زۆر نەخۆش بوو عەسرێكیان دایكی بۆ كات بەسەربردن هاتە ماڵمان و لەگەڵ دایک و باوكم دانیشت دایكم هەواڵی كوڕە نەخۆشەكەی پرسی ئەویش بەرووخـــارێكی خـەمناكـەوە باسی ئەوەی دەكرد كە چەند جارێک بردویێتی بۆ لای دكـتـۆرو چاری نەبووە! ئەو ژنە دەیگوت: دایكم دەڵێت هەبێ و نەبێ ئەو كـوڕەی تۆ بەبۆن كـەوتووە! دایكم كـاتێک گـوێی لە قـــسـەیە بوو بەبێ بیركردنەوە كتوپڕ بەو ژنەی دراوسێمانی راگـەیاند: ئەگـەر تۆزێک لە گـــاوی شـیـوەكـە دەرخواردی منداڵەكەی بدات چاكـدەبێـتـەوە، دایكم دەیگوت پیسی بەپیـــــیـــــیـــەوە دەڕوات! دوای ئەوەی ژنەكەی دراوسێمـان سەری رەزامەندیی بۆ ئەو قـسـەیەی دایكم راوەشاند. خێرا بەمنیان راگەیاند بچم تۆزێک لە گاوی شـیـوەكـە بهێنم. وا دەزانم ئێـسـتـایە هێشـتـا عوسـمـانی برام منداڵ بوو، من هەر خـۆم بەتەنهـا رۆیشـتم جـامێكی مسی بچوكیـان دایە دەستم و بەڕاكردن بۆی دەرچووم ئەو شێوەی لەنێو شارەوە دەهات و لەخـوار گـوندەكـەمـانەوە تێدەپەڕی لە چەند شـوێنێكدا باریک دەبۆوەو لە هەندێ شـوێنی دیكەشـدا پانیــیـەكـەی فـراوان دەبوو منداڵانی گـوندەكـەی ئێـمـەو گـوندێكی ئەوبەر ئێـمـەش رۆژ تا ئێـوارە یاریـیـان لە دەوروبەری ئەو گـاوە دەكـرد - ئێمـە پێمـان دەگوت گاو هەموو جارێک كە ئێـمـە دەچووینە نێـو باخـەكـانەوە باخەوانەكان بەبەرە راویان دەناین، بیرم دێت چەند جارێک لەدەست باخەوانەكان رامكردووەو كەوتوومەتە ناو گاوەكەوە، ئێـمـە بەبەردەوامی لە دەوروبەری ئەو گــاوەش بووین و نەشـــمـاندەزانی نەخۆشی چییە! كە چووم بۆ گاوەكە، لەشـوێنێكی تاڕادەیەک روونەوە وەک دایكم پێیوتبووم جامە مسەكەم پڕكرد لە گاوو بردم بۆ ماڵی دراوسێكەمان بڕوا بـكـەن دوای دوو یان سێ رۆژ بوو ئەو ژنە هات بۆ مـاڵمـان و بەدایكمی وت، كـە كـوڕەكـەی بەخـواردنی ئەو گـاوە چاكبـۆتەوە! ئیـتـر ئەوانەش فـێـری ئەو سەرنوێلكانە بوون ونەخۆش ناكەون).

ئەو كـەسـەی پرسـیـارەكـەی كـردبوو وادەردەكـەوت هیچ پەیوەندییـەک لە نێـوان پرسـیـارەكـەی خـۆی و وەڵامی پیاوەكە نەبینێتەوە، هەربۆیە لەسەرخۆ وتی (ئەوە شـتـێكی جیـاوازە تۆ باسی

دەکەیت، من دەڵێم ئەوانە لەناو ئەو کەسەی وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە وتی (من دەڵێم ئەوانە بەو بۆن و پیسییە راهاتوون و لەو بڕوایەدام ئەو بۆن و پیسییەیان لێبڕێت نەخۆش دەکەون، ئەوان بەیانیان دەچنە سەر ئەو سەردنوێلکانەو لە جیاتی هەڵمژینی هەوای خۆش بۆنی ناخۆشی پاشماوەکانی شار هەڵدەمژن!).

ئەوانەی بەیانیان دەچوونە سەر سەردنوێلکەکانی دەرەوەی شارو بێناگا لە کۆمەڵێک شت بەدووی دەستکەوتی بەکەڵکدا دەگەڕان، شاریش هەموو رازەکانی خۆیان لە کیسی نایلۆندا توند دەپێچنەوەو بەنیازی سەرنگومکردنی فڕێیدەدەن. نازانن چەند کەسێک بەبێ پەروا بەنێو رازەکانی ئەواندا دەگەڕێن و هەموو شتە شاراوەکانی ئەوان ددخەنە بەرپلارو گاڵتەپێکردن. ئەوانەی بەسەر نوێلکەکاندا دەگەڕێن، ئاگاداری ئەوەن خێزانەکانی شار چی دەخۆن چ شتێک زۆر بەکاردێنن. زۆرجار جنێوبارانی شار دەکەن، بەتایبەتی لەو کاتانەدا بەشتێکی پێچراوەوە ماوەیەک خەریک ددبن و هیچیشی تێدا نابێت، کاتێک شتێکی باشیش دەدۆزنەوە ماوەی گەڕانەکەیان کەمدەکەنەوەو بەخێرایی و دڵخۆشییەوە بەرەو ماڵەوە دەگەڕێنەوە بەبەردەوامی گاڵتە بەشار دەکەن و ددڵێن (شار هەموو شتێک فڕێدەدات!).

بەو پیاوەی لەنێو پاسەکەدا قسەی دەکرد، کەوتە باسکردنی ئەو شتانەی شار فڕێیددەدات، ئەویش لە چەند کەسێکەوە بیستوێتی هەندێجار ئەوانەی بەسەرە نوێلکەکاندا دەگەڕێن شتی بەکەڵکیان دۆزیوەتەوە. ئەو پیاوە لەو بارەیەوە دەستیکرد بەقسەکردن (دەڵێن جارێک زەرفێک ئاڵتونیان دۆزیوەتەوە نازانم ئەوە تا چەند راستەو منیش کەسێک بۆی گێڕامەوە، ئەویش لە یەکێکی دیکەی بیستبوو. کەس نازانێت هەموو ئەو شتانەی خەڵک دەیانگێڕنەوە راستن یان نا هەموو کەسێک دەڵێت یەکێک بۆی گێڕامەوە ئیدی کەس نازانێت ئەو کەسە کێیە؟ جاری وا هەیە یەک شێوە بەسەرهات لای چەندین بنەماڵە خێزان وەک یەک هەیەو ئەوە بەنەوە بەیەک شێوە دەیگێڕنەوە. جا نازانم ئەو زەرفە ئاڵتونە راستە یان نا، چونکە منیش بۆیانگێڕاومەتەوە) دوای تەواوبوونی قسەکانیشی لەبەرخۆیەوە گوتی: (زەرفێک ئاڵتون ئەو خەڵکە شێتبوو زەرفێک ئاڵتون فڕێبدات ئەگەر بیانوتایە ملوانکەیەک یان موستیلەیەکی ئاڵتون ئەوە رێی تێدەچوو، بەڵام زەرفێک...! لە دوای تەواوبوونی ئەو قسەیە ماوەیەک بێدەنگبوو دواتر کاتێک زانی کەس قسە ناکات بێدەنگی نێو پاسەکەی قۆستەوەو دەستیکردەوە بەقسکردن (دەبوایە ئەوانە لە پاردوە وازیان لەو کارەیان بهێنایە) ئەو کاتەی هیچ کەسێک پرسیاری بەدووی ئەو قسە نادیارەدا بەرز نەکردەوە ناچار پیاوەکە دەستیکردەوە بەقسەکردن وای بۆ دەچوو ئەو کەسانە دەتوانن واز لەو ئیشە بهێنن و ئیشێکی تر بکەن ئەو وایدەگێڕایەوە کە زۆر منداڵبووە لەگەڵ باوکیدا ئیشیکردووە هەربۆیە دوای پیشەکییەک بۆ سەرنجراکێشانی خەڵکەکە ئەمجارەیان بەشێوەیەکی راستەوخۆو بەخۆهەڵکێشانەوە کەوتە قسەکردن (من منداڵبووم باوکم لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا شتومەکیان بەوڵاخ بۆ ئەودیو سنور دەبرد، دواتر کە تۆزێک گەورەتر بووم ئیتر چەند جارێک لەگەڵیان چووم و هاوکاریم دەکردن، هەرچییەک رەواجی هەبوایەو پارەی زۆری بکردایە دەمانبرد بۆ ئەودیو سنوور، دوای مردنی باوکیشم بەهەمانشێوە لەسەر ئەو کارە بەردەوامبووم ئەگەرچی چەند جارێکیش لەسەر هەندێ شت کە دەمانبرد بۆ ئەودیو سنور زیندانی کراوم، بەڵام تازە چۆن واز لەو ئیشە بهێنم لە منداڵییەوە ئەوە کارمە، ئەوەی ئەوان دەیکەن ئیش نییە دەتوانن خۆیان بەشتێکی دیکەوە خەریک بکەن لەگەڵ ئەوەشدا وەک وتم تازە فێری ئەو ئیشە بوون و بڕوا ناکەم وازی لێبهێنن!).

ئەگەرچی کەسانی نێو پاسەکە تارادەیەک گوێیان بۆ قسەکان گرتبوو، بەڵام تەنها دوو کەسی نزیک ئەو پیاوەی قسەی دەکرد تێکەڵ بەگفتوگۆکە بووبوون، پیاوێک لەوەدەچوو تا ئەوکاتەش بەباشی لەتەواوی گفتوگۆکە تێنەگەیشتبێت. هەربۆیە روویکردە پیاوەکەو لێیپرسی (بۆچی تۆ زۆرجار لەو شوێنەوە تێدەپەڕیت؟) وەک ئاگادارکردنەوەیەک و تارادەیەکیش سەرزەنشتکردنێکیش وتی (پێشتر باسمکرد کە من و یەک دوو کەسی تری هاوڕێم هەندێک کەلوپەل دەبەین بۆ

ئەودیو سنوورو دەیفرۆشین، زۆرجاریش لەوێشەوە چەند شتێک دێنین بۆ ئێرە، بەودیو بکەن زۆر منداڵبووم لەگەڵ باوکم و هاوڕێکانیدا دەچووم بۆ ئەو ئیشە، هەموو جارێک دایکم دەیکرد بەبۆڵەبۆڵ لەگەڵ باوکمداو پێی ناخۆشبوو منیان بۆ سەر سنور دەبرد، باوکم پێیوابوو ئەگەر لەمنداڵیدا فێری ئیشکردن نەبم. کە گەورەبووم ناتوانم هیچ ئیشێک بکەم) بێدەنگییەک باڵی بەسەر کەشی نێو پاسەکەدا کێشا هەندێک لەوانەی لەنێو پاسەکەدابوون وا خۆیان نیشان نەدەدا گوێیان لە قسەکان نەگرتووە. هەربۆیە ئارەزووی ئەوەیان نەبوو تێکەڵ بەگفتوگۆکە ببن، ئەوانەی لە دەوری سەرەنوێلکەکان کۆدەبنەوە بۆ هەمان مەبەست بەنێو شاریشدا دەسووڕێنەوە، ئەوان دەڵێن (شار هەموو شتێک فڕێدەدات) خەیاڵیان بۆ ئەوە دەچێت مەرج نییە هەموو شتە فڕێدراوەکانی شار لەو سەرەنوێلکانەدا کۆببنەوە ڕەنگە چەندین شت هەبن لەنێو شاردا فڕێبدرێن، ئەو خەیاڵەش چەند کەسێک لەوانە بەدووی خۆیدا دەبات و بەنێو شاردا دەیانسووڕێنێتەوە، دەڵێن بۆ نزیکەی شانزە ساڵ دەچێت ئەوانە فێری ئەوەبوون بەنێو شاردا بگەڕێن بەبێئەوەی بەشێوەیەکی سروشتی و وەک دانیشتوانی شار بتوانن بەڕێگەدا بڕۆن، ئەوان بەبۆنێکی پیسەوە بەبەردەوامی بەنێوشاردا دەگەڕێن هەموو ڕۆژێک شەقام و کۆڵان و گەڕەک و بازاڕو قەیسەرییەکانی شار پڕ دەکەن لە بۆنی ناخۆش ئەوان لەتێپەڕبوونیاندا بەنێو شاردا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بۆنێکی زۆر ناخۆش بەدووی خۆیاندا بەجێدێڵن بۆنی سەرە نوێلکەکان لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن و بەشاردا دەیگێڕن ئەو بۆنە دەبەنە قەیسەرییەکانی شار، دەیبەنە بەر دەرگای ماڵان دەیبەنە نێو دوکانەکانی بازاڕ شاریان بۆگەن کردووە! خەڵکی شار بێزاربوون ڕقێکی زۆریان لەو کەسانە دەبێتەوە کە شاریان قەرەباڵغ و پیسکردووە.

ئەو پیاوەی بەتەواوی گفتوگۆی نێو پاسەکەی بەدەوری بابەتی سەرەنوێلکەکاندا دەسووڕاندەوە، لەوەدەچوو پێیناخۆش بێت بەو شێوەیە باسی ئەو کەسانە دەکات، هەربۆیە دوای ئەوەی چەند قسەیەکی پێوتن، بەهێواشی و وەک ئەوەی ئاخ بۆ ڕابردوویەکی سەنگین هەڵبکێشێت دەستیکرد بەقسەکردن (ئەوانەی هەموو بەیانییەک لە دەوری سەرە نوێلکەکان کۆدەبنەوە، جاران لە چەند گوندێکی دەوروبەری شاردا دەژیان و سەرقاڵی ئاژەڵداری بوون و زەوییەکانی نزیک شاریشیان کردبووە سەوزەو ڕۆژانە دەیانهێنا بۆ نێو بازاڕ ئێمەش پێشتر لە گوندێکی نزیک شار دەژیان، بەڵام زوو هاتینە شار وابزانم من ئەوکاتەی هاتینە شار تەمەنم پانزە - شانزە ساڵ دەبوو ئەو گوندنشینانەی دیکەی هەمووی سیانزە - چواردە ساڵ دەبێت هێنراونەتە شار. ئەوان کاتێک هاتنە شار هەموو ژیانیان گۆڕا پێمناخۆشە وادەڵێم، بەڵام ڕیتمە سادەو هێمنەکانی ژیانی خۆیان لەدەستداو نەشبوونە شارنشینێکی تەواو! جاران سەوزەیان دەهێنا بۆ نێو شار ئێستا بۆنی سەرە نوێلکەکان ئەوسا ئەوان شاریان دەژیان، بەڵام ئێستا خۆیان لەسەر پاشماوەی شار دەژین! شاریان پڕکرد لە بۆنی سەرەنوێلکەکان!) پیاوێک وەک ئەوەی لە پاڵ پشتگیریکردنێکدا قسەیەکی حەق بۆ ئەو کەسانەش بکات وتی (ڕاستە ئەوانە شاریان زۆر قەرەباڵغ کردووە، بەڵام ئەوان چیبکەن؟ ئەمە قەدەری ژیانەو بەهیچ شێوەیەک دەسەڵاتی خۆیانی تێدا نییە).

ئەگەرچی ئەو ویستی بەپەلە وەڵامی بداتەوە، بەڵام وەستانی پاسەکە لە بازگەیەکدا وایکرد هەمووان تەماشای پێشەوەی پاسەکە بکەن ،دوو سێ چەکدار لەمبەرو ئەوبەری جادەکەوە وەستابوون یەکێکیان دوای چاوگێڕانێک بەنێو پاسەکەدا بەدەست ئاماژەی بۆ شوفێری پاسەکە کرد، بڕوات هەمووی چەند مەترێک تێنەپەڕیبوو، ئەو پیاوەی زۆر بەپەلەبوو بۆ وەڵامدانەوە دەستیکرد بەقسەکردن (قەدەری ژیانی چی؟ ئەوان ئەگەر بیانەوێت دەتوانن هەموو ئیشێک بکەن، بەڵام خۆیان بەو پیشە ناشرینەوە خەریککردووەو ئەو ژیانە ساکارو سادەیەی خۆیان لەدەستداوەو شاریشیان بۆگەن کردووە) ئەو پیاوە لەگەڵ ئەوەی دەیویست ڕووی دزێوی ئەو کەسانە نیشانبدات کە پیشەیان گەڕانە بەنێو سەرە نوێلکەکاندا لە هەوڵی ئەوەشدا بوو کەلێنێکی گەورەی جیاوازی لە نێوان ئەوان و خۆیدا بۆ کەسانی نێو پاسەکە دروستبکات، ئەو پیاوە ئەوەی بەئاسایی دادەنا هەر کەسێک بەئارەزووی خۆی لەگوندەوە دێتە نێو

شار، بەڵام دەبێت بزانێت چ پیشەیەک هەڵدەبژێرێ و چۆن ڕەفتار دەکات؟ دەیگوت (من شانازی بەوەوە دەکەم خەڵکی گوندێک بووم و دواتر هاتووینەتە شار لەگەڵ ئەوەشدا شانازی بەشاریشەوە دەکەم و شارەکەم خۆشدەوێت، بەڵام ئەوان لەگەڵ ئەوەی نیازی گەڕانەوەیان نییە بۆ گوندەکانیان خۆشیان بەبەرپرسیار نازانن بەرامبەر بەشارو هەمیشە خۆیان بەمیوان دەزانن!) دوای ئەو چەند ڕستەیە لەسەرخۆ کەوتە باسکردنی ژیانی گوندو بەنەشئەیەکی پڕ لەخۆشییەوە لەژیانی نێو بێستان و دەغڵودان و باخ و بەخێوکردنی ماڵات دەدواو بەراوردی دەکرد بەو پیشەی ئێستایان و دەیگوت (بۆنی باخ و باخات لەکوێ بۆنی سەرەنوێلکەکان لەکوێ؟ هێمنی و هەوای سافی گوند لەکوێ و قەرەباڵغی و هەوای پیسی شار لەکوێ؟ من ئەگەر بستێک زەویم لەگوندێک هەبوایە دەچووم لەوێ نیشتەجێدەبووم ئەوانەی بەسەر نوێلکەکاندا دەگەڕێن دەبوایە هیچ نەبوایە لە ساڵی پاردوە بەتەواوی وازیان لەو پیشەیە بهێنایە!

ئەوانەی لەنێو پاسەکەدابوون بێدەنگ بووبوون و کەس قسەی نەدەکرد، لەوەدەچوو ئەو پیاوە چاوەڕێی ئەوەی کردبێت یەکێک پرسیاری لێبکات، هەربۆیە ئەویش وا خۆی دەرخست ئیدی تاقەتی قسەکردنی نەماوە لەوە نەدەچوو گفتوگۆکە کۆتایی پێهاتبێت، چونکە ئەو پیاوە بەڕوانینێکی گوماناوی و تەواونەکراوەوە کۆتایی بەقسەکانی هێنا، ئەمەش وایکرد پیاوێک کە لەتەنیشتییەوە دانیشتبوو بپرسێت (بۆچی دەبوایە ئەو کەسانە لە پارەوە دەستیان لەو نیشە هەڵبگرتایە؟) کاتێک گوێی لەو پرسیارە بوو بەرەنگ و ڕووخساری ئەو پیاوەدا وادەردەکەوت لەسەرەتای قسەکردنییەوە چاوەڕوانی ئەو پرسیارە بکات، هەربۆیە زۆر بەخۆشحاڵییەوە و تارادەیەکیش خێرا دەستیکرد بەقسەکردن (وەک دەڵێن ساڵێک لەمەوپێش بەیانییەکی زوو وەک هەموو ئەو بەیانیانەی ئەو کەسانە بەرەو سەرەنوێلکەکان بەڕێدەکەون، ئاوا ژن و پیاوو منداڵ ڕوویان کردۆتە یەکێک لەسەرە نوێلکەکان، وەک دەڵێن گەورەترین سەرەتوێلکە بووە هەر لە دوورەوە هەستیان بەشتێکی نائاسایی کردبوو لەوەنەدەچوو هیچ شتێک لەوێدا کەوتبێت، جگە لە پاشماوەکانی ڕۆژانی پێشوو ئەو کۆمەڵە کەسەی بەرەو ڕووی سەرەنوێلکەکە دەڕۆیشتن هەنگاوەکانیان خێراییان لەدەستدابوو، زۆر بەسستی و لەسەرخۆ بەترسەوە ڕۆیشتبوون تا نزیک بووبوونەوە زیاتر دیمەنەکە ڕونتر بووبۆوە، لە دواجاردا چاوی هەموویان زۆر بەسەرسامی لەسەر دیمەنی ئەو بەیانییە سەرە نوێلکەکە لەنگەری گرتبوو، دەڵێن ئەو بەیانییە لەبری پاشماوەی شار تەرمێک لەسەرە نوێلکەکەدا کەوتبوو وەک دەگێڕنەوە تەرمەکە مرۆڤێکی ئاسایی نەبووە، ئەوەی دەیڵێن تائێستاش کەس بڕوای پێناهێنێ من نازانم تا چەند ڕاستە، بەڵام هەموو ئەوانەی لەو بەیانییەدا چوونەتە سەر تەرمەکە لەباسکردنی دیمەنەکەدا تەبان، پێش هەموو شتێک کەوتنی تەرمەکە جێگەی سەرسووڕمان بووە لەکەوتنی تەرمەکەدا بەرزونزمییەکی زۆر لەسەر ڕووی لەشی دەرکەوتووە، سەرەڕای ئەوەش تەرمەکە لە دوورەوە بریسکاوەتەوە وەک ئەوەی لەشی لەوردە شووشە پێکهاتبێت. دەستی ڕاست و قاچی چەپی وەک هێڵێکی ڕاست و شەقامێکی ڕێک درێژببوونەوە، دەستی چەپ و قاچی ڕاستیشی بەشێوەیەکی نارێک و وەک چەند کۆڵانێکی پێچاوپێچ بەپێچەوانەی دەستی ڕاست و قاچی چەپییەوە بڵاوکرابوونەوە، زۆر کەس شێواوی و نارێکی کەوتنی ئەو تەرمەیان دەگەڕاندەوە بۆ چۆنیەتی فڕێدانەکەی تەرمەکە لەسەر شوێنێکی لێژ فڕێدرابوو، شوێنی دەستی ڕاستی زۆر لە شوێنی قاچی چەپی بەرزتربوو بەشێوەیەک فڕێیاندابوو خۆر لەلای شانی ڕاستییەوە هەڵدەهات و لەخوار قاچی چەپییەوە ئاوادەبوو، لەوە دەچێت نائاسایی دیمەنی تەرمەکە نەیهێشتبێت بەتەواوی و بەوردی لە جەستەی ئەو تەرمە فڕێدراوە بڕوانن هەندێک لەوانەی لەو بەیانییەدا لەسەر تەرمەکە ئامادەبوون، پێیانوایە ئەو شتەی لەو بەیانییەدا بینیویانە تەرمی مرۆڤ نەبووە، دەڵێن لەو بەیانییەوەی تەرمەکەیان تیادا بینیوە ئەوانەی هەموو ڕۆژێک بۆ دەستکەوتێک بەنێو سەرە نوێلکەکاندا دەگەڕێن وا بۆ ماوەی ساڵێک دەچێت هیچ شتێکیان نەدۆزیوەتەوە!).



# تراژیدیای شەوێک

شاخەوان ئیبراهیم

ـت بەخێرایی تێدەپەڕی، ـحۆشترین و ترسناکترین شەو بوو ـێی منەوە، تەماشای هەر لایەکی ئەم ـەردوونەم دەکرد ڕەش دەچۆو، لەسەر ـردۆنگەیەکی نزمتر لە کێوە ـدکاندابووم، بێدەنگییەک چوار ـوەرمی تەنیبۆوە، هەندێجار نەبێت ـنێو دارستان و باخچەی ماڵەکاندا و ـە ئاوازێکی خۆش دەنگی بۆق و ـژەڵی ترم بەرگوێ دەکەوتن.

بە ئاسپایی سەیرێکی ئاسمانم کرد وەک جاران ئاسایی نەدەهاتە بەرچاوم، بگرە ڕەنگی خوێنی پێوە دیاربوو ئەو جاردیان بە ترسەوە سەیری مانگم کرد، هێندەی پێنووسێک بە ئاسمانەوە دەبیندرا، هەر چوار لای مانگ سوور دەچۆوە، هەستم لەخۆ ڕادێرا هێواش هێواش باڵندەکانی خەیاڵ دەهاتنە نێو مێشکمەوە، بەدەم سەیرکردن و ئاوابوونی هەیڤەوە بیرم بۆ مردن چوو، مردنێکی ناسروشتی لێرە نزیک بۆتەوە، ئەگەرچی مردن هێزێکە مرۆڤ لە توانایدا نییە خۆی لێبەدوور بگرێت، هیوایەکی پووچە مرۆڤ بیەوێ نەمرێت، هەردەبێ بمرێت و کۆتایی بەبوونی بێت، بەڵام جار وا هەیە لای مرۆڤ ڕۆح شیرین و خۆشەویست دەبێ، بگرە بە هەموو جۆرێک هەوڵی ڕزگاربوونی لەدەست مردن دەدات.

لەملامەوە هاوسەنگەردەکەم بە توندی کۆکی، ڕاچڵەکیم، لە بنی پێمەوە تاوەکو تەوقی سەرم ترسێک لەرزاندی، بە ئەسپایی ڕووی کلاشنکۆفەکەم ئاراستەی پێش خۆم کرد، هێندە ترساو و شڵەژابووم دارو بەردی بەردەم خۆمم لێببوو بە مرۆڤ و هێرشیان بۆ دەهێنام، ماوەی چەند خولەکێک لە دارو گابەردەکانی پێش خۆم وردبوومەوە، هەستم کرد مرۆڤ نین، دوایی هێواش هێواش خەیاڵات و ترس دڵ و جەستەمیان جێهێشت و ئارام بوومەوە، بە هێواشی دەستم بۆ ژێر پۆشاکەکانم برد بە نیازی ئەوەی بزانم کاتژمێر چەندە، بە نهێنی دەنگی شقارتەم ئاگردا، چەند دەقیقەیەک بۆ وادەی دیاریکراو مابوو، دڵم داخورپا، ترس ئاخمی هەژاند، سەیری پێش خۆم کرد، شتێکی وام نەبینی لە مرۆڤ بچێت، لەنێو ئاوایی دەنگی بۆق و ئاژەڵم دەهاتنە گوێ، لەژێر پووش و گیا وشکەکانی بەردەم سەنگەرەکە ڕوحلەبەرێک دەجوولایەوە، دەنگی پێیە بچووکەکانی دەبووە هۆی شێواندنی هەستەکانم، حەزم نەدەکرد لەوێ دەری بکەم، بەڵام هەر دەبوایە دووری بخەمەوە، بۆیە بەردێکم بۆ هەڵداو لەوێم دوور خستەوە، هەمدیسان دەنگی بۆقەکان هاتنەوە گوێم، ئای کە دەنگی بۆقم چەند لەلا خۆشە و ئارامیم پێدەبەخشێت، کاتێ لەنێو کانیاو و

باخچەکاندا خۆشترین ئاواز لە گەروویاندا دەردەچێت و بە دونیادا بڵاودەبێتەوە، مرۆڤ هەیە بە سادەترین شت دەروونی ئاسوودەو خۆشدەبێ، ئەو شتە دەکرێ تەنیا دەنگی بۆقێک بێت، بەلام مرۆڤی واش هەیە بە هیچ تێرنابێ و تا دەمرێ ئاسوودەیی بەخۆوە نابینێت.

سەیری ماڵەکانی نێو دێم کرد، دوو تارمایی مرۆڤم لەنێو پەنجەرەی ماڵێکدا بینی، هێدی هێدی ڕوودو یەکتر دەچوون، هێندەی نەبرد ئاوێزانی یەک بوون، بەتاسەوە لێیان وردبوومەوە، هێواش هێواش دڵم خاودەبۆوە، خەریک بوو ئاگام لەخۆ نەددما، لە پڕێکدا دەنگی ئاژەڵێک هێنامیەوە هۆشخۆم، خۆ بووک و زاواکەی ڕۆژن کە بەهۆی ئاهەنگی ئەوانەوە نیوەڕۆ لە ماڵیاندا لەگەڵ هاوڕێکانم داوەت بووین و پیرۆزبایی ژیانێکی ئاسوودەمان لێکردن، خۆیانن، تەماشا چەند دڵخۆش و بە چێژەوە باوەشیان لەیەک داوەو جەستەی ڕووتیان تێک ئاڵاندووە، من دڵنیام هەنووکە ژیانیان پڕیەتی لە بەرائەت و بە هیچ شێوەیەک بیر لە مردن ناکەنەوە، ئای کە چەند بێزارم لەم ژیانە، ژیان بۆمن چ بەهایەکی دەبێت کە هەمیشە لە چاوەڕوانی مردندابم، مردن چ وشەیەکی قورسە، هەموو هیواکان لەنێو دەبات، خۆ تەنیایی و ترسیش بەشێکن لەمردن و مرۆڤ پێیان نازانێت، هەزاردها جار خۆزگەم بەخۆیان، من دڵنیام ئەمێستا حەز بە هەلاتنی خۆر ناکەن، منیش چاوەڕێی تیشکی خۆرێکم لە ئاسۆی ژیانم هەڵبێت.

نەرمەبایەکی فێنک بۆنی لەززەت و شەهوەتی لەگەڵدابوو بەرەو ڕووم دەهات، چاوم تێبڕین، بەسۆزەوەو مەست مەست میوەیان بۆ دەمی یەکتر دەبرد، هەندێجاریش لەشێوەی دوو باڵندەی عاشق دەمیان دەنایە نێو دەمی یەکترەوە، کاتێک بەمشێوەیە بینییانم بەدەست خۆم نەبوو رووچوومە نێو دنیایەک لە خەیالاتی سەیرو پڕ لە چێژەوە، هێدی هێدی شەوانێکی پڕ لە لەززەت و رامووسانم کەوتەوە بیر، بیرەوەرەکانم مێژوویێکن هەرگیز لەبیرناچنەوە.

هاوسەنگەرەکەم هێنامیەوە هۆشخۆم، چییە بۆ بانگ دەکەیت؟ چی چی؟ شتێکت بینیوە؟ ئازیزم لەم کاتە ترسناکەدا کەی وادەی قسەکردنە، خەریک بوو هەترەشم بچێت، تەنیا بۆ زانینی کاتژمێرە ئەو بانگکردنە؟ پرسیارێکی بێمانایە. جا کاتژمێر هەر چەندێک بێت بەئێمە چی، تاکو ڕۆژهەڵنەیەت، یەک و سی وشەش خولەکی تەواو، بەڵێ سی وشەش دەقیقە لەکاتی دیاریکراو لایداوە، پێدەچێت ئەمشەو هیچ لایەکمان حەز بەکوشتنی یەکتر نەکەین، مرۆڤ گەمژەیە ئەگەر بیر لە کوشتنی مرۆڤی دی بکاتەوە، نازانم مەرگدۆستی چ سوودێکی بۆ مرۆڤ هەیە، برواناکەم سوودی هەبێت من بۆهاتوومەتە نێو ئەم سەنگەرە خوێناوییەوە من و ئێوەو ئەوان هەموومان تاوانبارین، کوشتنی یەکتر بۆ؟ چ بێویژدانییەکە مرۆڤ کەسێکی دی لە نێوبەرێت و مافی ژیانی لێبسێنێتەوە، بەڵێن بێت ئەمشەوم لێبەسەرچێ لەپێش چاوی هەمووتان کلاشنکۆفەکەم دەخەمە نێو چاڵی پیسایی مزگەوتە کۆنەکەی ئاوایی، ئەوسا دوور لەشەڕو بەدڵێکی ئارام و ئاسوودەوە ژیانێکی خۆش دەگوزەرێنم، لەهەر شوێنێکیش چەک و شەڕ هەبێت من لەوێ هەڵدێم، تفەنگ ئەو دڵڕەقەیە بەهیچ شێوەیەک بەنەرمی قسە لەگەڵ کەسدا ناکات، خوێن دەڕژێنێ و خۆشەویستی لەفەرهەنگی ژیان دەسڕێتەوە، نامەوێ، من شەڕو ئاشووبم ناوێت، ئەی شەڕ تۆ پیسترین ناوی، دژی جوانییەکانی دنیاو سروشتی، برۆ دەست لەیەخەمان بەردەو لەم مەملەکەتە دووربکەوە، دەرچۆ لەماڵمان، چیتر باخچەو دارستانی جوانمان مەکە بەخۆڵەمێش و رووبارو کانیاوەکانیش بەخوێنی مرۆڤ سوور هەڵمەگەڕێنە، با چیتر منداڵانی ساوا بێ باوک نەبن و ژنەکانیش تەنیایی نەیانکوژێت، هێندەت خوێن رشت خەریکە بیابان و گۆڕستانەکان لەنێو خوێندا بزردەبن!

هاوڕێکەم هەستی لەخۆبڕی و بێدەنگییەک کەوتە نێوانمانەوە، بە ئاسپایی کلاشنکۆفەکەمم لەبەردەم خۆمەوە داناو تەماشایەکی دێیەکەم کردەوە، هێدی هێدی چاوم بە ماڵەکاندا گێڕاو ماڵی بووک و زاوا کەوتەوە بەرچاوم، وەک دوو ماری عاشق و

...ی لاولاوە ئاوێتەی یەکببوون، ...ی یەکتر هێناو برد ئاوەکو چێژو ...ی تەبەردا برا، هێدی هێدی لەنێو ...ی یەکتریدا جوولەیان لە خۆبڕی و ...ە نێو خەوێکی ئارامەوە.

...ی چ خەوێکی خۆشەو ئەوانەی ...کەوتوون، لەخەویشدا هەست بەچێژو ...می دەکەن، لەم دنیایەدا هەندێ لە ...زشیدان و هەندێکیش تۆسقاڵێک حەز بە ئاوات دەخوازن، هەندێک بیر ...ەمردن ناکەنەوەو ژیانیان لاشیرینە، بەلام هەشە لەنێو تاریکی و ترسدا چاوەڕێی مردنێکی خوێناوییە، مردن هەر دێت، بەلام ناخۆشترین مردن، بۆ مرۆڤ و هەموو رۆحلەبەرێک ئەو مردنەیە؟ کە خوێناویی و لاشە لە خوێنی خۆیدا بزربێت.

لە پڕێکدا، لەگەڵ دەنگی تەقەی نەیاران و هاوسەنگەرەکانم ئاگاهاتمەوە، ترس دامیگرت، بەشڵەژان و نابەدڵییەوە رووی کلاشنکۆفەکەم لە ئاسمان کردوو چەند گوللەیەکم بە بۆشایی ئاسمانەوە نا، هاوڕێکانم رووبەرووی شەڕێکی خوێناوی و ترسناک ببوونەوە، ماوەیەک سەرقاڵی شەڕێکی گەرم بوون، چەند جارێکی دیکە رووەو ئاسمان تەقەم کردەوە، هەستم کرد، هێواش هێواش بەرگری لەنێو سەنگەرەکە کەمدەبۆوە، ئەوانیش بەدەم گۆرانی و سروودی سەرکەوتنەوە هەوڵی ئەوەیان دەدا بێنە نێو سەنگەرەکەوە، سەیرێکی دواوەی خۆم کرد و هێدی هێدی بەمەبەستی خۆدەربازکردن رووەو دێ رێگەم گرتەبەر، لەنێو باخچەیەکی تووش رووەو سەنگەرە جێماوەکە وەستام، هیچ بەرگریکردنێک لەنێویدا بەدینەدەکرا، بەلام جارجارە گۆرانی و سروودی سەرکەوتنی ئەوانم بەرگوێ دەکەوت.

شەو هێواش هێواش رووەو کازیوە دەڕۆیشت، هەرچۆنێک بوو ماوەیەکی دیکە لەنێو باخچەو دارستانەکەی خوار ئاوایی خۆم ونکرد، هەر کە دنیا رووناک بۆوە یەکڕاست بەرەو سەنگەرەکەو بەهانای هاوڕێکانمەوە چووم، بەناسپایی رێگەم بڕی، نزیک ماڵی زاوا بوومەوە، ئاپۆڕایەکم بەرچاو کەوت، هەندێ جاریش گریان و هاواری ژنانم بەرگوێ دەکەوتن، دەبێ چی روویدابێت؟ پێدەچێ بەهۆی شەڕی ئێمەوە کەسێک گوللەی پێکەوتبێ و کوژرابێت، نازانم چی روویداوە، هیچ چارێکم نییە هەردەبێ بڕۆمە نێو خەڵکەکەوەو راستییەکەی بزانم، چەند هەنگاوێک رووەو ئەوێ چووم، وەستام، ئاوڕێکی دواوەم دایەوە، دوو منداڵ تیژتیژ بەرەو لای خەڵکەکە هەنگاویان هەڵدەهێنا، بەدەنگێکی نزم بانگم کردن، بەرقەوە تەماشای نێوچاومیان کرد و وەلامیان نەدامەوە، تیژتر لەجاران رۆیشتنەوە، هەمدیسان بانگیانم کردەوە، لەجاری پێشوو بەرق و قەهرتردوە سەیریان کردمەوە، بەشەرمەوە وتم: لەم ماڵە چی روویداوە؟ کەمێک بێدەنگ بوون، دوایی یەکێک لە منداڵەکان وتی: کارەساتێک روویداوە، چی چی؟ بەهۆی شەڕی ئێوە ئەو بووکەی دوێنێ گواستراوە ئەمشەو کوژرا. دڵم داخورپا، هێواش هێواش ئاو بەچاومدا هاتە خوار، کلاشنکۆفەکەم فڕێدایە نێو جۆگەلە ئاوێکی پیس و بەرەو لای خەڵکەکە رۆیشتم، خەڵکێکی زۆر بەدیار تەرمەکەوە ئەڵقەیان بەستبوو، بەوردی چاوێکم بەنێو خەڵکەکەدا گێڕا، هیچ کامێک لە هاوڕێکانم بەرچاو نەکەوت، تەواوی خەڵکەکە بەرقەوە تەماشایان دەکردم، لەژێر لێوەوە قسەیانیان دەکرد، لەوەی دەکرد بەتاوانبارم بزانن، دڵم ترسا، بەخێرایی لەنێویان دەرچووم، رێگەی سەنگەرەکەم گرتەوەبەر، هەرچۆنێک بوو خۆم گەیاندە سەنگەرەکەوە، چیم بینی، ئەفسووس لاشەی هەموو هاوڕێکانم بەشێواوی و لەنێو خوێنی خۆیاندا بینی، لەگریان بەولاوە توانای هیچ شتێکی دیکەم نەبوو، تەواوێک بەدیاریانەوە گریام، خەریک بوو ئاو لەچاومدا وشک دەبوو، رووەو دێیەکە هاوارم کرد، بگەنە فریامان، کەسێکم نەدی بێ بەهانامانەوە، بەرەو ئەملای سەنگەرەکە رووم وەرگێڕا، تەرمێک لەخوارەوە بۆر دەچوو، دڵنیابووم لەوەی کە تەرمی هاوسەنگەرەکانم نەبوو، هێدی هێدی بەدەم گریان و ترسەوە هەنگاوم بۆ هەڵێنا، هەر کە گەیشتمە سەری لاشەی یەکێک لە براکانم بوو بۆ کوشتنی من هاتبوو!!.

# ئێمان



ئەحمەد حەیران

رۆژ بەرۆژ دەموچاوی شێلوتر دەبوو، سیمای بەردەوام یەک ئەدگاری دەنواندو بەیەک رووخسار خۆی دەخستە روو، ئەویش گژی و داهێزران و پەشۆکی بوو، لەناخەوە هەناوی ترشابوو، بۆیە زۆربەی ئاکارو دانیشتن و هەڵسانەکانی رەنگدانەوەی گرێی شکستە بەسەر یەکدا کەوتووەکانی دەروونی بوو، گرێیەکە لێی کردبوو بە نەخۆشی، بۆیە لەقسەی شێلو بەولاوە شتێکی دیکەی باس نەدەکرد، لە نینۆکەکانی قاچی تا دەگاتە تاڵە مووەکانی تۆقی سەری، هەمووی تێنوێتی لێدەباری، بۆیە هەڵپەی بۆ گشت لایەک دەبرد راوەستان و گیرسانەوەی نەبوو، سەری بەسەر هەموو کونێکدا دادەگرت، لەگەڵ هەر قسەیەک بۆنی چەورایەتی لێ بهاتایە دادەچۆڕاو هەناسەیەکی قووڵی دەدایەوە، هەرچی بواری ئاڵۆزو دژوارو ناکۆک هەیە لە جەستەی شانەی دانابوو، خەندەو جوانی و ئاسوودەگی لەلای ئەودا کۆچی کردبوو، بۆیە قەد شتێکی بەسەر زاردا نەدەهات شادمانی بداتە مرۆڤ، هەمیشە تاریکستان هەمیشە جاڕستان، هەردەم (لۆمە)ستان، بەهیچ شێوەیەک حەزی لە بەها جوانەکانی ژیان نەدەکرد، قسەو دواندنی هەردەم (زەم)ستان بوو، لە پشتەوەی ئەو کردارەو پیادەکردنی ئەو ئاکارەدا ئاسوودەیی و چێژی بەناخی خۆی دەبەخشی، بەڵام راکردن بەدوای ئەم ئاراستەیە نەیدەگەیاند بەهیچ ئەنجامێک، چونکە وەک چەمک و رێبازو ئاراستەیەکی فیکری ئەو سوخەتەی نەگرتبوودبەر، بەڵکو لەناوەوە نەخۆش بوو، هێسکی نەرم بوو، ئیتر بێزارستانی خۆی بەهەموو لایەک پەرش دەکرد، نەدەوێرای هاوشانگیری لەگەڵ بکەی، یەکسەر پەتای(لۆمە)ستان بۆ تۆش دەهات، ناچار دەبایە دەست بە گلەیی بکەی ببی بە(زەم)ستان.

هەستم دەکرد منیش تووشی ئەم درمە بوومە، بەرە بەرە شالآوی جاڕسی دەورووبەری تەنیمەوە، نەمدەزانی بەرەو کام ئاراستە مل دەنێم، بەرچاوم بووە تەموتومان، دەروونم شێلو داگەڕا بینایم بڕی شکا، وامدەزانی هەنگاو لەهەوا دەهاوێژم، بەرەو کوێ بچم خودایە؟ بێزاری رووی تێکردم ئەو(بۆن)ە چ بوو بۆمهات؟ چۆن دەربازبم لەم شێلوستانە؟ نازانم نەمن گەندەڵ بوومە، نە دەورووبەرم رەشداگەڕایە؟ ئەو لۆمەستانە بۆچی ئێمەشی بێزار کرد، بۆ واز لەم سوخەتە ناهێنێ، ئەوێ جارێ کابرای چایەچی هەر ئەوەندە چایەکەی خستە بەردەمی، یەکسەر چەخماخەکەی دەرهێناو گوتی



ـکە: گوتی: چ پێکەم؟ گوتی: (ج، گ،ە،ر،ە) پاکەتەکەم حەلاڵی بووە، ئەمیش گوتی: من جگەرە ناکێشم، بەڵام هەرگیز پاکەتم بەتۆوە نەدیتووە، ئەوە منداڵە دەستگێڕەکە بۆ ـ: هات، بێنە لەگرێی قەپێلکە جگەرەی بۆش دەربازت کەم و پاکەتێکت بۆ بستێنم، پێی گوت: نا لێگەڕێ، ـو گێژەنی ئەو جارستانە تلمان دەخوارد، هەر ئەوەندەم ـی (شێلمان) بە دەرکەوت، یەکتریان کردە باوەش و ـمێزی شادیان بەیەکەوە کرد، هێشتا دانەنیشتبوو، پێی گوت: ئەمجارە نۆبەتی تۆیە دەبێ ئەم ئێوارەیە دەستم بخەیتەسەر زگی تێر، شێلمان کەمێک داماو، دەستێکی بەسەر لووت و ناوقژی داهێنا، گوتی: (من چەندین ساڵە ئەم هەوارەم جێهێلاوە سەراو و دەراووم زۆر دیوە، لەسەر چەندین پەت یاریم کردووە، کەس تامی لەمن نەکردووە، دەتەوێ بەرپێنەم بدەیە بەر) شێلمان سەری لەقاند گوتی: باشە ئێوارە لەوێ بە دیاربوو شێلمان دەیەویست دەستە چەورەکەی خۆی پێبسڕێتەوە دەستەگوڵی خۆی لێبدات، ئەو لەدەرگا لە شێلمان چووە ژوورەوە کەچی شێلمان لە پەنجەرە بۆی دەرچوو، پاش ئەوەی دەکەونە خەیاڵ و لەدەریای بێبن خولدەخۆن بە ئارەزووی خۆیان سەروپۆتەلاکی رۆژگار دەشکێنن، خۆیان چۆنیان بوێت ئاوەها نەخشی سەردەم و کۆمەڵ و خەلک و وڵات و ...هتد هەڵدەسەنگێنن، بەهار دەهێننەوە چۆکان، دڵیان چ بخوازێ ئەوە دەکەن و دەردەبڕن، ئینجا شێلمان وردە وردە بەرەو چەشمە دەڕوا، وردوباریک خۆی دەدزێتەوە لەبەرچاوان خۆی وندەکات و دەبێ بە تراویلکە، کاتێک هەست بەزۆر بێژی خۆی دەکات، دەبینێ شێلمان نەماوە.

دەڵێ: بەخوای دەستی خۆی وەشاند، ئەو لەمن فێلاویتر بوو قەیدی چ دەکا (ژیان هەمووی فێڵە) ئەمجارە بێتەوە دەستی خۆم پێش دەخەم، بۆیە ئێستاش شێلمان بەدوای شێلمان دەگەڕێ.

# سـنوورداش

**نیعمەتوللا حامید نەهێلی**

شەڤەو دگەل رێڤەچوونا هزرێن خوە، ئەز ژی یێ برێڤە دچم. بوکیڤە؟ چ ژڤان؟ دەمێ ئەڤ پرسیارە د مێشکێ مندا مێهڤان دبن، خوهەکا سپی من دشوت و ددانێن من دەرقسن! بەلێ... ژ ڤانێ من دگەل کچا ئاغایە و دڤێت هەر بچم، زەلامینیا من یا دوو دلە، جار دهێت و جار ژی دچیت؟ دڤێ هەڤرکیێدا، سەرێ من ب ستوینا نیشکا مالا ئاغای دکەڤیت

دەرگەهـ یێ بزێرەڤانە، چ زێرەڤان؟ ئاڤ ملێن وی دپەحنن.. سمبێلێن وی ژ بەر دوکێلا قەلینێ یێن زەربووین.

چەوا دێ کچا ئاغای بینم؟ د دلێ خوددا دبێژم. ئەزێ کفنێ خوە بدەستێن خوە کەردکەم، کا ئەزو کا ئاغا؟

هندەک جارا بنێ پێن من یێن دخورێن و مێێن من گژ دبن. ئاغا! ئەز ژی ئاغامە...؟ من ژی مێرگ و چیمەنێن نێرگزدار یێن هەین؟ هزار بیرهاتن لێ زێرەڤانن...! دڤێ ئاشوپێدا گازیەک هاتە من! کورو کاوەرە؟! پێن من بوونە ستینەکا هشک و گاڤەک لێ دبیتە هزرەت. لێ دنێرم.. وەی بابو ئەز چ بکەم؟ دگەل دەنگێ گاڤێن پێن وی، کەپروکا هزرێن من جار دهێتە نژنێ و جار ژی دهەرفیت. گوت: کورۆ تەخێرە ما نیشانێن گوها بتەڤە نینن؟! میرم..؟ نەخێر نەمیرم، لێ ئەز ژی ئاغامە و دڤێت ب زمانێ ئاغایا دگەل باخڤم.

من گوت: تو نزانی ئەز کێمە...؟ شیرەتکارێ خاتونیێ مە. ب نیک منڤە هات، حە... حە...حە، چ شیرەتکاری ب بچیکێن وەکی تەڤە ناقەتن!؟ بەلێ، من دڤێت خاتوینێ ببینم بگرنژێڤە من گوتێ. دەستێ من راهەژاندو گوت: ئەگەر وەسا نەبیت، دێ چەرمێ تە کەمە پێلاڤەک بۆ

ئاغای؟! ئەز دناخێ خوەدا هەلچووم... سوتم، هەناسەکا درێژ... کیر دهەلکێشم هندی مرۆڤ فرەکێ ل جگارێ ددەت گیرونە بوو، هات و خاتوین یا دگەلدا.

– خاتوین: زێرەڤان مەبهێلە بتنێ! زێرەڤان وێڤەچوو،

– خاتوین: کورۆ تو دین بووی، ئەڤە چییە تو دکەی؟

– بەلێ ئەز یێ ژ نەدیتنا تەدا دین بوویم و ژ بو دیتناتە دبە ئاغا!؟ دێ سنورا بەزینم دا بسەر بلندی تە بخازم.

– خاتوینێ گوت: دینبوون هەردەم ددرمانێ نەخوشیا نینە، بەر ل جهێ خوە یێ ب بهایە.

– ب دلەکێ شکەستیڤە دبێژم: بەلێ راستە... لێ دڤێت ئاغا ئەڤان پەیڤا بێژیت! ئەنێکا دل و هناڤ ژێ سوتی؟

ب روندکا داوینێ د دیتنا مندا، دێمێ وێ خاتر خواستن.

زێرەڤان یێ دلوێریت: خاتوین بچین؟ خاتوینێ گوت:

بەلێ و... پەیڤێن خوە بدوماهی نەئینان.

هەتا گەهشتیمە کۆلانا مالامە، دەهـ جارا پتر ژ بەر تەژی بوونا چاڤێن من ژ روندکا دهەلنگڤتم!؟

دگەل نیروژێ، پەزێ خوە من کرە دراڤ... بو هەڤرێ و هەدارا من؟ سینگێ خوە من ب وەغەرێ ڤەنا. ئەز، حەمو، رەمو... بەرەڤ باژێری هەڤرێنە.

ل چاپخانەکا باژێریدا، ژڤانێ مە هاتە بەستن... چایا خوە ڤەخوار.. پێکڤە رابووین، بازار چ بازارە؟ دێ بێژی کچکەکا چوادرە سالییە!؟ سینگێ خوە بومە ڤەکر.. ڤی تشتی بکرە.. یێ هەیێ فەرە.. ئەڤە ژی بۆ من.. سەرێ خوە بلند دکەم، کچک هەمی دبوونە خاتووین!؟ دێمێ وێ دچاڤێن مندا... بیرهاتن... دبونە کلیبەک، دەرهێنەر زەمانە؟!

دگەل لێدانا زەنگا داوی یا ژڤانی، ب دلەکێ پڕ خەم.. برین، بەر ب سنوری رێ کەتین. چوار شەڤ و روژێن پری سەرو سەقەمدا دەمژمێرەکا خەوێ پتێ لەبیوو هەزرەت. سەرێن مە دهزرادا وەربوون، پتنێ حەموی گاڤ بوگاڤێ دگازیکرنێن خوە یێن ماندیدا، گوهێن مە هشیار دکرن، من نەهێلن.. من نەهێلن.. تێدا چاپ دکر. دڤان گێلە شوکێن رەش و تاریدا... لسەرێ زنارەکێ، محەمەد بکەنیەکا ڤیلباز دا گوت: ئەڤ گوندێ هە دێ بیتە مخەلێ مە. ئەم گەهشتین، ب کلیلەکا ژەنگیڤە محەمەدی دەرگەهـ قوتا. زەلامەکێ بەژن کورت و بناڤ سالڤەچووی، سەرسیمایێن وی وەک کەڤالەکێ هونەری، ژیانێ نەقشێن خوە یێن لسەر دێمێ وێ کێشاین. دەرگەهـ ڤەکر.. بگرنژینڤە دبێژیت: بخێر هاتن دێ کەرەم کەن. ب ژورکەتین، گوپ گو پاسویادارا، ئاواز بنڤە بنڤە لاوێ دەلال دحەلاند. د کوژیەکێ تاری یێ خانیدا، سولتانێ شەڤێ.. روژەک دژ یێ مەدا دهەلکێشا.

قرێژا رێکێ ببوو هەڤیرترش، لەشێ مە دگەرما سوبێ را ترش کربوو. نالەنالێن حەموی دلێ کافرا یێ دسوت. محەمەدێ سنورداش وندا بوو... کرینە نێخسیرێ بیسەیێن جەندرما. شەرە دەڤێ من و حەموی و رەموی، دێ بێژی شەرێ دیکلایە.

تەق.. تەق.. تەق، دەرگەهە؟ ئەرێ ئەڤە کیە ڤێ نیڤ شەڤێ بسەرمە داگرتێ! حەمویە دبێژیت:

رابن رابن... جەندرمە هاتنە دگوندیدا.

حەمەوی خوە ل دەرگەهی دا.. رەمو ب پەنجەرێ را دەرکەت.. گوهێن من دێ بێژی رادارن، هێرڤە دزڤرن.. وێڤە دزڤرن.. د جهێ خوەدا بومە سنگێ مزگەفتێ.

کابانیا مالێ دەمێ ئەز دوی کراسیدا دیتیم، گوت: وەرە داوو وەرە دبێ دەهسانا کراسێ منڤە؟!

گورمێنەک هات.. ب قوینتاخا تڤەنگێ جەندرمەکێ دەرگەهـ ڤەکر.. بژورکەتن، مال سەروبن کر.

دلێ من وەسا یێ خوە دقوتیت دێ بێژی جهێ وی د سینگێ مندا نەمایە. جەندرمە دەرکەتن.. دەنگێ تەقێ هات، ئەو هات ئەو هات خلاس نەبیت، ئێکێ دبێژیت، تەق تەق تەق.. حەوارێن ئێکێ بلند بوون. واللاهـ ئەڤە دەنگێ حەمویە ددلێ خوەدا دبێژم. بێهنەک پێڤە نەچوو، گورمێنەکا مەزن هات... دگەل دا حەوارێن رەموی.. ئای بابۆ ئەز کوشتم.

دەمژمێرەک پێڤەچوو.. گوند بێ دەنگ بوو، من ژی بازدا. هەتا پێنج شەش پێنگاڤا دهاڤێژم، دەهـ جارا لپشت خوە دزڤرم. وەکی ئەساخەکێ ردبوکی بێهنا من تەنگ بوو.. ئەز کەتم. هوسا لخوە دزڤرم.. رەمو یێ د خوینا خوەدا دگەڤزیت..؟

رەمو: کورۆ ئەلڤە ئەو زەڤی یا تەژی مینە. رەمو: هەوارە.. وەی بابۆ ئەز دێ مرم. رابومەڤە داخوە نێزیکی وی بکەم، ئێدی من خوە نەدیتەڤە.. د تۆزێ وەربووم.. دخوینا خوەدا گەڤز یم.. دنیا لپێش چاڤێن تاری بوو... بێ دەنگیێ خود لن وەرکر. د دەمەکێدا چاڤێن خوە ڤەدکەم... رۆژ نیڤرویە.. پیرەمێرەکێ دان عەمر یێ لن بوویە خودان.

پیرەمێر: رابە مامۆ رابە، وەرە پشتا من. چاڤێ خود ل رەموی دگێرم رحا دسەردا چووی. گەهشتینە مالا پیرەمێری، دناڤ مەزەلا خانیدا دهێت و دچیت.. ڤی گیا دهەلینیت ویێ دی ددانیت. برینا من دەرمانکر.

پیرەمێر: مامۆ تو لڤێرە بە، دێ رابم هندەک پەزێ خوە بەم فرۆشم.. دا هێشترەکێ بکرین تە پێ بگەهینینە بازێری. ب هەر حالەکێ بیت، گەهاندمە نەخوشخانا بازێری.. هاتە سەرو ستوێن من و گوت: کورێ من خودێ دگەل تەبیت.

نوژدارۆ برین پێچ لن وەرهاتن. ئێدی من ئاگەهـ ژ خوە نەما.. چوومە دونیایەکا دی. د دەمەکێ ڤە د جنقم... ب دەنگێ زێمارێدا هشیار بم... دەیکا من یا لهنداڤی سەرێ من، بسکێن وێ یێن سپی د روندک و گرێدا یێن پەرمەن بووی؟! پێ خوە دکێشم دا پێشڤە رابم.. پێ من لدیڤ من ناهێت! سەرێ خو بلند دکەم... کا پێ من؟ ئەز... لەرزیم! خوهەکا سپی دمندا هاتە خوار... بێ هوش بومەڤە.

هەوارو گازی و گریا دەیکا من.. ئەردو ئەسمان هەژاند!؟

نەخوشخانە سەروبن کر.. وەی دای گوری، جانێ من گوری تە بیت.. ئەڤە چ بسەرێ تە هاتیە؟

چاڤێن من یێ ڤان دیمەنێن دەیکا جەرگ سوتی وێنە دکەن. هەست دکەم ئەز یێ دناڤ جەرگێ خوەدا بهوشتی. هندی هێز لن هەیە دکەمە گازی؟ نە هەرێ دەنگێ من بسەر ناکەڤیت، من ژ بیرکربوو کو دەنگێ منژی دناڤ زەڤیا مین رێژکریدا یێ کەتی. نیزنیزەکێ ژ من دهێت.

چاڤێن مەلویل و ب روندکێ دەیکا من زێرەڤانیێ لن دکەت.

من دەڤێ خوە لسەرێک راکر: دایێ نەترسە نامرم. هێشتا ئەڤ ئاخفتنە دناڤ دەڤێ مندا، خوە لن وەرکر.. هندی هێز تێ هەیە کێشامە بەر سینگێ خودو گڤاشتم. دای گوری تە بیت... ئینشەڵلا ئەز مرنا تە بچاڤێن خوە نەبینم.

پشتی سێ رۆژ پێڤەچووی، نوژدار بژوور دکەڤیت.. چاوایی گەنجێ دەلال؟ باشم.. من ژ ڤێرە دەربێخە. نابیت.. خرابە، ئاخافتنا من و نوژداری سەرێ خوە دخوت. دەیکا من بژور دکەڤیت، تە خێرە کورێ من؟ دادێ، عەرەبانەکێ بینە دا بچینە مال... هندی کرو گوت، فایدە نەکر. دێ بێژی ئەز یێ مرنا خوە دبینم! نەچاربوو.. دەرێخستم. نێزیکی کولانا مالا مە بووین، دەنگێ دەهول و زرنایێ وەکو پێلێن دەریایەکێ هار بسەر گوندیدا دهێتە خوار. دەیکا من، ئەرێ ئەڤە چیە؟ ئەڤەیا شمەکێمە! گوندیەکێ مە ئەز دسەیارێدا دیتم.. خوە نێزیکی دەیکا من کرو پستەک بوکر. هندی ب نیزنیزا خوەڤە دبێژم چ قەومیە؟ روندک وەکو سیلاڤێ لسەر رێێ دەیکا مندا هاتنە خوار. دەستێ خوە دسەرێ مندا ئینا خوار.. روندکێن خوە پاقژکرن: کورێ من ئەڤە داوەتا... و تەمام نەکر. دگەل ڤان ئاخفتنا سەیارا بیکێ لبەر سینگێ مە راوەستیا! بگرنژینڤە لێ دنێرم.. ئەرێ! ئەڤە کیە؟ تەزینکەک بسەر لەشێ مندا هاتە خوار... ئەڤە... خاتوینە بیک!؟ چاڤێ خوە ودر دگێرم. محەمەدێ سنورداشە زاڤا! دیمەنێن بیرهاتنێن من وەکو زنجیرەکێ دچاڤێن مندا دسوژن... لە شێ من سار بوو.. هندی دگەل من دئاخڤن، من ئاگەهـ ژ دەنگا نەما. بێهنا من کورت بوو... هندی بێهنا خوە دهەلکێشم، سینگێ من تە ژی هەوا نابیت. چاڤێن من د سەرێ مندا سور بوون.. ئەز خاڤ بووم. بلقەکا کەنیا بیک و زاڤا دوماهی دیمەن بوو چاڤێن من وێنەکری... خوینێ ژ دەڤ و دفنێن من هەلاڤێت! دێ بێژی هزار کێر پێکڤە یێ بلەشێ من دکەڤن.

هەتا ئافکێ لەشێ من مر.. دەیکا من کرە هەوار، خەلک لە جەمیان... داوەت راوەستیا، دەهول و زرنا بێ دەنگ بوون، بیک و زاڤا لهنداڤی سەرێ مە حازر بوون.

بەری ئەزما نێ من بشکێت، دگەل خوینا دلێ من ئەڤ پەیڤە دەردکەتن: هەی بێ ویژدان محەمەد... بێ دل .. زالم ئاغا... خائین بێ وەفا خاتوین؟

ئەز ساربووم، گیانێ من بلندبوو.. لهنداڤی سەرێ دەیکا من راوەستیا! روندکێن وێ پاقژکرن... پاشی بەرەڤ رۆژێ کەتە رێ... وندابوو.

# کچێک لە ئەستەمبوڵ
# هەڵدێ!

د. پیرداود مەخموری

لەم رۆژانەی دوایی رووی مۆن بوو، پێدەچێ شتێک توورەیی کردبێ، چەند جار پرسیارم لێ کرد:

- چیتە، چیت بەسەرهاتووە؟

بێدەنگ بوو.. رۆژێکیان قسەی کردوو گوتی:

- هەموو ئەو کێشانەی کە تووشی دێن، ئەو تەنگانەی پێوەی دەناڵێنن هۆکارەکانی ئەدەبخانەیە.

بەراستی هیچی لێ حاڵی نەبووم.. زۆرم لەسەر ئەو کۆڕە فیکریانە بستووە کە بۆ پەرەپێدان و پێشکەوتنی وڵات گێراون، لەناو پاس و شەمەندەفەرو پاپۆڕەکان، دەیانگوت وڵات پێشناکەوێت ئەگەر ئەو فرۆشیارو کارمەندانەی لە بازاڕی رەش موحاسەبە نەکرێن.

دەبێ وەکو هێشوو لە گۆڕەپانەکان لەداربدرێن، هەندێک دەڵێن پەیوەندی بەگەشت و گوزارەوەیە، هەندێک دەڵێن خەتای سامانی ماسییە لە دەریای مەرمەڕە، لەم جۆرە بۆچوونانە، یان ئەوەتا دەبێ کێشەی پێشکەوتنی وڵات بخەینە ئەدەبخانەوە، کە ئەمەیان قەت گوێم لێ نەبووە.

- باشە چ پەیوەندییەک هەیە لە نێوان پێشکەوتنی وڵات و ئەدەبخانەوە،

- پەیوەندییەکی زۆر بەتینە، لەهەر وڵاتێک دەبێ بەر لە هەموو شتێک کێشەی ئەدەبخانەکان چارە بکرێ، پاشان کێشەو گرفتەکانی دیکە چارە دەکرێن.

- باشە... چۆن ئەو قەناعەتەت لا پەیدابوو؟

- چونکە خۆم گەلێکم ئازار لێ دیوە، بەهۆیەوە گەیشتمە ئەو قەناعەتە ئەوەیان پارەکە وەکو ئەو مانگە روویداو لەلاپەڕە هەشتی رۆژنامەیەکی هەفتانەی فەرەنساوی بڵاوکرایەوە، کە لاپەڕەیەکی تایبەتە بەئاگادارییەکان، هەندێ لە نووسینگەکان ئەو نامانە بڵاودەکاتەوە کە بۆ یەکترناسین و هاورێیەتی و خوازبێنی دەنێردرێن.

شەیتان تووشی دڵەڕاوکێی کردم، گوتم دەبێ نامەیەک بۆ یەکێک لەو نووسینگانە بنێرم، ئاگادارییەکەم جارێک و دووان و چەند جارێک خوێندەوە، هەندێ لە ئاگادارییەکان دەبێ راستەوخۆ پەیوەندی بەنووسینگەکانەوە بکەن، هەندێکیشیان ئاگاداری تایبەتین بەو پیاوو ئافرەتانە کە بەدوای هاورێیەتیدا دەگەڕێن، یان ژنهێنان بەبێ ناونیشانی تایبەت.

ئاگادارییەکی نووسینگەیەک سەرنجی زۆر راکێشام کە بەمجۆرە بڵاوکرابۆوە، «دەزگاکەمان شانازی بەرابردووی درێژی حەفتاو چوار ساڵەی خۆی و جوانی و پاکییەوە دەکات». ئێمە یارمەتی دەیان هەزار کەسمان داوە بۆ گەیشتن بەهاورێیەتی لە نێوانیاندا بەهۆی نامەگۆڕینەوە، هەروەها بەشداریمان هەیە لە گرێدانی پەیوەندی خێزانی و دامەزراندنی کۆمەڵە مرۆییەکان، ئەگەر بکرێ لەمەڕ خەسڵەت و روخسارت بەدووردرێژی باسی کەسایەتی خۆتانمان بۆ بنووسن، یان لەمەڕ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ نامە گۆڕینەوە، یان هاورێیەتی یان خوازبێنی بنووسن، دەزگاکەمان بەشانازییەوە ئەو خزمەتەتان پێشکەش دەکات. لەگەڵ ئاگاداری نووسینگەکان ئەم ئاگادارییە تایبەتیانەش نووسرا بوون.

«تەمەنی بیست و شەش ساڵە، گەنم رەنگە، ئافرەتێکی مۆدێرنە، حەز بەپەیوەندی لەگەڵ لاوێکی رۆژهەڵاتی دەکات.. نمرە ٧٨ (...) پەیوەندی بەم نووسینگەیەوە بکە.

«تەمەن سی و یەک ساڵە درێژی ١٧٢ سم، دووچاوی شینە، بێوەژنە، نامەگۆڕینەوە بەئەڵمانی (...) لە رێگای ئەم نووسینگەیەوە،

هەندێکیان داوای زانیاری دەکەن لەمەڕ وڵاتان، هەندێک پوولیان دەوێت، هەندێکیش دەیانەوێ جەژنانە بگۆڕنەوە.

پەیوەندیم بەنووسینگەیەک کردو خۆم پێناساندن: «تەمەنم چل و پێنج ساڵە.. بڕوانامەی دواناوەندیم هەیە، بەژنم (١٥٥سم)، کێشم (٧٦کغم)، ئەسمەرم، پرچم رەشە، چاوم شەهلایە، لەسەرەخۆم، دەمارگرژ نیم، حەز لە نامە گۆڕینەوە لەگەڵ ئافرەتانی تەمەن (٢٠-٣٠) ساڵی دەکەم، زانیاریان لەگەڵدا دەگۆڕمەوە سەبارەت بەپەپوولەو ماسی بەزمانی ئینگلیزی، لە رۆژنامەکە وەڵامم درایەوە داوای سەت فرەنکم لێ دەکەن بۆ بڵاوکردنەوەی نامەکەم، هاورێیەکم لە پاریس دەژیا داوای ئەو مەبلەغەم لێکردو بۆم رەوانەی نووسینگەکە بکات، مەبلەغەکەم درا، بەماوەکی کورت سێ نامەم لە سێ ئافرەتەوە پێگەیشت، نامەی یەکێکیان چوار لاپەڕە بوو بەچاپ نووسرابوو. چەندین زانیاری تێدابوو

سەبارەت بەپەپوولەی لێوارەکانی رۆژئاوای فەرەنسا، لەکۆتاییدا داوای لێبووردن دەکات کە هیچ زانیارییەکی سەبارەت بەماسی پێ نییە،

نامەی دووەم زانیاری لەمەڕ ماسی تێدابوو، لە کتێبان وەری گرتبوو، داوام لێ دەکات کە زانیاری سەبارەت بەماسییەکانی لای خۆمان بۆ بنووسم.

نامەی سێیەم کە زۆر عەنتیکەبوو، با بیخوێنینەوە:

(ئایا بڕوا دەکەی کە ئەو ئافرەتانەی تەمەنیان لە نێوان (٢٠-٣٠) سالیدایە لە تۆ زیاتر زانیاری لەمەڕ ماسی و پەپوولەیان لەلایە، بەتایبەتی گەنم رەنگەکانیان؟ هەروەها تێنەگەیشتم بۆچی داوای رەنگ و تەمەنت کردبوو، ئەمەش چ پەیوەندییەکی هەیە لەگەڵ زانیاری لەمەڕ ماسی و پەپوولەدا؟! ئایا سەرسام نابی بە(مادلین)ی تەمەن سی و دوو ساڵەی گەنم رەنگ؟»

بەهاوڕێکەم گوت، ئەوەی تاکو ئێستا زۆر بەتەحەمولەوە قسەکانیم گوێ لێ دەبوو.

- تێناگەم چ پەیوەندییەک لە نێوان ئەدەبخانەو پێشکەوتنی ولاتدا هەیە..!

گوتی:

هاوڕێکەم سەبر بگرە.. هەموو شتێک دەزانی، ئەو کچەی کە نامەی یەکەمی بۆ نووسیبووم و بەتەنیا سەبارەت بەپەپوولەی نووسیبوو بەبێ ماسی، ئەو مواسەفاتانەی تێدانەبوو کە من دەمویست، هەروەها دووەمەکەشیان کە تەنیا سەبارەت بەماسی نووسیبووی، بەلام سێیەمەکەیان.

ئەو ئافرەتە بوو کە من بەدوایدا دەگەڕام، چەندین مانگ نامەگۆڕینەوەمان کرد.. نامەکانمان جگە لە پەپوولەو ماسی شتی دیکەشیان تێدابوو، هاوڕێیەتیمان بەنامەگۆڕینەوە گەورەتربوو، داوای وێنەیەکم لێ کرد، ئەویش داوای وێنەی لە من کرد، تاکو ئەلبوومەکەم پڕ وێنەی ئەوبوو، وێنەی گەورەو بچووک، دەموچاو، لەشی بەجلەوە، بەستیانەوە، بەرووتی و نیوە رووت، لە کۆتاییدا یەکترمان خۆشویست، لەنامەیەکیدا نووسیبووی، (وەرە بۆ پاریس)، چۆن دەتوانم بچمە پاریس کە من فەرمانبەرێکی بچووکم و مانگانە سێ یان چوار قرۆش وەردەگرم! حاڵەتی خۆم بۆ روونکردنەوەو پێم گوت:

(تۆ وەرە بۆ ئێرە) خوای لێ رازی بێ دڵێکی فراوانی هەبوو، سواری فڕۆکەبوو، هاتەلام، کە دیتم بەجوانییەکەی سەرسام بووم، چەندی بڵێی و بەهەمموو واتایەک رێکو جوان بوو، لە وێنەکانی خۆی جوانتر بوو، نەمزانی چی بکەم، ئەگەر بیبەمەوە ماڵە سادەکەی خۆمان شەرمە بۆ من و زوڵمیشە لەو کچەی دەکەم، ماڵەوەمان چی دەڵێن؟ هەڵوێستم چی دەبێ بەرامبەریان؟ هەموو شتێکم بۆ روونکردەوە، لە تاکسییەکە هەموویم پێ گوت، هاتینە ماڵی ئێمە کە لەگەڕەکی (مەولاناکابی) لە ژوورو نیوێک بوو، ژوورێکمان دا بەئافرەتەکە، هەموو خێزانەکەمان لە ژوورەکەی دیکە دانیشتین، دڵ نەرمی ئەو ئافرەتە لەرادە بەدەربوو، گرنگ ئەوەیە بڕیارمدا بیخوازم، کە پارەشم نەبوو، گوتی: (من پارەم هەیە)، خزموکەسەکانم نەیانتوانی بێ دەنگ بن، گوتیان: پێش هەموو شتێک دەبێ موسڵمان بێ، ئافرەتەکە رازی بوو، برایان بزانن ئەو ئافرەتە مرۆڤ نییە، فریشتەیەکە لە ئاسمان دابەزیوە، حەفتەیەک مادونیم وەرگرت کە بتوانم لەو حەفتەیەدا لە ئەستەمبوڵ بیگەڕێنم، بەتایبەتی ماڵی ئێمە کەڵکی بەردەوام دانیشتنی نەبوو، لە بەیانی زووەوە دەردەچووین نەدەگەڕاینەوە تاکو دوای نیوەشەوێ، رۆژێکیان زۆر زوو لەماڵەوە دەرچووین، لە دوکانی شیرفرۆشەکە دوو کوب شیری خواردەوە، لە رێگادا چاوی بەکۆنە چایخانەیەک کەوت کەوا دەوری بەچیمەن درابوو، گوتی: (چەند جوانە)، دوو کوپ چایەمان لەوێ خواردەوە، پاشان چوینە (مۆزەی ئەرکۆلۆژی) کات گەیشتە نیوەڕۆ هەستم کرد برسیەتی، چونکە لە دوو تێکەڵە زیاتری نەخواردبۆوە، پاشان سەردانی کەنیسەی (ئایا صۆفیا)مان کرد، زۆر هیلاک و ماندووبوو، کە لەوێ دەرچووین گوتی: توخودا پەرداخێک شەربەتم بۆ بێنە، پەرداخێک شەرابی (فیشنا)و یەکێک شەربەتی ترێی خواردەوە، کە گەیشتینە گەڕەکی (سەرکەچی) گوتی: «ببوورە دەمەوێ بچمە ئەدەبخانە».

چی؟ تەوالێت دەڵێی؟ کوڕە ئەدەبخانە لە کوێیە؟!

جاران ئەدەبخانەی گشتی لێرەبوو، چووینە ئەوێ هەر شوێنەواریشی نەمابوو، ئاودەستی گەورەی گشتی بەیەکجاری نەمابوو، یەکێک گوتی شوێنەکە تەملیک کراو رووخێندرا، غارماندا بۆ وێستگەکەی بەرامبەرمان، بۆ ئەو دەرگەیە چووین کە لێی نووسرابوو (W.C) کە تایبەت بوو بەئافرەتان، دەرگاکە داخرابوو، بەپارچە دارێک قەپاتکرابوو، بەستەزمانە زیاتر تەنگاوبوو، دەموچاوی سۆرهەڵگەڕا، بەهەردوو دەستی زگی خۆی گرتبوو، رۆیشتینە لای ئەدەبخانەی پیاوان، ئەویش داخرابوو، لەسەری نووسرابوو، لەژێر چاککردنەوەدایە، هەر جارێک هاوار دەکات منیش دەشڵەژێم، دەبێ ئەدەبخانەیەک پەیدا بکەم، لە یەکێکم پرسی،

- ببورە لەم ناوە ئەدەبخانەیەک نییە؟

- بەڵێ، ئەدەبخانەیەک لەوسەری پردی ئەمین نوتو هەیە،

- بەڵێ.. لەولایە

مادلین:

- ناتوانم رێ بکەم.

- مادلین بیکە لەراهی خودای،

بەستەزمانەی زگی بەچۆکەکانی وەنابوو، گینگلی دەخوارد، سواری تاکسیەک بووین، بەرەو پردی ئەمین بەرێ کەوتین کوا ئەدەبخانەکەی ئێرە؟

لە مێژە رووخاندوویانە، لە تەکسییەکە دابەزین، چارە چییە؟؟

مادلین گوتی:

له وێستگەی شەمەندەفەرو گەراجەکان ئەدەبخانە نییە؟

تووشی سەرسووڕمان هاتم و خەریک بوو مشەوەش بم، توانای بیرکردنەوەم نەما، دەبێ ئەدەبخانەیەک پەیدا کەین.

- برام بمانگەیەنە (قەرەکۆی).

مادلین هاواردەکات:

خەریکە شەقدەبەم.

- گیانەکەم تۆزێک ئارام بەو دان بەخۆتا بگرە، گەیشتینە بەندەری (قەرەکۆی).

- مادلین بابڕۆین..

بۆ هەردوولای راست و چەپمان دەڕوانی، شوێنەواری هیچ ئەدەبخانەیەک نییە، له فەرمانبەرێکم پرسی:

- برام ئەدەبخانە له کوێیە؟

- ئەدەبخانەمان نییە..

- باشە.. ئەدی ئێوە چی دەکەن؟

- تۆ چ هەقێکت بە ئێمەیە؟

- راستە هیچ پەیوەندی بەمنەوە نییە، یاڵلامادلین، یاڵلاگیانەکەم بابڕۆین

- بەهیچ جۆرێک توانای جوولەم نییە.

زۆری نەمابوو بتەقێت.. منیش یەک زەرە مێشکم لەسەریدا نەمابوو، چەندین باڵەخانە لەوێندەربوو.. گوتم: بابچینە ژوورەوە، پاڵم پێوەنا بۆ لای یەکێک له دەرگاکان، نەیتوانی بەسەر قاڵدرمەکان هەڵگەڕێ، کارمەندی ئەسەسۆنەکە گوتی:

- چاوەڕوان بکەن.. هەتاکو نەبنە چوار کەس ئەسەسۆنەکە بەرز نابێتەوە، زۆرمان چاوەڕێ کرد.. کەسێک نەهات.. کچەکە هەر گینگل دەدات.. ئاخ چاوەکەم، خەریکە شەقدەبەم.

- مادلین بووەستە.. گیانەکەم.. ئێستا هەر ئێستا..

هاواری کرد کەسێک له ئەوەکانی ئادەم نایێت سواری ئەسەسۆنە بێ؟

شێت دەبم..! گرنگ ئەوەیە دووکەس هاتن و سواری ئەسەسۆن بووین، له کرێکارەکەم پرسی:

- نهۆمی چەندەم؟

گوتم:

- بەمەرجێک تازەبێ.. نهۆمی چوارەم.

له نهۆمی چوارەم.. له بنەبانی ڕێڕەوەکە.. سوپاس بۆ خوا ئەدەبخانەمان دیتەوە.. بەڵام داخرابوو.. مەعقوله ئەدەبخانە داخرابێ؟

له منداڵە قاوەچییەکەم پرسی، هۆی داخستنی ئەدەبخانەکە چییە؟

گوتی: هەر میوانێک کلیلی ئەدەبخانەی لەلایە، لەکاتی پێویست دەیکاتەوە.

مادلین لەبەر دەرگای ئەدەبخانەکە بەچارچمکی دانیشت، دەڵێی خولی مانگانەیەتی.

- یاڵلا خۆشەویستەکەم هەستە.

له قاڵدرمەکان دەهاتە خوارێ دەڵێی مارە پێچ دەخوات، خۆی بە (موحەجەرە) کە گرتبوو.. دیتمەوە! لەگەڵاتە سەرای ئەدەبخانەی گشتی هەیە.. سواری تاکسییەک بووین، دەستم کرد بەئارەقە سڕینەوەی دەموچاوی ئەو بەستەزمانە پڕ ئێشە..

- گیانەکەم.. هەردوو چاوم.. واگەیشتین، ئێستا. ئێستا...

مادلین خەریکە هەستی نامێنێ، وەکو نیمچە بووراوەیەکی لێ هات، لەگەڵاتە سەرای دابەزین.. چووینە ناودەستی گشتی.

- برۆ چاوەکانم.. ئەوەتا ئەدەبخانە.. برۆ ژوورەوە.

- ئاه.. ئاه.. ئێرە.

- تەماشاکە، ئەو شوێنە تەنیا بۆ پیاوانە.

- قەیدی ناکا مادلین خان.. زەروورەت ئەمە نازانێ.

- ناتوانم لەبەرچاویان بچم.

ئەستەمبوڵ گەورەیە..!! یەکەر ئەدەبخانە گشتییەکەی گەرەکی تەقسیمم بەبیرهاتەوە، بەڵام هەموو ئۆتۆمبێلێک بەو رێگایە هەڵناگەرێ، قۆڵەکانیم گرت.

- برۆ چاوەکانم.. برۆ خۆشەویستەکەم.. وەرە.. زۆرمان نەماوە بگەینێ دان بەخۆتدا بگرە.. وەرە دەگەینە ئەدەبخانە.

بەهەموو گرانییەکی خۆی هاوێشتە سەرشانم.. له دەستم بەرەڵلا بوو.. له دەرگای یەکێک له باڵە خانەکان چوومە ژوورەوە، بەستەزمانەی نەیدەتوانی هەنگاوی گەورە باوێ، خۆی توند کردبوو،

بەپەلە بەسەر قاڵدرمەکان کەوت، ژوورەوە تاریک بوو.. نەمدیت چ بکات، چونکە من لەبەر دەرگا راوەستا بووم..

بەڵام دیتم ئاو بەرەو دەرگا دەهات و لەوێوە بۆ شەقام شۆڕبۆوە، ئۆخەی بەستەزمان ئیسراحەتی کرد، بەرەو رووی چووم، دیتم لەسەر یەکێک له قاڵدرمەکان دانیشتووە، سەری خستۆتە سەر موحەجەرەکی خەریکە دەگریێ.

گوتم:

- سوپاس بۆ خوا لە سەلامەتیت..

دیارە ئیسراحەتت کرد گیانەکەم دەستیم گرت.. هەڵستاین و دەرکەوتین شڵپەی ئاومان لێ دێ. مادلین خۆی پێ راناگیرێ.. بەردەوام دەگریێ.

- بگریێ خۆشەویستەکەم بگریێ..

بەگریان ئاسوود دەبی، بگریێ هیچ قسان ناکات.. گەیشتینە ماڵەوە.. بێدەنگ ماوە.. زاری ناکاتەوە له رۆژی دوایی.. بوخچەکانی هەڵگرت.. سەفەری کرد.. هیچ هەواڵێکی ئەوم گوێ لێ نەبوو.

پاش ماوەیەک نامەیەکم بۆ هات دەڵێ: (وڵاتەکەتان زۆر جوانە.. ئێوەش هەمووتان خەڵکی باشن، تەنیا ئەگەر ئەدەبخانەتان هەبوایە).

بەڵێ.. بەڵێ بەرێز ئەدەبخانە بەر له هەموو شتێک.. ئەگەر کێشەی ئەدەبخانە چارە نەکەن، ئەو وڵاتە هیچ پێشناکەوێت، تێگەیشتی؟؟ بەڵێ.. زۆرچاک تێگەیشتم.

**سەرچاوە:**

**عزيز نسين، لن نصيح بشرا، ترجمة: محمد مولود فاقي.**

# داوەتێکی ژەمی شێوان

ڕەزا سلێمان سالح
و/ ئەحمەد سەلام

هاوڕێکەم داوەتنامەیەکی بۆ ژەمێکی سەر لەشێوان بۆ هێنام بە بۆنەی کردنەوەی چێشتخانەیەکی برادەرێکی خۆی. کارتی داوەتنامەکە بۆ دوو کەس دەبوو، هاوڕێکەم پێی گوتم.

داوەتنامەکە بۆ خۆت و سەگەکەت کراوەیە تا ژەمێکی خواردنی شێوانی پێ بخۆن لە چێشتخانەی سەگان، ئەم چێشتخانەیە هاوڕێیەکی ملیۆنێرم بەم دواییانە کردوویەتییەوە.

بیرۆکەی کردنەوەی ئەم چێشتخانەیەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کاتێ جارێ لەجاران فیلمێکی ئەمریکی دەبینێ، لەوێدا دیویەتی چۆن سەدان هەزار چێشتخانە بۆ سەگان کراونەتەوە، هەر لەوێدا ئەمیش دەماری گرژ دەبێ و لەبەر خۆیەوە دەڵێ:

- نێ باشە بۆ لە وڵاتی ئێمەیش دا چێشتخانەی سەگان نەبێ، بەتایبەتی پاش ئەوەی هەموو ئامارەکان ئەوەیان سەلماندووە کە بەملیۆن سەگی ڕێزدار و بێ وەی هەن و، بە هەزارانیش سەگی بەرەڵلامان لەناو دایە! داوەتنامەکەم پێ ڕەت نەکرایەوە، بەڵێنم دا بەهاوڕێکەم کە خۆم و سەگە ئازیزەکەم لەکات و ساتی خۆیا بۆی بچین.

کاتێ هاوڕێکەم ڕۆیشت، ئەوجا زانیم چ گۆبەندێکە بۆ خۆم ناوەتەوە، باشە خۆ من سەگم نییە! پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر ئەوجا گەیشتمە چارەسەرێک ئەویش ئەوەیە، لەو دوکانەی تەنیشت خۆمان سەگێک بە کرێ بگرم. ئەم دراوسێیەم ماوەیەکە شوێنێکی لەم دەوروبەرە کردۆتەوە و سەگی تیا بەخێو دەکات، ڕۆژانە بەدوای سەگە بەرەڵلاکان، تووتەڵە سەگەکاندا دەسوڕێتەوە و کۆیان دەکاتەوە و لەم شوێنەدا بەخێویان دەکات، پاشان لێیان دەفرۆشێتەوە یان بەکرێیان دەدا.

خۆم گەیاندە لای ئەو برادەرە و داوای سەگێکم لێکرد بۆ ماوەی دوو سەعات بمداتێ بەکرێ، بۆ پێشەکی کرێکە داوای پەنجا دیناری لێکردم، پاشان سەد دیناری تریشی لێ سەندم بەناوی بارمتەوە، هەر کاتێ سەگەکەم بۆ گەڕاندەوە بمداتەوە.



سەگەکەم لەگەڵ خۆمدا هێنا، تاکسییەکم ڕاگرت سەرەتا شۆفێرەکە قایل نەبوو سەگەکە سوارکا کە شتێ لەکرێکەم بۆ زیادکرد ئەوسا دڵی نەرم بوو، هێشتی سەگەکەیش لەگەڵ خۆما سواربێ. گەیشتینە چێشتخانەکە، لەبەر قاپیەکە دوو کیژۆڵەی جوانکیلە وەستابوون، یەکێکیان گوڵێکی دایە دەستم و خستمە گیرفانی

پاڵتاکەمەوە، ئەویتریشیان تەوقێ گوڵی لە ملی سەگەکەم ئالاند. پاش چەند شەقاوێک ڕۆیشتن ئینجا کچێکی تر دەستی بۆ ڕاکێشام وەک بیەوێ داوای شتێکم لێ بکا، منیش خێرا گوڵەکەم لە گیرفانی پاڵتاوەکەم دەرهێنا و دامێ، بەڵام ئەو بەدەم بزەیەکەوە پێی گوتم:

- سوپاس گەورەم.. تکایە پاڵتاوەکەتم بدەرێ منیش بەسەر سورمانێکەوە پرسیم!

- بۆچی؟

گوتی:

- ئەوەی ڕاستی بێ تازەترین توێژینەوەی زانستی لەدەروون ناسی سەگاندا ئەوەیان سەلماندووە کە سەگ دەترسێ و بەری دڵیشی دەگیرێ کاتێ خۆی لەناو کەسانێکا دەبینێتەوە کە هەر هەموو پاڵتاویان پۆشیوە!

خێرا پاڵتاوەکەم داکەند و دامە دەستی و بەرەو ژوورەوە هەنگاوم نا، نەکو خوا نەخواستە داوای شتی ترم لێ بکا و لەبەر خاتری چاوی سەگەکان پێم داکەنێ.

لەسەر مێزێک دانیشتم و سەگەکەیشم بە تەنیشتمەوە دانا، مێزەکانی تریش هەر هەموو پڕ ببوون لەسەگ و هاوەڵەکانیان پاک و تەمیزی شوێنەکە تەواو سەرنجیان ڕاکێشام، لەپڕ زنجیرەی خەیاڵم پسا، کاتێ کیژۆڵەیەک هات بەخۆی و قاپێکی پڕ لە نەرمە گۆشت، هەر بەبۆن و بەرامەکەی چێژی خواردن لەگەدەی پیاو دەوروژا. قاپە گۆشتەکەی لەبەر دەمی سەگەکە دانا لەدڵی خۆما گوتم:

- ڕەنگە ئەمە بۆ من بێ و بەهەڵە بۆ سەگەکەی دانابێ.

ویستم دەست درێژکەم و پارچەیەکی لێ بخۆم لەناکاو کچە جارێکی تر هاتەوە، ئەمجارەیان قاپێ شیرینی و کوێک و شەکرلەمەی بۆ منیش دانا وردە وردە کەوتمە شیرینی خواردن، سەرنجمدا سەگەکەم لەخواردنەکەی بەردەمی خۆی ورد دەبێتەوە و لێشی ناخوا، ئاوڕم دایەوە دەبینم هەموو ئەوانی تر بەدەستی خۆیان خواردنەکە دەکەن بەدەم سەگەکانیانەوە، زۆر شەرمم بەخۆم هات کە هێشتا لە پرۆتۆکۆڵی دەرخواردنی سەگدا شتێکی ئەوتۆ نازانم.

ویستم بەدەستی خواردنەکەی دەرخوارد بدەم، بەدەستەکەی دیکەیشم دەست بێنم بەسەرو گوێلاکیا، بەڵام سەرنجمدا خۆی لەخواردنەکە دەدزێتەوە و نایەوێ بیخوا، جارێکی دیکە هەوڵم لەگەڵ دا بێ سوود بوو، لەپڕ لەژێرەوە کەوتە وردە وەڕین تا دەهاتیش دەنگی لێ بەرز دەکردەوە، تاکو وای لێهات خەڵکەکە هەموو ڕوویان بەلای ئێمەدا وەرچەرخان، لەمەیش نەهامەتی تر ئەوەبوو لەپڕ سەگەکەم قەڵەمبازێکیدا و کەوتە غاردان بەناو هۆڵەکەدا، بەم جۆرە ئاژاوەیەکی نایەوە، تا هەلێکی بۆ ڕەخسا بەهاتنە ژوورەوەی یەکێ لە داوەتکراوەکان، ئەو هەڵەی قۆستەوە و بەرەو دەرەوە هەڵات، منیش بەدوایا، بەڵام چەندم کردو کۆشام نەمگرتەوە و لێم ونبوو، پەیتا پەیتایش لەبەر خۆمەوە نەفرەتم لە چانس و چارەنووسی خۆم دەکرد و هەر لەبەر خۆیشمەوە لێکم دەدایەوە چۆن پارە بارەمتە کراوەکەیشم لەکیس چوو، لەم هێنان و بردنەدا بووم بیرم کەوتەوە خۆ من پاڵتاوەکەشم لە چێشتخانەکە لێ بەجێ ماوە، بەڵام ترسام بگەڕێمەوە لەتاو شەرمەزاری ئەو ئاژاوەیەی بەسایەی خۆم و سەگەکەمەوە بەرپا بوون.

بۆ ڕۆژی دوایی خاوەن کۆگای سەگەکانم بینی ویستم خۆمی لێ بدزمەوە کەچی ئەو لەپڕ هەڵیدایە و گوتی:

- ئەوە فڵانی چیت لەو سەگە کردبوو، دوێنێ کە هاتەوە تووڕەیی و خەصباری بەسەر و سیمایەوە دیار بوو.

منیش سەرتاپای ڕووداوەکەم وەک خۆی بۆ گێڕایەوە، کابرا دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی:

- ڕاستیەکەی هەڵەکە لەمنەوە بوو دەبوایە لەسەرەتاوە پێم بووتیتایە ئەم سەگەی ئێمە (ڕووەک خۆرە) نەک (گۆشت خۆر).

**سەرچاوە:**

هەفتەنامەی الاتجاه الاخر، ژمارە (١٧٦)، ٣/٧/٢٠٠٤، ل٢٧، رضا سليمان صالح سليمان/السودان.

# گەورە شاعیر لە روانگەی شاعیرانەوە

و: لە فارسییەوە: ئیسماعیل ئیسماعیل زادە

**بەشداربووان:**

- **مەنووچێهری ئاتەشی**
- **عەلی باباچاهی**
- **محەمەدی حقووقی**
- **محەمەد عەلی سپانلوو**
- **جەوادی مەجابی**

**مەجابی:**

کاتێ کە باسی شاملوو دەکرێ پێش هەموو شتێک شیعرەکەی دێتە زەینەوە. بەڵام بەبڕوای من لە ماوەی ژیان و لە پەنای شیعری شاملوودا کردەوەیەکی بەرفراوان و رەنگاورەنگ لە ئارادابووە. من بەوێنەی ژوورنالیزم.. ئەم شتە شیدەکەمەوە، ئەم ژوورنالیزمە تەنیا رۆژنامەوانی نییە، بەڵکو کۆی ئاکارێکە کە بەشێوەیەک لە کەنار ئەفراندن دادەنیشێ و کاری ئەفراندن بەرفراوان دەکاتەوەو لە نووسینی وتار، رۆژنامە، ئیش کردن لە راگەیەنە جۆراوجۆرەکان وەکو سینەماو رادیۆو تەلەفزیۆن- ەوە بگرە هەتا دەگاتە ئاخافتن و سەفەرەکان و کاسێت و ئەمجۆرە شتانە دەدوێ. یانی سەرجەم ئەو ئاکارانەی کە هونەرمەند دەیکا بۆ ئەوەیە کە کاری ئەفراندن و لێکۆڵینەوە بەجۆرێک پەرەپێبدا. لەم روانگەیەوە لە کۆمەڵگای ئێمەدا شاملوو یەکێک لە چالاکترین کەسانی بەرەی خۆی بوو، ئەگەرچی ئەو چەشنە ژوورنالیزمە لە پێش شاملوودا لەلایەن کەسانێکەوە وەکوو دێهخودا (لە بواری رۆژنامەوانی و نووسینی فەرهەنگی گشتی) ئەزموون کرابوو، لێرەدا من لە نێوان شاملوو و دێهخودا چەند شتی هاوبەش دەبینم. بەڵام لە شاملوودا ئەم چالاکییە نزیکەی چوار دەیەی خایاند. شاملوو بەهۆی ئەم ژوورنالیزمەوە هەوڵی داوە (لە ماوەی ئەم چوار دەیەیەدا) شیعری پێش خۆی کە نیما بێ و شیعری خۆی و هاو تەمەنەکانی و شیعری لاوان بەئێمە بناسێنێ. هەرچەند کەسانێک هەبوون و بەرەیەکیش ئەم کارەیان کردووە.

لەراستیدا یەکێک لە کارە گرینگەکانی شاملوو ئەوەیە کە ئەم ژوورنالیزمە چالاکە لە پەنای شیعرەکەی بوود، بەڵام ئەمەش بەم مانایە نییە کە شاملوو پشتی لە ئەدەبیاتی کۆنی ئێمە کردووە. ئەو لەسەر حافز نووسیویەتی و یان ئەوەی کە سەرنجی داوە بەکولتووری خەڵکی و لەژێر نێوی «کتێبی کوچە»دا ئەم سەرنجە دەکەوێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. لەراستیدا ئەو بەرەی کە شاملووی لەگەڵ خۆی هێناوەو لە کۆتایی دەیەی ١٣٢٠دا چالاک بووە



لەسەر هێڵێکی سەرەکی کاری کردووە: بەربەرەکانی کۆمەڵایەتی کە دەمەوێ کەمێک لەسەری بدوێم. یەکێک لەو شتانەی کە لە ساڵی ١٣٢٠-ەوە تاکو شۆڕشی گەلانی ئێران بەگرینگ دادەنرێ، کاری فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و هەروەها کێشەی بەربەرەکانییە لە بەرامبەر فۆڕم دا و ئەم بەربەرەکانییە جاری وایە سیاسییە و جاری واشە کۆمەڵایەتی و کولتوورییە. لەسەرەتادا شاملوو بۆ لای شەڕی سیاسی دەکێشرێ. دواتر بەخێرایی بەربەرەکانی کۆمەڵایەتی دەخاتە جێگای شەڕی سیاسی و لایەنی فەرهەنگی پێدەدا و قوولتری دەکاتەوەو دروشمی رۆژی لێدەستێنێتەوە. هەر بۆیە یەکێکە لەو شتانەی کە لە شیعری شاملوودا دەکەوێتە بەرچاو، بەربەرەکانییە، لەوانە بەربەرەکانی مرۆڤ دژی هەلومەرجی نائاسایی کە بەسەری داهاتووە، دژی بێ عەدالەتی، نەبوونی ئازادی، هەژاری، سووکایەتی کردن بەمرۆڤ و دواکەوتوویی. شاملوو لە ماوەی ئەم سی چل ساڵەی کە شەڕ ئیشی سەرەکی رووناکبیران بوو شیعری خۆی بەدەوری هەستی بەربەرەکانی هەڵچنیووە. لە پەنای بەربەرەکانی کۆمەڵایەتی شاملوودا هەمیشە کێشەی تایبەتیش لە ئارادابووەو ئەم لایەنە گەوهەری شیعری ئەو زیاتر دەکا. بەم مانایە شیعری شاملوو لە شوێنێک جۆرێک ناسنامەی کۆمەڵایەتی هەیەو باسی زەمانی خۆی دەکاو لە جوولانەوەکانی سەردەمی خۆی بەڵگەمان دەخاتە بەردەست، لە شوێنەکانی تردا شیعرەکانی ئەو لایەنی بیوگرافیک بەخۆیەوە دەگرێ و تێیدا هەست بە خاڵە وردەکانی ژیانی شاعیر دەکرێ. ئەمەش زۆر گرینگە کە چۆن شاملوو لەنێو جوولانەوەی کۆمەڵایەتی و سەرنجدان بەمانا گشتییەکان توانیوتی سەرنجی منی خۆی بداو وەکو مرۆڤی شارستانی ئاوێتەی خۆی بێ ئەو هەموو کات وەکو هەواڵنێرێک لەسەر شانۆیەکدا ناوەستێ هەتا باسی کۆمەڵایەتی پێشکەش بکا، بەڵکو هاتۆتە خوارێ و خۆی خستۆتە نێو خەڵکی وەکو کەسێک و دەنگێکی ئینسانی باسی خۆی و ژیانی تایبەتیشی کردووە. هەروەها تەواوی هەڵکشان و داکشانی ژیانی تایبەتی خۆی لەنێو شیعرەکانیدا نیشان داوە و دەبینین کە لە شوێنێکدا تووڕەیە، لە شوێنێکدا خەمناکە، لە جێیەکی تردا عاشقە، یان بێ پارەیە و شتی لەم چەشنە. ئەوەش جیاوازە لەگەڵ بەشێک لە شیعرەکانی شاعیرانی سەردەمی خۆی کە بۆچوونێکی گشتی و کۆن لە شاعیر نیشان دەدەن و باسی شتێک دەکەن کە لەراستی بوونی نییە. بەڵام شاملوو وەکوو مرۆڤێکی سروشتی و دیاریکراو دەنگێکی جیاواز باسی خۆێ دەکا. ئەمە زۆر گرینگە کە شاملوو توانیویەتی ئەم دژایەتییە پێویستە لابا، یانی منێکی کۆمەڵایەتی کە دەیەوێ بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی وڵات بەدژی ستەمێک کە بەمرۆڤایەتی دەکرێ شەڕ بکاو لە هەمانکاتدا دەنگێکی هەیە کە باسی تایبەتمەندییەکانی خۆی دەکا. ئەمە هەر ئەو شتەیە کە شاملوو وەکو مەولەوی بەشاعیری بێ وێنەو هەواڵنێر دادەنرێ. شاملوو لە هەرکیاندا یانی لایەنی کۆمەڵایەتی و لایەنی منی تاکەکەسی، زیاتر ستایشی ژیان دەکاو وەکو مەلێک نییە کە بیر لە مردن بکاتەوە. بەم مانایە لە هەلومەرجی نا لە باری دوای ٢٨ گەلاوێژدا ناهومێدی شتێکی ئاسایی بوو، هەمیشە بیر لە رۆژ رەشی و لەناوچوونی دەکراوە، کەچی بەپێچەوانە شاملوو وانەبوو. ئەم جۆرە بۆچوونە سیاسی و بیرکردنەوەیە هەمەلایەنە ببوو، بەڵام لەنێو هونەرمەندان و فرە زانەکانی

> شاملوو وەکوو مرۆڤێکی سروشتی و دیاریکراو دەنگێکی جیاواز باسی خۆی دەکا

ولآتدا ئەمەش شاملوو بوو کە وردە وردە توانی خۆی لەم ناهومێدییە رزگار بکاو تێیدا نووقم نەبێ و بەرەو هەناسەی مرۆڤێکی نوێ، مرۆڤێکی داهاتووبین بڕوا. لەم نێوانەدا شاملوو وە دیارکەوت. ئەو کەسێک نەبوو کە وەکو (نوسرەت رەحمانی) لەنێو ناهومێدیەکانی خۆیدا نووقم بێ، بەڵکو ئەو توانی لە ماوەی بیرکردنەوەیەکی دووردرێژدا دەنگی خۆڕاگری و سەرکەشی بەرەی خۆی بێت و هاوکات و هاورێ لەگەڵ لاوان حەماسەی مرۆڤی خۆڕاگر و تێکۆشەری سەردەمی خۆی بکاتە شیعرو لە وڵات و گشت دنیادا لەگەڵ دەنگی خەڵکی جیهانشاری نوێ هاودەنگ بێ.

شاملوو شاعیرێکی گەورەیەو بەبۆچوونی من ئەم ناساندنە وردبینانەتر لە شاعیری میللی - یە. چونکە شاعیری مەزن کەسێکە کە بێجگە لە ئەوەی لە چوارچێوەی جوگرافیای کولتووری خۆیدا باوەڕپێکراو و خۆشەویستە، لە شوێنەکانی تریش لە وشەکانی حاڵی دەبن و ڕێزی لێدەگیرێ و دەبێتە هاواری هاوبەشی مرۆڤایەتی. نیرۆدا، لۆرکا، شاملوو... وەکوو هاووڵاتیەکی جیهانی کەسانێکن کە زیاتر لەسەردەمێکە قسەیان کردووە، نەک وەکو دەنگێکی بەر تەسک لە چوارچێوەیەکی جوگرافیاییدا دەنگیان هەڵبڕیبێ. ڕەنگە درانی سەر ناوی شاعیری میللی بەشاملوو بەم هۆیە بێ کە نەتەوە سەرنجی داوەتێ و خۆشی ویستووە. شاملوو لە پێشڕەوانی بەرەیەکە کە دەیەوێ بەگۆڕوتینی زۆرەوە لەگەڵ خەڵکی سەردەمی خۆی پێوەندی بگرێ. ئەو لە دەورەیەکی چل ساڵەدا ئەم کارەی لە رێگای راگەیەنە گشتییەکان کردووەو پێوەندی کولتووری و کۆمەڵایەتی پێناسەی سەرەکی شاملووە، هەڵبەت هاو بەرەکانی شاملوو و دوای ئەم کارە کەوتوون. ئەمەش رەنگە بەم هۆیە بێ کە ئەدەبیاتی ئێمە لە چوارچێوەیەکی تەسک و دیاریکراو دامابۆوە. شاعیرانی دەیەی چل و پەنجا (١٣٤٠-١٣٥٠) توانییان بەکارکردن لە گۆڤارەکان و راگەیەنە گشتیەکاندا سنووری وانەی شیعری ئەمرۆ بەرفراوان بکەنەوە و سەرکەوتووش بوون و بەمرۆ گەیشتن.





**- حقووقی:**

بەڕێز مەجابی بۆ دەسپێکی کارەکە باسی چەند شتی جۆراجۆری کرد. بەڵام من سەرنج دەدەمە تاکەکەسی و تەنیا بوون. ئەم باسەی کە هاتە گۆڕێ ئەم ڕاستیە دەسەلمێنێ. من دەمەوێ ئەم تاکە کەسییە بەرفراوانتر بکەمەود و لە چەند لایەنی ترەوە بیخەمە بەر باس و لێکۆڵینەوە. هەڵبەت لە روانگەی رۆحی و زەینی و کەسایەتی شاملوودوە دەدوێم و وەکو شاعیرێکی خەڵکی و رەخنەگر یان هەر ناوێک کە بۆی بدۆزنەوە باسی لێدەکەم. بەبۆچوونی من خودی شاملوو مرۆڤێک بوو کە هەرکاتێ تووشی دەبووی وەکوو تووش بوون لەگەڵ خەڵکی تر نەبوو. کاتێ کە دەگەیشتینە شاملوو بەشێوەیەکی تر لەگەڵی ڕووبەڕوو دەبووینەوە ئایا هەر تایبەت بە ئێمەی خوێندکار نەبوو کە تەمەنیان بیست ساڵ یان کەمێک زیاتر بوو، بەڵکو گەورەتر لە ئێمەش کاتێ کە دەگەیشتنە شاملوو ئەم هەستەیان دەبوو. هەر بۆیە ئەو تاکەکەس بوونەی کە من ئاماژەی بۆ دەکەم جیاوازە لەگەڵ لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و شیعری و هونەری شاملوو کە دەبوونە هۆی ڕێزلێگیرانی ئەو. ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە سەر کەسایەتی ئەو کە هەمیشە لە پشت ڕووخساری شکۆداری، مرۆڤێکی تاکو تەنیا خۆی نیشان دەدا. خاڵی دووهەم کە دەبێ ئاماژەی پێبکەم ئەمەیە کە شاملوو



ئەحمەد شاملو

ـیرێکی ناهومـێد نەبوو. هیچ کات ێ نەخـسـتـە ژێر ئەم ناهومـێدییـەو ـەر جـارجـارێک تووشی دەهات ـەپۆلێکی بەهێزی هەست بزوێن ئەم ـمـێـدیەی تێکدەشکاند. ئەمـەش ـست بەپێچەوانەی «ئەخەوان» بوو کە ـمێدی کـۆمـەڵایەتی ئەو وردە وردە دەبووە ناهومـێـدییـەکی فـەلسـەفی. هەرچەند بەبۆچوونی من ناهومـێـدی فـەلسـەفـیی «ئەخەوان» ناهومـێدیەکی قـووڵ نیـیـە. وای دانێین لە شـیـعـرە سـەرەتاکـانی «ئەخـوان»ەوە هەتا «زسـتـان» و «چاووشی» و دواتر «کتیبە»و خوێندنەوەی لەسەر بەرد وەکو ناهومـێدییـەکی فـەلسـەفی بێت، بەڵام بەواتایەکی تر ناهومـێدی هەر جـۆرێک بووبێ خـۆی بەسـەر شـیـعـرەکـانیـدا دەسەپێنێ. بەپێچەوانە لە شیعرەکانی تری ئەخوان دا وەکوو «مردو مرکب» یان «انگاه پس از تندر» یان «سـبـز» و« غاز» کـە لایەنی تایبـەتیـان هەیە، بەسـەرنجدان بەجـۆش و خـرۆشـێکی جـارجـارەی ئەم شـیـعـرانەی وزەیێکی مـەزنی تایبـەتی، ئەمـە دەردەکەوێ کـە ناهومـێدیی ئەخەوان لە چاو ناهومـێدی «رەحـمـانی تەوەللولی» کە من پێیـان دەڵێم ناهومێدی رۆمانتیکی رەش، زۆر جیـاوازە. بەڕێز «تەوەللولی» بەم ژیانە خۆش نشینەی کە هەیەتی دەکەوێتە نێو ئەم شەپۆڵەوە. لێرەدا ئەو ئاوا دەڵێ:

**«بمرە ئەی پیـاو ئەتۆ وەک سـەگی ئاوارە برۆ ژین و بوونت بەبێ ئامانی خودا قەت نەبوو**

**سێـبەری شوومت بەسـەر هاوسەر و بێشکە مناڵ رەنج و ناکامی نەبێ بەهەمی سایەت نەبوو»**

یـان «نـادرپـوور» شـاعـیـرێک بوو کـە دایە دەچووە نێـو کـۆبوونەوە و دانیشـتـنەکان. ئەو عـاشقی ئەوەبوو کـــە لـە دەوری کـۆببنەوە و گـوێ بدەنە شـیـعـرەکـانی و چەپڵـەی بۆ لێبدەن و ماشـەڵلای پێبڵێن، بەم حـاڵە ئەویش تووشی ئەم رۆمـانتـیـکە رەشـە بێت. «فـەرەیدوونی مـوشـیـری»ش هەر ئـاوا. هەڵبـــەت هۆی رزگـاربوونی هەرکـیـان لەم شەپۆڵی رەش بینیە ئەم جۆرە دانیـشتن و کـۆبوونەوانەیە. بەتایبـەتی شـیـعـرەکـانی «نـادرپـوور» پـڕە لـە پێداهەڵووتن و دیمەنی بۆرژوا پەسندانە. ئێستا ئیزن بدەن لە دوای ئامـاژەکردن بەتاک و تایبـەت بوونی شـاملوو، هەروەها باسی ناهومـێدی و رەشـبـینی، باسی زمـانیش بکەم. زمانی شیعری شاملوو تێکەڵاوێکە لە زمـانی ئارکـائیک و زمـانی باوی ئەمـڕۆ و گـەوهەری زمـانی خەڵکی. ئەخەوان - یش هەر ئاوایە. هەرچەند شـیـعـری ئەخـەوان ئەم شـووم - یەی نیـە. بەڵام شـیـعـری «نادرپوور» ئەوەنـدە تووشی تەوژمی تەسویری زۆر دێ کە زمـانی فـارسی ون کـردووە. یانی ئێمە ناتوانین سنووری بۆ دابنێین و بڵێین کـە نـادرپـوور تـا چ رادەیـەک دەسـەڵاتی بەسـەر زمـانـدا هەیە. بەڵام لەم روانگەیەوە یانی لە روانگەی زمـانەوە بـەبـۆچـوونـی مـن ئـەو ئەزمـوونانەی کـە «نیـمـا» کـردنی لەگـەڵ هەمـووی ئەوانە جـیـاوازی هەیەو لێرەدا بەپێویستی نازانم کە باسی بکەم. ئێـسـتـا دەگـەڕێینەوە سـەر سـەرەتای باسـەکـەمـان. من باسی رۆمـانتـیـکی رەشم کـرد و دەمـگـووت ئاشـکـراترین و روونتـرین تایبـەتمەندی شاملوو ئەوەبووە کـە ئەگـەر ئەو هەنگاوی نایە نێـو ئەو دەریا تاریکە، هیچ کـات ئەوەندە ئەڕۆیشت کە ونبێ. ئەو هەمـوو کـات سـەری لە دەریـاوە بەدەردەوە بـوو و بـێ پـایـانـی دەریـای دەبـیـنـی. بـەڵام «تەوەلـلـولی» نـادر پوور» و«مـوشـیـری» نەیانتـوانی زیاتر لە چەند مـەتر هەنگاو بنێنە نێـو دەریاوە و هەر ئەوەش بـووە هۆی ئـەوە کــە زۆر بـە هاسـانی خـۆیان بگەیەنە کەناری دەریاو باری شانیان سـووک بکەن. هەر ئەو کەنارەی کە لە ژێر چاودێری

بەڵام بەهەرەتی ترین شت کاریگەرییەکی بوو کە شاملوو لەسەر زەینی رووناکبیری ئێمەی داناو نەیهێشت کە ئەم زەینییەتە ئاوێنەی ئەهلیزم بێ و لە بیر بکرێ و لە جووڵانەوە بکەوێ.

...نیما»ش دابوو: «ئەی ...ـەی لەکەناری دەریاو لە ...نی و خۆشی دانیشتوون».

هەر چۆنێک بێ لە ڕوانگەی منەوە هیچ کام ...وانە ڕەگیان دانەکوتا. لەم ...ێوەدا تەنیا دووکەس ...ـغەدار بوون کە نەتووشی ڕۆمانتیکی ڕەش هاتن و نەتووشی ڕۆمانتیکی سپی، وەکوو شیعری هیواداریی «کەسرایی» و «سایە». ئەم دوانە بێجگە لە نیما کە لە دەیەی سی دا کامڵترین شیعرەکانی نووسی، شاملوو و نەخەوان بوون. لێرەدا ئێمە باسی شاملوو دەکەین کە بەهۆی گەوهەری دینامیزمی کە هەمیشە لە شیعرەکانی دابوو و هەروەها بە هۆی ئەو عەشقە گەرم و گوڕ و قووڵەی کە بەژیان بووی، هەموو کات خۆی لە تاریکی ناهومێدی ڕزگارکرد و خۆی دەگەیاند بەیانییەکی ڕووناک. هەڵبەت هەڵبژاردنی نێوی «الف. صبح» و دواتر «الف. بامداد»یش هەر بەم هۆیەیە.

**- ئاتەشی:**

من بێجگە لەلایەنە شیعرەکان و هێزی شیعری شاملوو کە بەڕێزان. «مەجابی» و «حقووقی» باسیان لێکرد، بەجۆرێکی تر دەڕوانمە شاملوو. ئەمانەی کە باس کران هەموو ڕاستن. بەڵام من بۆ خۆم زیاتر بیر لە کاریگەریی شاملوو لەسەر زەینی ڕووناکبیری کۆمەڵگا دەکەمەوە، یانی هەر ئەو هومێدەی کە ئێوە لێی دووان، یانی ئەو کارەی کە شاعیرانی سیاسەتخواز وەکوو زۆر کەس کە نەیانتوانی بیکەن، شاملوو توانی ئەنجامی بدا. ئەو بەڕاستی توانی ئەو کارە بکاو بەسەر ناهومێدی کۆمەڵگادا زاڵ بێ. بەبۆچوونی ئەو ناهومێدییە بڕێک وەرگیراو بوو. چونکە لەسەرەتای سەردەمێک دابووین کە زۆربەی بیرە ڕۆژئاوایییەکان دەهاتنە ئێرانەوە و تاقمێک ئەمانەی وەکوو مۆدێلێکی ڕووناکبیری، یان مۆدێلێکی فەلسەفی بۆ وێنە نهیلیزم یان ئیگزیستانسیالیزم دادەنا و دەیانکردە بنەناو هەوێنی شیعرەکانیان. لە حاڵێکدا ئەگەر ئەو کەسانە ڕێیەکی دروستیان هەڵدەبژارد لەوە باشتر دەبوو کە شیعرەکانیان ئاوا لێ بکەن.

لە ئێراندا ڕۆمانیزمی واقیعی بە «ئەفسانە»ی نیما دەست پێدەکا. بەبۆچوونی من شیعرێک کە زیاترین کاریگەریی لەسەر شیعری سەردەم داناوە و تەنانەت لەسەر شاملوو و کەسانی تر داناوە. چونکە شاعیر بەچاوی خۆی دەڕوانێتە سروشت، بەبینین و هەستی خۆی پێوەندی لەگەڵ سروشت دەگرێ و یان وەکوو سوونەتییەکان کە دەڵێن چاویلکە لادەباو دەبینێ، هەست دەکاو بۆن دەکا، هەر چۆنێک بێ نیما لە «ئەفسانە»دا ئەمانەی فێرکردین کە بە چاوی خۆمان بڕوانینە ژیان. شاملوو بەتایبەت لە شیعرە نیماییەکانی دا بەتەواوی نیشانی دا کە ئەم توانایەی هەیە وەکو نیما درێژە بەڕێگای نیما.. بدا و شیعری نیمایی بەهێزیش بڵێ، بەڵام بەچەند هۆ ردنگە خوێندنەوەی شیعرە بیانییەکان یان موتاڵای - بەتایبەت - نەسری کۆنی فارسی هەروەک ئاماژەی پێکرا مێژووی «بەیهەقی» یان تەفسیری «عەتیقی نەیشابووری» و کەسانی ترو کەمێکیش «تەوراتـ» ئەو زمانە هاتبێتە بەر دەستی شاملوو. ئەو زمانێکی هەڵبژارد کە بێجگە لە نێوەرۆکی بیری گەورە بیری درەوشانەوەی مرۆڤایەتی نەیتوانی شتێکی دیکەی لە خۆ بگرێ. یانی ئەگەریش شاملوو بیسویستبایە نەیدەتوانی شیعرێکی عاشقانە یان شیعرێکی نەهیلیستی بڵێ. یانی کاتێ کە ئەم زمانە هەڵبژێردرا بۆ خۆی بەسەر زەینی شاعیردا سەردەکەوێ و شاعیر بەرەو ئەوپەڕی بیری خۆی و خەڵکی

ئەگەر دە ساڵ لە ساڵی ١٣٣٠ بەم لاوە بیژمێرین. دەیەی بیست هەتا دەیەی سی دەیەی سادقی هیدایەت - ە دەیەی سی هەتا دەیەی چل دەیەی نیما یوشیج - ە، دەیەی ٤٠ تا ٥٠ دەیەی جەلالی ئالی ئەحمەد - ە و لە دەیەی پەنجا هەتا مەرگی ئەو سەردەمی شاملوو.

هاندەدا. بەم هۆیە من دەڵێم شاملوو زیاترین کاریگەریی لەسەر زەینی ڕووناکبیریی کۆمەڵگای ئێمە بووە، هەروەکو ئەو دۆستەمان کە گوتی تەنانەت کەسانێک هاتبوون بۆ بەخاک سپاردنی شاملوو کە زۆربەیان شاعیر نەبوون و ڕەنگە هیچ کامیان بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ شیعردا هەڵسووکەوت نەکەن و تەنیا بەشێک لە شیعرەکانی (شاملوو) یان خوێندبێتەوە، ڕەنگە بۆ وێنە بەشێک لە شیعرە بەناوبانگ و بنەڕەتییەکانی شاملوویان خوێندبێتەوە. من وەکوو زەینییەتی ڕووناکبیریی چاو لەمانە دەکەم. ئەوان لەژێر کاریگەریی شیعری شاملوودا بوون و شاملوو لەگەڵ هێزی شیعری خۆی و ئەم زەینییەتە هەڵسووکەوتی دەکرد. ئێستا کارم بە لایەنەکانی تر وەکوو کاری «کووچە» و یان لەراستیدا کارە باشە ژوورنالیستییەکانی ئەو نییە کە ئێوە ئاماژەتان پێکرد، بەڵام بنەڕەتی ترین شت کاریگەرییەکی بوو کە شاملوو لەسەر زەینی ڕووناکبیریی ئێمەی داناو نەیهێشت کە ئەم زەینییەتە ئاوێنەی نەهیلیزم بێ و لە بیر بکرێ و لە جوولانەوە بکەوێ. شاملوو لە زیندوو ڕاگرتنی ئەم هەستی شەڕخوازان و بەربەرەکانیە، لەگەڵ خراپی و ستەمی ودزێوی کارێکی گەورەی بەڕێوەبرد. ئایا بۆچوونی من بوو کە باسم کرد.

**- سپانلوو:**

من لە ڕۆمانتیسیزمی بەڕێز حقووقی «شتێک بەقەرز وەردەگرم. دەبێ بگوترێ کە لەراستیدا ئەم ڕۆمانتیزمە ڕەشە قازانجێکە کە کەم تا کورتێک لە ئەدەبیاتی ئەورووپاییەوە بەئێمە گەیشتووە دەقێکە لە وەرگێردراوی شیعرەکانی بەتایبەت «بودلێر» و «رامبۆ»دا دیارە. هەڵبەت تاکو پێش ساڵی ۱۳۳۲ جۆرێک ڕۆمانتیزمی شۆڕشگێڕی بەسەر ئەدەبیات و شیعری نوێی ئێراندا حاکم بوو. دوای شکستی گەورەی سیاسی کە لەراستیدا ڕووناکبیران خۆیان بەقوربانیی ئەو شکستە دەزانی، ڕۆمانتیزمی شۆڕشگێڕیی کەوتە ژێر ڕۆمانتیزمی ڕەش کە ڕەگەکانی پێشتر هەبوو. بەڵام لە ساڵانی دوای ۱۳۳۲ نموونەگەلێکمان لە هەمەلایەنە بوونی ئەم ڕۆمانتیزمە ڕەشە لە بەشێک لە شیعرەکانی فرووغی فەرۆخزاد، موشیری، تەوەللولی، نادرپوور و شاملوودا هەیە. بۆ وێنە جۆرێک «ستایشی شەیتان»، شەیتان وەکوو هۆی یەکەم بەمانای سەرکەشی و ڕەنگە بەگومان ڕاڤەکردنێک بێ لە پرۆمتەیەک کە پێداگریی خوداکان بۆ مرۆڤ دەدۆزێتەوە. بەمجۆرە دەتوانرێ بگوترێ کە ئەم شەیتانە ئەوەندە لایەنی میتافیزیکی نەبوو کە لایەنی سیاسی سەردەم یان لایەنی فەلسەفی بووی. یانی شەیتان لەلایەکەوە دەیتوانی کاپیتالیزم، حکوومەتی دیکتاتۆریی یان سەرمایەداری بێ لەلایەکی ترەوە دەیتوانی بەپێچەوانەی هێزی شەڕخواز بەدژی سیستەمەکانی زوڵم و ستەم و... بێ. ئەم نموونانە کەم تاکورتێک لە ژیانی ئەدەبی شاملوودا دەبینم. لەو ساڵانەدا کە شاملوو تەسلیمی ڕەش بینییەکی سیاسی بووە، هەر خۆی تێدەکۆشی بەپەنابردن بەعەشقی تایبەتی بگاتە جۆرێک عەشقی گشتی، هەڵبەت ئیلهامەکەی لە «پۆل ئێلوار» وەردەگرێ. لە شیعرەکانی شاملوودا نێوی دوو سێ عەشق هەیە کە هەموویان ئەم دەورە دەگێڕن و نێویان لە چاپە نوێیەکانی شاملوودا نییە. وەبیرم دێ کە جارێکیان شاملوو پێی گووتم مەگەر چ کۆسپێک دەخاتە سەر ڕێ؟ من شیعرم داوە بەکەسێکەو لێم وەرگرتۆتەوە و داوەمەتە

فروغ، بۆ خۆی بە وشیارییەکی مێژووییەوە بەدوایدا دەچێ. ئەو شتە سەددییە تایبەتی هەوای تازە بە کە شاملوو سەرنجی نادات.. فروغ، دەست دەخاتە سەر شیعرێک کە ژیانە. ئەمڕۆکە شیعر تەکنیکی میللەتە نەک یاسەمەن و سونبول و گوڵخانەی فلان.

ـــــکی تر، من بۆ گاڵتـە
ـ ـ کـە بەڵێ ناسـرەددین
ـ - ـێ ئەم کـارەی دەکـرد،
ـــەـ ـوی - ناظم الدوله -
ـ ـ - ـشیر الدوله - ی لەو
ـ ـگـــرتەوەو دەیدا بە دە
ـــی تر، لە راستی دا من
ـــمـتە لەم گاڵتە کردنەدا
ـ کـە شـاعـیــری ئێـمـە
ـ ـمـــبــــەر بەرابووردوو
ـ شوکرەو دەروانێتە داهاتوو،
ھەمـوو کـات داهاتووە کـە
ھەموو شـتێک دەگۆڕێ بەڵام
ـ ـــوکـــری بەرامــبـــەر
ـەرابووردوو بۆتە هۆی ئەوە
کـە شـیـعـری شـاملوو لەهەر
جەشـنە نۆسـتــــالـۆژیا
دوورێـتــەوە. مـەگـەر ئەو
کـاتەی کە چوو بۆ هەندەران و
شـیـعـرگـەلێک وەکـوو
«هجـــرانی» نووسـی و یان
کـاتێ کە تۆزی پیری لەسـەر
نیشتبوو و سەردەمی منداڵی
بۆ وێنە «نەیشـــابوور»ی
دەکـەوتەوە بیـر، جـۆرێـک
نۆسـتـالۆژیا خـۆی دەنوێنێ.
دەتوانین بڵـێن ئەو بزووتنەوە
خـوێندکـارییەی کـە لە سـاڵی
١٣٤٠- دا دەستی پێکرد و
لەسـەر تەواوی هونەرەکـان،
ئەندێشـە و تەنانەت لە پێش
داوەریەکـاندا کاریگەرییـەکی
بـنـەڕەتـی دانـاو دەیــەی
ئەخـلاقی خولقـانـد - دەیەی
چل تا پەنجا - کـە ئەوپەڕی
گوڕوتینی ئەو سەردەمەیەیە.
تا ئەوکـاتە شـاملوو هەست
پێدەکـا کە جۆرێک وەهمی
پیلانگێڕی بەرامبەر بەهەموو
جووڵانەوە سیاسیەکان بووە.
ئەو لە تاکتیکە حیزبیەکان
کــــــە بـاوەڕی پێـی بـوو
دەسڵـەمـێـتـەوە و لە پێش
٢٨-ی گەلاوێژدا بەجێی ئەو
هیچی تر هەڵنابژێرێ، ئێستا
دەگاتە ئەو جێیەی کە دەزانێ
داخـــوازیی سـیـــاســـەت و
ئایدیالۆژیاکـــان چەشنێک
پیــــلان گــێـــڕییـــە بەدژی
نەتەوەکان، بۆیە لە روانگەی
ئەودا کــــەســــایەتیــــە
مێژووییەکان یان دوژمنن یان
قوربانین یانی ئەگەر کەسێک
زینـدوو بمێنێ خــــەریکی
خـــەڵـک فـریودانە بەڵام لە
نیـوەی دەیەمی چل بەم لاوە
رووداوگەلێک روویداو ئەوی
خـــســـتـــە قـــۆناغـێکی ترو
وەجموجۆڵی خست. چونکە
راستی بۆ ئەو پیاوە چرایەکی
ژیـــان بـــوو و لــــە زۆربـــەی
گرفتەکاندا رزگاریکردو بوو
بەهۆی ئەوە کـە ئاوا شـیـعـر
بڵێ:

**«تۆ بەم ژیانەت**
**وەکـوو تاوو باوێک کـە**
**خوێنی رەگم ویشک دەکا**
**دایە شەرمکێشی بینیتی**



**مردووەکان بووی و**
**من هەستم پێکردووە...**

ئەوکـات دەبینی کـە ئەم ئاڵوگۆڕە یانی رۆمانتیزمی شـۆڕشـە بۆ رەش بینیـەکی سـیـــاسی، لە چەشنێک ئومانیزم یان مرۆڤ خوازی کـە لە بنەڕەدا لەگەڵ بوونی شاملوو - یە یێک نایە. ئەم جیاوازیە یانی کێشـران بۆ لای مرۆڤێکی تەواو کە سادەو ساکاریشە بۆ وێنە لە سادقی هیـــدایەت دا دەبینـدرێ. ســـادقی هیـدایەت نووسەری هەژاریە بەڵام رقی لە هەژارەکانە. ئەو رێز لە مرۆڤ دەگرێ کە ناتوانێ وێنەکانی خۆی بدۆزێتەوە، بۆیە دەڵـێین ئەم جیـاوازیانە هەن. بەڵام لە شـیـعـرەکـانی دەیەی چلی شـاملوودا وردە وردە ئومانیزمی ئەو هەمەگر دەبێ و بەبۆچوونی من لە دەیەی حــەفـتـــا بەدواوە دەبێـتـــە جـۆرێـک روانینی فـەلسـەفی کە لەگـەڵ تەمەنی ئەو رێک دێتـەوە. ئەم روانینە جـۆرێک روانینی «خەییام»ا نەیە کە لە شیعری فارسیدا زۆر دەبـیـنـــدرێ مـــن لــە روانــگـــەی مـــێـــژوویـیـــەوە بۆچوونێکی ترم هەیە ئەویش ئەوەیە کە بیـردەکـەمـەوە بۆ وێنە ئەگـەر دە سـاڵ، لە سـاڵی ١٣٣٠ بەم لاوە بیـژمـێـرین، دەیەی بیـست هەتا دەیەی سی دەیەی سادقی هیدایەت - ە دەیەی سی هەتا دەیەی چل دەیەی نیما یوشـیـج - ە، دەیەی ٤٠ تا ٥٠ دەیەی جـەلالی ئالی ئەحـمـەد - ە و لە دەیەی پەنجـا هەتا مــەرگی ئەو ســەردەمی شـاملوو - یە ئێسـتـا ئەم سـەرکـەوتنە

من دەبینین هەر ئەو شاملوە پێشەنگە دەبێتە شاعیرێکی میللی و کاتێ کە شاعیرێک بوو بە میللی، ئیتر ئەو پێشەنگ نییە.

بۆچی و چۆنە؟ شاملوو نیمانی بە بایەخی ئەخلاقی، بەسبەینێ، داهاتوو و پەرستننارمانی مرۆڤی راگرت. لەکەنار ئەمانەش دا زمانی ئەو بەشێوەیەکی گونجاو تەواو و کامڵ بوو. ئەم زمانە بەوەسییەتی نیما لە کاتێکدا لایەنی ئارکائیک و لایەنی ئارگۆی تێکەڵاو کردو دوو جۆرە پێداویستی خەڵکی ئەنجام دا، یەکیان پێداویستی حاڵەتی «ئیتر وەکوو پێشوو عاشق و شەیدا نابێ» و ئەویتریان پێداویستی «هیچ کات لە مەرگ نەترساوم» یانی ئەم پێداویستیانەی لە خەڵک دەناسی. تەنانەت بەخوێنەرەکەی ئەم متمانەیەی دەدا کە بەباشی لە ئەدەبیات تێدەگاو بەم هۆیە شاملوو هێدی هێدی لەگەڵ ئاڵوگۆڕە هونەریەکەی دەبێتە شاعیرێک و لە کۆتاییدا شاعیرێکی نەتەوەیی، بۆ ئەو سەرناوێکی بێ گرفت دەبێ. هەڵبەت لەگەڵ دۆستان باسی ئەوەش دەکەین.

> ئەخەوان و شاملوو بەو رادەیەی کە باوەڕیان بەشیعری «فرووغ» بوو پشتیان لە شیعری سیلبەری دەکرد ئەویان بەشاعیری سەردەمی ئێمە دانەدەنا.

بەڵام من دەمەوێ بڵێم کە ئەمڕۆ دەڕوانینە شاملوو خەوێکی مێژووییە بۆ نەتەوەی ئێران و لە پەنای گەورە پیاوانی ئێران دادەنرێ. هەر بەو جۆرەی کە گوتوومە لە بەرهەمەکانی ئەودا لایەنی ئاسایی -ش هەیە کە هەڵبەت خەڵکی ئاسایی دەیەوێ. رەنگە بەناوبانگترین بەرهەمەکانی لەناو لاوازترین بەرهەمەکانی شاملوودابێ. بەبڕوای من ئەم رێتۆریسمە کە بێ گرتی و پڕ مانایی هەیە وەکوو: «ئاوا وەکو، لەکام شوێنی دنیادا، نازانم بالای کامە قەسیدە دەچی و باسی لێوو دەم و ددان و مرۆڤی ئەشکەوتنشین و شیری گەرمی (کە شوێن پێی غەزەلێک لە غەزەلەکانی سولەیمانی لەسەرە) غەزەل، ئەمانە لە شیعرە باشەکانی شاملوو نین، لە حاڵێکدا رەنگە بگوترێ خەڵکی زیاتر بەم شتانە دەگەڕێنەوە سەر ئەم زایەڵانە!

لە کەنار ئەمانەدا بەبڕوای من جادووی شیعری نیمایووشیج هێشتا نەدۆزراوەتەوەو شاراوە ماوە. یانی هێشتا جێی هەیە زیاتر بیری لێ بکرێتەوە کەچی شیعری شاملوو ئاشکراترە و زۆر زوو خۆی بەدەستەوە دەدا. بەڵام بەبێ ئەوەی کە تووشی ئەوە هاتبێت کە کێ لە کوێیە، شاملوو لە ئەدەبیاتی ئێران دا شوێنێکی مێژووی دروست کردووەو بەنێوی ئەویش دەمێنێتەوە.

– بابا چاهی:

من وەکوو لاوترین کەسی ئەم کۆبوونەوەیە دەبێ بڵێم کە دۆستان باسێکی تێروتەسەلیان سەبارەت بە شاملوو، چ لەمەڕ شیعری سیاسی، چ لەمەڕ کۆمەڵایەتی، پێشکەش کرد. بەڵام لەڕاستیدا من وابیردەکەمەوە کە زیندوویی و شادمانیی هونەری شاملوو تەنیا لەبەر مانا هیوادارانە نیە. ئەمەش دژایەتی لەگەڵ بۆچوونی دۆستان نییە، بەڵکوو سەرنج دانە بەلایەنەکانی تری شیعری ئەم شاعیرە مەزنە. یەکێک لە دۆستان ئاوا ئاماژەی بەشیعری شاملوو کرد کە شیعری شاملوو بەهۆی ئەو پلەوپایەیەی کە هەیەتی بێجگە لە مانای هیوادارانەی حەماسی ناتوانێ هەڵگری شتێکی تر بێ. ئەمە باسی لایەنی باشی شیعری ئەو دەکا، بەڵام بەمانای ئەوەش نییە کە بەهەموو شێوەیەکی پێداگری لەسەر ئەم جۆرە بەیانە دەکا. چونکە ئەم تایبەتمەندییە کە لە راستیدا ئەدیبانەیە - هەڵبەت ئەدیبانەی سەردەم. نەک ئەدیبانەی کلاسیک - لە چەند شوێندا جۆرێک «راستەوخۆیی» وەلا دەنێ. بۆ وێنە ئەگەر ئێمە کتێبی «هەوای تازە»ی شاملوو بخوێنینەوە کە وابزانم لە ساڵی ١٣٣٦دا چاپ و بڵاوبۆتەوە، دەبینین کە بەراستی لەگەڵ چ هەوایەکی تازەو چ داهێنانێکی رەنگاورەنگ رووبەڕوو بووینەتەوە. لەو کتێبەدا

...ردووک لایەن یانی ...ەمکی نیمایی یان غەیرە ...ی تێدایە و هەروەها لە ...ی ئەحنی دیالۆگ ئاسایی ... دایە و جاری واشە ...ەی کە باسم کرد دوور ...ێتەوە. بۆ وێنە:

**ساڵێکی شووم**
**ساڵی - با -**
**ساڵی فرمێسک**
**ساڵی ئەو ڕۆژە درێژانەی**
**وا کەمن**
**ساڵێک کە سواڵکەر**
**بوو، لە خۆبایی**
**ساڵێکی نەفام**
**ساڵی ژان**
**ساڵی ڕەشپۆشی...**

ئەم بەشە لە شیعری شاملوودا زۆر سادەیە یانی هیچ پێوەندیەکی لەگەڵ پلەوپایەی ئەدیبانەی شیعرەکانی دواتری ئەو نییە، ئەم سادەبوونە کە لە شیعری سالانی ۳۲و ۳٤ی شاملوو دا دیتە بەرچاو بەڕاستی دەمانخافڵێنێ، لەراستیدا نووسینی نوێ، خوێندنەوەی نوێ پێشنیار دەکا، پێشنیارێک لە کەنار لەحنی گفتوگۆکردنی چەند شیعری نیما-دا. هەڵبەت ئەمەش بەتەنیا ئانتی تیزی ئەو نییە. یانی ئێمە دەتوانین لە چاو شیعری نیما -ش سادەتر بدوێین بەڵام کاتێ کە «هەوای تازە» (۱۳۳٦)ی چاپ و بڵاوکردەوە، لەراستیدا نیما بەهێزترین و دوایین شیعرەکانی بڵاوکردۆتەوە لەوانە ۱۵ شیعری ئاشناو سادەو ئاسایی و هەروەها شیعری «پاشای سەرکەوتن» و ئەوانیتر. بۆیە من واهەست دەکەم کە لە شوێنێکدا کەس ناتوانێ لاسای شاملوو بکاتەوە. یانی سوودەکەی بەکەس ناگا. ئەویش لە شیعری سپیدا یانی هەر ئەو کەڵک وەرگرتنە لە وشەی ئارکائیک و ئارگۆ، هەر ئەو پێوەندیانە، کێش -ەکانی پێوەندی، هەر ئەو دۆزینەوەی پێوانەکانی مۆسیقایی و نیشان دانی زمانێکی تایبەت. بەڵام لە مەزنایەتی ئەم بەیانەدا شتێک قوربانی کراوە، شتێک قوربانی دەبێ، ئەویش ئەوەیە کە «فروغ» بۆ خۆی بە وشیارییەکی مێژوویییەوە بەدوایدا دەچێ. ئەو شتە سەددیە تایبەتی «هەوای تازە»یە کە شاملوو سەرنجی ناداتێ.. «فروغ» دەست دەخاتە سەر «شیعرێک کە ژیانە» ئەمڕۆکە شیعر تەکنیکی میللەتە نەک یاسەمەن و سونبول و گوڵخانەی فلان. ئیستاکە «فروغ» ئاگاداری ئەوەیە کە شاملوو هاتووە و لەسەر ڕووباری تایبەتی خۆی ڕاوەستاوە ناهێڵێ کەس بچێتە ئەو دەڤەرە «فروغ» دروست لە شوێنێک دەپرسێ کە کەس چاودێریی ناکا: «شیعرێک کە ژیانە»! وای دادەنێین کە هەموومان شاملوومان خۆشدەوێ، من بۆ خۆم دەتوانم بڵێم یەکێک لە عاشقەکانی شاملووم، بەڵام لەسەردەمی ئێمەدا هەر عەشقێک مافی ئەوەی هەیە کە بەگومانێکی هەستکردانەوە. بڕوانێتە عەشقەکەی یان بەدیهاتووەکانی بوون. بۆیە من دەبینم کە لێرەدا شتێک قوربانی کراوە، لە بەیان-ی مەزنی شاملوودا بێجگە لە شیعری حەماسی و مانای هیوادارانە شتێکی تر خۆڕاگری ناکاو لە تایبەتمەندی باشەکانی دانانرێ. هەروەک پێشوو کە گوتوومە بەبڕوای من چەشنێک پەیوەندی «لەنێوان شاعیر، خوێنەرو هەروەها لە نێوان دەق و خوێنەردا هەیە. جاری واشە شیعرگەلێک لە شاملوو دەخوێنمەوە کە سەر سوڕماو دەبم و بەخۆم دەڵێم بەڕاستی شاملوو شیعری ئاوای گوتووە! و ئێمە چەندەمان پێدا هەڵگوتووە! ئەمەش نەک لەبەرئەوەی کە خۆمان فریودابێ، بەڵام وادیارە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە وردە وردە بێین و با لاوان بێنین و فێریان بکەین. بەم مانایە شاملوو دەڵێ:

**«زۆر لەمێژە بەتوندی لەگەڵم**

شاملوو لە شیعری وڵاتانی تر تەنیا سەرنج دەداتە دوو سێ کەس یەکیان لۆرکا،یەو ئەوان تر ،پۆل ئێلوار، و مایاکۆفسکی.

دەدوێن

**ئەرێ ئێوە بۆ وەڵامێکی شیاو خۆڕاگرن؟!**

ئەمە دروست هەر ئەمەیە کە شاملوو سەبارەت بە «نیزامی گەنجەوی» دەڵێ، نیزامی ئاوای گوتووە:

**«زانینت بوێ و گەورەیی فێربە.. باباشت بیبێ ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژە»**

شاملوو رەخنە لەم شیعرە دەگرێ و دەڵێ ئەمە ئەسرە لەراستیدا ئەمە دەربارەی بەشێک لە شیعرەکانی خودی شاملوو - ش دا وایە.

کاتێ باسی شاعیری پێشەنگ دێ دەڵێن کە من لەپشت پەردەوە ! قسە دەکەم!؟

بەڵێ لە بەشێک لە زەماندا و لە روانگەیەکەوە شاملوو وەکوو شاعیرێکی پێشەنگ دادەنێم. رەنگە بەشێک لە شاعیرانی تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت پێشەنگ و سەرقافڵە بن. هیچ شاعیرێک بۆ هەمیشە نابێتە پێشەنگ، وەک بزانم «ئاندرێ بێرتۆن» هەتا کۆتایی تەمەنی ئەم نیگەرانیەی بوو کە نەکا بەشاعیرێکی پێشەنگ دانەنرێ. ئێستا ئەوە باسێکی جیایە. لەراستیدا پێشەنگ بوونی شاملوو بەدەوری شیعری سپی یانی شێوازی شیعری سپی خۆی دەخولێتەوە. یانی ئەگەر ئێمە دەبینین کە بۆ وێنە نیما دێت و برگەکانی شیعری کلاسیکی فارسی چ لە باری بنەما و چ لەباری کێش هەڵدەوەشێنێتەوەو پەیوەندییەکی نوێ لەگەڵ تەکنیکی شیعری پێکدێنێ، شیعرەکەی بەتەواوی رووت دەکاتەوەو لە ڕواڵەت دا لەگەڵ کێش بەکێشە دێ. کەچی شاملو بەئەنقەست کێش وەلادەنێ، بەڵام لە بەشێک لە باشترین شیعرەکانیدا کێش هەیەو ئەم کێش - ەش گۆڕانی بەسەر دادێ، یانی کێشێکی نیمایی - غەیرە نیمایی، هاو ئاهەنگیەک کە دەبێ رێز بۆ مۆسیقای زمان دانێ، یان بەوتەی سپانلوو جۆرێک کێش - ی پەیوەندی دێنێتە گۆڕێ. هەر چۆنێک بێ شاملوو دێت و لە شیعری کێش داری فروغ لایەنگری دەکا:

**«لە باخچەدا**
**ئەم دەستانەم دەچەقێنم**
**من دەزانم کەشین دەبم...**

شاملوو دەڵێ ئەم شیعرە کێشی هەیە، بەڵام بەشیعرێکی زۆر باشی دادەنێ (ببوورن ئەگەر کەمێک لە باسەکە دوور دەکەومەوە). دەڵێ ئەگەر لە ریای شەیتانی بەدووربێت دەتوانین لێی نزیک بینەوە و ئێمە دەبینین کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەشیعرێکی کێش داری باشی دەزانێ.

بێینەوە سەر باسەکەمان، شاملوو لە کەسانێکە کە لەرێی کەڵک وەرگرتن لە وشەی ئارکائیک و مۆسیقای شاراوەی ئەودا و هەروەها پێوانەکانی وێناکە دەبێتە هەڵگری چەندین زەمانی جۆراوجۆر، فەزای شیعری باوی سەردەم دەگۆڕێ.. ئەلیۆت. یش پێی وایە کە بەوشەی ئارکائیک دەتوانرێ فەزای ماندووهێنەری داسەپاو بەسەر شیعری سەردەم، بگۆڕدرێت. ئەمەش یەکێکە لەو شتانەی کە لە خزمەت شیعری سەردەم دایە. شیعری پێشەنگ شیعرێک بەتایبەتی بەباڵێکی رۆح زیندووە، شێوەیەکی هێرش بەری هەیە. ئەگەر هەڵە نەکەین لە یەکەم هەنگاوی ئێو هەرێمێکی بەرتەسک دا دەیەوێ شەرگەکانی دوور لە زەین داگیر بکا. بە وتەی «ئۆژێن یۆنسکۆ» شیعری پێشەنگ پێشڕەوی ئەو سپا - یەیە کە شوێن گەلێک داگیر دەکا و دواتر پاشماوەی سپا - کە دەچێتە ئەو شوێنەوە. بەڵام سەبارەت بەشاملوو باسی خاڵێکی گرینگ دەکەم. دیارە کاتێ کە مرۆڤ وەکوو «ئەخەوان» دێت و بەچاوێکی گوماناوی دەڕوانێتە شیعری بێ کێش -ی شاملوو یان بەشۆخی بەشیعری ئەسریی ئەو دەڵێ شیعرێک کە بۆتە ئەسر،

**شاملوو بەهۆی هەستی کەم وێنەی شاعیریەکەیەو ە توانیویەتی ئەم زمانە شیعرییە دەستەمۆ بکا، زمانێک کە لە ئەسر وەرگیراوە.**

یشانەکانی پێشەنگ بوونی شیعری شاملوو نابینێ. بەڵام بەبۆچوونی من :ببینین هەر ئەو شاملووە پێشەنگە ::بێتە شاعیرێکی میللی و کاتێ کە شاعیرێک بوو بە «میللی» ئیتر ئەو پێشەنگ نییە، ئەمە سەبارەت بە شاملوو جێی سەرنجەو ناتوانین خۆی لێ لادەین. کاتێ کە دەڵێم «میللی» مەبەستم تەنیا شاعیرێک نیە کە تەواوی چین وتوێژەکانی کۆمەڵگا دەیانەوێ، ئەمە ئامارە بەبەشێک لە راستیەکانە بەڵام رەنگە ڕووناک کەری شتگەلێک بێ بۆ وێنە لەمەراسیمی بەخاک سپاردنی شاملوودا کەسانێک دەبینین کە هیچ پێوەندییەکان بەشیعرەوە نییە و شیعریشیان پێ خۆش نییە، سەرنج دەدەن؟ بەڵام دەڕۆن و بڵیندگۆ بۆ شاعیر هەڵدەواسن. ئەم بڵیندگۆ هەڵواسینەو شتەکانی تر و خۆ نزیک کردن لە تابووت و وێنە هەڵواسین و... کارێکی خراپ نییە، بەڵکوو زۆر باش - یشە. بەوتەی مامۆستام مەنووچێهری ئاتەشی، بەراستی ئەمە لایەنی ڕووناکبیری شاملوویە کە ئەم کارانە دەسەلمێنێ.. ئەمەش لەبیر نەکەین کە لە بەرکارهێنانی جیاوازی نووسی و ئاشنایی و سڕینەوەدا کە بۆ وێنە لەکاری نیما و لەلایەکی ترەوە لەکارێکی خەیاڵیدا بەبێ ئەوەی هەڵمانسەنگاندبێ، جیاوازی هەیە. سوونەتی تەرکیب و ئافراندنەکانی شیعری شاملوو «میللی» بوونی ئەو وەپێش دەخا. نیما هەروەکو شاعیری شاعیرەکان و شاملوو هەروەکوو شاعیری جەماوەر دەمێنێتەوە! کاتێ کە دەڵێین «میللی» مەبەستم مانەوە لە چوارچێوەیەکی جوگرافیایی تایبەت نییە. کاتێ کە دەڵێین «میللی»یەو دواتر جیهانی. بەڵام «میللی» دانانی شاعیر بەمانای دوورخستنەوەی شاعیر لە هەرمانی و زیندووبوونی ئەو نییە. شاعیرێک یان شیعرێکی پێشەنگ دەبێ ڕێیەکی ڕۆیشتبێ و بەدروستی لە جەغزەکانی مێژوو تێپەڕ بووبێ. خاوەنی زۆر شت بێ بۆ مانەوەو کلاسیک بوون تاکو بەدروستی نێوی پێشەنگی لەسەر دانێن. ئەگینا شاعیرێکی سەر شێتە. دایە وەدوای مۆدێل دەکەوێ. هەربۆیە لەم جولانەوە شیعریانەی ئێستاکە کە نێوی فەزایەکی ترم لەسەر داناوە، ڕەنگە شاعیرانی پێشەنگ ببیندرێن کە جێبەجێکیان بۆ خود تەرخان نەکردووەو هەروەها ڕەنگە تووشی شاعیرانی پێشەنگ - یش بێین.

**حقووقی:**

من بەبۆنەی ئامارەکردنی ئاغای «باباچاهی» بەپێشەنگ بوون و هەروەها شیعری بێ کێش و شیعری سپی و ئەوەی کە لەلایەن هەموو شاعیرێکەوە پێشەنگ بوون بەراست دادەنرێ و یان شیعری بێ کێش و شیعری سپی کە بەشێک لە شاعیرە پڕ تەمەنەکانی ئێمە باوەڕیان پێ نییە، دەمەوێ ناراستەوخۆ بە ئامارەکردن بەپێوەندی خۆم لەگەڵ شاعیرانی بەناوبانگ و هەروەها ئەو ئاشنایەتیەی کە من لەگەڵ بۆچوونی ئەوان بوومە: چەند شت ڕوون بکەمەوە. هەر بەم جۆرەی کە گووتم لەگەڵ هەر کام لە شاعیران چەند حەوتوویان چەند مانگ ژیاوم، بۆ وێنە لەگەڵ خودی ئەم مەنووچێهری ئاتەشی - یە ماوەی ساڵ و نوێیک لەکاتی خوێندکاری و لە ژوورێکدا پێکەوە ژیاوین. ئەوەیە کە بەخوورەوشتی ئاتەشی ئاشنام و ئەگەر بڕیار بێ سەبارەت بەو بنووسم کە ئەرکی سەر شانمە و دەبێ بنووسم، دەتوانم زۆر شت بڵێم. بۆ وێنە شاعیر لە پێش هەموو شتێکدا دەبێ شاعیر بێ. سەرنج بدات و دواتر شیعر بڵێ. سەبارەت بە ئەخەوانیش هەر بەم جۆرە لێی نزیک بووم. لەگەڵ شاملوو -ش هەروا، ئەگەرچی کەمتر کەسێک دەیدی. یان لەگەڵ «ئازاد» و تەنانەت شاملوو-ش بەبۆنەی وەگەڕخستنی حەوتەنامەیەکی ئەدەبی لە تیراژێکی زۆر بەربڵاودا، ڕێک هاتبووە لام. هەڵبەت هەوڵدان بۆ حەوتەنامەکە بەئاکام نەگەیشت. یان سپانلووی خۆمان کە دەورەی سەربازیی لە ئیسفەهاندا تەواو کردو زۆرجار لە ئێوارەی پێنج شەممەوە تاکوو ئێوارەی هەینی لەگەڵ ئێمە بوو، لەماڵی من دەخەوت. من هەموو ئەوانەم لە نزیکەوە دەدی و پێش ئەوەی کە شیعرنووس بن هەموویان شاعیرن. بەپێچەوانەی ئەوان زۆر کەس هەن کە شیعر دەنووسن بەڵام هیچ جۆرە ڕەفتارو ئاکارێکی شاعیرانەیان نییە. هەڵبەت هەر ئەو

هەستان و دانیشتنانە بوو بەهۆی ئەوە کە بەبۆچوونی هەر کامیان سەبارەت بەوی تر بزانم.

بۆ وێنە شاملوو هیچ کات باوەڕی بە ئەخەوان نەبوو لە حاڵێکدا دەبوایە بەچەند هۆ باوەڕی پێ بوایە. بەپێچەوانە ئەخەوان باوەڕی بەشاملوو بوو بەچەند هۆ لێرەدا ناتوانم بیڵێم - بۆچوونی ئەخەوان سەبارەت بەشاملوو گۆڕدرا. ئەو دوو شاعیرەی کە هەموو کات لە زۆربەی گۆڤارەکانی ئەوکاتدا یان گۆڤارە بەناوبانگەکان وەکوو ئەو دوو ژمارەیەی «جنگ رازی» یان هەر گۆڤارێکی تر، نێویان لە پەنای یەکتربوو. هەڵبەت وەکوو دوو شاعیری پلەی یەکەم کە بەبۆچوونی من شیعرەکانیان زۆر بایەخی هاوبەشیان پێکەوە بوو. بۆ وێنە دەسەڵاتی ئەوان بەسەر زمانی فارسیدا شیعری ئەوانی بایەخدار کردبوو، دروست بەپێچەوانەی شاملوو و ئەخەوان، شیعری «فرووغ و سپێهری» لەبەر هۆی تر بایەخیان هەبوو. هەرچەند ئەخەوان و شاملوو بەو رادەیەی کە باوەڕیان بەشیعری «فرووغ» بوو پشتیان لە شیعری سپێهری دەکرد ئەویان بەشاعیری سەردەمی ئێمە دانەدەنا. هەموو ئەم ئاماژانە بەتایبەت لەسەر ئەم دوو شاعیرە، بەشێک لەو ئاماژانەیە کە دەمویست بیانڵێم و بەم دەرەنجامە بگەم کە ئێمە لەم ئاشنابوونانەدا دەتوانین زیاتر لە رەوشت و بۆچوونی شاعیرەکان بگەین. بۆ وێنە بزانین کە بۆچوونی ئەم دوو کەسە سەبارەت بەشاعیرانی تر وەکوو ئاتەشی یان سپانلوو، یان خوالێخۆشبوو «نەیستانی» و کەسانی تر چ بووە کە هەڵبەت من دەزانم و چونکە ئێستا کاتی ئەم باسکردنە نییەو لەکاتێکی تردا لەسەری دەدوێم. باسی سەرەکی ئێمە لێرەدا شاملوو شیعرەکانی ئەوە. بەسەرنج دان بەو ئاماژەیە باباچاهی سەبارەت شاملوو و هەروەها «هەوای تازە»، بەبوێرییەوە دەڵێم لە بارەی شیعر و زمان و فەزای شیعرییەوە هیچ کتێبێک وەکوو «هەوای تازە» شاملوو، ئازایەتی ئەداویەتێ و دوای ئەوەش لە خودی شاملووش وەکو شاعیرێک و هەروەها شیعرە سەرکەوتووەکانی، لە روانگەی «بنەما»و رواڵەت و... زۆر شتی وردی تر فێربووین. ئێستا بەسەرنجدان بەم هەموو پێشەکیانە کاتی ئەوە هاتووە کە بگەڕێمەوە سەر ئەو دو خاڵەی کە لەسەرەتادا ئاماژەی پێکراو بڵێم بەپێچەوانەی بۆچوونەکان، پێم وایە شاملوو بە «هەوای تازە» لە دەیەی سیدا وەکوو شاعیرێکی پێشەنگ خۆی ناساند و هەڵبەت ئەم ناساندنە وەکوو نوسەرێکی شیعری نەسر-ی وایە نەک وەکوو نووسەری شیعری سپی. لە روانگەی من دا شیعری سپی لەگەڵ شیعری نەسر-ی جیاوازە. شاملوو لە دەیەی پەنجا دا وادیارە بەنووسینی شیعری «ئیبراهیم لە ئاوردا» دەسەڵاتی خۆی لە شیعری سپی نیشاندا. ئێستا وادیارە سەپانلوو دەیەوێ قسە بکا.

**- مەجابی:**

من دەمویست سەبارەت بە شاملوو بدوێم.

**- سپانلوو**

من سەبارەت بەم پێشەنگ بوونە دوور ستەم هەیە، نەک بەبۆنەی دوور ستە سی رستە قسە بکەم.

باسەکەی من سەبارەت بەپێشەنگ بوون و شاعیری میللی بوونە. پێشەنگ بوون هەر لەخۆیەوە تایبەتمەندی نییە. تەنیا دەمویست باسی ئەم جیاوازیە بکەم.

**- باباچاهی:**

ئەمەی کە باستان کرد دژی وتەی من نییە.

**- ئاتەشی:**

منیش دەمویست بڵێم کە ئەگەر لەسەر کاریگەر بوونی شیعری شاملوو لەسەر زەینی روناکبیری، دوام مەبەست تاک و تەنیا بوونی شیعری شاملوو نەبوو، بەپێچەوانە یەکێک لە قسەکانی من ئەوەبوو کە بەمجۆرەی بەڕێزان گوتیان و ئێوەش ئاماژەتان پێکرد کاتێ کە نیماو شاملوو لە پەنای یەکتری دادەنێین لەبەر ئەمەیە کە ئێمە باوەڕمان بەوە کردووە کە لە موتالا نوێییەکانماندا شیعر ئەگەر چوارچێوەی بۆ دابنێ شیعرێکە کە چەندین ساڵ بخوێندرێتەوە و بۆ جارێکی تر شتی تێدا بدۆزرێتەوە و لە شیعری رووت - دا هیچ شتێک بەدی ناکرێ. بۆ وێنە بەبۆچوونی من نیما هێشتا گەورەترین شاعیری سەردەمە هێشتا شتی بۆ دۆزینەوە پێیە کە بەڕاستی وە دوای ئەکەوتووین و لاوەکانیش کە بێ تاقەتن و ناخوێننەوە تێناگەن و بەزمانی نیما نازانن. یانی چونکە بەناخی نیما نەگەیشتوون دەم و

ـست دەڕۆن و ڕێیەکی تر دەگرنە پێش ـە تو ناییەکەیان لە دەست دەدا. من ـەویست ئاوا بڵێم مەبەستی من تاک ـەیکردنی شاملوو شیعرەکەی نەبوو جـگە بەبۆچوونی من شیعری شاملوو ـموی ناکرێ. شیعری شاملوو هەر ـەیە کە هەیە. کاتێ کە شیعرەکانی ـخوێنینەوە شتێکی تر نادۆزینەوە. لە ـێت شیعرەکەیدا شتێکی تر نابینێ. ـۆیە بۆ من سەبارەت بەماموستای ـەڕێزم دوو شتم بۆ دێنە پێشێ، یەکیان ـەوەیە کە ئەو هەرچەند بەزمانی تایبەت ـەخۆی دەگا (بۆ وێنە ڕیتوریک، ـەسەرەی بەیهەقی، یان عەتیقی ـەیشابووری) و ئەم زمانە بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ و خۆیْ بەشاعیرێکی جیاواز لەوانی تر دادەنێ بەڵام ئەمەودای ئەدەبیاتی کلاسیکی ئێمەدا کە شاملووی تێدایە بێجگە لە خوێندنەوەی شیعری حافز یان خوێندنەوەی شیعری مەولانا، هیچ سەرنجێکی قووڵمان لەسەر ئەدەبیاتی کلاسیکی خۆمان نەدی. یان ئەمەی کە باسم کرد گرفتێکە کە تووشی شاملوو بووە. لە وتووێژێکدا کە لەگەڵم کراو خۆشحاڵم کە بڵاونەکراوە بەڵام لێرەدا باسی دەکەم. کاتێ کە بەڕێز حەریری لەگەڵ شاملوو گفتوگۆ دەکا شاملوو لە جێیەکدا دەڵێ: کە بەدوای چوارچێوەی شیعر دا دەگەڕێ، پرسیاری حەریری ئەوەیە کە شیعر چییە؟ پێش هەموو شتێک هەرکەس بێ دەڵێ: کە شیعر چوارچێوەیەکی تایبەتی نییەو فلان و فلان و کەسێکی تر بەلایەکی تردا دەڕوا. شاملوو دەڵێ کە شەمسی قەیسی رازی و لادەنێین، دواتر دەگاتە ئەو جێیەی کە دەڵێ: «شیعر وتەیەکە کە بەبێ کەڵک وەرگرتن لە هیچ پێوانەیەک شوێن لەسەر عاتیفە دادەنێ. ئەمە پێناسەو چوارچێوەی شیعرە». ئێمە وابیردەکەینەوە کە بەڕێز شاملوو ئەمەی دۆزیوەتەوە، منیش لە وتووێژەکەی ترم داگوتم کە ئەگەر ماموستای ئازیزمان تەواوی کتێبی - المعجم - ی دەخوێندەوە لە ڕستەیەک دا باسی شیعری نەدەکرد کە لە کتێبە دەرسیەکاندا بەنێوی «شەمسی قەیس» هاتووە: شیعر وتەیەکی کێش دارو خاوەنی سەرواو.. و فلانە و تا دەگاتە ئەو جێیەی کە دەڵێ فلان - بن سام بن نوح - نێوێک کە من ئێستا لە بیرم چۆتەوە، ڕۆژێک دێتە کۆبوونەوەیەک و شتێکی خوێندنەوە کە هەموو کەس سەرسووڕماو دەکا. گوتیان کە ئەمەت لەکوێ هێناوە؟ گوتی بۆ خۆشم نازانم، بۆم هات. یانی لێرەدا هەر ئەو مانایەی کە بەڕێز شاملوو پێی دەڵێ وتەیەک بەبێ کەڵک وەرگرتن لەهیچ پێوانەیەک، پێناسەی «شەمسی قەیسی رازی»یشە یانی من ئەم گرفتەم بوو کە دەبێتە هۆی ئەوە کە شاملوو ئەم قسانە بکا یان ئوستوورەی بۆ وێنە لەگەڵ مێژوو لێ تێک بچێ و نەتوانێ جیاوازیان بۆ دابنێ. هەڵبەت بەئەنقەست وای نەکردووە کە شیعری رابووردوو ڕەش بکاتەوە بەڵام هەر ئەو جۆرەی کە بەشێک لە دۆستان گوتیان، وادیارە بەڕێز سپانلوو-ش هەر وای گوت کە شاملوو یان سەرنج ناداتە رابوردوو یان سەرنج ناداتە گەورەکانی وڵاتی ئێمە. بۆ وێنە ئێمە تەنیا «حافز» و «سەعدی» مان نییە ئێمە «سەنایی» مان هەیە کە ئەگەر قەسیدە باشەکانی بخوێننەوە ئێستاش نوقمی سەرسوڕمان دەبن. ئێستاش شیعرەکانی قووڵ دیارە. بۆیە من دەمویست باسی ئەم دوو خاڵە بکەم. لە هەمانکاتدا ئێمە شاملوو بەماموستای خۆمان دەزانین و ئەو شاعیری وڵاتی ئێمەیە بەو مانایەش کە دۆستان پێی دەڵێن شاعیری میللی. ئەم مانایە لەگەڵ مانا کلاسیکیەکەی زۆر جیاوازە. لەسەردەمی پێشوودا پاشاکان شاعیری میللی - یان دەناساند بەڵام ئێستا خەڵک بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن. بەو مانایەی کە شاملوو بەخەڵک و خەڵک لایەنگری شاملوون، عاشقی ئەون، ئەو شاعیرێکی میللییە. شاملوو لە شیعری وڵاتانی تر تەنیا سەرنج دەداتە دو سێ کەس یەکیان «لۆرکا»یەو ئەوان تر «پۆل ئێلوار» و مایاکۆفسکی ئیتر من نازانم و ئێوە ڕەنگە وەبیرتان بێتەوە. ئەو دوو سێ شاعیرەی کە شاملوو باسیان دەکا خۆشەویستی ئەو بوون و ئیتر هیچکات نەماندیوە کە باسی ئەلیوت بکا.

**- سپانلوو:**

لەشوێنێکدا شاملوو ئیلهامی لە ئەلیوت وەرگرتووە بەڵام زۆر لاوازتر لەو نوسیویەتی. ئەلیوت دەڵێ: «شەوی زستان لەگەڵ بوونی - بیفتێک - بەنێو کۆڵانەکاندا تێپەڕ دەبێ». شاملوو

دەڵێ: «بۆنی برسێتی لە کوڵانەکاندا» یانی لە بەیانی ئەیلوت نەگەیشتووەو ئەو حاڵەتەی کردۆتە دروشمێکی کۆمەڵایەتی.

**- حقووقی:**

شاملوو لە هێلی زەینی ئەلیوت دانیە کە...

**- ئاتەشی:**

بڕیار وابوو کاتێ کە ئێمە باسی شاعیرێک بکەین سەرجەم تایبەتمەندییەکانی بخەینەڕوو، ئەگەر وانەبێ ئەمەش بۆخۆی گرفتێکە.

**- باباچاهی:**

بەڕێز مەجابی! ببوورە من وابیر دەکەمەوە دەبێ لە باسەکانمان سەبارەت بەشاملوو جیاوازی بیروڕا هەبێ، نەک ئەوەی کە باسی شتێک بۆ وێنە زمانی شیعری شاملوو بکەین!

**- مەجابی:**

من دەمویست سەبارەت زمانی شاملوو قسە بکەم. کاتێ هەوای تازە لەژێر چاپ هاتە دەرێ چەند جۆرە زمان لەگەڵ کێش پێوەندی دەبێ. جارێکی تر ئەم زمانە بەبێ یارمەتی وەرگرتن لە کێش دێتە ئاراوە... سەرجەم سێ جۆرە زمان لە «هەوای تازە» دایە کە شاملوو وردە وردە لەڕێگای نەسری تەوڕات - یەوە بەرەو نەسری سەدەی پێنج و شەش دەڕوا و بەزمانێکی مەزن دەگا کە زیاتر ئەدەبی بوونی تێدا دەدرەوشێتەوە تاکوو شیعری بوون. ئەوە سەیرە کە ئەم زمانە بێجگە لە شاملوو بەکەڵکی کەسێکی تر نایە یانی شاملوو بەهۆی هەستی کەم وێنەی شاعیریەکەیەوە توانیویەتی ئەم زمانە شیعرییە دەستەمۆ بکا. زمانێک کە لە نەسر وەرگیراوە، لە خزمەت خەیاڵ دانراوە تاکوو قسەی پێ بکاو تارادەیەکیش توانیویەتی قسەی پێبکا. لەڕاستیدا شیعری شاملوویی خولقاندووە کە لایەنگرانی لەلاسایی کردنەوەی ئەم زمانەو شیعرگوتن بەو شێوە بەیانە شکستیان خواردووە. چونکە ڕواڵەتی ئەم زمانە بۆ نووسینی شیعری ئەمڕۆ زۆر باش نییە. ڕەنگە ئەو زمانەی کە «فروغ» دواتر پێی گەیشت بەکەڵکی شیعری ئەمڕۆ بێ یانی زمانی ڕۆژانە و زیاتر لە هەموویان «نوسرەت ڕەحمانی» بەم زمانە شیعری نووسی و ئەو لەو کەسانەیە کە ئەم زمانەی دۆزیوەتەوە. ڕەنگە هونەری شاملوو لەوە دابوو کە توانی بە دەسەڵاتی خۆی لەسەر فەرهەنگی فارسی ئەم زمانە دەستەمۆ بکا کە لەسەر مۆسیقایەکی بێ وێنە دانراوە، ئەو زیاترین کەڵکی لەم زمانە وەرگرت و تایبەتیی کرد. لە هەمانکاتدا وای لەو زمانە کرد کەکەس نەتوانێ لاسای بکاتەوە. ڕەنگە بتوانین بڵێین کە شاملوو لە شیعری شاملوویی دا تواوەتەوە. و ئیتر شیعری شاملوویی لەوە زیاتر بەکامڵی ناگاو ئەمەش بنەمای ئەو خۆڕاگرییە کە شاعیر لە دەورانێکدا ئەزموونی کردووە، یانی ژیان و هەڵشکان و داکشانی سیاسی و فەرهەنگی و حکوومەت و شۆڕش و ئاڵوگۆڕیی لە ئێران و جیهاندا هەروەها ڕەنگدانەوەی ئەمانەی لەسەر بنەمای شیعری ئەزموون کردبوو. ئەم جۆرە شیعرە لە ڕوانگەی زمان و بەیان و لە ڕوانگەی پێکهێنانی فەزاو بنەماوەی بەرادەی کامڵی گەیشت و شاملوو لە ژیانی دا کامڵی ئەمجۆرە شیعرەی دیت و بۆ خۆی زۆرجاران دەیگووت: «بۆچی مرۆڤ لاسای شیعری من دەکاتەوە؟ ئێمە کە پێویستمان بەدوو شاملوو نییە من هەر بۆ خۆم و خەریکی کاری خۆمم». لەحاڵێکدا بەشێک لە زمانەکان هەن وەکو زمانی فرووغ کە هێشتا توانای ئەوەی هەیە درێژەی پێبدرێ یان زمانی شاعیرانی تر، تەنانەت زمانی «ئەخەوان» بەچەند هۆ بۆ درێژەدان نابێ، یەکیان ئەوەیە کە ئەو دەسەڵاتێکی تایبەتی بەسەر ئەدەبیاتی کلاسیکدا هەبوو. تا ئەو ڕادەیەش بەو زمانە قسەی دژواری دەکرد. هەڵبەت ئەم باسەی من سەبارەت بەشاعیران بەجۆرێک گشتبینانەیە. زمانی هەر کەسێک پێوەندی هەیە بەزەین و بەیانی تایبەتی خۆیەوە. هەرچەند شاعیرێکمان هەبێ ئەوەندەشمان کارکردی زمانی هەیە. بەڵام لێرەداو ئێستا جێگای باسی تەکنیکی نییە. بەڵێ بەبۆچوونی من ئەمەی کە کامڵی شیعری شاملووی پێدەگوترێ زۆر گرینگە کە لەنێو پەرانتێزێکی گەورەدا کەسێک دێ و لەسەردەمی خۆیدا دنیایەک دەست پێدەکا کۆتایی بەو سەردەمی خۆی دێنێ ئەم شیعرانە بەرادەی ژیانی شاعیر و سەردەمی شاعیر و ژیانی میللی ئێمە مانایان هەیە.

لە کەنار زمان و بەیان و ژیانی شاملوودا باسی حاڵێک دەکەم. دەزانین ئەو زۆر شەیدای حافز بووە و هەموو

ـت رەخنەی لە سەعدی دەگرت و دەیگووت: «گەورە پیاوی بچووک» ـیستی لە سەعدی دەکرد. ئەمە جیاوازی گوتنێکی نامۆیە کە ـەپێچەوانەی بۆچوونی خۆی و ـەیردکانیەتی سەبارەت بەسەعدی. ـەبۆچوونی من شاملوو زۆر لە سەعدی دەچوو.

**– حقووقی:**

لە فیردەوسی -ش دەچوو. تەنانەت زمانی فارسیی شیعری شاملوو (نەک زمانی شیعری) زمانی سەعدی و فیردەوسییە.

**– مەجابی:**

شاملوو لە بواری زماندا وەدوای زمانی بێ گرێی سەعدی دەکەوت. تێگەیشتنەکانی ئەو سەبارەت بەعەشقی زەینی زیاتر بەسەعدی نزیکە، سەعدی بۆ رێکوپێکردنی ژیان خۆشەویستیە ماددی – کە لە جۆرێک حیکمەت دایە – یەکانی دەهێنا ئاراوە. بەمانایەکی تر شاملوو بەدوای هاوتا کردنێکی ئەخلاقی و هەروەها بەدوای جۆرێک رێنوێنێ جەماوەر، یان رێبەربوون بوو. لەراستیدا عەشقی لاهوتی حافزو بەیانی حافز لە شیعری شاملوودا نابینین.

**– حقووقی:**

بەڵێ من گوتم لە شیعرە ئەدیبانەکانی شاملوودا رەگێک لە زمانی سەعدی و فیردەوسی دەبیندرێ. ئێوە کە زمانی شاملوو دەناسن، بۆ وێنە سەرنج بدەنە ئەم دوو بەیتەی فیردەوسی:

**لە مەیدانی شەڕدا هەژێنێ شەماڵ**
**پژێنی تکەی خوێن لە هەورانی تاڵ**
**چەمێنی سپی ئەسپ لە چەرخ و گەڕا**
**لەوەڕ پێدەرێ داڵ لە جەنگەی شەڕا**

**– مەجابی:**

رەنگە کردەوەی توندوتیژی شاملوو لە بەرامبەر سەعدی دا حاشاکردنی منداڵێک بێ لە باوکی کە زۆر لەو دەچوو بۆ وێنە لە عەشقدا، لە زمان، لە ژیان.

**– حقووقی:**

من ئەوەش بە وتەکانت زیاد دەکەم. من شتێکم بەشاملوو گوت، ئەویش راستەوخۆ پێوەندی بەفیردەوسییەوە بوو. یانی ئەو فیردەوسی بەشاعیرێکی مەزن دانەدەنا. یەکێک لەو هۆیانە بۆ شاملوو ئەوەبوو کە فیردەوسی · نظم-نووس بوو و زۆرجاران ئەم بەیتەی دەکردە شاهیدی قسەکانی:

**چەقاندنی چەپ و راستی نووشتاندەوە**
**خولی چەرخی چاچی – ی خورۆشاندەوە**

هۆیەکەی تر ئەمەیە کە بەچاوێکی مارکسیستیەوە لە فیردەوسی دەڕوانی. بۆ وێنە چونکە فیردەوسی لە چینی وەرزێڕ یان باشتر بڵێم لە فیودالەکان بوو. لە زەحاکێکە کە بەدژی جەمشید هەستاو خراپەی گووت. هەڵبەت ئەمەش وتەی شاملوو نییە، لە پێشدا لەلایەن «زەبیح اللا بێهروزە»وە هاتە ئاراوە، دواتریش دکتۆر «حسووری» ئەمەی گوت و شاملوو ئەم وتەیەی لە «حسووری» بیستبوو. سەبارەت بەم دوو بابەتە من لەگەڵ شاملوو باسم کرد. بەتایبەت لە بارەی شاعیر بوونی فیردەوسی و جیاوازی نوستوورە لەگەڵ مێژوو، هەروەها زمانی فیردەوسی کە دەبووە هۆی ئەوە کە شاملوو ئەو بە – نظم – نوسێک بناسێ. من بەشاملووم گوت: ئەگەر تۆ فیردەوسی بە -نظم-نووسێک دابنێی لەم دیدەوە تۆ بۆ خۆشت دەبیە – نظم – نوسێک، چونکە کاری تۆش جارجارە بەتایبەتی لەسەر زمانەو هەمووکات لەگەڵ گەوهەری شیعری نییە. کاتێ تۆ ئەمە دەڵێی زمانی هەڵبژاردەی خۆشت دەکەوێتە ژێر رەهێڵەی پرسیارەوە. چونکە زمانی شیعری تۆ و تەنانەت زمانی شیعرەکەت پێش ئەوەی کە بەمەولانا و حافز نزیک بێ بەفیردەوسی و سەعدی نزیکترە. ئەم سێ بابەتە یانی ئارکائیک و زمانی باوی سەردەم بنەمای زمانی شیعری تۆیە هەمان زمانی شیعری سەعدیە کە بەگۆشەیەکی چاو دەڕوانێتە زمانی خۆراسانی.

**– مەجابی:**

بێجگە لەوە روانینی سەعدی -ش لەکاری شاملوودا دەبیندرێ، ئەویش ئەمەیە کە نیگەرانیی مرۆڤێکی بە ئەزموون بۆ رێکوپێککردنی جیهان.

**– باباچاهی:**

بەڕێز مەجابی ئاماژەیەکی بە. هەوای تازە کرد کە منیش لە پێشدا ئەم باسەم کرد. بەشێوەیەکی بوون و ئاشکرا دەڵێم کە ئەو سەردتابوونی عاتفییە و هێنانە گۆڕێی پێشنیارە جۆراوجۆرەکان

که له هەوای تازەدا هەیە لە کتێبێکی تر بۆ وێنە لە «باغی ئاوێنە»دا و من تەنیا لە «هەوای تازە» چێژ وەردەگرم. ئێستا رەنگە ئەمە لە لێکۆڵینەوەیەکی هونەریدا بەتەواوی هەڵەبێ بەڵام من هەستی خۆم دەگێڕمەوە. ئێمە دەبینین کە لە نێو بەشێک لە شیعرە کێش دارەکانی «هەوای تازە»دا کە زۆرجار شیعرەکە تەسویری - شە بۆ شاعیر ج کۆسپێکی نەرم و نیان دێتە سەر رێگای ئاهەنگی رواڵەتیی شیعرەکە. هەڵبەت ئەمە لە بێ ئەزموونی شاملوو نییە. ئێستا من ئەم شیعرە دەخوێنمەوە.

**لە سوورایی رۆژئاوادا دوو کیژ بوون**
**لە کوێرە رێی رۆژهەڵاتەوە هاتنە لام**
**سێ گۆنای سوور هەڵگەراویان**
**تروسکە بوو**
**لە قوڵایی بێ کۆتایی شەودا**
**سەمای زوهرە چاویان بوو**
**وڵاتی رۆژئاوا خەڵاتیان بوو**

لە چەند شوێنێکی ئەم شیعرەدا دەبینین کە کێش خۆی نیشان دەدا، لە منیش زایەڵەیەکی سروشتی هەیە. بەڵام بەرچاونییە - یانی ئەو دیاردەیەی کە لەحنی مەزنی شاملوو دایە - لە جێیەکی تر دا دەبینین کە لەحن زۆر توورەیەو لە رواڵەتدا هیچ پێوەندی بەتێگەیشتنێکی ئاسایی لە ناساندنی شیعرەکەی نییەو بەیانێکی دژی هەیە. یانی توند و تیژی بەجێگایەک دەگا کە دەڵێن ئەوە شیعر نییە.

لەلایەکی ترەوە ئێمە لە «هەوای تازە»دا لەگەڵ - مصراع-ی دوورودرێژ رووبەروو دەبینەوە. ئێمە دەبوایە پێداچوونەوەمان هەبوایە، یانی لە کوێوە فەرمان دراوە کە دەبێ رستە کورت و پڕ ماناکان بچنە نێو دوو دێڕی درێژەوە؟

بۆ وێنە لاپەڕێک کە لە دێڕێکدا کورت دەکرێتەوە- ایجازی تایبەت بەخۆی هەیە. ئەمە شتێکی پێشنیارکراوە بەڵام پێم وایە کە بەلایدا تێپەڕبووین هەر بەو شێوەیەی کە بەخێرایی بەلای زۆربەی باسەکاندا تێپەڕبوون. بە وتەی فرووغ نابێ تەواوی شیعرەکان بۆنی عەتر بدەن. لەنێو «هەوای تازە»ش لەم چەشنە شیعرانەمان هەیە «شیعرێکی مۆن و توورە کە ئەمە بۆخۆی زۆرجێی سەرنجە! بەرای من ئەم جۆرە توورە نوسیە ئامۆژگاری و رێنوێنی پێیە:

**دستە قورسەکانم بەسندانی سەرم دادا**
**وەکوو خودایەکی بەرزی زنجیر ناڵاندم**
**هاوارەکانم بە دەکەی پڕ ئەسپێی ئیمام**
**زادەی کلاسیزم دادا**
**کەچی مەرێکی - مسمط - م قوربانی**
**نەکرد..**

**- حقووقی:**

ئێستا رای من ئەوەیە کە گشت باسەکانی ئێمە تازە بۆتە پێشەکیەک لەسەر شاملوو ناسی. ئێوە سەبارەت بەفیل ناسی کە دەزانن؟ تاقمێک کە هەر کامیان خەڵکی وڵاتێک بوون پێیان سپێردرا کە لەسەر فیل لێکۆڵینەوە بکەن. ئەوان دەبوو بچن بۆ ئەفریقا و ئاکامی کارەکەیان بەشێوەی نامیلکەیان کتێب پێشکەشی ئاکادیمی ژێرچاوەدێر بکەن. ئەوان چوون بۆ ئەفریقاو دوای چەند رۆژ کارکردن، یەکێیان کە ئێران بوو دەگەڕێتەوەو چوارپێنج لاپەڕەی سەبارەت بەفیل نووسی بوو کە فیل گەورەترین گیانلەبەری سەرزەوییەو.. دوای چەند رۆژی تر پاکستانیەک گەڕاوەو دە دوازدە لاپەڕەی بۆ وێنە ئاوا نووسیبوو فیل عاجی هەیە، گژوگیا دەخواو... دوای مانگێکی تر یۆنانیەک گەڕاوە و سەد لاپەڕەی نووسیبوو، دواتر ئەمریکاییەک بەپێنج سەد لاپەڕەو دواتر ئینگلیزییەک بەهەزار لاپەڕە نووسینەوە دەگەڕێتەوە... ماوەیەکی زۆری پێچوو. دیتیان کە تەنیا ئەڵمانیەکە نەگەڕاوەتەوە. دوای تێپەڕینی چەندین مانگ بوورن چەندین ساڵ گەڕاوە کە قژی سپی ببوو بەڵام کۆگێک یان باشترە بڵێم سەدان لاپەڕەی لێکۆڵینەوەی پێ بوو. لاپەڕەکانیان لێوەرگرت و بەرگی یەکەم لە کتێبی سەد بەرگیەکەی نێو نابوو: «پێشەکیەک سەبارەت بەفیل ناسی».


**سەرچاوە:**

١- نامەی ادبی، فرهنگی، هنری نافە - سال اول، شمارەی ٣و٤ . مردادو شهریور ١٣٧٦ .

**2- Modern short stories Edited by Guy N. Pocock M.A.p.p:57-67.**

# لایەنی بەرامبەر قبوڵمان ناکات

چاو خاوەنی قەڵەمێکی بە بڕشت و وەرگێڕێکی کارامەیە، رەخنەگرێکی هاوچەرخ و هەڵگری بیروبۆچوونێکی نوێخوازییانە. هەتا ئەمناسی لەزەینی خۆم و لەڕێی وتارو لێکۆڵینەوەو بابەتە بڵاوکراوەکانی لە گۆڤارو رۆژنامەکانی ئەمدیو و ئەودیودا، وای بۆ دەچووم مرۆڤێکی بەتەمەن گەورەو چووبێتە ئێوساڵەوە!

هەر لەدوای ئەو یەکترناسینەوە، رۆژبەرۆژ لێکتر نزیک بوونەوەمان زیاتر دەبوو، گفتوگۆو هاتوچۆی ئێوارەی سەر شەقام، هاموشۆکردنی ئەنجومەنی ئەدەبی و کۆمەڵی فەرهەنگی و فێرکاری سۆما، دۆستایەتی و هاوڕێیەتی قووڵتر کردینەوە تا وای لێهات بەیەکەوە لە کۆڕێکی رەخنەو هەڵسەنگاندنی بەرهەمی چیرۆکنووسێکی دیاری ئەم شارە بەشدارین و توانیمان بیروڕای تایبەتی خۆمان کە تا رادەیەک لە یەکدی نزیک بوون لەسەر ئەو بەرهەمە دەرببڕین.

رۆژانی دوایی بەهاری ساڵی ١٣٨٣ بوو، میوانداری کردین، ئەمە ژوورێکی خنجیلانەو کورسی و مێزێکی بچکۆلانەیە، پەنجەرەی ژوورەکە بەسەر جادەی دەرەوەدا دەڕوانێ لە هەمووی بەرچاوتر کتێبخانەیەکی پڕ لەگۆڤارو کتێبی کوردی، فارسی، ئینگلیسی خۆی بەهەرکەسێک دەناسێنێ، کە لێی نزیک دەبێتەوە، ئەم مرۆڤە دڵ پڕ لە بریایە (کاک عەبدولخالیق یەعقوبی)یە کە خاوەنی کتێبی:،رەخنەی ئەدەبی و قوتابخانەکانی، وەرگێڕدراوە لەزمانی ئینگلسی (چارلز برێسلێر)ە، کە دەزگای ئاراس ساڵی ٢٠٠٣ لەهەولێر چاپ و بڵاوی کردۆتەوە، هەروەها دوو کتێبیشی ئامادەو لەژێر چاپدایە بەناوەکانی ،دەنگی بلووریتی دەق،، کە بریتییە لە کۆمەڵێک وتاری هەڵبژاردەی خۆی لەبواری رەخنەی ئەدەبی، ،رێبازی دیکتاتۆرەکان، کە رۆمانێکی رۆماننووسی ئینیتیسیا سیلۆنییە، کە لەفارسییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. ئێستاش دەقی شانۆیی(مکبث)ی ولیام شکسپیری بەدەستەوەیە کە هەر لەزمانی ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، ئەمە جگە لەو وتارو لێکۆڵینەوەو وەرگێڕدراوانەی کە لەگۆڤارەکانی باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستان و بڵاو کردۆتەوەو دەکاتەوە. خوێنەری هێژا بابە بەیەکەوە بچینە جیهانی پڕ پرسیارو وەڵامەکانی ئەم دیمانەیەو بیخوێنینەوە:-



عەبدولخالق یەعقوبی

*** هۆکارەکانی قەیرانی فیکری ئەمڕۆی ئێمە لە چیدا بەرجەستە دەبێ؟ ئێمە وەک نەتەوەیەکی بێکیان و بێ دەسەڵاتی سیاسی (دەوڵەت) چ هەنگاوێک دەبێ بنێین لە پێناو:**

**١- بەدەستهێنانی مەوجوودییەتی نەتەوەیی لە رێگای کەلتوور، سەفەری مێژوویی.**

**٢- قەناعەت پێهێنانی لایەنی بەرامبەر بەوەی کە منی کوردیش هەڵگری فیکرەیەکی جیهان بینیم.**

**٣- توانایی حکومەتکردن کە خۆی**

**لە (قانوون، ئیدارەکردن، ئابووری، جوگرافیا.... هتد) دەنوێنێ.**

– من پێموایە ئەو قەیرانەی لە فیکرو جیهان بینی ئێمەدا دەبینرێ ڕەنگدانەوەیەکە لەو قەیرانەی کە لە شوناسی سیاسی و لە شوناسی ئێمە وەک مرۆڤێکی بێدەسەڵاتدا لە ئارادایە، ئەو قەیرانە شتێک نییە کە لە بۆشاییەکەوە سەری هەڵدابێ، بەڵکو هۆکارەکانی دەگەڕێتەوە سەر ئەو بارودۆخەی کە ئێمە وەک مرۆڤی کورد تێیدا دەژین، بارودۆخێک تێیدا لە دەسەڵاتێکی سیاسی خۆماڵی بێبەشین، قەیرانێک یاخود بابڵێین بارودۆخێک کەتێیدا لەدەسەڵاتێکی ئابووری و لەسەرچاوەکانی ئابووری بۆ دەستەبەرکردنی نیازەکانی نەتەوەیی خۆمان بێ بەشین، ئەوانە هەموو کۆمەڵێک بارودۆخن کە دواجار بوونەتە ئەو قەیرانەی کە ئێمە ئێستا تێیدا دەژین، ئەدەبەکەمان هونەرەکەمان تەنانەت هەڵسوکەوتی ڕۆژانەمان سەرچاوە گرتوو لەو قەیرانانەیە، بۆیە من پێموایە مرۆڤی کورد ژیانێکی تایبەت دەژی بۆ نموونە لە کوردستان ئێمە کاتێک ڕۆژانە بەزمانی کوردی ئەدوێین، بەڵام لەکاتی وانەخوێندن و وانەگوتندا، کاتێک لە کاروباری ئیداریدا، کاتێک لە ئاستی پەیوەندیدا ناتوانین ئەو زمانەی کە زمانی زگماکی خۆمانە بەکاری بێنین، واتە دەبێ قەیرانێک لە وجودی ئێمەدا بەدی بێت، قەیرانێک، کە هەمیشە ئێمە کوت کوت دەکات هەمیشە ئێمە دابەش دەکات بەسەر دەیان جۆربوونەوە. بوونێکمان دەبێ لەگەڵ ماڵ و بنەماڵە بێت، بوونێکمان دەبێ لەگەڵ ئیدارە بێت، بوونێکمان دەبێ لەگەڵ ژیانێک بۆ دەستەبەرکردنی ئابووری بێت بۆ زۆربوونی دیکە، کە هەر بوونێک و شوناسێکی دەوێ، هەر بوونێک قەوارەیەکی تایبەتی دەوێ ئەوانە هەموو ئەو هۆکارانەن کە ئاماژەم پێکردن، بەڵام ئەو شتانەی جەنابت ئاماژەت پێکردن دەبێ ئێمە لە پێناو وەدەست هێنانی ئەو مەبەستانە چی بکەین؟ ئەوەی ڕاستی بێت بەدەستهێنانی مەوجوودییەتێکی نەتەوەیی بەو مانایەی کە ئێمە بمانەوێ وەک نەتەوە لە جیهاندا بناسرێین دیارە بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ سەر دەسەڵاتی سیاسی، ئەگەر ورد لە مەسەلەکە بڕوانین دەبینین بەهۆی پارچە پارچەبوونی کوردستان بەهۆی بارودۆخە جۆراوجۆرە جیاوازەکانی بەشەکانی کوردستان ئەو شتە تائێستا بەندبووە بەهەڵکەوتنی دۆخێکی تایبەت لە ناوچەکە، تائێستا تەنها بۆ باشووری کوردستان ئەو دۆخە هەڵکەوتووەو ئێمە دەشێ چاوەڕێی وەها دۆخێک بین، کە لە بارەی قەوارەیەکی سیاسییەوە دواجار بتوانین مەوجوودییەتی نەتەوەیی خۆمان هەبێت، بەڵام ئەگەر سیاسییەکە پابەندی شتێک بەدەر لە ئیرادەی خۆمانە وەک نەتەوە، وەک گەل، بەڵام ئەگەر بمانەوێ ئەو مەوجوودییەتە نەتەوایەتییە لە ڕێگای کەلتوورو لە ڕێگای مێژووەوە دەستەبەر بکەین ئەمە زیاتر پەیوەندی بەئیرادەی خۆمان وەک کورد هەیە، تا ئەو ڕۆژەی ئێمە وەک کورد کەلتووری تایبەت بەخۆمان بپارێزین، کەلتووری تایبەت بەخۆمان بخوڵقێنین و لە هەمان کاتیشدا ئەو کەلتوورە بەجیهان نیشان بدەین و بینوێنین و قەناعەت بەجیهان بێنین، کە ئێمە خاوەنی ئەو کەلتوورە تایبەتییەین، ئێمە خاوەنی ئەو فەرهەنگ و هەڵسوکەوتە فەرهەنگییەین، دیارە وەک نەتەوەیەکی بێ دەسەڵات وەک نەتەوەیەکی بێ قەوارەی سیاسی بوونمان هەیە، لە هەمان کاتیشدا ئەگەر لە ڕێگای بەڵگەی مێژووییەوە کە ئێستا دیارە

**بەدەستهێنانی مەوجوودیەتێکی نەتەوەیی بەو مانایەی کە ئێمە بمانەوێ وەک نەتەوە لە جیهاندا بناسرێین دیارە بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ سەر دەسەڵاتی سیاسی.**

ـ ـێ مێژوویش زۆر کەم کراوە لە نێو حـمـێتی ئێمەدا، ئەوەش هەر ڕێگایەکی ـ ـ ـۆ سـەلماندنی مـەوجـوودییـەتی ـمـەر یەتی خـۆمـان، بەڵام وەک وتم ـ حـ ـ تەواوی ئەو هۆکـارانە دەتوانن ـست بدەنە دەسـتـی یەکـتـری و ئەو ـەرجوودیەتە بسەلمێنن.

ـمـەر دووهەمین کـێـشـەیەک کـە حـــــەتابت وروژاندت، واتـە ئـەوەی ـمبەلایەنی بەرامبـەری خۆمـان یاخود ـوـتری خۆمان بسەلمێنین، کە ئێمەش حـودنی جیـهان بینییـەکین لەراسـتیـدا ـێـشـەکـە زۆر پڕ پێچ و پەنایە، واتە ـتەکە دوولایەنی لێدەبێتەوە لایەنێک ـەوەیە کـە ئێـمـە نەتوانین قـەناعـەت ـەلایەنی بەرامبـەرمان بێنین، کە ئێمە خاوەنی جیـهان بینینیەکین. لایەنێکی مـەسـەلەکـە ئەوەیە ئێـمـە بتـوانین قـەناعـەتی پێ بێنین، کـە ئێـمـەش جیـهـانی بینی خۆمـان هەیە، بەڵام ئەو لایـەنەی تـر هـەر لە بنـەڕەتەوە باوەڕی بەوە نەبێت، کە ئێمـە بوونێکمـان هەیە یا ئێمـە کەسێکی ترین یا ئەسڵەن لە بنەڕەتەوە حاشـا لە بوونی ئێـمـە بکەن ئەوە دوو شتی جیاوازە لەراستیدا کورد تائێسـتـا کـەم و زۆر توانیـویەتی خۆی وەک بوونەوەرێک یـا وەک نـەتەوەیەک لە جیـهـاندا بسـەلمێنێ، بەڵام بەراستی قـــــــە لـەوەدایە تـا ئەو لایـەنەی بەرامبەرمان یا ئەوی دیکە ویستوویەتی ئەو شـتـەی کـە ئێـمـە سـەلماندوومـانەو لەراستیشدا بەدرێژایی مێژوو سەلمێنراوە وەک راسـتـیـیـەکی مـێـژوویی وەک راسـتـیـیـەکی کـەلتـووری یا وەک راستیـەکی سیاسی لێمان وەربگرێ، ئایا بەرژەوەندییـەکانی لایەن بەرامبـەر ڕێگای پێدەدات کە ئەو راستییـە حاشا هەڵنەگـرەی کـورد وەک قـەوارەیەکی سـەربەخۆ قـبـووڵ بکات، لەراسـتـیـدا دەبینین زۆربەی هەرە زۆری گرفتـەکانی گەلی کورد دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەوەی کە لایەنەکـەی بەرامـبـەری وەک گـەل ئەیناسـێـت، بەڵام وەک گـەل دانی پیانانێت، یانی دەزانێ کە ئێمە گەلین، بەڵام دواجار ئەو زانینەی وای لێناکات کە مافی خۆت پێبدات یا ئەو شتەی کە پێویستە تۆ هەتبێت بیخاتەبەر دەستت بۆیە من پێموایە کێشەی گەورەی ئێمە ئێستا ئەوە بێت کە خاوەنی جیهانیی یا خاوەن جیـهـان بینی نین، لە راسـتیـدا **کورد کەلتووری خۆی هەیە کورد مێژووی خۆی هەیە، بەڵام گرفتی گەورەی ئێمە ئەوەیە ئێستا لایەنی بەرامبەر قبوڵمان ناکات** وەرمـان ناگرێت، ئەویش تەنهـا بەهۆی ئەو بەرژەوەندییـانەی کە هەیانە، دواجار ئەو شتەی کە جەنابت فەرمووت کـە توانایی حکومـەت کـردنە، دیارە دیسـان ئەمـەش هەر دەبەسـترێتـەوە بەبارودۆخێکی مـێژوویی، ئەگـەر تۆ لە وڵاتێکدا بژی، کـە بەهاوولاتییـەکی پلە سێ و چوار سـەیرت بکەن. ئەگـەر تۆ لە وڵاتێکدا بژی کـە دەرفـەت و دەرەتانی ئەوەت پێنەدرێ لە ئیـمکانیـیـەتی هاوبەشی وڵات کەڵک وەربگری، ئەگەر تـۆ لـە وڵاتێـکدا بژی ڕێـگـای ئـەوەت نەبێ، کـە شـتـێکی شـایانی هەی پێی بگەی، دیارە باسکردن لە یاســـاو ئیـدارەکـردن و ئەوانە شـتـێکی زۆر بێ هۆیەوە چۆن ئەزمـوونی چەندان ساڵەی باشـووری کـوردسـتـان لە حکومـەتی سـەددامـدا ئەوەی نیـشـاندا کـورد هیچ کات وەک هاووڵاتییەکی یەکسان لەگەڵ عـەرەب چاوی لێنەئەکـراو کـایەی پێنەکرا، ئەو مـافـانەی کە پێی ئەدرا دەسـتـبـەجێ لێی ئەسێندراوە، ئەنفـال دەکراو گەلێ بەڵاو موسیـبـەتی دیکە، بەڵام ئەگـەر ئەو دۆخـە تایبـەت کـە هەڵکەوێت دیارە کـــورد دەبێ وەک عەقڵانییەتێکی سیاسی لە مەسەلەکە بڕوانێ و هەوڵی ئەوە بدات، کـە ئەو توانایەی هەیەتی بیخاتە گەڕ بۆ ئەوەی قـانوونێک دەسـتـەبەر بکات کـە ئەو قانوونە بەڕاشکاوی و لەبەرچاوی دنیاو بەپێی سەنەدو بەڵگە دان بەمافی رەوای کـورد دا بنێ، من رام وایە ئێسـتـا لە باشـووری کـوردسـتـان ئەو شـتـەی کـە سـەرکردە سـیـاسـیـەکـان زۆر دڵیـان پێخۆشـەو ناوی دەنێن هاوپەیمانییـەتی لەگـــەڵ وڵاتانی رۆژئاوا دواجـــار دەستەبەری ئەوە ناکات، کە گەلی کورد بتـوانێ ببێ بەهاووڵاتییـەکی یەکسـان لەگەڵ عەرەبەکانی عێراق، ئەوەی دەبێ ئەوان هـەوڵی بـۆ بدەن ئـەوەیە، کـــە یاسـایەک بچەسـپێت دواجـار بتـوانێ کورد بەهاووڵاتی دابنێت، ئەگینا بەڕای من کـــورد دەشێ بەخـــۆی خـــۆی بەڕێوەبەرێت، دەنـا ئەنفـــالەکـــان، کـیـمـیـابارانەکـان دیسان لەسەردەستی کەسانێکی تر کە تەنها رواڵەتیان لەگەڵ دیکتـاتۆرەکانی پێشوو جیـاوازی هەیە دووپات ئەبێتـەوە ئەگـەر ئەنفـالیش لە شـێـوەی ئەنفـالی سـیـاسی یاخـود کـیـمـیـابارانی نەبێت لایەنی کـەم لە بواری ئەنفـالی فـەرهەنگی و ئەنفـالی زەوتکردنی مـافی چارەی خـۆنووسین

دەبێت،کــە ئەوەش هەڕەشــەیەکــە بۆ دوارۆژی گــەلی کــورد لە باشـــووری کوردستان.

*** ئایندەی باشووری کوردستان بەچ شێوەیەک پێشبینی دەکرێ؟ جەنابت وەکو مرۆڤێکی رۆشنبیری کورد چۆن دەڕوانیتە ئەو هەلومەرجەی کە بۆ باشووری کوردستان هاتۆتە پێشێ؟ ئایا دەتوانرێ دڵنیایی بەمیللەتی کورد لە پارچەکانی دیکەش بدات، کە ئێمە دەتوانین لە داهاتوویەکی نزیک ئیدارەیەکی کوردی کە واقیعەن بتوانێ خزمەت بەکێشەی نەتەوایەتی کوردی بکات بێنینە ئاراوە، تا چەند دەشتوانین گەش بین بین بەبۆچوون و بیروڕای سەرکردە سیاسییەکانی خۆمان؟**

- لەراستیدا ئەو باودۆخەی لە باشووری کوردستان هاتۆتە ئاراوە بارودۆخێکی زۆر تایبەتە. هەڵبەت حاشای لێناکرێ کە ئەنجام و ناکامی دەیان ساڵ هەوڵ و تەقەللای رۆڵەکانی کوردە بۆ گەیشتن بەمافە رەواکانی خۆمان، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەنجامی ئەو بارودۆخە تایبەتەشە کە لەناوچەکان روویداو وڵاتانی زلهێز هاتنە سەر ئەو رایەی کە دەشێ بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆمان و لە هەمان کاتیشدا دانانی نە حکومەتانەی، کە لەگەڵ بیروڕای ئەوان یەک دەگرنەوە، دیارە کورد ئەوەندەی کە پێویستە لەو هۆکارانە وردبێتەوە زۆر زیاتر پێویستە ،کە دەسکەوتی تایبەتی خۆی لەو بارودۆخە وەدەست بێنێت، واتا ئێستا لە باشووری کوردستان هەلومەرجێک لە ئارادایە کە لە قازانجی گەلی کوردە، بەڵام هەر ئەوەندەی کە ئەو هەلومەرجە بۆتە هۆی بەرژەوەندی گەلی کورد بەس نییە، بۆ ئەوەی کە گەلی کورد بەمافەکانی خۆی بگات بەڵکو دەشێت لەم نێوانەدا ئیرادەیەکی بەهێزی فیکری و سیاسی لە ئارادا بێت، کە بتوانێ ئەو بارودۆخە پڕ لە بەرژەوەندییە بۆ گەلی کورد بکا بەبارودۆخێک، کە بەرژەوەندییەکە بشکێنێتەوە بەلای نووسینی جۆرە یاسایەک کە مافەکانی گەلی کورد لە کۆمەڵگای عێراقدا دەستەبەر بکرێت، چونکە ئەگەر بڕیاربێت ئێمە وەک گەلی کورد لە دۆخێکی جیاوازدا هەمان چارەنووسمان هەبێت، کە پێشتر هەمان بوود دیارە نەمانتوانیوە ئامانجەکانی خۆمان بپێکین، بۆ ئەو بارودۆخە دەبێ وەک دیاردەیەک لەگەڵی رووبەڕووببینەوە کە بەردەوام لە حاڵەتی دڵەڕاوکێ دابین بۆ ئەوەی کە ئەو بەرژەوەندییە بەرژەوەندییەکی کاتییە یاخود دەتوانین بیکەین بەبەرژەوەندییەکی هەمیشەیی و، لەو رێگایەود ئەو شتەی کە گەلی کورد لە باشووری کوردستان بەدوایدا بووە بۆ خۆی دەستەبەر بکات، دیارە ئەمە دواجار کاریگەرییەتی دەبێ بەسەر بارودۆخی ناوچەکە، لەراستیدا پێشاندەری ئەوەشە، کە کورد دەتوانێ خۆی بەتوانایی خۆی وڵاتەکەی بەڕێوە ببات، بەڵام ئەو شتەی، کە من لێرەدا وەک خاڵێکی لاواز دەیبینم جیاوازییەکە لە نێوان کرداری دەسەڵاتدارە سیاسییەکان و خواست و ئارەزووی جەماوەری خەڵکدا دەیبینم، چونکە جەماوەری خەڵکی باشووری کوردستان بەردەوام لەسەر ئەوە پێداگری دەکەن، کە کورد دەشێ نرخی ئەو هەموو قوربانییەی داویەتی وەدەستی بێنێت، کە ئەویش گەیشتن بەمافی سەربەخۆیی یاخود لایەنی کەم فیدرالیزمە، کەچی سەرکردە سیاسییەکانی کورد بەردەوام باس لە هاوپەیمانییەتێکی بەقسە دەکەن کە لە نێوان هێزەکانی وڵاتانی بیانی و هێزە کوردییەکاندا هەیە، دیارە ئەو هاوپەیمانییەتە دڵخۆشکەرەیە، بەڵام تا چەندە دەبێتە زامنی ئەوەی، کە مافە رەواکانی گەلی کورد بچەسپێت ئەوە شتێکی تەمومژاوی و نادیارە، بۆیە لەراستیدا ناشکرێ چارەنووسی میللەتێک بەحاڵەتێکی تەمومژاوی بەرخورد بکرێ، بەڵکو دەبێ لە سیاسەتدا ئەو شتەی، کە پێویستە بچەسپێت و بەروونی بۆ خەڵک دیاری بکرێت و ئەو ستراتیژیانەی کە دەیگرنەبەر دواجار دەست نیشان بکرێ، بۆیە لەم حاڵەتەی کە ئێستا لە باشووری کوردستان هەیە لە هەمان کاتدا دڵخۆشکەرەیە زۆریش جێگای مەترسییە، چونکە من وای دەبینم کە دەرفەتی مێژوویی جاری وا هەیە بەدەیان سەدە جارێک هەڵدەکەوێ و ئەگەر ئەو دەرفەتە مێژووییە ئەقڵانییەتێک لەگەڵی رووبەڕوو نەبێتەوە کە بیکات بەبەرژەوەندی و بیکات بەمافێک بۆ گەلەکەی لەوانەیە لەکیس بچێت و ئیتر ئەو بارودۆخەش نەگەڕێتەوە.

**ئا: سەعدوڵلا نوری**

## عیسام عەبدوڵڵا:

# شیعر... خەڵک جوانتر دەکات

و: شەپۆل رەشید

(بەهرەی شیعری تۆ بەرووبوومی ئەوەیە یەزدان بە لوبنانی بەخشیووە)، بەم وشانە سەعید عەقلی شاعیر بەهرەی عیسام عەبدوڵلای خستەروو، بەو بۆنەوە کە خەڵاتی سەعید عەقلی پێبەخشرا، لەبەر ئەوەی خەڵکی شارۆچکەی خەیامە لەباشوور، شاعیر لەناو وڵاتی شیعری خۆیدا ئاگری وێنە پرشنگدارەکانی بە رەنگەکانی ئازارو بەرەنگاری و خۆشەویستی و راستیی بوون و جەوهەری مرۆڤ هەڵدەگیرسێنێت، مرۆڤ لەهەموو شتێکی پێوەندیدار بە دیاردەکانەوە ئازاد دەکات و بە دەربڕینە شیعرییەکانی، کە بە قووڵایی ئەزموون رووناک کراونەتەوەو بەهرە دەوڵەمەند کراون واتا بە مێژوو دەبەخشێت و شەهیدبوون و نەمرییش بە بەری داهێنان و داهێنەراندا دەکات و لەگەڵ خۆشەویستیدا، بۆ قوتاربوون لە بێهوودەیی لەرووی پێوەندییە مرۆییەکانەوە.

وێستگە داهێنانەکانی خۆیان لەدوو دیوانە شیعردا دەنوێنن: قاوەی تاڵ ١٩٨٢و دێڕی مێرووله١٩٩٤ ئێستەیش سەرقاڵی ئەوەیە سێیەمین دیوانی ئامادە بکات تا لە ماوەیەکی کورتدا بڵاوی بکاتەوە، بەڵام شاعیر بەوە ناسراوە کە دیوانێک چاپ بکات کتێبێکی لەگەڵدا دەبێت بە دەنگی خۆی هەموو چامەکانی تێدا تۆمارکردووەو رای وایە کە پێویستە شیعر بە زمانی رۆژانە کە قسەی پێدەکرا، شان بەشانی خوێندنەوە، گوێی لێبگیرێت.

بەو بۆنەیەوە خەڵاتی سەعید عەقلی وەرگرتووە ئەم هەڤپەیڤینەی لە بارەی بۆچوونی لەمەڕ شیعرو شاعیران و ئەزموونەکانی لەم بارەیەوە لەگەڵدا سازدراوە، لێرەدا دەیخەینە پێش چاوی خوێنەران.

*** بۆچی بۆ دەربڕینی ناخی دڵ و دەروون و مێشکت، زمانی زارەکیت هەڵبژاردووە؟**

– زمانی زارەکیم بۆ ئەوە هەڵبژاردووە، چونکە لە زمانی پاراو گرانترە، لەکاتێکدا هەندێک لایان وایە کە زمانی زارەکی زوو وەردەگیرێت، من هەست بە پێچەوانەوە دەکەم، لەبەر ئەوەی دابەشکردنی کۆمەڵایەتی زمان وا دەخوازێت خەڵکی مامەڵە لەگەڵ پاراودا بکەن کە ئەویش شازادەیە، کەچی زمانی زارەکی کچی دەرگەوانە. من دەڵێم بردنی کچی دەرگەوان بۆ ئاهەنگی شاهانە گرانترە لەوەی شازادە ببرێتە ماڵی دەرگەوانەوە. بۆیە زمانی زارەکی پەسەندتر دەبێت، چونکە زۆر پۆشتەترو ئامادەباش دەبێت، گەورەکان سەری بۆ دادەنەوێنن، هەرچی شازادەیە ئەوە

بەهۆی ڕێزلێگرتنی باوکییەوە ڕێزی لێ دەگیرێت نەک بەهۆی جوانی و ئامادەباشییەوە.

من حەزدەکەم خۆم لە شتی گران بدەم و گوێ بە ئاسان و باو نادەم، چونکە جۆرە ئاگرێکی پیرۆز هەیە کانە میتاڵە ئاسانەکان دەتوێنێتەوە، مەبەستم شیعری ئاسانە، ئەو ئاگرە بەسەر زارەکیدا تێدەپەڕێت و دوڕو مرواریەکانی دەمێنن، واتە واتا باشەکان، داهێنان لە ئاسمانی واتادا، کە بۆ فرەبێژی و دارشتن دژوارە، یان ئامانج دەپێکیت یان بێ دەنگ دەبیت، لە زمانی پاراودا دەتوانین شتی لێ وەربگرین و پشتیشی پێ ببەستین، کەچی لە زارەکیدا لە بۆشاییەکی مەزندا دەتوێینەوە.

*** تۆ لە شیعرەکانتدا دژ بە مرۆڤ، دژ بە ئافرەت، دژ بە شەڕ شۆڕشگێڕیت، ئایە ئەم شۆڕشگێڕییە لە ئائومێدییەوە هەڵقولاوە، یان ئارەزووی گۆڕانکارییەوە، کە جیهانێک دروست بکەیت خەونی پێوە دەبینیت؟**

- شاعیر کوردەتاچییە، شۆڕشگێڕە، گۆڕان دێنێتە کایەوە، نیشتمان و نەخشەکان ناگۆڕێت، بەڵکو نەخشەی روحی ئادەمیزاد دەگۆڕێت، خەڵک جوانتر دەنوێن ئەگەر لەگەڵ شیعردا لێک تێبگەن، هەروەها سەربازو قوتابی و جوتیارو مامۆستا.. جیهانیش جوانتر دەبێت کاتێک شاعیر سێبەری رۆشنبیری و جوانی و ئاگابوون و زیرەکی و هەمەچەشنەکی خۆی بەسەردا دەدات.

من شۆڕشگێڕم دژ بە پێشینانی چاکەخواز، کە هەریەکە لە سەعید عەقل و موتەنەبی و ئەبو تەمام و نەزار قەبانی و هەموو باڵا بڵندەکان چامەی عەرەبی و دەق و چامەکەیان داگیرکردووم، بۆیە هەوڵ و دەدەم وەدەریان نێێم و دەقەکەمیان لێ قوتار بکەم تا زمانم ببێتە زمانی خۆم و باڵام و چامەکەم ببنە هی خۆم.

بەڵێ شاعیر بگۆڕە، بەڵام بگۆڕێکە جوانی دێنێتە کایەوە، کار لە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی یان رامیاری ناکات، بەڵکو مامەڵە لەگەڵ هەقدا دەکات لەسەر بەردی رۆح بۆ ئەوەی جوانتر و رازاوەتر ببێت.

من شۆڕشگێڕی دژ بە شەڕم، بەڵێ، هیچ تێگەیشتوویەک نییە دژ بە شەڕ ڕانەوەستێت، بە تایبەتی دژ بە شەڕی ناوخۆ، لەبەر ئەوە رقم لە شەڕە چونکە رقم لە ناشیرینییە بە هەموو جۆرەکانییەوە. لە شیعرەکانمدا ڕێزی شەهیدانم گرتووە، ئەوانەی کەس ڕێزیان ناگرێت و ئەوانەی کە شایەنی ئەوەن تەنیا بۆ خوێنی ئەوان سەردانەوێنین، هەرچی ئەوانی دیکەن کە بۆ بەرژەوەندی خۆیان دەکۆشن، ئاوڕیان لێ نادەمەوە، بەردەوام دەڵێم با شەهید بن تا بیانناسم، لەو چامەیەمدا کە هونەرمەند مارسیل خەلیفە دەیچڕێت دەڵێم (کەس نییە بیانبینێت تا شەهید نەبن..) تەنیا لەبەردەم ئەوانەدا دادەنەوێمەوە.

*** لە چامەکانتدا خولیای شوێن و، خولیای کات بەدی دەکرێت، ئایە تۆ ترست لە کات و لە ڕۆیشتنی خێرای کات بەرەو کۆتایی هەیە؟**

- وەک هەموو مرۆڤێک، شوێن بەلای منەوە، ئەو شتەیە کە هەریەکە لە ئێمە تێیدا دێن دەچین، کاتیش ئەوکاتەیە هەوڵی تێدا دەدات، خواوەند هاویشتووینیەتە ئەم ئەستێرە، گوتویەتی: کاتتان حەفتاو پێنج ساڵە، تێکڕای تەمەنی مرۆڤ، گەشت و سەیران بکەن و رابوێرن، من بە فەرمایشتی ئەو دەکەم و، لەو شوێنە گەشت و سەیران دەکەم کە گۆی زەوییەو هەوڵ دەدەم سنوورێک بۆ کات دانێم، بۆیە هەرکە یەک رۆژ لە تەمەنم زیاد بێت، یەک رۆژ لە تەمەنم کەمتر دەبێتەوە، لێرەدویە، هەست کردنم بەکات، هەست کردنێکی زۆر هەستوەرانە و مەترسیدارە.

هەندێک هەن لەناو شوێندا بەند دەکرێن، خەڵکانی دیکەش هەن شوێن فرەوانتر دەکەنەوە، منیش لەو کەسانەم کە هەوڵ دەدەم شوێن و هەنگاوو سەیران و ماوەو گەڕان فرەوان

شاعیر کوردەتاچییە، شۆڕشگێڕە، گۆڕان دێنێتە کایەوە، نیشتمان و نەخشەکان ناگۆڕێت، بەڵکو نەخشەی روحی ئادەمیزاد دەگۆڕێت

بکەمـــەوە. بۆیە هەمـــوو وڵاتانی جیـهـان وڵاتی منن، بەڵام بەیرووت و شـەقـامی (حـــەمـــرا) هەڵدەبژێرم و پاسەوانی کولەمەرگی شارەکە دەکەم.

*** لە شیعردا واقیعیانەیت هەندێک جار تا رادەی ئازار، پروات بەخەون نییە؟**

– پێوستە شاعیر واقعیانە بـێــت، بـەڵام نـەک وەک واقیـعیانەی رۆژنامەنووس، واقـیـعـیـەتی شـاعـیـر لە ســـرووش وەرگـــرتن لە رووداوەوە هەڵدەقـــوڵێت، بەڵام خـــۆی لێ لادەدات و، لەبارەیەوە دەدوێت تا بێژەکان ببنە شـــیـــعـــر. کـــەچی رۆژنامـەنووس واقـیـعـیـیـانە شـان بە شـانی خـوێندنەوە دەجووڵێتەوە.

*** تـــا چ رادەیـــەک شـیـعرەکانت بە ئاوێنەیەک دادەنرێت کە خودی خۆت و گـیـان و دڵت رەنگی تێـدا بدەنەوە؟**

– لە شیعرەکانمدا، واقیع و خـــەڵک رەنگ نادەنەوە، شیعر دووەمین کۆپی کراوی ژیانە، ئاوێنەیەک نییـە ژیان رەنگی تێـدا بداتەوە، من دژ بە تیـــۆری ئاوێنەم، کـــە فیـزیکیـیـە، کەچی شیـعر سیحردو پێچەوانەی فیزیکە، هەندێک وا دەزانن کە شیعر بێژەیە، من دەڵێم جوانترین بێژەیە لەگەڵ هێشتنەوەی ئەوەی کـە ئامـاژە بە لادراو دەکـات، بۆیە ئەگـەر یەک ملیـۆن تۆن بێژە وەربگرین و بیگوشین، تەنیـــا یـەک ملیگرام شـیـعـرمـان دەست دەکـــەوێت، ئەوی دیکەی هەمـوو بێ هوودەیە. هەر لە زووەوە عـەرەب گـوتوویانە: (رەوانبێژی لە کورتبڕیدایە و، باشـتـرین بێـژە ئەوەیە کــورت بێت و مـــەبەست بپـێکێت). ئێـمـە ئەو دوو دەربـڕیـنـە دەزانـین، بـەڵام بەداخەوە پێڕەویان ناکەین.

*** ئافرەت لە شیعرەکانتدا پـەرت و بـڵاوە، بـەبـێ هوودەیی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت، بۆچی؟**

– لەبەر ئەوە دەمـــەوێت ببـێـتـــە دایک و، یارو، خوشک و، کچ و، هاوسەر، بـۆ ئـەوەی هـەمـــــوو خـەسڵـەتەکانی تێـدا بەدی بکرێت، ئەمـەیش کـارێکی زۆر سـەختـە، وەک بڵـێـیت بەدی نایەت، بۆیە هەندێ جار پێوەندی لەگەڵ ئافرەتدا دەبەســـتم، هەڵچـــوون و داچوونیان تێدا روو دەدات، هەندێک جـار پشـتی تێ دەکەم یان رووم وەردەگێڕم، یان بەدەوری خـــۆمـــدا دەخولێـمـەوە، وەک بڵـێـیت کـــەس نابینم، هەست بە شـەختـەیەک دەکـەم ئەگـەر ئافـــرەتم لێــــود دوور بکەوێتـەوەو، هەست بە گـەرمـایەکی زۆریش دەکەم ئەگەر بە ژمارەیەکی زۆر لەدەورم کۆ ببنەوە، لە هەردوو باردا یان (سەرما)مە یان (گەرما)مە، هەردوو بارەکەیش پێشووم پێ نابەخشن.

وەک شـاعـیـرێک کـە ژن و منداڵی هەبێت، کۆمەڵ وام لێ دەخوازێت نەرێت بەرزبم، یان کـابرایەکی ئاسـایی بم، منیش ناتوانم، لە کوێوە وشەو داهێنانم لە رووی واتاوە بۆ دێت؟ چۆن چۆنەکی شوێنێک بۆ خۆم لەنێوان (شۆڕەسوارانی بێـژە)دا بدۆزمـەوە، ئەوانەی سـواری ماینی شیعر دەبن و بە گوتن سەرکێشی دەکەن، تا بچمە نێو حاڵەتی خۆمەوە لەگەڵ ئافرەتاندا، حـاڵەتیـشم لەگـەڵ پیـاودا کـێـشـەی زۆرتر هەڵدەگرێت، چونکە حەز لە کەس ناکـەم ئەو برادەرو دۆستە زۆر نزیکانە نەبێت، کە دەست بە بەردی رووحـدا دەخـشـێنن و، بڕوام بە ژیان و بە مرۆڤ پێ دەبەخشنەوە.

*** لە هەندێک لە چامـــەکـــاندا شێوازێکی گاڵتەکردن بە ژیان بەرچاو دەکەوێت، ئایا ئەوە لە ئاکامی گەڕانی زۆرت بەدوای راستیدا هەڵنەقوڵاوە؟**

– کـــاتێک چیـــای غــەم و پەژارە گـــەورەتر دەبێت و بەرزتر دەبێتـــەوە و شـــتی ســـەیرو ســـەمـــەرە زۆرتر دەبن، کـاتێک بە رێکەوت رەش دەبێتە سپی و، خـــەڵکی دەبنە تارمـــایی و، سەردەمیش دەبێتە سەردەمی (فۆبگۆ) کـە هەمـوو دیاردەیەک سـاختـەیە و، ناتوانین راستـەقـینە بدۆزینەوە، ناتوانم بە گـاڵتـەکـردن رووبەرووی ئەم ژیانە ببـمـــەوە و هەتوانی پێـویسـتی بۆ بدۆزمـەوە. بە پێکەنین و بەگاڵتەجاری مشت و مڕ دەکەم، شمشێری قسەی رەق

بەڵێ شاعیر بگۆڕێ، بەڵام بگۆڕینکە جوانی دێنێتە کایەوە، کار لە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی یان رامیاری ناکات، بەڵکو مامەڵە لەگەڵ هەقدا دەکات لەسەر بەردی رۆح بۆ ئەوەی جوانتر و رازاوەتر ببێت.

> پێویستە شاعیر واقعیانە بێت، بەڵام نەک وەک واقیعیانەی رۆژنامەنووس، واقیعیەتی شاعیر لە سرووش وەرگرتن لە رووداوەوە هەڵدەقوڵێت، بەڵام خۆی لێ لادەدات و لەبارەیەوە دەدوێت تا بێژەکان ببنە شیعر، کەچی رۆژنامەنووس واقیعییانە شان بە شانی خوێندنەوە دەجوڵێتەوە.

و، تیشکدانەوەی رووناک و پێکەنینی بەرز، بەرز دەکەمەوە تا بتوانم لە ژیاندا بەردەوام بم.

*** لە شیعرەکانتدا روو لە کێ دەکەیت؟**

- روو لە کەسانی تایبەت دەکەم، **شیعر کەم کەس گوێی لێ دەگرن، بەردەوام شیعر بۆ کەسانی تایبەت** بووە، ئەوانەی زیرەک و تێگەیشتوون و ئاگایان لە شتە و مێشکیان چوست و چالاکە، ئەوانە ئارەزوومەندانی شیعرن و منیش شیعر ئاراستەی ئەوانە دەکەم، ئەوانەی کتێب دەکڕن و وتارێکی رەخنەیی دەخوێننەوە و ئامادەی کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە دەبن، ئەوانەی بایەخ بە شیعر دەدەن و داوای دەکەن و بەرەو پیری دەچن..

*** دوو دیوانت چاپ کردووە دە ساڵیان لەنێوانداية، بۆچی کەم دەنووسیت و ئەم دەگمەنییە لەبەرچی؟**

- **شیعر میتاڵێکی دەگمەنە، بۆیە کەمە.** ئایە ئەو کتێبە زۆرانەی کە بلاوکراونەتەوە و لەسەریان نووسراوە شیعر، ئایە ئەوانە شیعرن؟ ئەوە (فۆیگۆ)یە، شیعری راستەقینە کەمە. من لە کانگەیەکی قووڵدا کاردەکەم، کە رەگی شیعری تێدا لە کۆنی کۆنەوە تا هەتا هەتایە رەگ و ریشەی داکوتاوە، هەر دە ساڵ جارێک زەوی دەکۆڵم تا مشتێک لە کانی (میتال)ی شیعری رەسەن بدۆزمەوە. کەچی کەسانی دیکە خۆڵەکەیان پێ بەسە، خۆڵیش ئەوەندە زۆرە هەموو لۆرییەکان پڕ دەکات، بەڵام دوڕو مرواری پڕ بە یەک مشت دەبن.

*** چ کات دەنووسیت؟**

- هەندێک جار ناچار دەبم لە بۆنەیەکدا بنووسم، بۆ نموونە چامەی (چەند وێنەیەک)م لە فیستیڤاڵێکدا نووسی لە شاردا سازدراو، چامەی (مریەم)م لە فیستیڤاڵی مریەمی و دێری مێروولەم لە فیستیڤاڵی رێز لێنانی عاسی رەحبانی لە گازینۆی لوبناندا نووسی، ئەم چامانە پێوەندییان بە بۆنەکانەوە هەیە، هەرچی شیعرەکانی دیکەیە، ئەوە لە ناو ئۆتۆمبێلەکەمدا دەیاننووسم، ئۆتۆمبیلەکەم وەگەڕ دەخەم و رووپێوەکان پڕ دەکەمەوە و ئاورنگێکی سووکم بەسەردا دەبارێت، کە لە ناوەندی شاردا دەبم هەست دەکەم تاک و تەنیام، وێڕای ئەو هەموو ئۆتۆمبیلانەی دەوروبەرم، پەنجەرەکانم دادەخەم، تا جنۆکەی شیعر دڵنیام بێت و دێتە دەرەوە و لەگەڵی پێک دێم، لە یەکێیەتیەکی تیژو دەگمەندا، لە زۆرییەکی جۆراوجۆرو پڕ هەراو هوریادا.

*** لەسەردەمی کۆمپیوتەرو تایبەتمەندی و ئەنتەرنێتدا، شوێنی کتێب بە گشتی و دیوانە شیعر بە تایبەتی لە کوێدایە؟**

- **خوێنەرانی زمانەکان بە گشتی و شیعر بە تایبەتی روو لە کەمییە، چونکە لەسەردەمی تایبەتمەندیدا مەبەستەکانی شیعر هەر یەکە بۆ شوێنی خۆیان رۆیشتن،** ئەوسا شاعیر رۆژنامەنووس بوو، پارێزەر بوو، مێژوونووس بوو.. ئەمڕۆ رۆژنامەنووسی، مێژوو، پارێزەری بوونەتە پسپۆڕایەتی سەربەخۆ لە زانکۆدا، بۆیە مەبەستەکانی چامە کەمتر بوونەتەوەو تەنیا بەردی شیعری ئاسایی و جەماوەری شیعری ئاسایی ماوە کە بووەتە شتێکی دەگمەن. لەم رووەشەوە دەڵێم ئەم کارە یەکێکە لە ئەفرەتە مەزنەکانی شیعر، چونکە هیچ هونەرێک گەشە ناسێنێت و نەش و نما ناکات، ئەگەر کۆمەڵ لە ئامێزی نەگرێت. ئەمڕۆ شاعیران وەک کەسانی بێ دایک و باوکیان لێ هاتووە و شیعر لە ژیانی خەڵکدا هیچ بایەخێکی نەماوە، پێشان ئەوکەسەی شیعری ئەزبەر نەکردایە، وا دەژمێررا کە لەو کۆمەڵەدا ناژیت، کەچی ئەمڕۆ شتەکە پێچەوانە بوونەتەوەو وای لێ هاتووە ئەو کەسەی بایەخ بە شیعر بدات و تەماشای دەکرێت لە دەرەوەی کۆمەڵ بەسەر دەبات، بەداخەوە ئەمڕۆ دنیا پشتی لە شیعر کردووە.

**لە ئەنتەرنێتەوە کراوەتە کوردی**

## عەبدولستار ناسر:

# ترس فێری نووسینی کردم

و: عبدولوتەلیب عەبدوڵلا

لە بەغداد ناسیم، بەڵام هەتا کۆمەڵە چیرۆکی (بەختەوەرترین پیاو لە دنیا)م نەخوێندەوە نەمزانی لەکام بواری ئیبداعیدا دەنووسێت. هاوڕێمان «سریکۆ لشتارتیش» ئەو کۆمەڵە چیرۆکەی تەرجەمەی زمانی (سربی) کرد، هەر ئەویش ئەو گفتوگۆیەی لە سربییەوە کردۆتە عەرەبی، هەروەها «سریکۆ لشتارتیش» توانیویەتی تایبەتمەندییەکانی ئەو نووسەرە کەشف بکات، وەک چۆن ئێستا ئەو نووسەرە یەکێکە لە نووسەرە بەناوبانگەکانی عەرەب، لە وڵاتەکەی ئێمەش دوای ئەوەی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بەدیارکەوت، دوای ئەوەی کۆمەڵە چیرۆکێکی بەسەربەخۆیی بەزمانی (سربی) بەچاپ گەیشت، وەک یەکێک لە نووسەرە دیارەکان ناسرا.




* بابەپێچەوانەی شێوازە باوەکان دەستپێبکەین و بپرسین چۆن بووی بەنووسەر؟ ئەوە لە دنیای عەرەبیدا چۆن دەکەوێتەوە؟ ئەوای چیرۆکی یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی یەکەمت چۆن کەوتەوە؟ لەلای خۆم پێم خۆشبوو ئەو پرسیارانەم بەهەرمێنی ئەو کۆمەڵە چیرۆکەو ژمارەی تیراژەکەی پەیوەست بکەم، چونکە رازی بوونی خوێنەرو دنیای رۆشنبیریی گشتی ئاشکرا دەکات. ؟

- ترس فێری نووسینی کردم، من دەمنووسی بۆ ئەوەی نەترسم، ڕەنگە مەسەلەکە لە منداڵی واکەوتبێتەوە، توندوتیژی باوکم وای لێکردم کە ئەو کاتانەی لە دەفتەرە بچووکەکەم لە بارەیەوە دەمنووسی دوو ئەوەندەی ئەو توندوتیژ بم، هەروەها توندوتیژی مامۆستای نیشتمانی و بێ رووی ئەو وای لێکردم کە جوانترین جنێو بنووسم، زێتر زمان درێژی بکەم و بەلەزەتتر بیرازێنەوە. ئێمە لە دنیایەکی

**تووندوتیژی مامۆستای نیشتمانی و بێ رووی ئەو وای لێکردم کە جوانترین چیرۆک بنووسم، زێتر زمان درێژی بکەم و بەلەزەتتر بیرازێنمەوە.**

پڕ ترس و تووندوتیژی و نەزانی لەدایک بووین، بۆ ئەوەی چێژ لە شتەکان وەرگرین و هێزی خۆمان بنوێنین لەسەرمان پێویست بوو کە زێتر بخوێنینەوەو زێتر بنووسین، ئەوەش زۆربەی خوێنەرانی (ئەوەی شەستەکان) دەگرێتەوە، بەڵام چیرۆکی یەکەمم لە کتێبی یەکەمدا (الرغبة في وقت متأخر) (١٩٦٩) سەرەتا بوو، هەموو ئەدیبێکیش سەرەتای هەیە، بەنسبەت من قەلغانێک بوو لەو ترسە گەورەیە دەیپاراستم. کتێب لە وڵاتانی عەرەبیدا تیراژی لە هەزار دانە زێتر تێپەڕ ناکات، بەتایبەتی رۆمان و شیعرو چیرۆکی کورت، بەڵام کتێبی چێشت لێنان و خوێندنەوەی بەخت و یادەوەری سەماکەران، یەک دنیا جەماوەری هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا چیرۆکەکانم خوێنەری خۆیان هەیە، چیرۆکەکانم جورئەتیان تیایە، لە سانسۆرو پۆلیس ناترسن. بۆیە ساڵێکی تەواو لە ژوورێکی ئینفرادی ژێرخان زیندانی کرام، لەسەر چیرۆکێک کە لە ساڵی (١٩٧٥) بەناونیشانی (سیدنا الخليفة) لە دیمەشق بڵاوم کردەوە.

*** جارێک (یوسف برۆدسکی) وەک زەرورەتێک لە پێناو رابوونەوەی ئەوەی نوێ و تێکۆشان لە پێناو ئازادیدا گوتی: من هیوای خۆم لە ئازادی بڵاوکردنەوەدا دەبینمەوە، بەڵام ئەو ئازادییەی کە کەوتۆتە دەستی ئەوەی دووەم بەقەد ئەوەی بەهایەکی بۆماوەییە، هێندە لە تاکەکەسدا خۆی نابینێتەوە، من مەبەستم ئەوەیە کە گەلێک لە کتێبەکانت قەدەغە کراوو رێگا پێنەدراو بوون، ئایا مانای ئەو قەدەغە کردنە چییە، لە وڵاتی عەرەبی چ وێنەیەکی کردەیی لە خۆ گرتووە؟ رۆژێک گوتم قەدەغەکراوەکانی نووسین و ژیان لەتۆ جێگیر نابن، بەڵکو لە ئەوانی دیکەدا جێگیر دەبن. هەروەها جارێکی دیکە گوتم «جوانترین شت خەڵەتاندنی سانسۆرە» هەر بەمجۆرە لە ناوەڕاستی حەفتاکان کەوتیتە ناو زیندانەوە؟**

- دەبێ هەمیشە ئەوەمان لەبیر بێ کە ئازادی نادرێ، بەڵکو دەسەنرێ، لە وڵاتێکی داپلۆسراوی وەک عێراق زۆرگرانە، بەڵکو مەحاڵە بتوانێ وشەی حەق دەربارەی دیکتاتۆرو خوێن رێژو تاکە حیزبی کەڵەگا بنووسی و بڵێی زۆربیان لەداهێنەرانمان کوشت چونکە خاوەن فیکر بوون، وەک چۆن هەزاران ئەدیب و نووسەر بەرەو کەنەداو سویدو نیوزیلەندا و ئوستراليا رایانکردو خۆیان لە بێگاری و ئازاردان رزگارکرد. ئێمەش لە ناوەوەی وڵات فیکری خۆمان لە شێوەی رەمزو ئەفسانە دەردەبڕی. تاکو پیاوانی سانسۆر دەسخەرۆ بکەین، پێش روخانی رژێمی بۆگەن لە ٩ نیسانی ٢٠٠٣ کارەکانی من لە ناوەوەی عێراق قەدەغە بوو، بەڵام بەشێوەیەکی نهێنی و لە رێگەی کۆپی کردنەوە کۆمەڵێکی باش لە خوێنەرو ئەدیبان بەرهەمەکانی منیان بەردەست دەکەوت.

هەتا ئێستا من پێموایە ئازادی بیروراو بڵاوکردنەوە، تەواوی ئازادییەکان لەخۆ دەگرێ، حەقیقەت دادپەروەرییە، ئەگەر فەرمانڕەوایەک لە وشەی حەقیقەت سڵ نەکاتەوە، یان فەرمانڕەوایەک هەر لەسەر کاغەز سڵی لێ بکاتەوە واتە نە دادپەروەری لە ئارادایەو نە یاسا، بەڵام بە نسبەت ئازادی بڵاوکردنەوەو سانسۆر لە نیشتمانی عەرەبیدا لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێ، لێرەدا جیاوازییەکی گەورە لە نێوان (بەیروت) و (ریاز) هەیە، وەک چۆن جیاوازیش لە نێوان (قاهیرە)و (تەرابلس) هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا

ـ ـۆر لە وڵاتی عەرەبیدا ھەت ئێستاش کتێب ێکدەشکێنێ. ئەوەش بۆ ەوە دەگەڕێتەوە کە ـەرمانڕەوا لە وڵاتانی ـەرەبیدا لە ڕێگەی ھەڵبژاردنێکی شەرعییەوە دەسەڵات ناگرێتە دەست، بەڵکو بەھێزی گوللە لاقەی دەسەڵات دەکات. ئەوەی بەھێزی گوللەش بێ، تەنھا بەھێزی گوللە نەبێ دانابەزێ.

*** زۆربەی خوێنەرانی چیرۆکەکانی تۆ گەنجن، دەڵێن وەک چۆن سوقرات لەکاتی خۆی گەنجەکانی بەرەو بەدکاری برد، تۆش بەھەمان شێوە، ئایا ئەو قسەیە تەنھا بەدەوری ئەخلاقی عەرەبیدا دەخولێتەوە، یان لە دەوری یاخی بوونی جیاوازانەی مرۆڤایەتیدایە؟**

– پێشتر، بەر لە بیست ساڵ، چیرۆکی سێکسیم دەنووسی، لە بارەی پەیوەندییە حەرامەکانەوە دەمنووسی، لە بارەی خۆشەویستیەکی وروژاوو بێ سنور، وەک چۆن لە بارەی لادانە سێکسییەکان (ھۆمۆسێکسوال) دەمنووسی، ھەروەھا لە بارەی چێژی سێکسی ڕێگا پێنەدراو، ئەوانە لە کۆمەڵە چیرۆکی (السفر الى الحب) و (نساء من مطر) کە لە بەغداد چاپکراو ھەروەھا لە (الحب رميا بالرصاص)و (مطر تحت الشمس) کە لە قاھیرە بلاوکرایەوە بەدەرکەوت، بەڕاستی خوێنەرانی من گەنج و تازە پێگەییوەکان بوون، بەڵام پیرەکانیش بەنھێنی لە چیرۆکەکانم دەگەڕان، ھەروەھا نافرەتان لەوێ چێژی ونبوویان بەدەست دەھێنا، ئەو چێژەی کە بەشێوە فەرمییەکەی قەدەغە کراوبوو، لە زەمەنێک لە زەمەنەکان وابزانم بەرەو خراپەکاریم بردن، وەک چۆن (سوقرات) قوتابییەکانی بەرەو خراپەکاری برد. لەراستیدا کاتێک من ئەو چیرۆکانەم دەنووسی گاڵتەم بە پەروەردە ھەڵەکان و ئەخلاقە تۆخەکان دەبرد کە لەنێو خێزانی عەرەبیدا پەیڕەو دەکرا، چونکە کاتێک منداڵەکان گەورە دەبن و ئەوەی کە لە دایک و باوک وە بەرگوێیان کەوتبوو ساختەبوو، ئیتر ئەو پەندو ئامۆژگارییانە بۆ خۆیان دەبنە کارەسات.

بەڕاستی پێت دەڵێم ئاواتەخوازم کە بۆ ئەو جۆرە چیرۆکانە بگەڕێمەوە، بەڵام تەمەنم ڕێگام پێ نادات بەمجۆرە یاخی بم و لە (ئەخلاقە بەرزە) ساختەیەکە دەربچم کە ھەر لە منداڵییەوە ژەھرەکەیان نۆش کردووە.

*** لە نێوان نووسەرو کۆمەڵگادا کەلێنێکی گەورە ھەیە، لە نێوان ئەو دوو سەربازگەیەدا دژبوونەوەیەکی توند لە ئارادایە، ئاشتی تیا بەدی ناکرێ، ئەمڕۆ ئەو کەلێنە لە پێشان بەفرەوانترو قووڵترە ئاگر لە نێوانیاندا ھەڵدەستێ، بەمجۆرە ھەستدەکەین، تونێلێکی ڕەش لەو نێوانە ئامادەیە ھەموو شتێک ھەڵبلوشێ، واپێدەچێ ھەموو ڕێکەوتن و ئاشتییەک لەم نێوانەدا تەمەنی کورت بێ، وەک ئەوەی پێویستیان بەیەکتر نەبێ، ڕۆژێ لە پێش کۆمەڵە برادەرێک لە عێراق گوتم: ئێمە ھەموومان کۆمەڵە منداڵێکی بێ دایک باوکین.**

– من تەنھا لەوە لەگەڵ تۆ جیاوازم کە پێموایە نووسەر یەک جۆر نین، یان لە ھەموو شوێنێ لەیەک ناچن، ھەندێ کۆمەڵگا ھەیە لە پێناو ئەدیبێکی زیندانی کراو، یان تاراوگە کراو لە بەرامبەر فەرمانڕەواکانیان خۆیان لە سەنگەر ناوە. وەک دەڵێیت لێرەدا ئەگەر کەلێنێکی قووڵ لە نێوان کۆمەڵگاو نووسەردا ھەبێ، چ وا لە نووسەر دەکات بنووسێت، ئەگەر ھەست بکات کۆمەڵگا لە دژی ئەوە، ئایا لە پێناو ئەواندا ئیبداع دەکات، باشە با ئێمە «گاربیل گارسیا مارکیز»

دەبێ ھەمیشە ئەوەمان لەبیر بێ کە ئازادی نادرێ، بەڵکو دەسەندرێ.

و «ماریو بارگاس یوسا»و «ئیفواندرتیش» وەرگرین ئایا هیچ کەلێنێک لە نێوان ئەوان و کۆمەڵگاکەیاندا دەبینی؟ دەشێ من وەک پێویست لە پرسیارەکەت نەگەیشتبم. **ڕاستە ئێمە نەدیبی نەوەی شەستەکان کۆمەڵێک منداڵی بێ دایک و باوکین، هیچ شتێک لە نەوەی پێشووی خۆمان فێرنەبووین، بۆیە باوکێکمان لە پاریس کڕی، دایکێک لە شیلی،** لە نێوان ساڵێک و ساڵێکی دیکەدا لە دبڵن گوێ بۆ باوکێکی دیکەو لە ئەمریکا بۆ دایکێکی دیکە رادەگرین. لەدووتوێی قسەکاندا دەمویست بڵێم ئەگەر باوکێکی باشت نەبوو پێویستە بەدوای باوکێکی گونجاودا بگەڕێیت.

ئەگەر فەرمانڕەوایەک لە وشەی حەقیقەت سڵ نەکاتەوە، یان فەرمانڕەوایەک هەر لەسەر کاغەز سڵی لێ بکاتەوە واتە نە دادپەروەری نە ئازادییەو نە یاسا.

*** تکایە لەسەر بەغدایەکەی خۆت شتێک بڵێ: بەو سیفەتەی کە وەک بابەتی بەردەوامی تۆیە، تۆ لەو شارەی کە رۆژێک لە رۆژان پایتەختی هەموو دنیابوو، چۆن ژیاوی، مەبەستم لە ژیان و ئەو هەموو جیاکارییانەیە کە لە نووسینەکاندا بەرجەستەی دەکەیت، ئایا هاوڕێیەتی لەوێدا چۆن بووە؟**

– وەک بزانم پێش سەدان ساڵ بەغدا وەک پایتەختی هەموو دنیا نەبووە، بەڵکو بەدەیان جار لە پشتەوە خەنجەریان لێوەشاندووە، خوێنی پاکیان بەسەر شەقام و کەنیسە و مزگەوت و قوتابخانەو کەنارەکانی دیجلەو فوراتدا رشتووە، بەڵام لەگەڵ هەنگاوەکانی مێژوو هەر خۆی برینەکەی خۆی تیمار کردووە، پاشان وەک سیمرغێکی سەربەرز، وەک دارخورما سەربەرزەکان گەڕاوەتەوە، ئێستا بۆ پێنج ساڵ دەچێ بەغداییەکەی خۆم نەدیووە، بەڵام هەموو شەوێ خەونی پێوە دەبینم، وەک چۆن لە پەنجاو شەستەکان دیوومە هەروا دێتە خەونم، بەکراسێکی بوکێنی جاویدانی دەلەرێتەوە، پەلەیەک لە خوێنی وشکهەڵاتوو بەسەر لایەکی کراسەکەیەوە دەبینم.

من زۆرم لەسەر نووسیووە، چیرۆکەکانم بەرئەو دەکەون. لەو بڕوایەدام لە کۆتایی ئەوساڵ ببینمەوەو هەندێ لەو قەوزانەی کە پێوەی ئاڵاون بشۆم، هەندێ لەو ساچمانەی کە دوژمن ئاراستەی کردوون لێی بکەمەوە، هەتا ئەگەر هەر گوناهێکم بەحەقی ئەو کردبێ خوا لە گوناحەکانم خۆش بێ ئەگەرچی هەرگیز من بەو گوناهانە ناگەم.

*** بەنسبەت ژیانی رۆژانە و کاروباری رۆژانە، دێتەوە بیرم کە جارێک گوتت: «قومارو مەی و ئافرەت» هەموو ژیانی عەبدولستار ناسر بوو. ئەگەر وابێ، کەواتە کە گەورەش دەبی دەست لە بەشێک لەو شتانە دەدەیت، کە لە کاتی خۆی چێژت لێوەرگرتووە، ئایا تۆ وای نابینی؟**

– قومارو مەی و ئافرەت ناونیشانی ژیانم بوون، دەمەوێ بڵێم کە پێش زەمانێک، زەمانی گەنجێتی و تافی لاوی و جوانی ناونیشانی ژیانم بوون، من بەمجۆرە لە نێوان لێوە تەڕەکان و هۆڵەکانی رۆلێت و سەرخۆشی پیاڵەدا خۆم دابەش دەکرد، تامی هەنارم لەکاتی خۆی دەکرد، کە لەسەر دار دەردەکەوت، راوی ئاسکم لە پایزان دەکرد، ئەگەرچی ئاسک هەر تەنها لە بەهار دەردەکەوێت، من ناوی خۆم لەسەر لمی کەنار دەریاکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا دەنووسی، لەگەڵ هەموو ئەو گەردەلوول و شەپۆلانەش کەچی ناوی من لە یادەوەری ئەسکەندەرییە و ئابولی و مارسیلیاو لەشبونە و بەرشلۆنە و بەسرەو بەیروت هەر بە هەڵکەندراوی ماوەتەوە.

سەیرە هەزاران ساڵ بەسەر ژیانمدا گوزەری کردووە، من رۆژانێک ئافرەت و مەی خواردنەوەو قومار تەواوی

...ـە بوو، ئەوەی کـــە لە ...ەمـــووان زێتــــر جـــێگای ...ـەرسوڕمانە ئەوەیە کە مەی ...ـــێنێتـــەوەو قـــومـــار ...ـمێنێتـەوەو ئافـرەت هەر ...ـوێنیــشـــانی ژیانمە، بەڵام ...ـەوەی کـــــە ون دەبێ و ...ـمـــێنێ، واتە ئەو بزۆتە ...ـڕشنگدارەی کـــە لەو سێ چەپکە گوڵە دەمێنێ مانای «تێرمردن بوون»ە، «من تێر ...مردن بووم».

*** ئامـــۆبوون... بابۆ ئەو پرسـیــــارە بگەڕێینەوە کــە سەرەتا خستـمـانەڕوو، کە دەوڵەتێک هەر تەنهــا وەک رەعـیـەت سـەیری تاکـەکـانی خۆی دەکـات، یان لە کـۆیلە زێتــر نایانبــینێ، ئیــتــر لەلایەک بەختەوەریت کە لە ســـالی ١٩٩٩ ئەم وڵاتە بەجێ دەهێــڵی، لەلایەکی دیـکەش، کـــە رەنـگە لە یەکەمیان گرنگتر بێ ئەوەیە کـە لەبەدختـیـە شوێنی لە دایکبوون و زمان و زاراوەی خـۆت کـە زمـانی دایکتـە بەجێ بهێڵی. ئایا ئەوەی کە زۆر تاسەی دەکەیت زمانە، یــان شــــــــارە یــان هاوڕێکانت... هتد؟**

– من دوای ئەوەی براکەم و برازاکـــەم هەریەک پێنج گــوللەیان ئاراســــتـــەی ســـەرکـــراوو بەراشکاویش حکومـەت پارەی گوللەکـانی لێوەرگرتین، ئیتر لەو رۆژەوە ئێـــمـــە بەنـســـبـــەت ئەو خـوێنڕێژانە، گـەل نەبووین، ئێمە کۆیلەی ئەو سیستەمە گـــۆڕبەگـــۆڕەبووین. من لەو بڕوایەدام کـە بەڕاسـتی ئەو رۆژەی لە دەسـتـیـان رزگـارم بوو بەخـتـەوەر بووم ئەوەش بۆ ئێـــوە دەگـــەڕێتـــەوە بـەتـایـبــــــەتی هـاوڕێ «ســـربکولشـــتـــارتیش» لەوکاتەدا داوەتنامەیەکی بۆ رەوانە کــــردم بۆ ئەوەی لە کـــــــۆنـگرەیەکی ئەدەبی بەشداری بکەم بەڕاستی ئەو داوەتنامەیە لە کاتێکی زۆر گونجاو بۆم هات.

بەڵام بەنســـــبـــەت ئەو زمـانەی کـە لە دەســتم دا، وەک لە پرسیارەکەدا هاتووە ئێـــســـتـــا من لە وڵاتێکی دیکەی عـەرەبیـدام، زمـان هەریەک زمـانە بەڵام تەنهـا ئەو تاسەیەم دەمێنێتەوە کە بە بەغـــــداو بەســـــرەو هاوڕێکانم دەمبەستێتەوە تاسەی شەقامی موتەنەبی و مەیخانەکانی بەغداد دەکەم.

*** هەندێ لە کـتـێـبەکـانت لەگەڵ خـێـزانەکـەت «هەدبە حــــســـێن» بەیەکـــــەوە نووسیووتە، ئەویش چیرۆکی جــوان دەنووسێ، دەمـــەوێ بپـــرسم لەبەهرەی تۆو ئەودا جوتبوونێک هەیە، ئایا مـەسـەلەی نووسین بە «دووقـەڵەم» تەنهـا مـەسـەلەیەکی تەکنیکـیـە، یان شــتــێکی دیکەی وەک دوانەی پێک گۆڕینەوەویەکتر تەواوکردن و وەرگرتن و بەخشینی نێوان دوو عاشقی (کوڕو کچ)ە. رەنگە ئەوە شێوازێکی قووڵ بێ لە یەکـتــر دواندن و پێکەوە ئاخـافتن، یان داواکردنی حەقیـقەت بێ لە نێوان ژن و مـێـردێک کـە هەمـیـشـە تاسەی یەکتر دەکەن.**

– من کــــارێکی هاوبەشم لەگـــەڵ خێزانەکەم «هەدبە حسین»دا نەکردووە من چ لە ســـروشــتی نووسین و چ لە ناوەڕۆکـدا لەو ناوچم. ئەو بۆ خــۆی نووسـەرێکی کـارامـەیە، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـــــدا رۆژێـک لە رۆژان ئەو دوو قەڵەمە بەیەکەوە شتێکی هاوبەشیان نەنووســیــوە، رەنگە لە داهاتوودا ئەو کارە ئەنجام بدەین.

*** پانتـــاییـەکی ئەدەبی خـرۆشـاو وروژاوو نیـمـچـە ئاشکرا لە شەقامی هارونە رەشـیـد و قـاوەخـانەی حەسـەن عـەجـەمی لە بەغـدا هەیە، رەنگە ئەو پانتـاییـە لە هیچ شـوێنێکی ئەوروپا، لەتەواوی دنیـــــادا نەبێ، لەوێ لەو پانتـاییـە ئەزمـوونگەرایە خوێندنەوەی قەسیدەو چیرۆک و بەشێک لە رومان بەشێوەی کۆد بەڕێوە دەچێ، ئامـانجی ئەو شـەونخـوونیـیـە وەک وەرگـێـڕو رۆژهەڵاتناس (سربکۆ) تەعـبـیـری لێ دەکـات «بەشـێـوەیەک لە شـێـوەکـان روونکردنەوەی تروسکە سیاسییەکانە،**

فەرمانڕەوا لە وڵاتانی عەرەبیدا لە ڕێگەی هەڵبژاردنێکی شەرعییەوە دەسەڵات ناگرێتە دەست، بەڵکو بەهێزی گوللە لاقەی دەسەڵات دەکات، ئەوەی بەهێزی گوللەش بێ، تەنها بەهێزی گوللە نەبێ دانابەزێ.

**وەک ئەوەی ڕێکەوتنێک لە ژێرەوە لە نێوان پیاوانی سانسۆرو نووسەردا هەبێ، تاکو ئەو ترووسکاییانە بچنە دەرەوەی ماڵ و بازار، وەک نوکتەیەکی سەرکەوتوو مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.**

- دەڵێم بەداخەوە قاوەخانەی (حەسەن عەجەمی) ئیتر تەواو بوو، هیچ ئەدیبێک دوای ڕوخانی ڕژێم ئێستا لەوێ دانانیشێ، ئەدیبەکان شوێنێکی دیکەیان هەڵبژاردووە، ئەویش قاوەخانەی «شا بەندەرە» و دەکەوێتە خاڵی بەیەکگەیشتنی بازاڕی سەراو شەقامی موتەنەبی، ئەوێ بازاڕێکی بەناوبانگی کۆنە کتێب فرۆشتنە.

بەڵام قاوەخانەی حەسەن عەجەمی هەتا ئێستا لە یادەوەری داهێنەراندا هەرماوە، پانتاییەکی حەقیقی گفتوگۆکردن و دەمەتەقێ و کەشفکردنی نهێنییەکان و دروستکردنی نوکتەی سیاسی بریندارکەر بوو، بەڵام ئەمڕۆ شتەکان گۆڕانیان بەسەرداهاتووە، دوای ڕووخانی ڕژێم و ڕەشبوونەوەی ئەو کابوسە ترسێنەرە هەندێک شت یادکردنەوەیان ترس دەخاتە دڵ، بەڵام لە قاوەخانەی شابەندەر هەتا ئێستاش گفتوگۆ کردن لەسەر ئەو کتێبانەی کە بەم دواییە لە جیهان دەردەچێ هەر بەردەوامە.

بەم دواییە پێش چەند ڕۆژێک لە بارەی کتێبەکەم «بەختەوەرترین پیاوی دنیا» کە «سربکو لشتارتیش) تەرجەمەی زمانی (سربی) کردووە ئاگادارم کردنەوە، هەڵبەتە ناتوانن زمانی (سربی) بخوێنینەوە، بەڵام من حەزم کرد لە بارەی ئەوەی کە لەمندا ڕوویداوە پێیان ڕایگەیەنم.

*** کورتە چیرۆک لە دنیای ڕۆژئاوادا فۆرمەکەی گۆڕاوە، ئێستا وەک ڕەگەزێکی ئەدەبی و دیاردەیەکی ڕۆشنبیری وێنەیەکی خێرا بەدەستەوە دەدات، «وێنەیەک کە خێرا دەردەچێ». هەموو ڕۆشنبیرێک ئەوانەی کە توانای جوان نووسینیشان نییە دەتوانن بینووسن و بڵاوی بکەنەوە، لەژێر ئەو ڕۆشناییە ئەگەر چیرۆکی عەرەبی هەتا ئێستا بەشێوە باوەکەی نموونەی کۆن دووبارە بکاتەوە تۆ چی دەڵێیت، ئایا فاکتەرە پیشەیی و شارەزایی و کارزانی لە شێوازو نووسین چیی لێ ماوەتەوە، ئایا ئەو جیاوازی و لەیەکچوونەی کە لە نێوان نموونەی ئەدەبی و ئەوەی کە بەتەقلیدی خۆرئاوایی ناوزەد دەکرێ و ئەوەی کە بەکەلەپووری خۆرهەڵاتی ناودەنرێ لە چیدایە؟**

**ئایا ئەو ڕەگە هاوبەشەی کە یەکیان دەخات. وەک مێژوونووسان دەڵێن ئەو ڕەگەیە کە خۆی لە حیکایەتی شەعبی کەلەپووردا حەشارداوە و بەشێوەی حیکایەتی خورافی و چیرۆکی ئاژەڵان و حیکایەتی فوکاهی دەردەکەوێت؟،**

- لە دنیای عەرەبیدا کورتە چیرۆک تەواو بەو شێوەیە گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، بەڵام مۆدێلێک هاتە ناوەوە ناوی چیرۆکی زۆر کورت بوو، یان کورتیلە چیرۆک، بۆ خۆی یارییەکی جوان و تەڕیوو لە دێرو وشەی کورت پێکهاتبوو، بەخێرایی تێدەپەڕی، بەخێراییش خوێنەر لە بیری دەکرد، من بۆ خۆم پێشتر چیرۆکی لەو ڕەنگەم دەنووسی، بەڵام زۆر بەراشکاوییەوە هیچ گرنگیەک لەو جۆرە نووسینەدا نابینم وەک (جان پول سارتەر فەیلەسوفی فەرەنسی) لە بارەی کورتە چیرۆکەوە دەڵێ کورتە چیرۆک وەک قورسترین هونەری نووسین دەمێنێتەوە. لە نموونەکانی پێشوشدا وەک پیشەو کارزانییەک دەردەکەوێت کە تەنها دروستکەری کارامە دەیناسێ، بەڵام چیرۆکی (گوزەرکەری خێرا) ئامانج ناپێکێ لە زۆربەی جاردا گوللەکەی لە جۆری موختار کوژدایە.

**تێبینی:**

ئەو گفتوگۆیە (بتیار تشتیکوفیج)ی سەرنووسەری ڕۆژنامەی ئەدەبی کە بەزمانی یوگسلافی سربی دەردەچێ لەگەڵ عەبدولستار ناسردا سازی داوە. خۆرهەڵاتناس (سربکۆلشتارتیش) کە کتێبیکی ئەوی لە (٤٤) چیرۆکی کورت تەرجەمەی زمانی سربی کردووەو لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەکی بەرفرەوان کە بەقەڵەمی خۆی نووسیوویەتی بڵاوی کردۆتەوە، ناونیشانی کتێبەکە (بەختەوەرترین پیاوی دنیا)یە، پێش ماوەیەک لەو بارەوە ڕۆژنامەی (الزمان) هەواڵێکی بڵاوکردەوە، ئەوەی سەردوە دەقی چاوپێکەوتنەکەیە.

**سەرچاوە:**

**ڕۆژنامەی (الزمان) ژمارە (١٨٩٨ / ٢٠٠٤/٨/٢٨) ل١١ ئەلف یا.**

# پاداشتی سیتای
# چیرۆکنووسی شەترەنج

**نافع دیبەگەیی**

چیرۆکەکان رووداوی راستەقینەن، بەتێپەڕینی کات لە بیر دەکرێن، ئەقڵمەندان و تەگبیرکەران ئەوان رووداوان وەک عیبرەت و سەرمەشقی داداتی مەبەست گێڕاویانەتەوەو دەگێڕنەوە، لە سینگەوە بۆ سینگی نەوەیەکی دیکە، بەر لە تۆمارکردن کەم و زیادی تێکەوتووە، میللەتانی گێتی هەریەکەیان سەرگوزشتەی مێژوویی و زادەی خودی تۆمارنەکراوی خۆیانیان هەیە، دیارە خودان داستان و رووداو تێ بزربوونە، بە ئەگەرو مەگەر وابوودو وا گێردراوەتەوە لەسەر شێوەی چیرۆک خەست کراوەتەوەو قالبی ئەو دەوروبەرەیان وەرگرتووە، کە تێیدان، بۆیە کوردەواری لە گێڕانەوەی چیرۆکەکاندا گومانێک دەهێڵێتەوەو گوتوویەتی «هەبوو نەبوو کەس لە خودا گەورەتر نەبوو» مەبەست لەوەدایە، تەنیا گوتەی خودا راستەو ئەوانی دیکە بای ئەگەرو مەگەر دەیانبزوێنێ، بێگومان گۆیندەی چیرۆکی عیبرەتدار یاخود دانەرەکانیان بەدرێژایی مێژوو



زۆرجاران لە دیوانی شاهانەو کۆچک و سەرای دەسەڵاتداران خەڵاتکراون.. جا ئەقڵمەندان قبوولیان کردبێ یان نەکردبێ گرنگ نییە، گرنگ لەوەدابووە زۆرجاران خەڵاتکراو گرەوی سامان و دارایی، یان گرەوی ئەقڵ و زانستیان لە پادشایان بردۆتەوە... نموونەی چیرۆکێک لەوانە چیرۆکی داهێنان و ئەفراندنی (چاتورانجا)، (چتۆرانکا)یە، کە بووەتە شەترەنجی ئەمڕۆمان.

ئەو چیرۆکە مێژوویێکی دێرینی هەیەو سەرچاوەکانیشی دەچێتەوە وڵاتی چین و ماچین و هیندستانەوە، ئەوە بەپێی شانامەی فیردەوسی و چامەیەکی هیندی بەناوی (بانا)و کتێبێکی هیندی بەناوی (هالایۆدها) و کتێبێکی دیکەی هیندی (بهاویشیاپوران) کە (گوتاما) دایناوە، سەرەڕای کتێبی (چەترەنگ نامە)ی فارسی چەند چیرۆکێک سەبارەت بەزادەو ئەفراندنی ئەو غامانە باس دەکەن، کە هەموویان کێشمە کێشمێک لە نێوانیاندا هەیەو لە سێ چیرۆک سەرچاوە دەگرن، کەوا دووانیان لە وڵاتی چین و ئەوی دیکەیان لە هیندستانە.. تانوپۆیان یەکە، گێڕانەوەیان جودایەو تەنانەت داهێنەری شەترەنجیش لێک جودا دەبێتەوە، بەپێی هەر چیرۆکێک کەوا دەبنە چەند کەسێک... کە یان وەزیرن، یان زاناو بلیمەتن، یاخود ئافرەتن.. وەک ساسای داهیر، شیرام، سینا، ژنی راڤانی پادشای لاسا لە هیندستان جگە لەوانە ژمارەی خانەکان غامەکانی شەترەنج زیادو کەم دەبن.. ئەوانەی لە چین و ماچین (٦٤) خانەن و ئەوەی هیندستان

**میللەتانی گێتی هەریەکەیا سەرگوزشتەی مێژوویی و زادەی خودی تۆمارنەکراوی خۆیانیان هەیە.**

(١٠٠) خانەیە دیارە (٦٤) خانەی ولاتی چین بەرەو فەلسەفەی (تاو)ی چینی و هەشت لاکەی (یانگ - ین) سەرچاوە دەگرێ لە گۆڕاحەکانی (مزاج) جەستەی گیانەوەران ساردیی و گەرمی، تاریکیی و ڕۆناکیی، زۆریی و کەمیی، چاکوخراپی... هتد کە فەلسەفەکەیان لە (٨) لایەکدا خۆ دەنوێنێ و هەر لایەکیش (٨) پارچەی تاکو جووتی تێدایەو بەمەوە سەرەنجام (٦٤) خانە پەیدا دەبێ و بەنەزەروان تالع و یەغبار باش و خراپ. ساغی و نەساغ لێرەدا خەست دەبێتەوە..

کەچی (١٠٠) خانەی هیندییەکانیش لە جەنگێکی مەیدانی و دووبارەکردنەوەی بەهێمای ئەندامەکانی بەرجەستە دەبێ، ئەوە سەرەڕای جوداییی لە ئەندامانی شەترەنج کە کۆمەڵێکن.. حوشترو فیل و ماین و ئەسپ و پیادەو قەلاو پادشاو وەزیرەکان ناوی شەترەج کە ئەمڕۆ بەرقەرارەو لەلامان ناسراو و، دیارە دەبێ ناوەکەشی هەر لە چین و هیندەوە بووبێت و، پتریش بەلای چین دەڕوات سەبارەت بە برگەبرگەیی ناوەکەی، کە ئەمەش یەک لە سیفەتەکانی زمانی چینی و ژاپۆنییە گۆتەیان برگەییە و بەجۆرێک نووسینەکانیشیان ئەو دیاردەیەی پێوەیە.. خاقانەکانی ولاتی چین پێیان گوتووە (چا - تو - ران - جا) بەدەنگی (چ)ی لای خۆمان نا، بەڵکو ئەو دەنگەی لە (ویچ)ی ئینگلیزدا هەیە (wich)... لە زمانی ساسنسکریتی بە (چتور - انکا) ناوی هاتووە، بەو مەبەستەی ئەوە لە (چوار - ئەندام) یان (چوار - پادشا) وە پاشکەوتبێ.. کەوا چوار ئەندامی (فیل و سوارەو پەیتوون و پیادە) تیر ڕۆڵ دەبینن، هەرچەندە لە فارسییەکەیدا بە (چەترەنگ) ناوی بردراوەو کتێبی (چەترەنگ نامەی) بەناونووسراوە.. باس لە غامەکانی (مباریات - gams) شەترەنج دەکات.. چەندان چیرۆک و سەرگوزشتە ناواخنی دەبێ نازایەتی و سوارچاکی، پادشای نەزان و وەزیری زاناو ژنی بلیمەت، پیتۆلی و ژیری زانایان، کوشتارو تالان و بڕۆ... پێکهاتەی چیرۆکەکانن.. جا ئەو چیرۆکانەو ئەو غامەیارییانە ژنێک بۆ مێردە پادشا دەست و پێ سپییەکەی داینابێ، وەزیرێک لەترسی دەسەڵاتی پادشا داینابێ، زانایەک بۆ خەڵات ڕێکی خستبێ.. هەموو ئەوانە لە چیرۆکی شەترنج گوتراون، بەمەستی ئەوەی پادشا فێر بکەن و بتوانێ بەرەنگاری دوژمن بێتەوە، یان دایکی خۆی پێ بڕوا بهێنێ.

هەروەکو لە بەراییدا گوترا زادەو بیرو هۆکارەکانی پەیوەستی.. ئەگەرچی گوتنەوەیان جودایەو لێرەدا یەک چیرۆکانە دەگێڕینەوە کورد گۆتەنی ئەگەر وابێت و مەگەر وانەبووبێت.

جەمهوور پادشایەکی هیندستان دەسەڵاتی دەکێشا هەر لە کشمیر تا دەگەیشتە ولاتی چین و شاری (سەندەلی) پێتەختی بوو.. کچێکی ژیری پادشایەک خێزانی بوو.. یەک کوڕی لێ هەبوو بەناوی (کوا).. هەندەی پێناچێت پادشا دەمرێ.. بێوەژن مێرد بەشووبرایەکی خۆی دەکاتەوە (مای) کە لە شاری (زەنبەر) دادەنیشت، لەوێش کوڕێکی دەبێ و دیارە سەری ویش دەخوات و ئەو مێردەشی دەمرێ و وەکو مێردەکەی دیکەی تەنیا کوڕێکی لێ پاش دەکەوێ بەناوی (تالخەند).. ئێستا بێوەژن لە دوو مێردان دوو کوڕی هەیەو، (کوا) حەوت ساڵ لە (تالخەند) گەورەترە.. دایکیان دەسەڵاتی پاشایی دەگرێتە دەست تا یەکێکیان شایستەی پادشایی دەبێ.. هەروەک وایە هەردووانیان

حـ...ن لە پادشایەتییەو هەریەکەیان لە جێگای ...ی خۆی.. کە گەورە ...ن حەق وایکرد (کوا) ...ێتە پادشا.. (تاڵخەند) ...زی دەبێ و ناحەزانیش ...گری شەڕ خۆش دەکەن و ...ێتە هەرا.. ئاڵاو رمب و چە...ڵ بەرز دەبنەوە بەمردنی (تا...خەند) و بەرتوبڵاو ...شکرەکەی بەئەنجام ...گات... لە دوورەوە ...سەر بورجی قەڵا ...یکیشیان چاوەڕوانی ئەنجامی شەڕە خوانەخواستەکانیان سەریان ...ێدەچێ... کە لەشکر گەڕاوە دایکیان، کە ئاڵای لەشکری تاڵخەندی نەبینی تێگەیشت کوژراوە.. ئەوەی لە دەستی هات کردی لە سووتاندنی کەلوپەلی خۆی شتی دیکەی کۆشک و هەوڵی خۆ فڕێدانی ناو ئاگرەکەیدا.. بەڵام نەیانهێشت و هەمیشە لەسەر ئەوە رشت بوو.. داوا لە (کوا) دەکات چۆن بووەو چی کراوە.. ئەگەر لە رووداوەکەی بڕوای نەهێنێ هەر خۆ دەسووتێنێ... بۆیە پادشا کوا دەست و پێوەندانی کۆدەکاتەوەو وەزیرەکان تەگبیری بۆ دەکەن.. زاناو بلیمەت و پیاوی ژیر ولات ئامادە دەکەن.. وەزیرەکەی ساسای داهیر. بلیمەت و زانایەکی ولات بەناوی (سیتا) رادەسپێرێ شتێکی وا بکات دایکی پادشا قەناعەت بێنێ کە تاڵخەندی کوڕی نەکوژراوە، بەڵکو لە حەسرەتان گیانی دەرچووە کاتێ لەشکرەکەی شکاوە.. (سیتا)ی زانا بە ئەقڵمەندیی خۆی جەنگەکە لەسەر شێوەی جەنگێکی بچووک و دووبارەو سێ بارە دەکاتەوە یارییەکی لەسەر شێوەی چەند غامێک پێکدێنێ، کە فیل و حوشترو سوارەو پیادە تێیدا رۆڵ ببینن لە پانتایی مەیدانێکدا کە دابەشی کردبوو بۆ (١٠٠) بەش و لە هەر بەشێک ئەندامێکی دانا.. کە داهێنانەکەی تەواوکرد ئینجا لە بەردەمی پادشاو وەزیران و لەشکرو بەردەم دایکی پادشا جووڵەی بەئەندامەکان دەکرد... بەو جۆرە رێکی خستن. لەهەر لایەکدا دوو لەشکری ئاوا دەکرد پادشاکان دەکەوتنە نێوەندی مەدانەکەیان یان گۆڕەپانەکە وەزیرەکان لای راست و چەپ، دوو فیل هەریەکەیان لەسێ خانەدا هاتووچۆیان دەکرد.. دوو حوشترو سوارەیان لەسەربوو، ریزی دواتر دوو سوار ماین و لەم لاو ئەولایان دوو پاڵەوان دانران، بەرەو راست و چەپ دەجووڵان، ئەنجا لەبەردەم هەموو ئەوانە دوو ریز پیادە رێکخران، ئەنجا سیتا بە پێی پێویست فەرمانی بزواندنی هەریەکە لە ئەندامەکانی دەدا، غامەکانی شەترەنج دەستی پێکرد هەریەکە لە بوارو ئاراستەی خۆی دەبزووێ ئەمیان ئەوی دەخواردو دەبزان.. کار گەیشتە ئەوەی لەشکرێک هەرەسی هێنا تەنیا پادشاکەی لە نێوراستی مەیدانەکە بەجێما.. ئەویش دیارە تاڵخەندە بەبێ برینداربوون و لێدان.. هەر دەبێ لە حەسرەتان مردبێت... بەمەوە دایکی کوا سەرنجی دەداتێ و چەند جارێک دووبارەی دەکەنەوە بۆیە ئەمجارەیان ئەو یارییە راستەقینەیەی بەنموونە بۆ بچووک دەکەنەوەو لە داری عاج و ئەبەنووس نموونەی حوشترو ئەسپ، سوارە، پیادە، پادشا، فیل.. دروست دەکەن لەگەڵ پانتاییەکی دابەشکراو بۆ (١٠٠) خانە.. ئەنجا دایکیان خۆی پێ خەریک دەکات شەوو رۆژ بەڵکو بەتەواوی دڵی ئۆخژی بێت کە تاڵخەند نەکوژراوە، بەڵکو خۆی مردووە لە حەسرەتان.. بەمجۆرە دایکی خەریکی ئەوە دەبێ و دڵی پێی ئۆقرە دەگرێ..

ئەو یارییەی کە **بچووک** کراوە، بچووکترو **ئاسانتر دەکرێت و ژمارەی**

ئەو یارییەی کە بچووک کراوە، بچووکترو ئاسانتر دەکرێت و ژمارەی ئەندامانیشی بۆ ئاسانکاری و زوو فێربوون کەم دەکرێتەوەو تاکو لە شێوەی شەترەنجی ئێستا ماوە..

ئەندامانیشی بۆ ئاسانکاری و زوو فێربوون کەم دەکرێتەوەو تاکو لە شێوەی شەترەنجی ئێستا ماوە.. سەبارەت بەو کارەی وەزیر (ساسای داهیرو) و پێتۆلی و زانایی و ژیری (سیتا).. پادشا کوا دەیەوێ باشترین خەلای سیتا بکات.. کە بووە مایەی بڕوایی هێنانی دایکی لەلایەک و فێرکردنی هونەری جەنگ لەلایەکی دیکەدا.. لێرەدا پادشا داوا دەکات (سیتای) داهێنەر بەگەورەترین خەلات پاداشت بکات و پێی دەڵێ.. ئەی سیتا دەمەوێ لەو کارە گەورەو گرنگەت کەوا (چتورانکا)ت داهێناوەو بووە مایەی دلارامی دایکم و وەکو دانەیەکی هەمیشەیی هونەری جەنگە بۆ هەموو پادشاو سەرکردەکان.. پێم خۆشە لە بەردەم هەموو ئامادەبووانی لە پادشاو دەسەلاتدارو سەرکردەکان ماڵی دنیا بخوازی سیتا ماوەیەک بێدەنگ دەبێ و بیردەکاتەوە.. پادشا پێی دەڵێ شەرم مەکەو مەشترسە گەنجینە و سامانی من یەکجار زۆرەو بڵێ.. سیتا لە دڵی خۆیدا دەڵی ئەو پادشایە گەمژەیە و نەزانە دەیەوێ بەماڵی دنیا خەڵک قەناعەت بهێنێ و خەلاتم بداتێ وەک ئەوەی ماڵ و سامان هەموو شتێک بێت، وادەزانێ ئیدارەی وڵاتی بەماڵ و سامانی ئەوو دەسەلاتی ئەوەوە وەستاوەو ژیریی و دانایی و زیرەکی ئەقڵ مەندانی بەبیردا نایەت، بۆیە واچاکە لێرەدا وانەی ئەقڵ و زانستی فێر بکەم..

پادشا ماوەیەک لێ بێدەنگ دەبێت و ئەنجا دەڵێ دەی سیتا بۆ وەڵام نادەیتەوە، دیارە هیچ شتێک لە گەنجینەی شاهانەی من رانابینی؟... سیتا دەڵێ پادشام من بەئەقڵ و ژیریی و زانست ئەو (چتورانکا)یەم داهێناوە بۆیە دەشمەوێ خەلاتەکەشم لە رێگەی ئەقڵ و زانست بێت و ئەو خانانەی چیتورانگا دەبینی..! من بۆ هەر خانەیەک لەو خانانە چەند جارەی دەنکە گەنمەکانم دەوێ، لە خانەی یەکەم دەنکە گەنم و لەخانەی دووەم (٢) دەنکە گەنم و لەخانەی سێیەم (٣) دەنکە گەنم و لەخانەی چوارەم (١٦) دەنکە گەنم.. بەمجۆرە پادشا قسەکانی بەسیتا دەبڕێت و پێی دەڵێ بەسە بەس دەنکە گەنمم بۆ بژمێرە.. دیارە تۆ گاڵتە بەپادشایەتی و سەرەوت سامانی من دەکەی.. وام زانی فەیلەسوف و زاناو دانای.. بەلام کە وانەبووی.. ئەنجا پادشا داوا لە ژمێریاران دەکات بیبەن دەنکە گەنمەکانی بۆ بژمێرن و ئەگەر کەمیش بوو خوزارێکی گەنم بدەنێ.. ژمێریاران دەست دەکەن بە ژماردنی دەنکە گەنمەکان بەو پێیەی سیتا باسی کردبوو جەنجارەی خانەی دووەم و سێیەم.. هتد بەمجۆرە خەریک دەبن...

پادشا لەسەر خواردنی نیوەڕۆدا سیتاو خەلاتەکەی دێتەوە بیرو روو لە خەلکەکە دەکات بەپێکەنینەوە دەڵێ سیتا بەخۆی و خەلاتە کەم بایەخەکەی لە مێژە رۆیشتووە.. وەلامدراوە پادشام وا ژمێریاران و بیرکاران خەریکی حیسابن پادشا سەری سوڕماو گوتی حیسابی چی چۆن تائێستا بەرێتان نەکردووە دەبڕۆن بارێکی گەنمی بۆ بار بکەن... هەر بەمجۆرە ژمێریاران و بیرکاران بەردەوام دەبن لە ژماردنی داواکەی سیتا.. شەو کاتی نووستنی پادشا دیسان داواکەی دێتەوە بیرو دەڵێ خۆ سیتا بەرێکراوە.. وەلام دەدرێتەوە.. تاکو ئێستا بە بەردەوامی بیرکاران حیساب دەکەن.. پادشا دەڵێ لەوە زۆر سەرم سوڕماوە ئەم حیسابە دەبێ چی بێ و دەڵێ... بەیانی کە لە خەو هەستام سیتا کاری تەواو نەکرابێ ئەوا لەسەرتان دەدەم... بیرکاران و ژمێریاران بەگەرمی خەریکی حیساب و ژماردن دەبن.. لە ترسی فەرمانی پادشا بەیانی زوو سەرۆکی بیرکاران و وەزیران دەچنە خزمەت پادشا کە هێشتا لەخەو هەلنەستاوە.. ئەنجا لەگەڵ هەلستانی لێی دەچنە ژوورەوە دەڵێ.. پادشا دەڵێ چییە وا بەو زوویەوە هاتوون خۆ شتێک رووی نەداوە، بەلام پێش ئەوە پێم بڵێن سیتانان بەرێکردووە بەخۆ بەبارە گەنمی ئەوانیش دەڵێن پادشا بۆ ئەوە هاتووین و، گوتمان تاکو ئەمرێکت دەرنەکردووە خۆ بگەیەنینە نێو دەستی تۆ. نەخێر سیتا نەرۆیشتووە.. پادشا گوتی، لە گەنجینەو عەمبارەکانی من بای سیتای گەنم تێدا نییە بۆ نایدەنێ؟ .. وەلامیان داوە و گوتیان پادشامان جێبەجێکردنی داواکەی

...ێت نە تواناو دەسەڵاتی تۆو هیچ ...تێیەکی دیکەدا نییەو ئەو دەنکە ...نەی سیتا داوای کردووە لەسەر ...ووی زەمین بەدەست ناکەوێ..! ...تش هەناسەیەک هەڵدەکێشێ و ...ێ دەیباتەوە و پاشان دەڵێ پێم ...ێن ئەو ژمارەیەی داوایکردووە چەندە؟

وەڵام دەدرێتەوە پادشای گەورەمان ئەو ژمارەیە بەپێی ...نستی بیرکاری ئەمڕۆمان ...خوێندرێتەوە بەڵام بەنووسین بەمجۆرەیە:

٧٤٤ . ٧٣ ٧٠٩ ٥٥١ ٦١٥

٤٤٦ ١٨ هەژدە کوینتلیۆن و چوارسەدو چل و شەش کوادرلیۆن و حەوت سەدو چل و چوار تریلیۆن و حەفتاو سێ بلیۆن و حەوت سەدو نۆ ملیۆن و پێنج سەدو پەنجاو یەک هەزارو شەش سەدو پازدە*

**پەراوێز**

* بۆ خوێندنەوەی ژمارەی وا گەورەونەو بێ شومارو بۆ زانیاریت دەتوانی چۆنییەتی خوێندنەوەو رەنووسکردنی بزانی لە نووسینێکمان لە گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی ژمارە(١٣)ی ٢٠٠١ (ل٨٨)

دەنکە گەنم و ئەوەش لە عەمبارێکدا جێگەی دەبێتەوە کە بەرزی و پانی درێژییەکەی ٤م.
١٠م، . . . . . . . . . . ٣٠٠م
بێت واتە . . . . . . . ٣٠٠کم و ئەو ماوەیەش درێژترە لە دووری نێوان خۆرو زەمین و قەبارەکەی دەکاتە
. . . . . . . . . . . . ١٢م٣
یان . . . . ١٢کم٣ کەوا قەبارەی ١م٣ جێگەی . . . . . . ١٥ دەنکە گەنم دەبێتەوە.. پادشا لەمە حەسرەت ئەو ژمارەیە شڵەژا.. و گوتی بەڕاستی من داواکەی سیتام زۆر پێ کەم بوو، وادیارە ئەو راستیکرد چۆن بەعەقڵ و زانست چتورانگای داهێنا بەو شێوەیەش خەڵاتی کردووە.. ئاوا سیتا بەماڵی دنیا لەگەڵی نەکردم، بەڵکو بەئەقڵ و زانست لەگەڵی کردم.. بەڵێ کار هەیە نەدەسەڵات و نەماڵی دنیا دادی نادات.. تەنیا ئەقڵ و زانست خۆی نەبێت.. ئەنجا هەموو وەزیرو بیرکارو ژمێریارانی بەدەوری خۆی کۆکردەوەو گوتی تەگبیرێک.. بەڵام بەزانست و بەژیریی.. وەڵامدراوە پادشامان مادام تۆ ئەقڵ و زانستت سەرپشک کرد ئەوا چارەسەری ئاسانە.. هەرچەندە فەرمانەکەت جێبەجێ نابێ... چونکە ئەگەر هەمووو رووی زەمین بەدەریاو وشکایی بکرێتە کێڵگەی گەنم ئەوا هەر بەشی ناکات... مەگەر بە چەندان ساڵان ئەوە بدرێت، بەڵام هێشتا ژماردنی ئەو ژمارەیەی کە سیتا داوای کردووە ستەمە.. چونکە ئەگەر لە هەر چرکەیەکدا دەنکە گەنمێک بژمێردرێ ئەوا لە یەک رۆژدا واتە (٢٤) کاتژمێر تەنیا (٨٦٤٠٠) دەنکە گەنم دەژمێردرێت و (١)م٣ گەنم بەشەش مانگ دەژمێردرێت، هەمووشی بە ٨٥٤ ٧٧٥ ٨٠٧.٥ ٢٣٦ . ٧٢ . ٩٢٢٣٣٧٢٠ساڵ تەواو دەبێت دیارە ئەوەش ستەمە.. با وەڵامی ئێمە هەموومان بۆ سیتا ئەوە بێت.. با سیتا بێت هەر لە ئێستاوە بەبەردەوامی گەنم بپێوی و بیبات.. لێرەدا پادشا دەڵێ ئەنجا سیتا وا هاتمەوە سەرخۆ هەر چەندە سیتا توانی خەڵاتەکەم رەت بکاتەوەو بیسەلمێنێ کە لە دران نایەت.. بەڵام بانگی سیتا بکەن... و سیتا ئامادەبوو.. پادشا گوتی سیتا خەڵاتەکەت دەدەمێ بەو مەرجەی خۆت بیژمێری.. سیتاش گوتی: بەڵێ پادشام چۆن دەزانم ئەو خەڵاتە بەتۆ نادرێت ئاواش دەمزانی بەکەس ئامادە ناکرێت و ناژمێردرێت، بەڵام مەبەستم بوو زانست و ژیریی بەتۆ بناسێنم..

ئەو ژمارەیەی کاتی خۆی سیتا داوای کردبوو بەپێی ژمێریاری و سیستەمەکانی خوێندنەوەی رەنووسەکان ئەمڕۆ بەمجۆرە دەخوێندرێتەوە بەسیستەمی. (١٨) کوینتلیۆن و (٤٤٦) کوادرلیۆن و (٧٤٤) تریلیۆن و (٠٧٣) بلیۆن و (٧٠٩) ملیۆن و (٥٥١) هەزارو (٦١٥) دەنکە گەنم.

ئەوەش خەڵات و پاداشتی چیرۆکنووسی شەترەنج کە نە پەیدا دەبێت و نە دەژمێردرێت و نەدەدرێت.

# بەشێک لەمێژووی
# جلوبەرگی ئافرەت

جەلیلی ضیاء پور
و: لەفارسییەوە وریا قانیع

شوێن پێهەڵگرتنی مێژووی جلوبەرگی دانیشتوانی هەر ناوچەیەک(کە لە سەرەتاوە بەچ شێوەیەک بووە بەچ جۆرێکی دیکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە) ئەمە کارێکە کە شایستەی لێکۆڵینەوەو وردبوونەوەو سەرنجدانە. مرۆڤ لەوکاتەوە کە ڕووتبووە هەستی بەشەرمەزاری خۆی کردووە. بەو هۆکارو کەلوپەلانە کەلەبەر دەستیا بووە خۆی داپۆشیوە. لە گەڵای دارەکانەوە بگرە تاکو سەردەمی بەکارهێنانی چەرم(دیاری خواوەندی خوای تەورات)- سەردەمی ئەشکەوت نشینی- مرۆڤ تاوەکو ئەمڕۆکە سوودی لێوەرگرتووە. کچەکانی حەواش (کە هاوبەشی ژیانی پیاوان بوون) لە حەوای گەورەوە(کەدایکی هەموو مرۆڤە) پەیڕەوییان لێکردووە و چاویشیان لێکردووە. لەماوەی ڕۆژگاردا بەکەلوپەلی جۆر بەجۆر خۆیان داپۆشیوە،

بەڵام لەڕاستیدا چۆن و بەچ کەلوپەلێک شەرمی خۆیان داپۆشیوە.

ئەمە سەر گوزەشتەیەکە کەسەرەتایەکی تاریکی هەیە، ئایا جلوبەرگی ئافرەتانی ئەو وڵاتە لەپێش هاتنی ئارییەکانەوە کە کۆچەر بوون بەچ شێوەیک بووە؟ ئەویش تاریک و تەم و مژاوییە.

ئەوبۆچوونانە کە پشت بەزەمینەی نەژاد شناسی و مرۆڤناسی ، کار ئاسەکان دەبەستێت(کەباوەڕی کۆچکردنی بەشێک لەهۆزەکانی باکوور ئارییەکان- بەرەو ئەم ناوچەیە= بانەکانی- سەرزەمینی وڵاتی ئێران بەهێزتر دەکات). لەبارەی چۆنییەتی جلوبەرگییانەوە لەو ڕۆژگارەدا هیچ زانیارییەکی ڕاست و دروست بەدەستەوە نادەن، بەڵام هەوڵ و تێکۆشان و بەدواداگەڕانی دێرینە ناسان، توانیویانە شوێن پێیەک بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەک بۆ هزرو چوونە نێو دەروونی سەدەکانی ڕابوردووە دوورەکان بەدەست بهێنن.

گیرشمن دەنووسێت: بۆ یەکەمجار لەئێراندا(لەهەڵکۆڵین و پشکنینی ئەشکەوتی- تنگ پیدە Pabda- لەچیاکانی بەختیاریدا کە کەوتووەتە باکووری خۆرهەڵاتی شوشتەر) شوێنەوارێکی پاشماوەکانی مرۆڤی ١٠ تا ١٥ هەزار ساڵ پێش زایینەمان دۆزییەوە لەو شوێنەدا مرۆڤ بۆ ئامادەکردن و بەدەستهێنانی خۆراکی خۆی دەستی بەڕاوکردووە.

لەم کۆمەڵگا سەرەتاییەدا، ژن ئەرکی تایبەتی هەبووە: (وەکو چاو دێریکردنی ئاگر، دروستکردنی دەفری سواڵەتین، کۆکردنەوەی ڕیشەی گیا خۆراکییەکان، ناسینی گیاو کاتی سەوزبوونیان لەئەستۆدابوو) ئەو دانەوێڵانە کەبەدەستییان دەهێنا . بەهۆی چاودێری هەمیشەیی، ئافرەتیان بۆ ئەزموونگەری چاندن و ناسینی وەرزەکان ڕێنومایی کرد.

لەسەردەمی ئەشکەوتنشینیدا ئافرەت بەهۆی ڕاپەڕینی ئەرکەکانییەوە دەسەڵاتی خۆی ڕوونتردەکردەوە. دایکسالاری ئافرەتان، ئافرەتیان گەیاندبووە پلەو پایەی ڕۆحانییەت. چونکە ئافرەت بەگوێزەرەوەی خوێنی تیرە بۆهاو تیرەی خۆی دەژمێردرا زنجیرەی پەیوەندی بنەماڵە بەهۆی ژنەوە پێکدێت.

لەدواییدا زانرا و بەرچاویش کەوت، کە گرنگیدان بە پێشڕەوایەتی ئافرەت یەکێکە لەکاروباری تایبەتی دانیشتوانی بانەکانی ئێران، لەدواییشدا داب و نەریتی ئارییە داگیرکەرەکان شوێنی خۆیان لەنێوان دوو ڕووباردا کردەوە. ( کە دانیشتوانەکانیان لەهەمان سەرچاوەی دانیشتوانی بانەکانی ئێرانەوە هاتبوون) باوەڕیان بەوە هەبوو کەژیان دەستکردی رب النوعه = نیمچە خوایەکە.

پێش لەمێژوو لەناو ئەم بانانەدا، چەندین هەیکەلی بچووکی نیمچە خواکان بەساغی دۆزراونەتەوە. (کە نیمچە خوای دیکە) بوونی ئەم هەموو نیمچە خوایانە ئەو مۆڵەتەمان پێدەدات، کە باوەڕمان بەوە هەبێت دانیشتوانی پێش مێژووی بانەکانی ئێران، باوەڕێکی وەکو باوەڕی دانیشتوانی پێش مێژووی نێوان دوو ڕووباریان هەبووە.

لەبارەی شناسنامەو پلەو پایەی نیمچە خواکانەوە لەنێوان کار ناسەکاندا بۆچوونی جیاواز هەیە. بەڵام باوەڕی گشتی لەسەر ئەوەیە کە: ئەم ژنە خوای سروشتە، پەرستنی لەنێو دانیشتوانی پێش مێژووی ئێران و وڵاتانی دراوسێی ئێراندا باوی هەبووە. لەدواییدا لەئەدەبیاتی داهاتوویاندا ناوی ئەم خوایە بەئەناهیتا براوە. لەوە دەچێت ئەم نیمچە خوایە هاوسەرێکی هەبوو بێت، کە ئەویش نیمچە خوایەک بووبێت. لەوکۆمەڵگایەدا بەمێردو منداڵی ئەو ژمێردرابێت. (بەبێگومان لەم ئایینزا سەرەتاییەدا کە ئێمە دەتوانین ژن و مێردایەتی نێوان براو خوشک بدۆزینەوە.)

> ئافرەت بەگوێزەرەوەی خوێنی تیرە بۆهاو تیرەی خۆی دەژمێردرا زنجیرەی پەیوەندی بنەماڵە بەهۆی ژنەوە پێکدێنێت.

ئەم داب و نەریتە لەخۆرناوای ئاسیادا باوی هەبووە. ئێرانییەکانیش لەهۆزە بوومییەکانەوە بەشێوەی(میرات) بۆیان مابووەوە هەروەها بناغەی ژن و مێردایەتی نێوان دایک و کوڕ، کە ڕابوردوویەکی کەمتری هەیە. دەبێت لەم ئایینەدا بەدوایدا بگەڕێین. کتێبی(ایران ازاغاز تا اسلام) تەماشا بکە.

لەبارەی تایبەتمەندییەکانی ئەم نیمچە خوایەی دایکەوە، ویل دیورانت، لەکتێبی(مشرق زمین گاهواره تمدن)دا دەنوسێت:

بەپێی ئامارێکی ڕەسمی لەبابل(کە لەسەدەی نۆهەمی پێش زایینیدا کراوە) ژمارەی خواکان نزیکەی ٦٥٠٠٠ بوون. کە بۆ گەورەو گرنگترینیان وەکو(شمش، نەنار، عەشتار) چەندین پەرستگا دروستکرابوو ئەم خوا زۆرو زەبەندانە لە دانیشتوانەوە دوور نەبوون. زۆربەیان لەسەر زەوی و لەناو پەرستگاکاندا دەژیان، بەوپەڕی ئیشتیهایانەوە خواردنیان دەخوارد، لەدیدارەکانی شەوانەیاندا لەگەڵ ژنانی ئیماندارانیاندا دەیان دەکرد چەندین منداڵیان بەخەڵکی بابل دەبەخشین.

عەشتاری (خوای مێینەی هەموو شارەکان- کەهەمان ئەستارتی یۆنانییەکانە As-tare و عەشورەتی، یەهودییەکانە Ashtoreth) گرنگی ئەو هەر تەنها ئەوە نەبوو، کە خوای جوانی و ئەوینیشە، هەم خوای میهرەبانی و دایکایەتییە، سروشدەری نهێنی و بەپیت و بەرەکەت کردنی خاک، دروستکەری توخمەکانی جیهان بووە. بەڵکو خوای جەنگ و ئەوین بووە.

لێکۆڵینەوەو بۆچوونە سەرنج ڕاکێشەکانی دێرینەناس (گیر شمن) ئەوە ئاشکرا دەکات کە: مرۆڤە سەرەتاییەکانی وڵاتی ئێمە بۆ ئاراستە کردنی هزری لێکۆڵەرەوانی خۆیان (کەیەکەم خوای مرۆڤ چ کەسێک و چۆن بووە). ژن کە خاوەنی ئیمتیازێکی بەرجەستەی زاوزێیە هەڵدەبژێرین. یەکەم ئافرەتیش بەدایکی هەموو مرۆڤ دەزانن (بە حەوای تەوراتی ناسیوەو بەرجەستەی دەکات) ئافرەت کەلەیەکەم خولی دایکسالاریدا لەبەر خاتری ڕاپەڕاندنی مەسەلەکان کاروبارو فەراهەم هێنانی بەختەوەری و فراوانی، بەخاوەنی دەسەڵات و بەشایستەی ڕێزلێنانی

دەناسێت، وردە وردە دەیداتە بەر باری سەرنج و پەرستن، چەندین نموونە لەشێوەی ئەو، لەرووی زاوزێوە بەدایکی هەموو میهرەبانی هەموو زیندەوەرانی دادەنێت. وابەرچاو دەکەوێت کە ئەندێشەی خودایەتی دایکی دایکەکان، دەبێت لە رۆژگارێکی کەمتردا بێتە ئاراوە، کە مرۆڤە سەرەتاییەکان، رووت، یان نیوە رووت بووبن، هە بەو شێوەیە کەلە دایک بوون دروستکراون، چونکە گەلێک لەپێش ئەو سەردەمە مرۆڤ جلوبەرگی داهێناوە بەیادی رابوردوو، کاریگەری باوەڕو پیادەکردنی باوەڕی (چاو بەچاو) لەسەر بناغەی بڕیارە ئاینییەکان سەرەڕای ئەمانەش بەهۆی کاریگەری و نفوزی خوایەکانی سەرزەوییەوە هێشتا نیمچە خوای دایک بەهەمان سەروسیمای دێرینی خۆیەوە هەیکەلەکانیان بە رووتی دروست کراون، لە دواییدا شەرم لە نێو کۆمەڵگا وردە وردە باوی پەیدا کردووە. نیمچە خوای دایکیش جلی کراوەتە بەر. هەموو خواوەندەکان کراسی چەرمیان بۆ ئادەم و ژنەکەی دروست کرد. کردیانە بەریان، (ئەم زانیاریانە لەتەوراتەوە وەرگیراون) دووبارە ئەمەش یادەوەری سەردەمێکە، کە مرۆڤ لەدوای چەندین رۆژگاری رووتەڵەیی توانیوییانە لەچەرمی زیندەوەران جلوبەرگ بۆ خۆیان دروستبکەن.

بوونی هەمە چەشنەی ئەم نیمچە خوایانە کە بە جلوبەرگی چەرمینەوە دروستکراون، لەسەردەمی پێش مێژوو لە ناوچەکانی وڵاتی ئێمەو نەتەوەکانی دراوسێماندا، بەدەست هاتوون و دۆزراونەتەوە لایەنگیری ئەم بۆچوونە دەکەن، هەروەها هەیکەلە قورینەکان و بەردە مەرمەڕەکان و مسییەکان بەکراسێکی داوێن فراوان و بەردین بەشێوەیەکی سادە جلیان لەبەر دایە، کە لە پێش مێژووەوە لە گردۆڵەکانی حەساری داموغان دۆزراونەتەوە، پەیوەندیان بەسێ هەزار ساڵ پێش زایینەوە هەیە، (کریستن ویلسن، لە کتێبی مێژووی پیشەسازی ئێراندا ناوی بردوون و لێیانەوە دواوە.) ئەمەش خۆی لە خۆیدا زەمینەیەکی دیکەیە بۆ سەرنجدان لەم بۆچوونانە.

بەدەست هێنانی ئەم بەڵگانە کە پەیوەندیان بەسەردەمە جۆراو جۆرەکانەوە هەیە، بەهەر ئەندازەیەک کە رۆژگار تەی دەکەین. لەدوورەوە دەرکەوتنی تەم ومژاوی خوای دایک و بەپیت و فەرکردنی زەوی وزار بەتەی کردنی رۆژگارەکان بۆمان روونتر دەبێتەوە. خوا مێینەکان (کەلە دەستپێکردنی ئەندێشەی کۆمەڵانی خەڵکی پێش مێژووەوە لە مێشک و هزری مرۆڤدا لەدایک بووە) باشترین رچەیە بۆ دۆزینەوەی ئافرەتانی پێش مێژوو. لە رێگای ئاشنابوون بەم خوداوەندانەوە لە کۆمەڵگاکاندا- لەو کاتەوە کەئیمانیان هێنا بەوانەی بە بناغەی پشت بەستن بە ئیمان و مەزهەب. هەمیشە باشترین کەرەسەیان بۆ خواکان فەراهەم هێناوە- دەتوانین جلوبەرگ و خشڵە دەستنیشانکراوەکانیان بەباشترین جلوبەرگی ئیمانداران بزانین.

بۆ ئێمە هەندێک لەهەیکەلە گەورەکانی خوای جوانی و بەپیت و فەرکردنی زەوی، ئاناهیتامان بۆ بەجێماوە، کەچەند سیفاتێکی داوەتە پاڵ، لەگەڵ خوای عەشتاردا لێکچوونیان لەنێواندا هەیە، ئایا ئاناهیتا هەمان خوای دایک (عەشتار)ە؟..

(وەکو بڵێی یەکبوون یان یەکنەبوونی ئەم دوو خوایە، لە رێگایەکەوە کەبۆ شوێن پێهەڵگرتن و دۆزینەوەی سەرهەڵدان و داهێنانی جلوبەرگی سەرەتایی ئافرەتانی پێش مێژووەو گرتوویانەتەبەر، هیچ شوێنەوارێک نییەو هەرکەسیش دەتوانێت لەنێوان دوو کۆمەڵدا (کەلە رووی فەرهەنگەوە لەیەک دوورن یان نزیکن) بە سیفاتی جیاجیاو تایبەتی خۆیان بیان

لێکدانەوەی
بوون و هەبوون
و رووداوەکان
لەدیدو گۆشە
نیگای
خودێکی
پارچەپارچەکراوی
نێو فەزای
دەقەوە
سەرهەڵدەداو
کە تێڕوانینی
خەفەتبارترین
کۆژێنێوی شیعر
و پرۆسەی
نووسینە.

ناسێت، بەڵام بۆ ئەو کەسانە کە رووداوو چۆنییەتی گۆڕنکارییەکان لەسەر بناغەی گۆڕانکارییەکانی پێویستی کۆمەڵایەتی (دوور لەدەمارگیری) بکۆڵێتەوە چەندین زەمینە بۆ لێکۆڵینەوە هەیە، کە شێوە فراوانەکانیان (کەلە بناغەدا یەکێک بوون) ناتوانن رەچاویان نەکەن.

ئارییەکانی ئێران پێش ئەوەی بێنە ولاتی ئێرانەوە، یان ئەو ئاریانەی دیکە، کەچوون بۆ هیندستان، هەر باوەڕی ئایینیان لە نێواندا هەبووە.

مامۆستا پوور داود دەنووسێت: وردبوونەوە لە نووسراوی (یە شتەکان) لەوانەش بە داستانە میللیەکانی ناوی . ناچار دەبین بگەڕێینەوە بۆ سەردەمێکی گەلێک دوور، بدەینە بەر مەودای سەرنج و وردبوونەوە، تاکو بگەینە سەردەمێک کەهێشتاکو ئێرانییەکان و هیندییەکان لەیەک جیا بوونەتەوەو لەیەک شوێندا دەژیان، چونکە ئەم داستانە بە ئاشکرا لە (ریگ ویدا)ی بەرەهەمەنەکانیشدا هەیە تەماشا بەرگی یەکەمی یەشتەکان بکە.

لەولاتی دوایی ئاریەکاندا (ئێران) خەڵکانێک هەبوون کە لە رووی بەراوردەوە بۆمان دەردەکەوێت، کەخاوەن هەندێک بیروباوەڕ بوون کە گەلێک لەیەکترەوە نزیک و هاوشێوە بوون، ئەوەش کە ئارییەکان بیروباوەڕی ئایینی خۆیان بەسەر دانیشتوانی بانەکانی ئێراندا سەپاند. یان بوومییەکانی بانەکانی ئێران خزاونەتە نێو باوەڕی ئارییەکانەوە. بابەتێکی پێویستی بەلێکۆڵینەوەو پسپۆڕی تایبەتی هەیە، بەلام گەلێک لەو خوایانە کەلە ئایینزای پێش مێژووی ئارییەکاندا هەبوون، لەرووی ژمارەیانەوە لە خواکانی دانیشتووی بوومی بانەکانی ئێران و دراوسێکانیان کەمتر بوون.


جلوبەرگی کچانی کورد لە ساڵی ١٢٧٥ی کۆچی هەتاوی لە ئێراندا

لەبەرگی یەکەمی (یەشتەکاندا) نوسراوە: (زیاد لە یەشتەکان سرووده ئایینیەکان چەندین ناوی خوداکانیان تێدایە، کە سی رۆژەی مانگ بەناوی ئەوانە ناونراون.) زۆربەی ئارییەکانی ئێران خوا زۆروزەبەندەکانی خۆیان وردە وردە کەمدەکردەوە، بەرپرسیایەتییەکانی ئەوانیان بەچەند خوایەک سپاردووە، هەروەکو چۆن لە (هورمزیەشت)دا هاتووە کە: نزیکەی شەست ناویان بۆ ئاهورامزدا داناوە، هەموو ئەو خاسیەتانە کەشایستەی پلەو پایەی خوایە، وەکو زانا، توانا، میهرەبان، پێیا بەخشیوە. (یەشتەکان لاپەڕە ٣٠)

زەردەشت کە داهێنەری بیرو باوەڕی ئایینی بوو، لە راستیشدا دەبێت بەپێغەمبەرێکی شۆڕشگێڕی بناسین لەدژی هەموو گەندەڵ بوونێکی رەوشت راپەڕی، هەروەکو لەیەشتەکاندا نووسراوە، لەدوای دەرکەوتنی یەزدانی تاک و تەنها بەناوی ئاهورامزدا، (رابەری زانا) ناونرا. کۆمەڵێک لە خواکانی دێرین(دێوەکان: بەڕێ ونکەرو ئەهریمەن ناودەبران) رەدکرانەوەو لەناوچوون.

هەرلەسەر ئەم بناغەیەیە دەتوانین پەی بەوە ببەین، کە: (دەگونجێت ئاناهیتای خوای ئاوو فراوانی- کە خاوەنی کۆمەڵێک شتی هاوبەشە لەگەڵ خوای دایک- عەشتار، بەهەموو تایبەتمەندیەکەیەوە- بەهۆی ئامادەبوونی هەندێک لەکۆمەڵانی خەڵک، نفوزی بیرو باوەڕی روونی زەردەشت پاڵاوتەیەک بێت لەو) چونکە بەپێی ئەو بەڵگانەی لەبەردەستدان، خوای دایک ، خوای ئەوین و جەنگ، خوای جوانی بەژن و باڵا، سروش بەخشی نهێنی پیت و بەردکەتی خاک، دروستکەری توخمی گەردوون، لەهەمان کاتدا بە دایکی بنەماڵەی(هەردو)دەژمێردرا. نازناوی مەعشوقەی میهرەبانیشی هەبووە.

لەیەشتەکاندا دووبارە، خوای ئاناهیتا(کەبەپێی ئەفسانەیەکی ئیسلامی ئەستێرەی زوهرە،- بغدخت ئاناهیت-

یانی بەکچی خوا ناونراوە) خانمێکە بەژن و باڵا جوان و سروشت جوان، بەسینگی بەرجەستەوە فەرمان ڕەوایی(با) و هەورو باران و مانگ و فراوانکەری، گەلەو ڕەوگ و سامان و وڵات خاوێنکەرەوەی بەرزی هەموو پیاوان و(مشیمە= وێڵداش)ەو ئەو کەسەیە کە زاووزێی هەمو ژنان ئاسان دەکات لەکاتی پێویستدا شیربە هەمووژنانی دووگیان دەبەخشێت.

(ئاهورامزدا بەزەردەشتی وت، ئەمە بۆمن ئەی زەردەشتی ئەسپنتما، ستایشی ئەم لەشکرە سوورەی ئاهیدە بکە، کەسێکە، کەبەهەموو ناوچە فراوانەکاندا دەرمان دەبەخشێت و دوژمنی دێوەکانەو ملکەچی ئایینی ئاهورایە، شایستەیە کەهەموو جیهانی مادی ستایشی بکەن. شایستەیشە کەلە جیهانی مادیدا، ستایشی بکەن و داوای پاڕاندنەوەی لێبکەن.

پیرۆزەیەکە کە گیان دروستکەرو پیرۆزەیەکە کەپەرە بەگەلە و ڕەوگ دەدات، پیرۆزەیەکە کەگەشە بە سامان دەدات، پیرۆزەیەکە کە وڵات فراوان دە کات. کەسێکە(تۆو)ی هەموو پیاوان خاوێندەکاتەوە، کەسێکە کە (پەرەوڵ= وێڵداشی منداڵ)ی هەموو ئافرەتان بۆ زاوزێ پاک دەکاتەوە، کەسێکە کە زاووزێی هەموو ژنان ئاساندەکات. کەسێکە کەبەهەموو ژنانی دووگیان لەکاتی پێویستدا شیر دەبەخشێت).

گیرشمن لەکتێبی(ایران ازاغاز تا اسلام) ئاماژەیەکی بۆ نیمچە خوای دایک کردووە، کە خودی خۆشی دەڵێت لەوانەیە ئاناهیتا بێت و دەنوسێت :(لەشووشدا هەیکەلێک لەگڵی سوورەوەکراو دۆزرایەوە(پەیوەندی بەسەردەمی ئەشکانییەکانەوە هەیە) لەکارگەیەکی هەیکەل سازیدا دۆزراوەتەوە، کە نیمچە خوایەکی ڕوت و قوت نیشان دەدات. کەبەدەستێکی مەمکی گرتووەو دەیگووشێت و شیرەکەی دەکاتە جامێکەوە کەبەدەستی چەپی گرتوویەتی . مامۆستا پووورداود، دەنووسێت:( ئەو تاریف و وەسفە، کە لە ئاوێستادا لەبارەی ئاناهیتا نووسراوە ئەو هەیکەلانەش کەلەم فریشتەوە بەجێماوە، ڕاستەوخۆ بیری مرۆڤ بەرەو خوای بابلییەکان (ایشتار= عەشتار) دەباتەوە، بەکورتی ئاماژەیەک بۆ ئەوە دەکەین کە ستایشی ناهید لەهەر سەدەیەکدا بردوی هەبووبێت بەشێک بووە لەئایینی ئێرانی دێرین. ناهید پەیوەندی بەکۆمەڵەی فریشتەکان و ئیزەدەکانی ئارياییەکانەوە هەیە) . دووبارە دەنوسێت: لەئاوێستادا سەبارەت بە فریشتەیەکی دیکەش کە پارێزەری ئاوە باسی لێوەکراوە. بە(ئاپام نەپات) ناوبراوە. لە(ویدVidc)ی بەرەهەمەکانیشدا هەر بەوشێوەیە ناوبراوە. لەوێشەوە فریشتەیەکی نێرینە پەیدابووە.

دەبێت بیربکەینەوە ئایا دەگونجێت کە ئاپام نەپات لەرۆژگارێکی گەلێک دێریندا بەڕاستی فریشتەی ئاو بووبێت و بەهاتنە خوارەوەی ئارياییەکان بۆ ناو بانەکانی ئێران، بەرەو ڕووبوونەوەی باوەڕیان لەگەڵ دانیشتوانی بومی



-وچەکاندا و سوودوەرگرتن لەیەکتری و دەرکەوتنی زەردەشت پێغەمبەری شۆڕشگێڕ، کەهەموو خواکانی خۆیان و دەرەکییەکانی هەڵوەشاندنەوەو کردنی بەکرداری چاک و خراپ . ژمارەی ئەو خوایانەی- بۆ زیاتر سنووردارکردنیان- لەناو یەکتردا توانەوەو پەیوەستیکردن لە ئەنجامدا خوای عەشتارو (ئاناهیتا) هەڵبێتە کایەوە. بەرپرسییەتی ئاپام نەپاتیش لەو سەندرابێتەوەو، هەمووهونەرەکانی بۆ بەرانبەرەکەی گوێزرابێتەوە؟

لەهەموو روویەکەوە زنجیرەیەک بەسەرهاتی ورد، کە لە دەرەوەی باسەکەی ئێمەدایە، وادێتە بەرچاو بەگۆڕانێکی وردو لەسەرخۆ خوای دایک( عەشتار یا نیشتار) بووبێت بە ئاناهیتا، ئەگەر وەهاش نەبێت، بەهۆی ئەو پەیوەندییە زۆر نزیکانەوە، کە لەنێوان ئەم دوانەدا هەیە لەشیان لەڕووی جل و بەرگەوە دەتوانرێت بەهاوبەش، بڕیاریان لەسەر بدرێت لە گەڵ ئەو گۆزەئاوەدا کەبە دەستیانەوەیە هەروەها لەنەقشی رۆستەمدا بە (بازنەی پەیمان) هاتووە، کەیەکەمەکەیان پەیوەندی بەسەردەمی ئەشکانییەکانەوە هەیە، دووهەمیان پەیوەندی بەسەردەمی ساسانییەکانەوەیە. گەلێک لەپێش مێژوودا(دوورلەو رۆژگارە کەبوونی دایکی ژیان- عەشتار- دێتە نێو هزری دانیشتوانی ئەم بانانەی ئێرانەوە.) تاکو رۆژگاری ناولێنانی نوێی بە ئاناهیتا ماوەیەکی دوورودرێژە، ئایا دانیشتوانی بانەکانی ئێران لەو رۆژگارەدا چییان لەبەردابووە؟. یان ئەو ئاریانە کەلەپێش ئەوەوە دێنە نێو بانەکانی ئێرانەوە چییان لەبەردەکرد.؟ ئەمەش پرسیارێکە کە کارناسان لەمڕۆوە، وەرامێکی ئاڵۆزو نادیاریان هەیە، دێرینە ناسەکان بەڵگەی گەلێک کەمیان لەبەردەستدایە، بەڵام هەر ئەو بەڵگە کەمانە ئەگەر لەگەڵ هەندێک لێکۆڵینەوەی زانستی وەکو مرۆڤناسی و زەویناسی و چەند بابەتێکی دیکەدا بەراوردیان بکەین، رێگای دەسگەیشتن بەئاوات و مەبەستمان بۆ تەخت دەکات.

ئۆمستد لەمێژووی شاهەنشاهی هاخامەنشییەکاندا بەگێڕاندنەوە لە زاری دوناڵد ماک کاونەوە، دەنووسێت:گەلێک لەپێش ئەوەدا کەئەم بانانەی ئێران ناویان لێبنرێت، خەڵکێکی زۆری تێدا دەژیان. لەچاخی کۆتایی سەهۆڵبەندانەکاندا گەلێک ئامێری بەردین لەبەرهەمی مرۆڤەکانی چاخی بەردینی نوێ دۆزراونەتەوە. لەنزیکەی هەزارەی پێش زایینیدا گەلێک دێهاتی بچووک هەبوون کەپەناگای مرۆڤی کشتیاربوون، کە هەورگەشیان زانیوە.( ئەو ماڵە سووتاوانەی دۆزراونەتەوە لەو گۆڕانکاریانەدا، کەلە هونەری



وێنەی جلوبەرگی ئافرەتانی رۆژگاری دەوڵەتی زەند، هێڵەکانی هاوتەریبی سەرسنگی لە شێوەی جلوبەرگی چەرکسییەکانەوە وەرگیراوە

هەورگەکانیاندا بەرچاو دەکەوێت) ئەوەمان نیشاندەدات کەئەو خەڵکانە ئازوو گوێزیان کردووە...

دووبارە دەنووسێت: زۆربەی ئارییەکان نیشتمانی خۆیان لە باکووردا بەجێهێشتووە، بەرەو ئاسیای ناوەندی رۆیشتوون. لە کێوە بڵندو بانەکانەوە( وەکو زنجیرە چیای ئەلبورز لەباکوورەوە، زاگرووس لەخۆرئاواوە) سەرکەوتوون، ناوەندی بانەکان بیابانێکی پان و بەرین بوو. کە رۆیشتن بەناویدا دژواربوو. لەشوێنێکدا دەریاچەیەکی سوێرو لە شوێنێکی دیکەشدا خاکی شۆرەزاری قاوەیی- مەیلەو سوور-دایدەپۆشی. چیاکانیش بەهەمان ئەندازە ، وشک و بێدارو درەخت و تەنانەت بە بێدەوەن بوون

دێرینە ناسەکان یەکەم شوێن پێی خەڵکی دانیشتوانی باکووریان لە بانەکانی ئێراندا دۆزیبیەوە، کە لەڕووی ئێسکی کەللە سەریانەوە نیشانیان داوە:( کەلە قەڵایەکی بورجدار لەداموغاندا

دۆزراوەتەوە. ئەوەش وا نیشاندەدات کە لەکتوپڕو ناکاودا پەلاماریان دراوە. جەستەی ئەو کەسانە کەپارێزگاری ئەم قەڵایەیان کردووە. لەگەڵ ژن و منداڵەکانیان دۆزراونەتەوە.)

ئۆمستد، دەنووسێت: ئارییەکان لەسەرانسەری مێژووی رابوردووی خۆیاندا. زیاد لەهەموو شتێک(گەلە) داربوون، واتە ئاژەڵداربوون، نوێترین دەستەیان، کە لە ئاسیای ناوەندیدا بەدوای ئامۆزا ئێرانییەکانی خۆیاندا هاتونەتە ناو بانەکانی ئێرانەوە(کیمرییەکان، واشگوزاکان، یان سکاکان بوون) جلوبەرگ و ڕەختی ئەسپەکانیان و کاردو سەرەگورزی جەنگی یان لەلوڕستاندا ماوەتەوە



جلوبەرگی ئافرەتی زەردەشتی لە ڕۆژگاری سەفەویدا

دۆزراونەتەوە.(خشەریتە، گەورەو گرنگترین کەسیان بووە کە بە فەرەوەتیش ناسراوە).

ئەوەکانی ئەو لەناوچەی(هگمتانە= هەمەدان، رگە وئازربایجانی ئەمڕۆکە دەوڵەتیان هەبوو، فەرمانڕەواییان دەکرد) لەم سێ ناوچەی خاکی (ماد))دا چەند تیرەی جیاجیا لەخەڵکی ماد وەکو(بوسیی، پارتا کسنی، سترو خاتسی، ئاریزانتی، بودییەکان) هەبوون، بۆیەکەمجار مادەکان و پارسەکان لەساڵنامەی ئاشووری(لەرۆژگاری شەلمانەسری سێهەم لە(٨٣٦ پ ز لەبارەی پاشاکانی پارسووا، کەلە خۆرئاوای دەریاچەی ورمێ باجیان سەندووە) باسیان لێوەکراوە، شەش ئەدادی پێنجەم، لەنزیکەی ٨٢٠ پ ز، ئەوانەی لەو شوێنەدا کەئێستاش (پارسواش)ی پێدەڵێن لەلای باشووری-ئانور= کرماشانی ئەمڕۆکە) دۆزییەوە لە ٧٣٧ پ ز، تگلات پلیسری سێهەم لەپارسوای ئەسڵیدا دەستی بەتاڵان و بڕۆو هێرش و پەلامارکرد( نووسەری ئاسووری لەباتی پاریس ناوی دیرینی گووتی بەکارهێناوە).

ئەم دوو کۆمەڵە ئارياييەی (ملدکان و پارسیەکان) هێشتا لەجێ گۆڕیندابوون. کە پارسەکان لەرێبازگەی خۆیانەوە بەرەو باشوور (لەگەڵ هەموو تیرە جیاجیاکانی خۆیاندا) دەرێژەیان بەڕۆیشتندا.

(مارانییەکان، ماسپییەکان پانسالییەکانی کشتیار، دروسیانییەکان و گرمانییەکانی دانیشتووی دەشتەکانی کرمانی ئێستا، لەتیرە گەلە دارو بیابان نشینەکان بوون، دائیەکان، ماردییەکانی دانیشتووی دەوروبەری تەختی جەمشید. دروپیکییەکان و ساگارتییەکانی دانیشتوی دەورو بەری یەزد) هێشت بەرەو باشوور دەڕۆیشتن و بلاوەبوونەوە.

نومستد، لە کتێبی (تاریخ شاهنشاهی هخامنشی) لە زاری هەرۆدۆتەوە دەگێڕێتەوەو دەنووسیت: کە ئەم مادیانە هێشتا نیوە بیابان گەرد بوون. لەرووی نەخشەکانی ئاشوورییەکانەوە، ئەوانەیان کەبە قژی کورتەوە (بە قەیتانێکی سور دەیانبەست) بەریشێکی گرژو کورتەوە وێنەیان کێشراوە دووبارە لەسەر کراسەکانیانەوە کراسێکی لە پێستی مەریان لەبەر دەکرد، کە هەتاکو ئاوقەدیان دەهات، جوتێک پێڵاوی ساق درێژ (کە بۆ ڕۆیشتن بەناو بەفردا لەبار بوو)لە پێدایە.... دووبارە بەگێڕانەوە لە (ویدیودات)دوە دەنووسێت: لەچەرم و کوتاڵی چنراو جلوبەرگ و لە چادری ئەوگین (وەک ئەوانەی هێشتا لە ئاسیای ناوەندیدا دەست دەکەون) لە خانووی دار (وەکو ئەوانەی کەلە پاش سووتاندنیان خۆڵەمێشەکانیان وەکو تەپۆلکەیەک لە دەشتەکانی ورمێدا ماونەتەوە دەبیسین) (تاریخی شاهنشاهی هخامەنشی) تەماشابکە.

لەم بابەتانەوە وادەردەکەوێت کە ئارییەکان لە نیشتمانی ئەسڵی خۆیاندا بوون، بەهۆی سەرمای بەهێزی

نشتەکانی باکوورەوە ناچار بوون کە پێستی گەرمی وەکو کەوڵ و نەوگیان هەبێت. بەڵام ئایا لەدەوروبەری هەزار سێ پێش زاینی لە کاتێکدا کە ئاخرین نشتەیان کەخۆیان گەیاندە بانەکانی ئێران ، لەم کاتەدا ئەم جۆرە پۆشاکەیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە و هەیانبووە، ژنەکانیشیان هەر ئەم جۆرە جلوبەرگانەیان لەبەر کردووە؟ . دەتوانین بڵێین. چونکە ئەگەر لەبەر باری ناچاری گۆڕانی ئاووهەوای ژینگە نەبێت هیچ پێویست بەگۆڕانکارییەکی بەپەلەی جلوبەرگ ناکات، لەم لایەنەوە ژیانی بومی دانیشتوانی بانەکان . ئەی ئەوان چ جۆرە جلوبەرگێکیان هەبووە؟.

دیاکۆ نۆف لە کتێبی مێژووی ماددا، دەنووسێت: بەشێک لە ولاتی ئێمە لەچارەکی سێهەمی هەزارەی سێهەمی پێش زایین بەشێک بووە لەناوچەیەک کە سەرچاوە نووسراوەکان تیشکیان خستۆتە سەر، لە رووی ئەو شوێنەوارانەوە کە بەزمانی ئەکەدی و سۆمەری و هۆریانی نووسراون و لەبەردەستدان ، وا دەردەکەوێت کەلە بناری چیاکانی خۆرئاوای زاگرۆس (ئەو شوێنەی کەلەوێدا مادی خۆرئاوا پێک هاتبوو) تیرەکانی هۆری لۆلۆبی و گۆتی کەلەوانەی لەئازەربایجانی ئەمڕۆی کوردستانی ئێراندا نیشتەجێ بووبن و ژیابن. بەرواڵەت چەند تیرەیەکی دیکەش بوون. کە لەگەڵ عیلامییەکاندا خزمەتیان هەبووە.

لە هەندێ شوێنی ئەم ناوچانە کە دیاکۆ نۆف ناوی بردوون چەند نەقشێکی سەر بەردو بەرجەستە هەیە، کە جلوبەرگی دروستکراوی ناو ئەو نەقشانە نیشاندەری جلوبەرگی خەڵکی دانیشتووی خۆرئاوای ولاتی ئێمەیە لەپێش مادەکانەوە . هەروەها جلوبەرگی ناو ئەم نەقشانە گەلێ شێوەیان لەجلوبەرگی ئەو هەیکەلانە دەچێت کە لە رۆژگاری پێش مێژووی شووش و خەڵکانی هاوشێوە دروستکراون و دۆزراونەتەوە. دیاکۆنۆف لەناو چەند شوێنەوارێکی بەردینی ئەم ناوچەیە باسی دوو شوێنەوار دەکات لەو باوەڕەش دایە، کەتا ئەندازەیەک شێوەو چۆنییەتی جلوبەرگی کۆنترین دانیشتووی ولاتی ماد، روونەدەکاتەوە: یەکێکیان تابلۆیەکی بەردینی بەرجەستەیە کەلە شوش دۆزراوەتەوە، بەتابلۆی نارام سین ناسراوە، ئەوی دیکەشیان وێنەی بەرجەستەی ئانو بانینییە لە لەسەر پێلی زەهاویدایە و هی لۆلۆبییەکانە پەیوندی بەدەورو بەری ٢٥ سەدە پێش زایینەوە هەیە، دەنووسێت: لە تابلۆی نارانسیندا لۆلۆبییەکان جلو بەرگێکی سوک و داوێنداریان هەیە چەرمێکی رەش وسپیان داوە بەسەر شانەکانیاندا ئەمەش لە هەزارەی سێیەمدا جلوبەرگی دانیشتوانی مانئا و مادی خۆرئاوایی کاسپییەکان بووە. (بەوتەی هەرۆدۆت).

لە تابلۆ بەرجەستەکەی ئانوبانینیدا پاشایەک بەجلوبەرگی ئەکەدییەوە نیشاندراوە. (کلاوێکی نەوگین؟) ریشوو دار لەگەڵ پشتوێنێک و جووتێک کەوشی سەندەڵ، دیلەکانیشی تەنها کلاویان لەسەر دایە. لەنۆ وێنە، دیلەکان تەنها هەشت کەسیان کلاوی سۆمەری ئەکەدییان لەسەردایە نۆهەمەکەیان یانی ئەوەیان کەلە ریزی خوارەوەیە لە پێش ئەوانی دیکەوەیە کلاوێک، یان تانجێک، کەلە هەزارەی زایندا تایبەتمەندی مادەکانی خۆرهەلات بووە، لە دوایشدا پارسییەکان لەوانە وەریان گرتووە و لەسەریاندایە.

دیاکۆنۆف دەنووسێت: هەموو ئەوانەی سەرەوە ئەوە نیشان دەدەن، کەلە نێوان هەزارەی سێهەم یەکەمی پێش زایینی داب ونەریت و پێکهاتەی دانیشتوانی ولاتی مادی ئایندە (لە رووی نژادناسی و مرۆڤ ناسییەوە) ئەوەندە گۆڕانیان بەسەردا نەهاتووە.

لە تابلۆ بەرجەستەکەی ئانۆبانینیدا ژنێکیان لەبەرامبەر پاشا دروست کردووە کە جلوبەرگەکەی شایستەی سەرنجدانە ئەو ژنە بەدەستێکی ئەو تەنافە (کەدیلێکی پێوە بەسترابۆوە) گرتووە لەبەردەم ئانو بانبنب رایگرتوە.. وادێتە بەرچاو ئەم ژنە (بە بەستنەوەی سەرۆک هۆزەکان، سەرکەوتنی ئانوبانینی بەسەر دوژمنەکانیدا نیشان دەدات، هەروەها نیشانی پاشاشی دەدات ). عەشتار (خوای جەنگ و سەرکەوتنە، جلوبەرگەکەی ئەو، جلوبەرگێکی کەلێک ژنانییە ) کە هەیکەل ونەخشە بەرجەستەکانیان لە ناوچەکانی خۆرئاوای ولاتی ئێران بەشێوەی جۆراو جۆر هەیە، (هەوەکو چۆن پۆشاکی ژن لەئەخشە بەرجەستەکەی ناو تابلۆی ئانوبانینی وەکو پۆشاکی ئەو خوایەیە کە هەیکەلێکی گەچینی هەیە.- کە لە ماری سوریەدایەو درێژییەکەی ١٣/٥ سانتیمە، پەیوەندی بە سەدەی هەژدەهەمی پێش زاینەوە هەیە. وەکو یەکن).

لە شووشدا گەلێک پارچەی هەیکەلی گەورەو بچووکی سوالەتینی ئافرەتانی

پێش مێژوو دۆزراوەتەوە. کە هەریەکەیان خاوەن جلوبەرگێکی تایبەتین، هەموویان بەو سیماو بارودۆخەی کە هەیانە بەبیر هێنەرەوەی خوای عەشتارن، هەروەکو هەیکەلی ئەو ئافرەتە منداڵێکی لەئامێز گرتووەو شیری پێدەدات، (درێژی ئەم هەیکەلە ٩/٩ سانتیمەترە).

هەیکەلێکی دیکە کەئارایشی مووی سەری خوای دایک دێنێتە بەرچاو، ئەم ئافرەتە پەنجەکانی دەستی لەژێر هەردوو مەمکییەوە لەیەکتر هەڵپێکاوە (درێژی ئەم هەیکەلە ٩/٧ سانتیمەترە).

لەبارەی قوماشی جلوبەرگی ژنانەی ئەم هەیکەلانەی پێش مێژووی عیلام وناوچەکانی دەوروبەری. کارناسان نووسیویانە لەوە دەچێت زۆربەیان لەچەرم بووبن. (چەرمی مەڕ، کە ناسانتر بەدەست هاتووە) لەو چەرمانەی کراسی داوێن کورت یان کراسی درێژی سەرتاپای باڵای گرتووتەوە، دروستکراوە.

هەیکەلێک کە (لە ماری سووریە دۆزراوەتەوە) پیاوێک نیشان دەدات، کە جلوبەرگێکی (فەروە)یی لەبەردایە. مەڕێکی لەئامێز گرتووە، (بوونی ئەم هەیکەلە لەباشترین لایەنگری بۆچوونەکانی کارناسانە کەلە فەروە جلوبەرگی پیاوان و ئافرەتانی بەر لەمێژووی ئەو شوێنە دروستکراوە کەلەم جۆرە هەیکەلانەی تیا دۆزراوەتەوە). لە نیشاندانی خوری مەڕ، بەهەمان شێوەی فەرووی پیاوان (تەنانەت ک خوریەکەشیان بۆ کردووە) لە هەیکەلەکان و تابلۆ بەرجەستەکانی ئەو کەسانەوە کەفەروەکی کورتیان لەبەر دایە، گەلێ نموونەیان لەبەر دەستدان وەکو هەیکەلی فەرمانڕەوای شاری (ماری) کە پەیوەندی بە ٢٥٠٠ ساڵ پێش زاینەوە هەیە.

یان تابلۆی بەرجەستەی (نورنانشی) سۆمەری (سیلودار)ی شاری لاگاش و کچ وکوڕەکانی.

هەموو ئەم هەیکەلانە کەلە قوڕو سواڵەتن، بەر لەمێژوو بەئەندازە بچوک بچووکی چەند سانتیمەتری دروستکراون، زۆربەیان لەبارەی پیاوە پیرۆزەکانەوەن بەتایبەتی وەکو خوای دایک=عەشتار. کە باوەڕدارەکانیان، کە تا توانیویانە بەبچووکترین شێوە دروستیان کردوون (بەشێوەیەک، کەبتوانن هەمیشە بەبێ ماندوو بوون بەناوی تەبەرک، پیرۆزییەوە پێیانبێت).

بەهاتنی ئارییەکان بۆ بانەکانی ئێران، لە ماوەیەکدا (تا سەردەمی مادەکان) لەنێو ئەم خەڵکانەدا دانیشتووی بوومی هاوسێکانیاندا رووبەڕووبوونەوەیان پێشهاتووە: لەلایەنی ئارییەکانەوە (هەروەکو چۆن لە ویدیودات وهەدۆدۆت ئاماژەمان کرد) سوودیان لەچەرم و پارچە نەوگ وەرگرتووە، لەلایەکی دیکەشەوە دانیشتوانی بانەکان و دراوسێکانی زۆر لە پێشترەو فێر بوو بوون، کەلە پێستی ئاژەڵی هەمەجۆرە پۆشاکیان بۆخۆیان بدورن.

هەروەها لە رووی ئەو بەڵگانەوە کەلەبەر دەستدان، دەزانین کەجلوبەرگی ئاشوورییەکان لەچەرم و فەرووی چاکترو جوانترو داوێنی ریشەدار (لەوانەی لە فەروەوە بووبن؟) دروست کراون.

لۆلۆبییەکان و ئەکەدییەکان و دانیشتوانی دامێنەکانی زاگرووس گەلێک لەپێشترەوە کراسی داوێن کورت و درێژیان لەچەرم هەبووە، سوودیان لێ وەرگرتووە، هەموو ئەو خەڵکانە بۆ باشتر سوود وەرگرتن لەو کەلوپەلانەی هەیانە (هەروەک ئەوانە کە شوێنەواری پێشینیان نیشان دەدەن) زۆرتر توانای خۆیان بۆ بەرجەستە کردنی سەلیقەیان بەکار دەهێنا. لەم رووەوە لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ یەکتردا، سوودیان لەیەکتر وەردەگرت.

هەیکەلەکانی پێش مێژوو لەگەلێک ناوچەدا دۆزراونەتەوە لەبەر دەستدان. کەشوێنی دەستی داهێنانی بەشێک لەو پۆشاکە گولارانە، یان نەخشەدارانە لەناوچەکاندا کە هەیکەلەکانیان تیا دۆزراوەتەوە نییە، بەڵام تەنها خەڵکانی ئەم شوێنە سوودیان لێوەرگرتووە. (کە دەنووسێت لەوانەیە عەشتار بێت). کڵاوی هەرهەموویان، بەبیرهێنەری لوڕەکان و بەختیارییەکانە لە خۆرئاوای بانەکانی ئێراندان.

لەم دواییەدا پەرداخێکی زێڕین لە (مرودەشت)ی شیراز دۆزراوەتەوە، کە پەیوەندی بەڕۆژگاری پێش مێژووی ئەو ناوچەیە هەیە، لەسەر ئەم پەرداخە، وێنەی دوو ئافرەت کێشراوە، کە یەکێکیان راوەستاوەو ئەویدیکەشیان دانیشتووە. هەریەکەیان کراسێکی درێژی فەرویی سەرنج راکێشیان لەبەردایە.

#### جلوبەرگی ژنانی ئێرانی لەسەردەمی مادەکاندا

بەپێی لێکۆڵینەوەی کارناسان و سەرنج دان لەو نەخشانەی کەلەبەر دەستدان، دەردەکەوێت کە جلوبەرگی مادەکان لەو ناوچە پان و بەرینەکانی

ـدا چەند جۆرێک بوون:

جۆرێکیان، هەر ئەوەیە کەهەرۆدۆت مۆسیویەتی، بریتی بووە لە: کراسێک تا ئەژنۆ، نیو قەدێک لەپێستی مەڕ، پێلاوێکی درێژو قەیتانێک بەسەر ـوچەوانەوە دەبەستراو مووەکانی سەری گۆدەکردەوە، باسی لێوەکردووە. (لەبارەی شەروالەوە هیچ نەوتراوە).

دیاکۆنۆفی کارناسی سۆڤیەتی، لە کتێبی مێژووی ماددا چۆنیەتی پیاوێک ئەنەخشە بەرجەستەکانی ئاشووری لە دوور- شارۆکین و ئەینەوای نیشانداوە- کەئەوانە بە خەڵکی ماد دەزانێت، بەپێی نووسینەکانی هەرۆدۆت، بەهاوشێوە بەرامبەریان دەناسێت: ئەم پیاوانە شەروالیان لەپێدا نییە، پێڵاوەکانیان تاژوور ئەژنۆیانەوە تاژێر کراسەکانیان درێژ بوون، کەبە توند دەبەستران، (وا دێتە بەرچاو ئەم جۆرە پۆشاکە پۆشاکی سەرەتای هاتنی ئارییەکان بۆ بازنەکانی ئێران نیشاندەدات).

جۆرێکی دیکە (کە هەموو کارناسان لەسەری رێککەوتوون و یەک بۆچوونیان هەیە): کڵاوی ئەوگینە، کراسێکی درێژ تاسەر ئەژنۆیان لەگەڵ (دەرپێیەکی پان وبەرین،ودەرەلەنگەکانیان هاتبووەوە یەک- کەنیشاندەری جۆرێک لە شەروالی کوردی ئەمڕۆکەیە-) هەروەها جۆرە پێلاوێک (لەراستیدا بۆ ئەوجۆرە زەویانەیە کەبەفرو سەهۆڵ بەندانیان تێدایە وەکو ناوچەکانی باکوور لە بارنین)- لەوە دەچێت مەبەست لەکڵاشی پەڕۆ بێت، وەرگێڕ- بەڵام هەرچۆنێک بێت لە رووی سیمای گشتی لەگەڵ پۆشاکی ئارییەکانی دانیشتووی ئاسیای ناوەندی (سکاییەکان، پارتە دێرینەکان،بەلخییەکان، گنداریەکان، سغدییەکان). کە لە تەختی جمشیدان لەیەکەوە نزیکن.

جۆرێکی دیکەی جلوبەرگێک کە مادەکان هەیانبووە (بەپشت بەستن بەو وێنانەی ناو ئەو مۆرانە کەلە شێوەی بانگردێن دان بەراورد کردنیان لەگەڵ نەخشە بەرجەستەکانی تەختی جەمشید) کە جۆرە جلوبەرگێکی چیندار و بەرین، کە گەلێک دێرتر لە فارسەکان و هاخامە نشینەکان سوودیان لێ وەرگرتووە، لەهەڵسەنگاندن و بەراورد کردنی ئەم جلو بەرگانەدا. هیچ خزمایەتییەکیان لەگەڵ جلوبەرگی ئارییەکانی باکوور و ئاسیای ناوەندیدا نییە، بەڵکو وەکو جلوبەرگی ئەخشی باڵداری پاساگارد. یاد ئاوەری جلوبەرگی دانیشتوانی دراوسێیانە.

شتێک کە دەبێت رەچاو بکەین، ئەوەیە کە: بەپێی ئەخشە بەرجەستەکان و هەیکەلەکانی پێش مێژوو، جلوبەرگی ژنانی ئەو سەردەمە لە رووی شێوازەوە (لەگەڵ کەمێک) ، لەگەڵ جلوبەرگی پیاواندا یەکسانن. لە رۆژگارێکی دوورو درێژدا پۆشاکی ئافرەتان ، بەهێواشی و لەسەر خۆ، چەندین جۆری تیا پەیدا بووەو گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەڵام لەو سەردەمەدا کە مادەکان دەسەڵاتیان پەیدا کردبوو (لە جلوبەرگی جۆراوجۆری دانیشتوانی بۆمیش سوودیان وەرگرتووە). ژنان چیان لەبەر دەکرد؟ ئەو ئەخشانەی ژنانی ئەو سەردەمە کە ئێستا لەبەر دەستدان (کارناسان ئەوانە بەپارسی دەزانن، جلو بەرگەکانیان لەگەڵ جلوبەرگی رۆژگاری پێشووتر شایستەی بەراوردن، لەم رووەوە ناتوانین ئەوانە بە جلوبەرگی ئەو سەردەمە دابنێین دەبێ بەهی نێوان مادو پارسیان دابنێین، چونکە پۆشاکی خانمانی پارسی، بۆخۆی لەبناغەدا جۆرێکی دیکەیە). یەکێک لەو ئەخشانە کەبەخامێکی پارسی ناسراوە ژنێک کە کراسێکی قۆڵکورتی لەبەر دایە، کۆتایی داوێنی کراسەکەی ریشوودارە، بەگشتی شێوەی مووی سەری وەکو قژی منشیانی بابلییە.

لە هەیکەلێکی دیکەدا کە درێژاییەکەی ۱۳/۳ سانتیمە، ئافرەتێک نیشاندراوە، کە کراسێکی درێژو (داوێن ریشەدار)ی لەبەر دایە ئارایشی مووی سەری یادەوەری خوای دایکی (عەشتار-ئانا هیتایە)، جگە لەمانەش چەند بەڵگەیەکی بەهێزتر هەیە، کە ئێمە بۆ ناسینی جلوبەرگی ئافرەتانی ئەو سەردەمە رابەرایەتی دەکات: وەکو نەقشە بەرجەستەکەی چیای (رەنگان) لە بەبەهان و وێنە بەرجەستەکانی ئاشووری ئەینەوا لەگەڵ مۆرەکانی ژێر خاکی، ای جالب، (کە وتویانە پەیوەندیان بەسەردەمی پاریسی- هاخامەنشیەوە هەیە).

نەقشە بەرجەستەکانی چیای رەنگان (کەهرتسفلد بە وردی لێی دواوە کرستین ویلسن لەکتێبەکەی خۆیدا- صنائع ایران- لێی دواوە) نەقشەکە لەسەر بەردێکە گەلێک وێنەی لەسەرە. رب النوع ربة النوع لەگەڵ ئەو پەیڕەوانەی ئەوانەیان دەپەرست لەسەری کێشراوە. رب النوع لەسەر تەختێک کەلە شێوەی مارێکی پەپکەە خواردو دروستکراوە دانیشتووە، دوو شاخ لەکڵاوەکەیدا

هاتوونەتە دەرەوە، جامێکی بەدەستەوەیە، کە دەڵێن ئاوی زندگانییە، (کەلە جامەکەوە هەڵدەقوڵێت بەرەو ئیماندارەکانی دەڕوات.) رب النوع لەپشت سەریەوە دانیشتووە.؟! لەسەر پۆشەکەیەوە چەند شاخێک دەرچووە. لەپێش و پاشی ئەم خوایانەوە بەزۆری ئیماندارەکانیان راوەستاون. هەریەکەشیان کراسێکی درێژی لەبەردایە، ژن و پیاو بەهۆی ئەو جیاوازییەوە کەلەنێو سەرپۆشکانیاندا هەیە لەیەکتری جیا دەکرێنەوە، چەند پێیەک لەخوار بەردەکەوە لە نزیکی پلەکانەکەوە، وێنەیَ چل ئافرەت کێشراوە داوێنی کراسەکانیان تا سەر ئەژنۆ دادەپۆشێت، جگە لە پێشەواکانیان هەموویان قژیان گەش و هۆنراونەتەوە، کە بە پشتیان شۆڕ بوونەتەوە).

وا دێتە بەرچاو کە ئافرەتەکان سەرپۆشیان بەخۆیاندا داوە، لەژێر سەرپۆشەکەوە پەلکە درێژەکانیان دەردەکەوێت و دیارن.

ئەم نەقشە بەرجەستەیە لە گەلێک شوێنیدا کوژاونەتەوە. کوژانەوەکەیان رێگەی لە دەسنیشانکردنی تەواوی بەوردی گرتووە. بەڵام هەرچۆنێک بێت، شێوەی قژەکانیان یادئاوەری ئافرەتانی مادن، کە لە نەقشی ئاشووری نەینەوادا هەیە.

لە روونکردنەوەیەکی کریستین ویلسندا هیچ باسێکی سەرکراس یان دەسماڵ، یان سوخمە نییە، تەنها لەبارەی داوێن کورتیانەوە دواوە، بەڵام لەسەر بازووی ئافرەتەکان شێوەیەکی کەمێک نادیار بەسەر قۆڵەکانیانەوە دیارە، زیاد لەمەش لەناوقەدیاندا پشتوێنێکیان بەستووە، دووبارە بەسەرنجدان لە کراسی درێژی خوای (مێینە)یان و شاژن، وادێنە بەرچاو، کەیەخەکانیان بازنەییە.

لەنەقشی بەرجەستەی ئاشوور کە راگوێزانی مادەکان نیشاندەدات ئافرەتەکانی مادو منداڵەکانیشیان وێنەیان کێشراوە، ئافرەتەکان کراسێکی درێژیان لەبەردایە. رووپۆشێکی کورتتر (کە دامێنەکەی نیوە بازنەییەو قۆڵیان کورتە). بەسەر کراسەکەدا لەبەر کردووە. (ئەم رووپۆشە هەندێک جار وەکو شنل وەکو قۆڵ نیشاندراوە ). قژی ئافرەتەکان هەروەکو ژنانی ناو نەقشە بەرجەستەکەی کێوی رەنگانە، هەروەها لەپشت سەریانەوە شۆڕ بۆتەوە.

مۆرێک، (کە دەڵێن لەسەردەمی پارسەکان و ماوەتەوە). دوو ئافرەت نیشان دەدات، کە هەریەکەیان کراسێکی درێژ تاکو سەر پێیان داپۆشیوە لەبەشی خوارەوە، یانی لە دامێنەکانەوە، ریشوو دارن، باڵاکەشیان (وەکو کراسی ئافرەتەکانی ناو نەقشەکە ئانوبانی نییە) ناوبەناو بەشێوەیەکی ئاسۆیی دابەشکراون (وا دێنە بەرچاو، کە لە فەرووی پێستی بەرخ دروستکرابن). بەسەر ئەویشدا سەرپۆشێک لەشێوەی عەبایەکی کورتدا کە دامێنەکەی نیو بازنەییە، (نیوەی لەشیان دادەپۆشێ) لەبەر دایە. قژی سەریان چڕو پڕو کورتە و لەبن گەردنیاندا لەسەر شانیان کۆبوونەتەوە. ئەم شێوەی قژەسەرە، یاد ئاوەری ئافرەتانی ناو مۆرێکی گردی ئاشوورییەکانە (کە دوو ئافرەت بەرامبەر یەک راوەستاون لە باوەڕدا ئەو کەسە کەلەسەر پشتی شێرێک راوەستاوە عەشتاری خوای جەنگ بێت).

ئەم نموونانە (بەسەرنجدان و ورد بوونەوە لەو کەسانە کە لەو رۆژگارەدا لە جلوبەرگ بەهرەمەند بوون). نیشانەی جلوبەرگی ئافرەتانی مادەو لەوەش دەچێت لەپێش ئەوانیشەوە بەکار هاتبن.

ئایا ئافرەتانی سەردەمی ماد، لەجلوبەرگی رازاوەو چیندار کە لەناو مادەکاندا باویان هەبووە. سوودیان وەردەگرت؟. ئەمە پرسیارێکە وەرامدانەوەی سەلمێنراوە، چونکە لە نووسینی مێژوو نووسانی سەردەمە دێرینەکاندا دەردەکەوێت، کە لە کۆشکی شاهانەی مادەکاندا(لە رووی جوانی و شکۆمەندییەوە بەتایبەتی لەسەردەمی ئەژدیهاکەدا). وەکو دەرباری ئاشوورییەکان بوون. لەمڕووەوە (پیاوانی ماد توانیویانە لە جلوبەرگی چیندار و رازاوە بەهرەمەند بن). ئافرەتانیش لە مۆدێلی سەردەمیان بەشکۆ مەندییەوە بەهرە مەند بوون.

### سەرچاوە

کتێبی پۆشاک زنان ایران: لە نووسینی ابوالقاسم حسینی شیرازی.

### پەراوێزەکان

١- تەماشای کتێبی (هنرقاشی و پیکرتراشی درایران زمین)بکە.

٢- ئەم نەخشە یان ئەم نەقشە بەرجەستەیەی ئانوبانینی (نووسەر) لەسەر پێڵی زەهاو لە نزیکەوەبینیویە، تەماشای هەمان کتێبی پێشوو بکە.

# هونەرمەند عەلی زەنگەنە

## گۆرانیبێژە مەحروومەکەی کەرکووک

وشیار ئەحمەد ئەسوەد / کەرکوک

رەنگە نووسین لە بارەی هونەرمەند (عەلی زەنگەنە)، بۆ کەسێکی وەك من ئاسان نەبێت، لەبەرئەوەی ساڵەهایەکی زۆرە دەیناسم و یەك لە هەرە نزیکەکانی خۆمە... بەڵام مەغرووریيەت و مەحروومییەتی ئەم گۆرانیبێژە ناسراوەی کەرکووك وای لێکردم ناچاربم لەبارەیەوە بدوێم.. بەعاتیفە نادوێم، بەڵام بڕوا بکەن هونەرمەندانی کەرکووك و زیاتریش ئەوانەی تا دواساتی رووخانی بەعس لەژێر دەسەڵاتەکەیدا بوون و هەر بە خاوێنیش مانەوە، هەقدارن لەوەی زۆرترین گرنگیان پێ بدرێ و بایەخێکیان لە قەڵەمی ئێمەمانان بەرکەوێ.. کە عەلی زەنگەنە یەك لەوانە، چونکە زۆر لەمێژە سەروکاری لەگەڵ هونەری رەسەنی کوردیدایەو بەرهەمی زۆرن و مێژوویيەکی پڕ لەسەرووەریشی هەیە... لێرەدا مەبەستمە ئەم هونەرمەندەو کارە هونەرییەکانی و ئەو ئاستەی پێی گەیشتووە بخەمە بەر تیشکی سەرنج..



**(عەلی محەمەد عەبدولڕەحمان)** ناسراو بەعەلی زەنگەنە/ - ١٩٥٦ کەرکووک - گەڕەکی ئیمام قاسم) جگە لەوەی وەک هەر بەهرەمەندێکی دیکە، هەر لە قۆناغی سەرەتاییەوە لەلایەن مامۆستاکانییەوە بایەخ بەبەهرەکەی درا، بەڵام دەکرێ بڵێین دەستپێکی ئەو وەک هونەرمەندێک لەوێوە چەکەرەی کردووە، کە هونەرمەندی گەورە مامۆستا (سەلمان فایەق کاکەیی) لە ساڵی ١٩٧٢ لە زنجیرە دراماى (مەرەزە) رۆڵی (گۆرانیبێژی ماڵی ئاغا)ی پێ بەخشی، لەگەڵ ئەوەی رۆڵێکی کەم و بچووک بوو و لە چەند دەقیقەیەکی کەمدا دەرکەوت، بەڵام رۆڵێکی دیارو بەرچاوبوو لە زهنی هەموو ئەوانەدا ماوەتەوە کە ئەو درامایەیان بینیوە.. دیارە ئەمەش بۆ مێرد منداڵێکی وەک عەلی زەنگەنە لەوکاتەدا هاندانێکی زۆر باشەو پشتگیرییەکی کاریگەر بوو بووە ئەرشیفێکی بەنرخ بۆ کارە هونەرییەکان و مێژووی ئەم هونەرمەندە کە تا ئەبەد شانازی پێوە بکات... دەکرێ لێرەوە ئاماژەیەک بەرەوت و کارە هونەرییەکانی عەلی زەنگەنە بکەین، بەوەی ئەم هونەرمەندە لەسەرەتاوە تاکو ئێستا چەند جارێک دابڕاوەو دیسان گەڕاوەتەوە کۆڕە هونەرییەکە، بەڵام پێدەچێ هۆکاری ئەو دابڕانانە ژیانی



تایبەت خۆی یان باری سیاسیی ولآت بوو بێ، نەک کەمبوونەوەی ئارەزووەکان لە وێنەی هونەردا، چونکە لە نێوان هەر دابڕانێکدا کە دواتر دەستی پێکردۆتەوە، بەتوانایەکی فرەترو بەرهەمی باشتر خۆی پیشانداوەتەوە.. بۆ نموونە کە لە ساڵی ١٩٧٢ لە (مەرەزە) بەشداریی کرد، لە پاشا ٦ ساڵ کاتێک لەگەڵ تیپی مۆسیقای سلێمانی گۆرانیی (بەرزی باڵاکەت)ی لە ئاوازی خۆی تۆمارکرد، بۆ ئەو قۆناغە یەک لە گۆرانییە زۆر باش و ناودارەکان بوو، دیارە لە قۆناغەکانی دواتریش هەمان هەڵوێست دەبینرێ کە رەنگە پێویست بکات دواتر بەچەند ئاماژەیەک باسیان بکەین...

عەلی زەنگەنە تاکە گۆرانبێژی بەتواناو سەرکەوتوو نییە لەکەرکووکدا، دەنگی دیکەش هەن هەمان ئەو توانایەو رەنگە زیاتریشیان هەبێت، بەڵام نکوڵی لەوەش ناکرێ کە ئەو لە ناسراوترین و پڕ بەرهەمترین هونەرمەندە ئەمڕۆ لە کەرکووکدا کە حاڵی حازر جگە لە بەردەوامیی خۆی لەگۆرانی گوتن، هاوکات وەک مامۆستایەک لە هەوڵی پەروەردەکردنی خەڵکی دیکەشدایە...

ئەو لە دەنگە هێمن و نەرمەکانە، لەگەڵیشا دەنگێکی کوردیی رەسەنە، کە تاکە گۆرانییەکیشی نییە لە شێوازی کوردی ترازابێ، هاوکات لەرێی بەرهەمەکانییەوە بەجۆرێک رایهێناوین کە هەست بەدەنگێکی ئاشقان بکەین، چونکە هەڵبژاردنی شیعرو بەرجەستەکردنی ئاواز لە نێویدا پتر شەڕی ئەشقەو زیاتریش شیعری تەڕو گەرم بۆ گۆرانییەکانی هەڵدەبژێرێ، بۆیە هەرچەند بچینە تەمەنەوە، بەڵام ئێمە وەک گۆرانیبێژێکی ئاشق و گەرم لێی دەڕوانین.. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەم هونەرمەندە سروشتی خۆی وا خوڵقاوە کە رووخۆش و نوکتەباز بێ، ئەمەش هۆکارێکی دیکەیە کە لەلای جەماوەرەکەی ئێسکی سووکتر بکات، ئەم رووخۆشی و ئاشقی و دڵتەڕییەی زیاتر لەگۆرانییەکانی (پەری - نازە نازە - باوابێ - بووک هاتەوە) دەبینرێ، کە هەریەکەیان دەنگدانەوەی خۆیان هەبووە.. ئەگەر بەوردی سەرنج لە شیعری گۆرانییەکانی بدەین کە زۆریان هی خۆیەتی، توانایەکی تا ئاستێک باش دەبینین و زیاتریش لە گۆرانییەکانی (منی شاعیر - عەشقی ئێمە - کوا بەهار)دا.

عەلی زەنگەنە رەنگە وردە شارەزاییەکی لە مەقام هەبێت، بەڵام مەقامبێژ نییە لەگەڵ ئەوەی جارجارەش خۆی لە قەرەی مەقام دەدات، بەڵام من پێم وایە ئەمە شەڕ فرۆشتن بێت بەمەقام، چونکە دەنگ و شێوازی ئەو زیاتر دەنگێک گۆرانییە وەک لەوەی مەقامی بێت.. لێرەدا وتەیەک مامۆستا (باکووری)م بیر دێتەوە. کە بۆی باس کردم کاتێک لە بەغدا چۆتە خزمەت مامۆستا عەلی مەردان و ویستوویەتی مەقام بچڕێ، عەلی مەردان راستەوخۆ رێنمایی کردووە بەوەی کە خۆی خەریکی مەقام نەکات، چونکە ئەو دەنگێکی گۆرانییەو مەقامی نییە. منیش لێرەدا ئەگەر عەلی زەنگەنە روخسەت بدات و لێم نەڕەنجێ، دەڵێم ئەگەر مامۆستا عەلی مەردان تانێستاش لەژیاندا بمایە، هەمان ئەو ئامۆژگاری و رێنماییەی بۆ عەلی زەنگەنەش دەکرد.. (کەچی

عەلی زەنگەنە رەنگە وردە شارەزاییەکی لە مەقام هەبێت، بەڵام مەقامبێژ نییە لەگەڵ ئەوەی جارجارەش خۆی لە قەرەی مەقام دەدات، بەڵام من پێم وایە ئەمە شەڕ فرۆشتن بێت بەمەقام.

مـاڵ ئاوەدانە هەر واز ناهێنێ و سـووره لەسەر ئەوەی جارجاره مەقام بچڕێ)...

عـەلی زەنگەنە خۆی مـامـۆسـتـایەو پیشەی ئەو بەروەردەیە، وابزانم ئەمەش ئەوە ئاسان دەکاتەوە کە فێری ژەنینی ئامێرێکی مۆسیقا بێت، کەچی دوای نزیکەی ٣٥ سـاڵ تەمـەنی هونەری، تائێستا تاکە ئامێرێکی مۆسیقایشی نەگرتۆتە خۆی بەو مەبەستەی فێری بێت و بۆ ئاوازەکانی بەشێوە زانستییەکە سوودی لێ ببینێ، بۆیە خۆویستانە ئاواز دادنێ کە پێم وایە ئەمەش جۆرێکە لە فەرامۆشکردن و بۆتە خەوشێک...

عـەلی زەنگەنە هاورێیەکی دێرین و نزیکی منەو زۆربەی کاتیش پێکەوەین، بۆیە تەواو شارەزای تەبیعەتی هەم... هەرچەند خۆش مەشرەب و مەجلیس گەرمە، سەد ئەوەندەش دڵناسک و خۆشگلەییە... بەتایبەتی ئێستا زۆر گلەیی دەکات، ئەمە لە کاتێک کە رژێمی بەعس نەمـاوەو کەچی هونەرمەندانی کەرکوک هەر مەغدوور دەبینێ. ئێ خـۆ وابزانم هەقی خۆشیەتی، ئەوەتانێ هونەرمەندانی کەرکوک کە ساڵەهایەکی درێژ لە ژێر دەسەڵاتی بەعسی کۆنترۆڵ کرابوون و لەژێر زۆرترین گوشارو فشـاردا دەچەوسـانەوە، کەچی دوای پرۆسەی ئازادیش کە پێیان وابوو زۆرترین بایەخیان پێدەدرێ، بەڵام بایەخ و هاوکارییەکان لەئاست ویستەکانی ئەوان و مەحروومییەتی ئەوان نییە، کاکە عەلیش هەر خۆی بەتەنیا هێندەی سەرجەم هونەرمەندانی کەرکووک گلەیی دەکات... لەروویەکی دیکەشەوە هەقی گلەیی هەیە، چونکە ئەو ئێستا (جێگری لقی کەرکووکی سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان)ە، بۆیە زۆرترین پرسیاری لەلایەن هونەرمەندانەوە لێدەکرێ و داواکاریی دەخرێتەروو، کەچی ئەو وەڵامەکانی نیوەچڵن و هاوکاتیش ناتوانێ داواکارییەکان تەنها بەشێکی کەمی نەبێت جێبەجێ بکات.

لێرەشەوە دەگەڕێمەوە سەرکارە هونەرییەکانی ئەم هونەرمەندە.

ئەوەبوو پاش گۆرانیی (بەرزی بالاکەت) دیسان بۆ ماوەی ٩ ساڵ دابڕاو پاشان لە ساڵی ١٩٨٧ لە شیعری خۆی و ئاوازو مۆسیقای هونەرمەند نورەدین جاف بەگۆرانیی (عەشقی ئێمە) لە تەلەفزیۆنی کەرکووک چاومان پێکەوتەوە، بەپێویستی دەبینم ئەوەش بڵێم کە ئەم بەرهەمەش دەنگدانەوەو ئاستێکی باش هەبوو، دوو ساڵیش دواتر لە ١٩٨٩دا، هونەرمەند گۆرانیی (نازە نازەو تەمەن ئەڕوا بەرەو پیری) دیسان هاتەوە سەر شاشە، بەڵام جۆرو شێوازی گۆرانیی (نازە نازە) بەشێوەیەک جەماوەری و لە ئاستێکدا بوو کە لەتەواوی کوردستاندا بناسرێ و قبوڵ بکرێ...

لێرەوە دیسان عەلی زەنگەنە وەستایەوە تاکو پاش راپەڕین ساڵی ١٩٩١و دواتر دەستی پێکردووە، بەڵام ئەمجارەیان لە چوارچێوەیەکی بەرتەسک کە نەک هەر عەلی زەنگەنە، بەڵکو سەرجەم هونەرمەندانی کەرکووک ئەوانەی لەژێر دەسەڵاتی بەعسدا بوون، وەک چۆن لە شارەکانی دیکەی کوردستان دابڕان، بەهەمان شێوە هونەرەکەشیان دابڕا، ئەمەش وایکرد کە ئیدی دەنگیان نەگاتە دەرەوەی کەرکووک... ئەگەرنا، ئەوا بەرهەمەکانی ساڵانی نەوەدەکانی، هیچیان کەمتر نەبوو لە (نازەنازەو عەشقی ئێمە) بەپێچەوانەوە رەنگە باشتریش بووبن، وەک گۆرانییەکانی (منی شاعیر - کوا بەهار.. نەگۆڕاوم- پەری) و چەندانی دیکەش کە لە دووتوێی ئەوارێکدا لە ینب کەرکووک و لە تۆمارگاکان بڵاویکردنەوە... دوای پرۆسەی ئازادیش تەنها لە ئاهەنگ و بۆنەکاندا بەشداریی هەبووە، جگە لەوەی بەرنامەی (سیلاڤ)یش لە کەناڵی ئاسمانی کوردستان میوانداریەکان کرد... ئێستاش گۆرانیی (سەفەر مەکە) لە شیعرو ئاوازی خۆی و مۆسیقای خالید جوانرۆ، دوابەرهەمی ئەم هونەرمەندەیە کە لەگەڵ (تیپی مۆسیقای شەفەق) لەکەرکووک تۆماری کردووەو رەنگە لە داهاتوودا کلیپی بکات.

بێگومان زۆر ماوە لە بارەی هونەرمەند عەلی زەنگەنەوە باس بکەم، لێرەوە زۆرشت جێدەهێڵم بۆ داهاتوو، کە رەنگە پێویست بکات لە دیمانەیەکدا ئێمە پرسیاری لێبکەین و، ئەویش لە وەڵامەکانیدا یەک دنیا گلەیی کەرکووکییان هەڵبڕێژێ... بەڵام توخوا نازی هەڵگرن.

# فەرهەنگەکی گشتگری کوردی لەرێیە

فەیسەل مستەفا حاجی

یەکێتی نووسەرانی کورد/ لقی هەولێر لە ١٠و١١و ١٢/١١/٢٠٠١ هەنگاوەکی پیرۆزی بەرەو دانانی فەرهەنگەکی گشتگیری کوردی نا کە سیمینارەکی لە هۆتێلی دمدم سازکردو ژمارەیەکی زۆر لە پەیوەنداران و پسپۆرو لێهاتووی ئەم بوارە بەگوتارو لێکۆڵینەوەو تێبینی بەشدارییان تێداکرد.

ئێستاش کۆڕی زانیاری کوردستان لێژنەیەکی تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە پێکهێنایەو لێژنەکە دەست بەکاربوویە.

منیش، بۆنەوەی- بەش بەحاڵی خۆم- بەشدارییەکی بچووک لەم پرۆسەیەدا بکەم چەند پەیڤەکم لێکدایتەوەو، بەپێی چەند بنەماو خاڵی تایبەت بە زمانی خۆمانەوە چەوت و راستەکانیانم دیارکردییە، کەئەمانەیە:

١- هەندەک دەنگ لەزمانی کوردیدا نییە. ئەو پەیڤانەی ئەم دەنگانەیان تێدایەو هەندەک شوێن و ناوچە بەکاریان دێن و لەشوێن و ناوچەی دیکە پەیڤی رەسەنی کوردیان هەیە ئەم دەنگانەی تێدانییە، وەک:

ح: کە لەبنچینەدا«هـ»ە، حەرِی: هەرِی، حەشت: هەشت..تد

ع: لەبنچینەدا«ئـ»یە، عاسمان: ئاسمان، عەسپ: ئەسپ..تد

ق: لەبنچینەدا «ک»یە، قەزوان: کەزوان، قەلات: کەل..تد

٢- هەندەک پەیڤ لە کوردیدا بەکاردێنین کە دەنگەکی بیانییان تێدایە، زۆربەیان کوردی نین و بەرامبەریان پەیڤی دیکەی کوردیان هەیە کە لەدیالێکتێکی دیکە یان ناوچەیکی دیکە بەکار دەهێنرێن، وەک بۆ نموونە:

تاقەت : هێز. تاقم : دەستە. غەزال(خەزال) ئاسک، مامز. حەوز : گەرِ. عەرد : زەوی .

٣- هەندەک پەیڤ لە بنچینەدا کوردین، بەڵام گۆرِانکارییان بەسەرداهاتووەو دەنگەکانی پاش و پێش کراون، وەک:

ئێجگار : ئێکجار(یەکجار) پەشیمان : پێشەمان. دڵرِفێن : دڵفرێن..تد

٤- هەندەک پەیڤ لەبنچینەدا کوردین، بەڵام دەنگەکی بۆ زیادکراوە، یان لێی کەم کرایتەوە، وەک:بەر : دلبەر. لە(دل+ب+ەر) پێکهاتییە.

دستارِ : دەستارِ. لە(دەست+هارِ) پێکهاتییە.

٥- هەندەک پەیڤی کوردی هەیە، بەچەوتی بەکاری دێنین و پەیڤە راستەکەمان هەیە وەک:

مێرووستان : مێروو. (ستان) واتە: شوێن، نیشتمان. کەواتە(مێرووستان) ناوی کونی مێروو یە.

مێشهەنگڤین : هەنگ. پەیڤی«هەنگڤین» لێکدرایەو لە(هەنگ+ ڤین) پێکهاتییە، واتە ڤینی هەنگ.

ئارینۆک: ئالینۆک. واتای پەیڤەکە نۆکی لەتکرایە کە دەکاتە(ئال+ی+ نۆک) نەک ئاردی نۆک.

ئاڤس :(ئاوس): ئاڤز(ئاوز) لە( ئاڤ، ئاو+ دز) پێکهاتییە.

٦- هەندەک پەیڤی کوردی هەیە دەنگی(ل)ی تێدایە بەهەڵە گرانمان کردییە کە لە راستیدا لاوازە، وەک - بۆنموونە:

پێلاو : پێلاو. کە پەیڤەکی دارِژایە لە پێ+ لە+ ناو) پێکهاتییە کە«لە» ئامرازی پەیوەندییەو«ل»ە کە لاوازە.

بەمجۆرە: (کولاو) چەوتەو(کولاو) راستە.

کە لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا پەیڤەکانی(پێلاڤ و کولاڤ) بەکاردێن. ئەمانەی خوارەوەش ئەو پەیڤانەن کە بەلێکدانەوەو بۆچوونی خۆم چەوت و

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ئارینۆک | ئالینۆک | بەحر | دەریا | بلّقی سەرئاو | گۆمەزە |
| ئازار | ئادار(ئاودار) | بەحەشت | بەهەشت | بنێشت | بەنیشت |
| ئاڤس | ئاڤز(ئاڤدز) | بەراوپشت | بەروپشت | بیستۆک | تێلەفۆن |
| ئاوس | ئاوز(ئاودز) | بەعیڤ | باهیڤ | پەحن | پان |
| ئۆقرە | ئارام | باسۆق،باسۆخ | باستیک | پەحنی | پانی |
| ئینجا | ئەمجا ،ئەڤجا | باعاندن | باڕاندن | پەژیوان، پەشیمان | پێشەمان |
| ئێجگار | ئێگجار | بانق | بەنک | پاقژ | پاکژ،پاک |
| ئێسق | ئێسک | حەسانەوە | ژووژیان | پرۆسقان | پچڕان |
| پشقل | پشکل | حەشەرەڵا | هەراهەرا | خاڵ | لالۆ،ئاپۆ |
| پێڵاو | پێلاو ،پێلاڤ | حەشت | هەشت | خاڵۆزا | لالۆزا ،ئاپۆزا |
| پێشکەش | پێشکێش | حەشتێ | هەشتێ | خاڵۆژن | لالۆژن،ئاپۆژن |
| تەحر | جۆر | حەفت | هەڤت | خالی | ڤالا |
| تەحل،تەعل | تال | حەفتە | هەڤتە | خوری | هری |
| تەشقەڵە | گێچەڵ | حەفتێ | هەڤتێ | خۆرەتاو | هەتاو |
| تاق | تاک | حەفتیار | کەمتیار | دەرقەت | توانین |
| تاقانە | تاکانە ،ئێکانە | حەمام | سەرشوو | دەسمێژ | دەستنوێژ |
| تاقەت | هێز | حەمی | هەمی | دەغمە | ئەشکەوت |
| تاقم | دەستە | حەموو | هەموو | دەقلووک | مازوو |
| تۆقان | زراوچوون | حەوز | گەڕ | داخ | سوێ |
| تێنووس | لێنووس | حاجیرەشک | پەڕەسێلکە | دستاڕ | دەستاڕ |
| جەحشک | جاش | حاجی لەقلەق | لەگلەگە | دڵڕەق | دڵڕەش |
| جەرگقایم | بەجەرک | حرچ | هرچ ،ورچ | دڵڕفێن | دڵفڕێن |
| جلّقاو | جلکاو | حشک | هشک ،وشک | دۆزەخ | دۆژە |
| جیران | دراوسێ،ئاوسێ | حوققە | فێڵ | دولبەر | دلبەر |
| جیقلدانە | جیکلدانە | حونەر | هونەر | دووفاق | دووپەل |
| چەعڤ | چاڤ | حونێر | هنێر | دووقەد | دوولانە |
| چاق | لنگ | حیلە | فێڵ | دوولەقان | دوولەپان |
| چاوقایم | چاونەترس | خەریک | لەگژ | رەحەتی | کۆڤک |
| چقل | چوکل | خەزال | ئاسک ،مامز | رەخ | تەنیشت |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| حەپەسان | سەرسامبوون | خەزوور | هەسوورە | رەق | رەپ |
| حەپوو | هەموو | خەستوونەوە | هەسوبوون | راستەقینە | راستەکینە |
| حەچەل | گێچەڵ | خەستوخۆڵ | هەسوهۆڵ | رق | رک |
| حەڕی | هەڕی | خەفەت | سوێ | رق وکین | لەنج |
| حەژدە | هەژدە | خەل | سیهک،سیرکە | رۆغان | رۆن |
| زەردەخەنە | زەردەکەنی | خەلووز | رەژوو | رووخان | رمان، هەرفین |
| زەخم | برین | خارچک | کڤارک،کوارک | رووخاندن | هەرفاندن |
| زاخ | زاری | شەقام | جاددە | رێخت | سروشت |
| زاخە | ژێرزەمین | شەقانشەق | سەرانسەر | قەسیلە | کەوچک |
| زاخوور | ئەشکەوت | شەلغەم | شێلم | قەلات | کەل |
| زاقوزیق | زاکوزیک | شاقاو | هەنگاو | قەلغان | مەتاڵ،سپەڕ |
| زوخاڵ،زغال | رەژوو | شاقۆڵ | شاوول | قەلانک | چەلاک |
| زعرک | بەرک،وردەبەرد | شرەق | درز | قەلس | چرووک |
| زۆخ | هێز | شۆخوشەنگ | لەوەند | قەلفەز | تاڤگە |
| ژەحر | ژەهر | عەداب | کێم | قەمتار | کەمتیار |
| ژلووقاو | شلەژاو | عەرد | زەوی | قەور | گۆڕ |
| سەبر | ئارام | عەسپ | ئەسپ | قەمیش | لەڤەن |
| سەرقات | دەرپۆشک | عاستەم | ئاستەم | قەوزە | کەڤز |
| سەرقاتی،کۆپەوگۆزە | دەرگڤانک | عاسمان | ئاسمان | قەفەز | رکەو |
| سەرمەشقانە | سەرمەشکانە | عیسک | ئیسک | قاپ | ئامان |
| سەغلەت | دڵتەنگ | غەزەتە | رۆژنامە | قاپی | دەرگا |
| سەقادان،سەکامدان | رێکخستن | غەزال | ئاسک،مامز | قاپوت | پاڵتۆ |
| سەقام | رێکی | فێقی | میوە | قاچ | پێ |
| سەوقات | دیاری | قەباغ | دەرپۆش | قاتی خانوو | نهۆم |
| ساقۆ | پاڵتۆ | قەپاندن | فڕاندن،رەڤاندن | قارچک | کڤارک،کوارک |
| سایەقە | شاهی | قەتاندن | برین،بزداندن | قاروونە | مۆرانە |
| سبحەینێ | سبەینێ | قەدپاڵ | لاشان،تەنیشت | قازانج | وەج،کەلک |
| | | قەرز | وام | قاد | مەیدان |
| | | قەرزدار | وامدار | قالۆنچە | کێز |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| حەپەسان | سەرسامبوون | خەزوور | هەسوورە | رەق | رەپ |
| حەپوو | هەموو | خەستوونەوە | هەسوبوون | راستەقینە | راستەکینە |
| حەچەل | گێچەڵ | خەستوخۆڵ | هەسوهۆڵ | رق | رک |
| حەڕی | هەڕی | خەفەت | سوێ | رق وکین | لەنج |
| حەژدە | هەژدە | خەل | سیهک،سیرکە | رۆغان | رۆن |
| زەردەخەنە | زەردەکەنی | خەلووز | رەژوو | رووخان | رمان، هەرفین |
| زەخم | برین | خارچک | کڤارک،کوارک | رووخاندن | هەرفاندن |
| زاخ | زاری | شەقام | جاددە | رێخت | سروشت |
| زاخە | ژێرزەمین | شەقانشەق | سەرانسەر | قەسیلە | کەوچک |
| زاخوور | ئەشکەوت | شەلغەم | شێلم | قەلات | کەل |
| زاقوزیق | زاکوزیک | شاقاو | هەنگاو | قەلغان | مەتاڵ،سپەر |
| زوخاڵ،زغال | رەژوو | شاقۆڵ | شاوول | قەلانک | چەلاک |
| زعرک | بەرک،وردەبەرد | شرەق | درز | قەلس | چرووک |
| زۆخ | هێز | شۆخوشەنگ | لەوەند | قەلفەز | تاڤگە |
| ژەحر | ژەهر | عەداب | کێم | قەمتار | کەمتیار |
| ژلووقاو | شلەژاو | عەرد | زەوی | قەور | گۆڕ |
| سەبر | ئارام | عەسپ | ئەسپ | قەمیش | لەڤەن |
| سەرقات | دەرپۆشک | عاستەم | ئاستەم | قەوزە | کەڤز |
| سەرقاتی،کۆپەوگۆزە | دەرگڤانک | عاسمان | ئاسمان | قەفەز | رکەو |
| سەرمەشقانە | سەرمەشکانە | عیسک | ئیسک | قاپ | ئامان |
| سەغلەت | دلتەنگ | غەزەتە | رۆژنامە | قاپی | دەرگا |
| سەقادان،سەکامدان | ڕێکخستن | غەزال | ئاسک،مامز | قاپوت | پاڵتۆ |
| سەقام | ڕێکی | فێقی | میوە | قاچ | پێ |
| سەوقات | دیاری | قەباغ | دەرپۆش | قاتی خانوو | نهۆم |
| ساقۆ | پاڵتۆ | قەپاندن | ڤراندن،رەڤاندن | قارچک | کڤارک،کوارک |
| سایەقە | شاهی | قەتاندن | بڕین،بزداندن | قاروونە | مۆرانە |
| سبحەینێ | سبەینێ | قەدپاڵ | لاشان،تەنیشت | قازانج | وەج،کەلک |
| | | قەرز | وام | قاد | مەیدان |
| | | قەرزدار | وامدار | قالۆنچە | کێز |
| | | قەرویلە | چوارپایە | قالی | مافوور |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| قورۆڵ | کولۆر | لەحیمکردن | پەرچیمکردن | میرووستان | میروو |
| قورۆمە | هەوجار | لەسەرخۆ | هێدی،بەشێنەیی | نەخۆش | نەوەش |
| قوربان | گۆری | لەش قورس | لەش گران | نەخۆشی | نەوەشی |
| قورقوشم | زریج | لەقاندن | لڤاندن،هژاندن | نەعتک | ناوچەوان |
| قوزبرکە | جۆبرکە،دووکلکە | هنداق | هاوتا، بەرامبەر | ناخون | نینۆک |
| قۆزەرەشە | کۆکەرەشە | هێلکە | هێک * | ناعال | ناڵەبار |
| قوژبن | کوژی،کوژبن | یاقە،یاخە | پستۆ | ناق | گەروو |
| نرخ | بەها | یەلغار | هێرش | نخە | نۆک |
| نقم | نگم | | | نخاڤتن | داپۆشین |
| نیخ | گەروو | | | | |
| هەڵپروزقانن | هەڵپرۆسکاندن | | | | |
| هەڵقەندن | هەڵکەندن | | | | |
| هەڵقاچین | هەڵپاچین | | | | |
| هەڵقرچان | هەڵچرچان | | | | |
| هەڵخلیسکان | هەڵیسکان | | | | |

* ناوچەیەک لە بادینان دەنگی(ح) زۆر بەکاردێنن و بەشی زۆری ئەم دەنگە لە راستیدا دەنگی(هـ)ە.
* دەنگی (ع) لە کوردیدا نییەو زۆربەی دەنگی (ئـ) ە
* دەنگی(ق) هاتۆتە ناو کوردی و زۆربەی دەنگی(ک)ە
* پەیڤی(هێلکە) راستە، بەلام(هێک) کورترو سووکترەو لەپەیڤی(ئێگ)ی ئینگلیزی نزیکترە

**سەرچاوە**


١- فەرهەنگی خاڵ(کوردی،کوردی)-نووسراوی شێخ محەمەدی خاڵ. جزمی یەکەم چاپی: چاپخانەی کامەران/ سلێمانی سالی ١٩٦٠ .
٢- فەرهەنگی خاڵ/ جزمی دووەم، سالی ١٩٦٤ .
٣- فەرهەنگی خاڵ/ جزمی سێیەم، سالی ١٩٧٤ .
٤- ئەستێرە گەشە(کوردی، عەرەبی) دانانی فازیل نیزامەدین، چاپی یەکەم لە بلاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی(مطبعة الاجیال بغداد) ١٩٧٧ .
٥- قاموس اری: فەرهەنگی ئاری(کوردی، کوردی، عەرەبی) الجزء الاول.صابر گرد عازبانی سالی ١٩٨٤ .
٦- فەرهەنگی مامۆستا بۆ قوناغا سەرەتایی/ سۆرانی و بادینی/ عەرەبی، دانانا عەبدولسەتار فەتاح حەسەن و ئەنوەر محەمەد تاهیر. چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ/ هەولێر سالی ٢٠٠٠ .
٧- فەرهەنگی کوردستان/ گیوی موکریانی. چاپی یەکەم، سالی ١٩٩٩ لەدەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس چاپکراوە.
٨- کەمالنامە، فەرهەنگی زانستی/عەرەبی، ئینگلیزی، کوردی، دانەر کەمال جەلال غەریب چاپی یەکەم/ سلێمانی، ٢٠٠٣ .
٩- فەرهەنگۆکە پاشکۆکانی پەرتووکە قوتابخانەییەکان.

## مێــــژووی ســــەرهەڵدان و دەرکــــەوتنی

# پیــــتی ئــــەلــف و بــێ

ئا: خالید سابیر



لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، دەرکەوتنی پیتی ئەلف و بێ بەتێپەڕبوونی رۆژگار پێشکەوتنێکی مەزنی بەخۆیەوە بینی«١»، دەرکەوتنی ئەو پیتانە دەگەڕێتەوە بۆ ٤٠٠٠ ساڵ پێش زایین، کە بۆ یەکەمجار بەشێوەی وێنەی رەمزی دەرکەوتن، دواترو لە نزیکەی سێ هەزار ساڵ بەر لە زایین لەلای میسرییەکان ئەو پیتانە بوونە پیتی زمانی ئاخاوتن و بریتی بوون لە٢٤ پیت، هەریەک لەو پیتانە نیشانەیەک، یان زیاتریان پێک دەهێنا، ئەوەش بووە هۆی سەردتای دەرکەوتنی یەکەم پیتی ئەلف و بێی روون و ئاشکرا لە مێژووی دێرینی مرۆڤایەتیدا. میسرییەکان توانیان ئەو پیتانە لای خۆیان جێگیر بکەن، ئەگەرچی زمانی قسەکردنیان زۆر جێگیر نەبووبوو، هەروەها بەهیچ شێوەیەکیش نەچووبووە قالبێکی رێکوپێکەوە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش نووسینی پیتە رەمزییەکان و پیتە هیرۆ گلیفییەکان واتای جۆراوجۆریان دەدا بەدەستەوە. زۆر لە پسپۆرانی زمان لە جیهاندا سەرهەڵدان و دەرکەوتنی پیتی ئەلف و بێ دەبەنەوە بۆ گەلانی سامی، کە (فینیقییەکان و ئاشوورییەکان و عیبرانییەکان).

لە چاخە دێرینەکاندا و بەپێی ئەو نووسراوانەی کە لە دوایان ماوەتەوە، فینیقییەکان بەیەکەم میللەت دادەنرێن لە داهێنانی پیتی ئەلف و بێداو ئەو پیتانەش لە دوو بەش پێکهاتبوون، بەشێکیان جێگیر راوەستاو - و بەشەکەی دیکەشیان نیوە جێگیربوون.

لە پاشماوەی شوێنەواری بابلییەکاندا (١٠) نووسراوی فینیقییەکان دۆزرانەوە، کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ١٤-١٥ سەدە بەر لە زایین، ئەو نووسراوانە ئەوە دەردەبڕن کە نووسراوی فینیقییەکان لە هیرۆگلیفییەوە وەرگیراون و لە (١٠٠) پیتی رەمزی پێکهاتوون، ئەو نووسراوانەش لە شێوەی ئەو نووسراوانە دان کە لەناوچەی (ئۆگاریت) لەسەر کەناری ناوچەی فینیقییەکان دۆزرانەوە. لەلایەکی تردوو لەسەردەمی بابلییەکاندا جۆرە نووسینێک بەکاردەهات کە ئاسانتر بوو لە نووسینی هیرۆگلیفی میسرییەکان ئەگەرچی هەمیشە پەیوەندیان بەو وڵاتەوە هەبووە.

ئەوەی شایانی باسە هۆی سەرەکی پاڵنەری دانانی پیتی ئەلف و بێ لەلای فینیقییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییەی کە لەوکاتەدا باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشابوو، ئەوان میللەتێک بوون بەردەوام بەبازرگانیکردنەوە خەریک بوون زیاد لە

**لە چاخە دێرینەکاندا و بەپێی ئەو نووسراوانەی کە لە دوایان ماوەتەوە، فینیقییەکان بەیەکەم میللەت دادەنرێت لە داهێنانی پیتی ئەلف و بێدا.**

میللەتانی تری دراوسێشیان و رۆژانەش دووچاری تەنگ و چەڵەمەی بازرگانی دەهاتن، هەروەها نووسینی فیرعەونییەکان بۆ ئەوان کارێکی گرانبوو کە بەرادەیەکی کەم ئاسانکاری دەدایە دەستەوە، لەبەر ئەم هۆیانە بیریان لەوە کردەوە، چارەسەرێک بۆ ئەو کێشەیەیان بدۆزنەوە، بۆ ئەم مەبەستە پیتی ئەلف و بێیان داهێنا کە بریتی بوو لە ٢٢ پیت، ئەو پیتانە تا ئەندازەیەک سیستمێکی رێکوپێکیان لە خۆگرتبوو، ئەو پیتانەش ئەمانە بوون: ئەلف، بیت، جیمیل، دالین، هیە، واو، زین، هیت، تیت، یود، تان، لامید، میم، نون، سامیش، عین، فیە، صاد، کاف، ریش، سین، طاو.

هاوکات ئەم پیتانە قسەشیان پێدەکراو لەراستەوە بۆ چەپ بەشێوەیەکی ئاسۆیی دەنووسران، ئەو داهێنانەی فینیقییەکان، مێژووی نووسینێکی راستەقینەی هێنایە ئاراوە. لەلایەکی دیکەوە گریکەکان لە پێش دوو هەزار ساڵ بەپیتی رەمزی فینیقی دیان نووسی، بەڵام توانیان سیستەمێک بۆ پیتە بزوێنەکان (جولاوەکان) دابنێن، کە ئەو پیتانە لە نووسراوی فینیقییەکاندا نەبوون، هەروەها شێوەی نووسینی پیتەکانیشیان گۆڕیبوو وەک ئەوەی پیتی ئەلف کرابوو بە ئەلفا، هیە بۆ ئیە، یود بۆ ئەی، عین بۆ ئۆ، لەگەڵ ئەو گۆڕینانەشدا پیتێکی بزوێنی تریان زیادکرد ئەویش پیتی (ئیی) لاکێشەیی بوو، جگە لەوە دوو پیتی (سامیش و صاد)یان گرێداو پیتێکی نوێیان بەناوی (ئێکس) دروست کرد، سەرباری ئەوانە سێ پیتی تریان بەکارهێنا کە لە ناو پیتی فینیقییەکاندا نەبوون، ئەوانەش پیتی (فی)، کی، پسی) بوون.

رێکخستنی ئەم پیتانە بەشێوەیەکی خێراو کتوپڕ نەبووە، بەڵکو چەندین گۆڕانی بەسەردا هاتووە ئەویش بەکەڵک وەرگرتن لە پیتی ئەلف و بێی میللەتانی دراوسێیان، بۆ نموونە گریکەکان سوودیان لە پیتی ئەلف و بێی (ئابۆلۆردریانی، ئایۆنی، ئەتیکی و نەتەوەکانی دورگەکان) وەرگرتووە.

بەرلەزایین بە ٤٠٠ ساڵ، پیتی ئەلف و بێی ئایۆنی کە لە ٢٤ پیت پێکهاتبوو سەری هەڵدا، ئەم پیتانە لەماوەیەکی کەمدا لەسەرانسەری یۆناندا بەکارهات و تائێستاش لە نووسینی نوێی یۆنانیدا بەکاردێت و، هەروەها کاریشیان کردە سەر پیتی ئەلف و بێی قیبتی و سیریلیکی هەر لەم میانەدا پێش ئەلف و بێی ئەتروسکی زۆر نزیکە لە پیتی ئەلف و بێی یۆنانی نوێ، هەندێک لە پسپۆڕانی زمان بۆ ماوەیەک لەو بڕوایەدا بوون کە ئەو پیتانە بنچینەکەیان لە پیتی ئەلف و بێی فینقییەوە وەرگیرابن و، پیتی ئەلف و بێی ئیتاڵی کۆن کە لە ٢٠ پێک هاتووە، هەندێک پیتی رەمزی تیایە کە لە پیتی (فی، تی) و پیتی (جاما)ی یۆنانی دەچن)، بەڵام هیچ کام لەو پیتانە هاوشێوەیان لە پیتی ئەلف و بێی فینقیدا نییە. زۆر پێدەچێت کە پیتی ئەلف و بێی ئەتروسکی پشتی بەپیتی ئەلف و بێی ئۆجدی و ئۆسکی و سابلیکی و تارادەیەکیش بەپیتی لاتینی بەستووە. روون و ئاشکرایە کە بەربڵاوی پیتی لاتینی لەو چەند سەد ساڵەی رابردوودا لەناوەراست و رۆژئاوای ئەوروپادا بەکار دەهات، بەڵام بەپەیدابوونی پیتی ئەلف و بێی (رۆما) کە بەشێوەیەکی خێرا بەناو گەلانی ئەوروپادا بڵاوبووەوە، شوێنی پیتی ئەلف و بێی لاتینی گرتەوە.

سەبارەت بەپیتی ئەلف و بێی عیبری کەوتبووە ژێر کاریگەری پیتی ئەلف و بێی فینیقییەوە، ئەم پیتانە زۆر نزیکبوون لە پیتی ئەلف و بێی بابلییەوە، بەڵام لەکاتی نووسینەوەیاندا چەند گۆڕانکارییەکیان تیادا کرا، ئەوەش لەو دەمانەدا بوو کە

حولەکەکان لە پەرت و بڵاوی رزگاریان بوو پاش ئەوەی توانیان یەک بگرنەوە، بەو هۆیەوە پیتی ئەلف و بێی عیبری سەری هەڵداو لەو سەردەمانە بەدواوە تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆ ئیسرائیلییەکان پێی دەنووسن. ئەو پیتانە زۆر نزیکن لەو نووسراوانەی کە لە پاشماوەی شوێنەوارە دێرینەکانی عیبرانییەکاندا ماونەتەوە. لە رۆژگاری ئێستادا لقی (سامارێتانی)«٣»لە نووسینەکانی عیبرانییەکاندا بە زمانێکی پاکی و بێگەرد دادەنرێت، بەیەکێکیش لە پیتە ئەلف و بێیە بنەڕەتییە سەرەکییەکان مەزەندە دەکرێت، چونکە ئەو پیتانە دووربوون لەهەر گۆڕانکارییەکی تیایاندا کرابێت، بەڵام کاریگەری زۆری پیتی ئەلف و بێی ئەرمەنیان بەسەرەوەیە، ئەگەرچی بەشی زۆری ئیسرائیلییەکان بەو پیتانە دەنووسن، هاوکات ئەم پیتانە رێسایەکی تایبەتیان هەیەو پیتی درێژکراوە تیایاندا زۆر کەمەو لە زاراوەسازیدا هەژارەو هاوتا وشە - المرادف - شیان تیادا نییە. لەلایەکی تردەوەو بەشێوەیەکی بەربڵاو پیتی ئەلف و بێی ئەرمەنی لەناو گەلانی دراوسێیدا بڵاوبۆتەوەو بۆتە بەشە زمان - دیالێکت - ئەرمەنییەکان کە لەکاتی ئێستادا قسەی پێدەکەن، ئەو پیتانە لەکاتی خۆیدا لە شاری ئەنتاکیاوە تا شاری(مەکە)و لە میسریشەوە تا ناوجەرگەی ئێران بڵاوبۆتەوە، هۆی بڵاوبوونەوەکەشی بەو ناوچانەدا لەلایەن دوو توێژەرەوەی فەرەنسی (ڤۆلنی) و (هالیڤی)وە دۆزرانەوەو ئاشکراکران. ئەو دوو ناوبراوە پاش لێکۆڵینەوەیەکی درێژخایەن گەیشتنە بیردۆزێکی نامۆ، بەتایبەتی بۆ ئەو پیتە ئەلف و بێیانەی کە لە هندستاندا بەکاردێن. لەچاخە دێرینەکان و تا ماوەیەک لەمەوبەریش، وا دەزانرا کە ئەو پیتانەی هیندییەکان بەکاری دێنن - پیتی سانسکرێتی - لەلایەن هیندییەکانەوە داهێنرابن، بەڵام پاش ئەوەی چەند نووسراوێک لە ئەفغانستاندا دۆزرانەوە، جۆرێک لە نووسینی (هیندی بەکتریانی) لەو نووسراوانەدا هەبوون، کە زۆر نزیکە بوون لە پیتی ئەلف و بێی ئەرمەنی ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە کاریگەری نووسراوی سانسکرێتیشیان پێوە دیاربووە، ئەوەش ئەوە دەردەخات کە دوو پیتی ئەلف و بێی ئەرمەنی و سانسکرێتی لەیەکەوە نزیکن، بەڵام پیتی ئەلف و بێی سانسکرێتی کاریگەری پیتی ئەلف و بێی گریکی پێوە دیارە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو پیتە زمانێکی بنچینەیی نییە، بەڵکو لەراستیدا بەپێچەوانەوەیە. هەر لەو وڵاتەدا (هیندستان)، لەسەدەی سێیەمی پێش زایینەوە دووجۆر نووسراو هەبووە (خارو ستی و براهی)، شێوەی پیتی ئەم دووانە راستەوخۆ درێژکراوەی شێوەی پیتی ئەلف و بێی ئەرمەنییەو نووسراوە هیندییەکان دەگەڕێنەوە بۆ براهی، کە لە نووسینی ئەم زمانەدا دەنگی راستەقینەی وشەکان تۆمار دەکرێت بەپێچەوانەی نووسراوی ئەرمەنییەکان کە تەنها لەرینەودی وشەکان تۆمار دەکات، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا روون نەبۆتەوە کە چۆن پیتە نەبزوێنەکانی نووسینی براهمی بەو شێوەیەی ئێستای پێشکەوتووە، بەڵام پیتە بزوێنەکانی هەمان پیت لە رێگەی درێژکردنەوەوە پێشکەوتووە.

لەو سەروبەندانەی کە پیتی ئەلف و بێی ئەرمەنی بەخاکی ئێراندا تێپەڕی و گەیشتە هیندستان، لە ئێران جۆرەنووسینێکی لە ئارادابوو کە لە چەند پیتێکی ئەلف و بێ پێکهاتبوو لە شێوەی رەمزی بڕگەیی، بەڵام دوای ماوەیەک ئەو جۆرە پیتی نووسینانە نەماون و دووجۆرە نووسینی تر پەیدابوون کە بەشێوەی پیتی ئەلف و

پیتی ئەلف و بێی سانسکرێتی کاریگەری پیتی ئەلف و بێی گریکی پێوە دیارە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو پیتە زمانێکی بنچینەیی نییە، بەڵکو لەراستیدا بەپێچەوانەوەیە

بێ دەنووسران و لە دوو زمانی (زەند) کە لە ڕۆژهەڵاتی ئێراندا بەکاردەهات و (پەهلەوی) کە لە ڕۆژئاوای ئێراندا بەکاردەهات پێک هاتبوون«٤»، ئەو دوو پیتەش کاریگەری پیتی ئەلف و بێی ئەرمەنیان بەسەرەوەبوو. بەگوێرەی پیتی ئەلف و بێی عەرەبیەوە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پیتی ئەلف و بێی (نەبتی - النبطی). ئەم جۆرە پیتانە بەو شێوەیە گەشەیان سەند کە دوو پیتی ئەلف و بێی ئێرانی و هیندی پیایدا تێپەڕین و دواتر گەشەیان کرد. (پالمیری) کە جۆرە پیتێکی ئەلف و بێ بوو، لە وڵاتی ڕەسەنی خۆی دوورکەوتەوەو بەرەو ڕۆژهەڵات کشاو گەیشتە چین و ئاسیای ناوەند، لەو ناوچانەدا چەند لقێکی وەکو (دیجور)، مەغۆل، کالموک)، مەندشو)ی لێ جیابووەوە، هەر لەو سەربەندانەدا پیتی ئەلف و بێی (نەبطی) بەرەو پێش هەنگاوی لەبەرچاوی دەنا)، ئەوەش بەهۆی ڕۆڵی مێژوویی و ئاینی بوو کە دواتر ئەو پێش کەوتنانە بوونە بنچینەی نووسینی عەرەبی، لە سەرەتای دروستبوونی پیتی عەرەبییەوە دووجۆر نووسینی جیاواز بەدەرکەوتن، نووسینی (کوفی) لقی ڕۆژهەڵات کە کاریگەری ئەلف و بێی سریانی پێوەدیاربوو، ئەم جۆرە پیتە بۆ نەخش و نیگار بەکاردەهێنرا. جۆرەکەی تریان بۆ نووسینی ڕونووسکردن (نسخ) لقی ڕۆژئاوا بوو کە ئەمەیان سەرچاوەکەی لە ئەلف و بێی (نەبطی)وە وەرگیرابوو، ئەو دووجۆرە پیتە جگە لە عەرەبەکان، گەلانی موسڵمانی تریش لەو ڕۆژە بەدواوەو تاوەکو ئێستا بەکاریان دێن.

بەپێی بۆچوونی زانای زمانزانی مەزن (ف. دی سوسیر) گۆڕین و پێشکەوتنی پیتە ئەلف و بێیەکان بەهەموو جۆرەکانیانەوە، دەگەڕێتەوە بۆ پێشکەوتنی زمانەکە خۆی بەواتایەکی تر لەگەڵ گۆڕان و پێشکەوتنی میللەتەکە خۆی. نابێت ئەوە لەبیر بکرێت کە گۆڕانی پیتە ئەلف و بێیەکان لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە نەبووە، بەڵکو لە ڕێگەی گۆڕانی گەلەکە خۆیەوە بووە، هەروەها هەندێک لەگەلە دێرینەکان بەهۆی ژێر دەستەیی بەردەوامیانەوە پیتی ئەلف و بێی سەربەخۆیان نەبووە کە پێی بنووسن، بەڵام گەلی وەهاش هەبووە لە ڕابردوویدا زۆر پێشکەوتووبووەو خاوەنی ئەلف و بێی خۆی بوو، ئەگەرچی دوایی چەندین سەدە بەهۆی باری دژواری شەڕو داگیرکردنەوە نەماوە، بەڵام ئەلف و بێکانیان لەڕێگەی ئەو نووسراوە دێرینانەی کە لە پاشیان بەجێماوەتەوە کەنەک تەنها خۆیان کەڵکیان لێ بینیوە، بەڵکو گەلانی دراوسێشیان هەتا ڕادەیەک زۆر دوور لە خۆشیان سوودیان بینیوە، لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بەکاریان هێناوە.

**پەراوێزەکان:**

**١- پیتی ئەلف و بێ بەواتای کۆکردنەوەی پیتەکانی زمانێک بەشێوەیەکی ڕێکوپێک دێت.**

**٢- فینیقیەکان بەگەلانی (سامی)ن و لە پێش زاییندا بە ٢٨٠٠ ساڵ لە خاکی لوبنانی ئێستادا ژیاون، لە گرنگترین شارەکانیان (عەکا، صەیدا) بووە.**

**٣- تا ئەم سەردەمەیش چەند هۆزێکی جولەکەی شاری نابلس بەلقی ساماریتانی دەنووسن.**

**٤- حەسەن پیرنیا لە کتێبە مێژووییەکەیدا (ایران باستان) دەڵێت: زەردەشت دوو کتێبی هەبووە (ئاڤێستا و دین کورد) ئەم دووانە بەپیتی پەهلەوی نووسراونەتەوە، دوای زەردەشت (ئازەربودمار سوپەند) ناوێک لە پەهلەویەوە پیتێکی تری داهێنا، کە پێکهاتبوو لە ٤٢ پیت و پارێزگاری هەموو دەنگێکی دەکرد، هەروەها ناوبراو دەستی بەنووسینەوەی (ئاڤێستا) بەو پیتانەکردو ناوینا (زەند).**

**٥- یەکێک لەو میللەتانە فینیقییەکانە کە بەیەکەم میللەت دادەنرێن لە داهێنانی پیتی ئەلف و بێدا.**

**سەرچاوە:**

**١- اللغة الحضارة. (مصطفى مندور) ١٩٧٤ مصر.**

**٢- اصوات واشارات - دراسة في علم اللغة - تاليف (ا. كوندرانون) ترجمة ادوريوحنا. بغداد.**

**٣- علم اللغة. ترجمة (يوئيل يوسف). ١٩٨٦ بغداد.**

**٤- المنجد في اللغة والاعلام. ١٩٨٤ بيروت.**

**٥- گیونامە (گیوی موکریانی) ١٩٦٠ هەولێر.**

# نێرو مێ

## یەکە ژ تایبەتمەندیێن زمانێ کوردی

بەرهەڤکرنا: سایب محەمەد

زمانێ کوردی ژی هەر وەک هەموو زمانێن جیهانێ ب زمانەکێ زندی د هێتە هەژمارتن.

زمانێ مە نێکەو نابیتە دوو، ئەگەر چ هندەک نیشان چێدبیت دیالێکتەکێدا هەبن و د یادی نەبن نەخاسمە زمانێ کوردی زۆرێ دەولەمەندە ژ لایێ دیالێکت و زاراڤانڤە.

نێرومێ د زمانێ کوردیدا رۆلەکێ بەرچاڤ یێ هەی ب تایبەتی د زارێ کرمانجیا ژووریدا بەلێ ئەو نییە ب تنێ دیالێکتا کرمانجی نیشانێت نێرومێ تێدا هەنە، بەلکو ل دیالێکتا هەورامیژی نیشانێت نێرومێ بەرچاڤ دەکەڤن، هەروەسا دیالێکتا سورانی ژی شینەوارێت نێرومێ ماینە نەخاسمە دەڤەرا خۆشناڤەتی و رەواندزێ، لێ بەرف کزی و نەمان د چن.

ژ بەر هندێ ئەوێ د ڤێت خۆ فێری زارێ کرمانجیا ژووری بکەت، پێدڤیە شارەزایەکا تەمام هەبیت ب کار ئینانا نیشانێت نێرومێ، نەخۆ نەشێت بدروستی باخڤیت و ڤەخوینیت، ئەگەر بەرێ خۆ بدینە زمانێ ئینگلیزی ئەو (He)و (She) ب کار د هێنن، زمانێ عەرەبی ژی(هو)،(هي) ب کار د هێنن، زمانێ کوردی ژی(وی - wî)و(وێ- we) بۆ نێرومێیا کەت ب کار د هێنن.

ل کوردستانا سۆڤیێتێ گەلەک لێڤەکولین و پێکول هاتنەکرن ل سەر خۆیا کرنا رەگەزێن نێرومێ، لێ کەم و کورتی د رەوشێت نێرومێدا هەر وەک خۆمانەڤە، هەتا سالا(١٩٣٣) چەند زانایێت تولازێن کوردێن سۆڤیێتێ، چەند لێڤەکولینەک دەرباری کێشا رەسەن د زمانێ کوردیدا بلاڤکرن، پشتی چەند لایەنێن ڤەشارتی ییێن ڤێ کێشێ بۆ وان روونبووڤە. د ئەنجامێ وان لێڤەکولینادا شەش رەوش و دۆخ ئاشکرا بوون د زمانێ کوردیدا، سێ ژ وان دبێژنێ: ردوشا راستەوخۆ، گازیکرن، تیان، سێیدیژی ژمارە بۆ دانان بەلێ هەتا ڤێ گاڤێ لێڤەکولین ل سەر نەهاتیەکرن.

هندەک پێکولێدی ژی هاتنەکرن وەک خاندنەک ل سەر نیشانێت نێرومێ ژ لایێ سەیدا جگەرخوین و سەیدا سادق بەهائەدین و کوردۆییێڤ، بەلێ وانژی ب تەمامی روون و ئاشکرا نەکرو هیچ بنکەو دەستوورێن راست و دروست دانەنان.

دابەشکرنا ناڤان ژ لایێ رەسەنی بۆ جارا ئێکێ ژ لایێ ک.ک. کوردۆیێڤ سالا (١٩٤٩) هاتە بەلاڤکرن پاشی سالا(١٩٤٩) ڤەکولین هەر بەردەوامبوون هەتا شیان د پەرتوکێت رێزمانێدا ب ڤی جوری ناڤێ ردوش و دۆخان هات:

١- حالێ راست.
٢- حالێ گازیکرنێ.
٣- حالێ تەواو.
٤- حالێ هەڤرا.
٥- حالێ تەڤایی.
٦- حالێ جیوار.

هەر چەوا بیت ب فەر دزانین هندەک نیشانێت نێرومێ د زمانێ کوردیدا نەخاسمە زارێ کرمانجیا ژووری خۆیا بکەین، چونکی ڤێ گاڤێ ل خاندنگەهو پەیمانگەها وەک دەرس تێنە خاندن.

هەروەسا من هەولدا پەیڤێت کوردی یێن رەسەن ب کاربینم ب تایبەت ئەوێن ل ناڤ گوتن، پەند، حەیرانۆک، هۆزان، فۆلکلۆر، چونکی ئەو زمانێ خەلکینە نەک زمانێ بازاری.

**رەوشـــا (دۆخ) گـــازیکرنێ (بانگکردن):-**

نیشانێت گازیکرنێ بۆ جارا ئێکێ ژ لێڤەکولێنێت بەشێ زمانێ کوردی ئەرمنستان، ژ لایێ زانایێت سوڤیێتی هاتنەکرن.

ئەڤ نیشانە د هێنە بەرچاڤ بۆ نێرو بۆ مێ (لێ، لۆ، وای لۆ، وای لێ، هێلی، هۆ لۆ، ئێلی، ینۆ، ولۆ، ێ، ۆ).

**(لێ - Lê)** ئالاڤێ (ئامـــــراز) گازیکرنێیە بۆ (مێ) ب کار د هێت بۆ دویر ئەخاسمە د فۆلکلۆرێ کوردیدا، دەمێ کچ و کـــوڕ ب ســـتـــران لێک ڤەدگێرن.

وەک:

**لـێ دۆتمـامـێ، لـێ دۆتمـامـێ، وەز وەناکەم**

**ئەز قولپا بەر سینگا ل تە ڤەناکەم**

**(لۆ - Lo)** ئالاڤێ گازیکرنێیە بۆ نێر ب کار د هێت بۆ دیر.وک:

**لۆ پسـمامۆ ئەز گـول نێرگزێ بهێن ناکەم.**

**(ۆ -O)** ئالاڤێ گازکرینێیە بۆ نێر ب کار دهێت. وەک:

**کـوڕ(ۆ) دین(ۆ) تۆ ل سەریانا خۆ نەمەشینە.**

**(ێ) -Ê** ئالاڤێ گازکرینێیە بۆ مێ ب کار د هێت. وەک:

**کچ(ێ) دین(ێ) ئەمن دەشتـە ئەمن زۆزانە.**

**(ینۆ - Ino)** بۆ نێرومێ کۆم ب کار د هێت. وەک:

**کـورد(ینۆ) هشیـارین رۆژا سەرخوە بوونێ هات.**

**رەوشا پالڤەدانێ (خستنە پاڵ):-**

زمـانێ کوردی ب تایبـەتی دیالێکتـا کـرمـانجی گـەلەک دەولەمـەندە ژ لایێ ئالاڤێن پالڤەدانێ، ئەم د شێین بێژین نیشانێت پالڤەدانێ ب ڤی رەنگینە.

**(ئا - A)** بۆ مێیا کەت، (ێ- Ê) بۆ نێـرێ کـەت( ،ێد، ێن، یێت) بۆ نێرومێی کۆم.

بۆمێیا ) کەت وەک:

١- **کچ(ا)** بێ دایی، بێ تەکـبیـرو رایی.

٢- **ئاڤ(ا)** زەلال، شێلی نابیت.

بۆ(نێرێ) کەت(ێ -Ê) وەک:

١- **کوڕ(ێ)** گوهـ نەدەت بابی، هێـژ بچویک بترسینە.

٢- **کوچک(ێ)** بێ ئاگرو پەل، گـرار ل سەر ناکەلیت.

نیشانێت پالڤەدانێ د گەڵ (جێناڤ) ژێ ب کار د هێن، مینا:

بۆ مێ: ئەز(ا) سلم، ئەز سل نابم، هەکە تە تەبینم، ئەزا هارو دینم.

بۆ نێر: ئەز(ێ) دەلالا خۆ ژڤرینم ب حەنەک و لاڤردییا.

بۆ مێ : من(ا) خواندی هەمی دەما.

بۆ نێـر : من(ێ) کـاغـەزەکـا بۆ لاوێ خۆ ڤرێ کری.

ێین، ێد، ێت: ئالاڤێت پالڤە دانێنە د گەڵ هەردوو رەگەزێن نێرومێ ێین کۆم ب کار دهێن وەک:

کچێن کوردستانێ د چەلەنگن.

٢- کـێـز کێت کەندالا، موخابن بینە، ژنێت بەرمالا.

٣- کوڕێن مە خورت و زانانە.

٤- مێرێت قـەنج ناگرین، بەلێ ئەو دوژمنێت خوە د گرین.

**رەوشا ئەگـەر کـارێ رسـتێ رابوورێ تێپەڕ بوو:**

نیشانێت نێر(ی-î)، (وی- wî)

وەک: کوڕی کڤانێ باب(ی) کێشا.

(وی) کڤانێ باب(ی) کێشا.

نیـــشـــانێت مێ(ێ- É)، (وێ- WÊ)

وەک: کچ(ێ) تەشیا دای(ێ) رێست

(وێ) تەشیا دای(ێ) رێست.

ئەو سەیداو مـامۆستـایێن بەحسی رێزمـانا کـوردی کـرین ئەخـاسـمـە پشکا (نێرومێ) هیچ بنکەو دەستور بۆ مە دانەنایـنە چەوا بشێین هندەک پەیڤان ژێک جـودا بکەین، لێ وان گـوتیـە:* ناڤێن تشتێن زڤرو گران نێرن.

* ناڤێن تشتێن نەرم و ناسک مێنە.

* ئەندامێن لەشێن مرۆڤی ئەگەر تاک بوون مێنەو ئەگەر جووت بوون نێرن.

* ناڤێت چەکێت شەری هندەک نێرن هندەک مێنە.

* دارێت تەڕ مـێنە و دارێت هشـک نێرن.

هەرچەوابیت ئەڤـە نابیـتـە بنکەو دەستـوور، بەلێ ئەوێ پێدڤیـە ل سـەر زمـان زانان پتـر ل سـەر ڤی بابەتی لێڤەکولین و خواندنا بکەن بۆ وێ ئێکێ بگەنە ئەنجامەکێ باش.

زارێ کـرمـانجی خـەلـک یێ ل سـەر ئاخفتنێ لێراهاتین، هیچ ئاریشە نینە د کـارهینانا نیشـانێت نێـرو مێـدا، لێ ئەوێ دڤـێت خـوهی بکەتە دیالیکتـا کرمانجی تویش هندەک گیروگرفتان د بن چونکی، هیچ رسـتـە بێ نیـشـانێت

نێرومێ چێنابیت، ژ بەر هندێ ئەوێ دڤێت فیرێ ڤی زارەی بیت دڤێت بێ شەهرەزابیت ب کارهێنانا نیشانێت نێرومێ، ئەخوَ ئەشێت ب رێکوپێکی باخڤیت و تویشی زۆر هەلان د بن، چونکی هەر وەک مە گوتی هەموو پەیڤ د بیت، یان نیر بن، یان مێ بن، یان دوو لایەن بن. بوَ پتر روونکرنەڤە، ئەو خالا ل سەری مە گوتی: ئەگەر ئەندامێن لەشێ مرۆڤی کەتبوون ئەڤە مێنەو ئەگەر جووتبوون ئەڤە نێرن، دا بزانین چەند راستە.

١- پەیڤا(سەر) تاکەو رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: سەرێ شەرِ بەرەڤانی هەرێ شکەستییە.

٢- (دەڤ) تاکەو رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: دەڤێ وی ژ شیر د شەوتە.

٣- (زمان) تاکەو رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: زمانێ درێژ بەلا سەرێ خودانییە.

٤- (دل) تاکەو رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: دلێ کوَڤان، سەرێ پر ژان.

٥- (روی) جوتەو رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: رویکێ من ئەرامیسە، ئەز مریدا شێخیمە.

٦- (دەست) جووتەو رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: دەستێ نەکەت، بوَ برینە باشە.

٧- (گوهـ) جووتەو رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: گوهێ خوَ بدە مەزنا، بلا خەلەت بوَ تە بیێژن.

٨- (چاڤ) جووتەو رەگەزێمێ وەر د گریت.

وەک: چاڤێ رەش نە هەوجەی کلێیە.

٨- (لێڤ) جووتەو رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: لێڤا من ئەراموسە.

٩- (پێ) جووتەو رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: پێ خوَ تەمەت بەرکا خوَ درێژکە.

١٠- (دفن) تاکەو رەگەزێ مێ وەر د گریت.

وەک: دفنا بلند هەر یا شکستییە.

١١- (گەردەن) تاکەو رەگەزێ مێ وەر د گریت.

وەک: گەردەنا منا زەرا زەیتوونی.

١٢- (سینگ) تاکەو رەگەزێ نێر وەر د گریت. د زارێ بادینیدا، لێ د شێوی بوَتانیدا رەگەزێ مێ وەر د گریت.

وەک: سینگێ کەلەش دووستامن، راناگرن زیڤ و زێرە(زارێ بادینی).

وەک: ل سەر سینگا تە هەبوو برینەکا کور. (بوَتانی)

١٣- (پشت) تاکەو رەگەزێ مێ وەر د گریت.

وەک: پشتا مروَڤی ل شەلا مروَڤی بیبیت.

١٤- (زک) تاکەو رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: زکێ تێر د کەنیت.

١٥-(ئەنی) تاکەو رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: ئەنیا تە ژ هەیڤا چار دێیە.

د ئەنجامدا پەیڤێن(سەر، دل، زک، لێڤ، دەڤ) ل دەستوری لادەن بەلێ دێ شێێن بێژین هندە پەیڤە نێرن و هندە پەیڤە مێنە.

ئەگەر هێڤ بکینە پەیڤا(ئاڤ)و سەروَکانێت ئاڤێ دیسان دێ بینین هندەک مێنەو هندەک نێرن.

بوَ نموونە: پەیڤا (ئاڤ) مێیە. ئەگەر بێخینە رەوشا پالڤەدانێ د بیتە:

(ئاڤا خورتا سەر ئەڤراز د چیت).

ئەگەر بێخینە رەوشا گازیکرنێ د بیتە:

(ئاڤێ بینێ ژ کانیا، ژ نابینێ ژ ئەسلیا).

(کانی) رەگەزێ مێ وەر د گریت.

وەک: کانیا گوندێ مە ب دەراڤە.

(جوَ) رەگەزێ مێ وەر د گریت.

وەک: جوَیا بەر مالا مە ترکە ترکە.

(بیر) رەگەزێ مێ وەر د گریت.

وەک: بیرا بێ بنە.

(رووبار) رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: رووبارێ خابیرێ ب بارانێ شێلی نابیت.

(چەم) رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: چەمێ ژێری، مژێ گرتی.

(رەز) رەگەزێ نێر وەر د گریت.

وەک: رەزێ بێ خودان، بەری ناگریت.

د ئەنجامدا دێ شێێن بێژین سەروکانیت ئاڤێ هندە پەیڤە رەگەزێ

نێر وەر د گرن، هندە پەیڤە رەگەزێ مێ وەر د گرن.

**هندەک نیشانێت دی یێن نێرومێ**

(یێ -Yê )، (یا - Ya)

بۆ نێر: (یێ) ئەخواری ب سمبێلێلا ڤە د مەهیت.

بۆ مێ: (یا) ب لنگەکی خراب و کەت گوندەکی.

(ڤی - Vî)،(ڤێ - Vê)

(ڤی) بۆ نێر و (ڤێ) بۆ مێ بۆ دوو مەبەستا ب کار دهێت هەر وەک هەڤالناڤێ نیشانەو جێناڤێ نیشانە.

بۆ هەڤالناڤێ نیشانێ نێر دێ بێژین:

ڤی کوری کڤانێ بابی کێشا.

بۆ هەڤالناڤێ نیشانێ مێ دێ بێژین:

ڤێ کچێ تە شیا دایێ رێست.

بۆ جێناڤێ نیشانێ نێر دێ بێژین:

ڤی کڤانێ بابی کێشا.

بۆ جێناڤێ نیشانێ مێ دێ بێژین:

ڤێ تەشیا دایێ رێست.

بژلی وان نیشانێت مە بەحس ژێ کری هندەک ناڤ مە یێن هەین رەگەزێ نێرومێ وەر د گرن د دۆخێ پالڤەدانێدا، ئەگەر نێربوون نیشانێ(ێ) وەر د گرن و ئەگەر مێ بوون نیشانێ(ئا) وەردگرن وەک: هەڤال، دۆست، یار، دەزگر، برادەر...هتد.

بۆ نموونە: دوست وەک نێر: دوست(ێ) من شوخ و شەنگە.

وەک مێ: مالا بابێ کەلەش دوست(ا) من شەوتی.

یار وەک نێر: مالا یار(ێ) من ل تاخێ ژێری.

یار وەک مێ: هەرچی یار(ا)وی جیرانە.

بژلی وان نیشانێت ئەوێن مە روونکرین هندەک ناڤ یێن تایبەتن بۆ نێرو هندەک بۆ مێ وەک:

پسمام : بۆ نێر

ئامۆزا:

دۆتمام : بۆ مێ

هەر وەک مە گوت دیالێکتا سۆرانیژی بێ بەش نینە ژ نیشانێت نێرومێ، لێ بەرەڤ کزی و نەمان د چن بەلێ شێنەوارێت وێ دیارن وەک بۆ ئەمرو گازیکرن.

بۆ نێر نیشانێ (ئە- E) ب کار دێت وەک:کورە، بابە.

بۆ مێ نیشانێ(ێ- Ê) ب کار د هێت وەک: کچێ. بۆ کۆم پاشگرێ(ینە) ب کار دهێت وەک کورینە، کچینە.

هەر وەک مە گوت شێوێ هەورا میژی هندەک نیشانێت نێرومێ هەنە ئەگەر چ شارەزایی من نینە لێ ب کورتی ئەڤ نیشانە ب رچاڤ د کەڤن بۆ (ئەو):

ئاد- نێر، ئادە - مێ.

بۆ هاتن: ئامان= هاتووە بۆ نێر، ئامێنە= هاتووە بۆ مێ.

{بیەن = بووە - نێر،}

{خاسا= باشە - نێر، خاسەنە - باشە - بۆ مێ}

{بێنە = بووە - مێ}

{کوڕەکە/ پیاکە} {کورۆ}

{کن چەکێ/ ژنەکێ} {کنچێ}

**ئاڤر:**

دیالێکتا کرمانجیا ژووری هەر وەک دیارە گەلەک تاو لێ یێن هەین وەک: بۆتانی، بادینی، هەکاری، بایەزیدی ئاشتایی، بەشێ کوردستانا ئەرمنستانێ، جورجیا، کوردێن سوریا و ئێرانێ.

ژبەر هندێ دێ بینین هندەک پەیڤ ل ڤێرە و ل وێرێ هندەک جوداهی یێن هەین ژ لایێ رەگەزێ نێر و مێ وەک پەیڤێن (قەلەم، سینگ، پرچ، پێلاڤ، قیز... هتد).

ئەڤە ژی ڤەدگەرێت بۆ بارودۆخێ کوردستانێ، هەروەسا دابەشکرنا خاکا کوردستانێ دناڤبەرا چەند مللەتێت جاواز، بەلێ دێ شێێن بێژین مە پێدڤیە دەستورەکی دانێن بۆ جوداکرنا نێر و مێیان.

چەوا مەگوت ژێدەر و چاڤگ هەموو مێنە، یان پەیڤێت پیشەسازی ئەوێت هاتینە دناڤ کوردیدا مێنە یانژی ناڤێن هەیڤ و ستێرا هەموو مێنە.

ئەگەر بێتوولێ ڤەکولین بەردەوام بن دێ شێێن دەستورو بنگەهێن رێک و پێک بۆ رێزمانا زمانێ کوردی دانێین.

**ژێدەر و سەرۆکانی:**


١- رێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، پرۆفیسۆر، ک، ک، کوردۆییێڤ، وەرگێرانی دکتۆر کوردستان موکریانی لە روسییەوە، ١٩٨٢.

٢- ئاوا و دەستورا زمانێ کوردی، جگەرخوین ١٩٦١.

٣- رێزمانا کوردی، سادق بەهائەددین.

٤- زمان و ئەدەبێ کوردی، دیالێکتا کرمانجیا ژووری دانانا شێرکۆ ئەحمەد حوێز و فیسەل مستەفا حاجی سالا ٢٠٠٠.

٥- گوتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان، حەجی جەعفەر، ١٩٨٦.

# لاڵۆ ڕەنجـــدەر لە دیدارێکدا



زەردەشتیەت یەکێک لە ئاینە هەرە دێرین و دیارەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین و بگرە جیهانە، باوک و باپیرانمان بەر لە بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام هەڵگری ڕاستەقینەی ئەو ئاینە بوونە، زەردەشتییەت ئاینێکی قووڵ و بەهادارە ڕێساو یاسای بۆ گشت بوارە جیاجیاکانی ژیان داناوە، بەڵام بەداخەوە کورد وەک نەتەوەیەک زانیاری ئەوتۆی لەسەر ئەو ئاینە نییە.

هونەرمەند لاڵۆ ڕەنجدەر وێڕای بایەخدانی بەهونەر ئەوا خوێنەرو چاودێرێکی شارەزای ئەو ئاینە دێرینەیە، ڕاستە ڕەنجدەر ئەکادیمی و زانستیانە زەردەشتیەتی نەخوێندۆتەوە بەڵام زانیارییەکی باشی دەربارەی هەیە، بۆیە بەباشمان زانی لەمیانی ئەو دیمانەیەدا ئەوەی لە هەگبەی دایە بیخەینەڕوو.

* من زەردەشتیەتم وەک کەلتوور وەرگرتووە نەک وەک ئاین.

* کورد ئێستا لە هەموو کاتێک زیاتر پێویستی بەبەهاو چەمکە مرۆییەکانی ئاینی زەردەشتە، چونکە زەردەشتییەت هەڵگری کەلتووری پێکەوە ژیان و لێبوردنە.

* زەردەشت مۆسیقاژەنێکی لێهاتوو بووە بەتەمووورەکەی موناجاتی لەگەڵ ئەودا دەکرد.

* ئاگر لە ئاینی زەردەشتی سەمبوولی ڕووناکییە.

<u>**کەلتوور نەک ئاین**</u>

*** ســـەرەتا بابزانین بایەخـــدانت بەئایینی زەردەشـــت لـــە چ سـۆنگەیەکـەوە سـەرچاوە دەگرێت؟**

- من زەردەشـتـایەتیم هەمـیـشـە وەک کـەلـتـوورو مـــێـــژوو وەرگــــرتووە بەپێـــچـــەوانەی ئەوەی هەندێک کەس وا تێدەگەن زەردەشـتـیـیـەتم وەک ئاین وەرگـرتووە، بەڵام شـانازی بەوە دەکەم، کە بەشێکە لە کـــەلـتـــوورو مـــێـــژووی نەتەوەکـــەم هەروەک چۆن مـیـسـرییـەکـان ئیـسـلامن کـەچی ئێـسـتـاشی لەگـەڵ بێت شانازی بە ئەهرامەکان دەکـەن و دەسـتـبـەرداری نابن، من پێم وایە ئەوەی گـــوڵلە بەڕابردووی خـــۆی بنێت ئەوا ئەوەی داهاتوو نەفرەتی لێدەکات، ئێمە گەر موسڵمانین بەلای منەوە ئەو ئیسلام پەرستییەی ئێمە (عەگال پەرستییە) نەک خواپەرستی، من گەر موسڵمانم بەو عـەگال پەرسـتـیـیە دەبێت ناوی عـارەبی لە منداڵەکەم بنێم و کەلتوری نەتەوەی خۆم ڕەت کەمەوە.

بەڕاستی ئەم عەقڵییەتە پێویستی بەپێداچوونەوە هەیە زۆر ئاسـاییـە نوێژ بکـەین ڕۆژووبگرین خـواپەرسـتی خـۆمـان بکەین، بەڵام بەعـەقـڵێکی کـوردانە نەک بەعـەقـڵێکی

عارەبییانەی شۆڤینی رەگەزپەرستانە.

کاتێک ئیسلام هاتە کوردستان تەنها قورئانی پیرۆزی لەگەڵ خۆی نەهێنا، بەڵکو کەلتوری دوورگەی عارەبی بۆ هێناین ئەو کەلتورەی کە پێش لە دایک بوونی ئیسلامیش کۆمەڵێک شتی هەڵەو نادروستی لەخۆ دەگرت، بۆ نموونە ئەم چەقۆیەی کە بەئاشکرا لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان ملی کەسانی بێ تاوان دەبڕێت هەمان ئەو چەقۆیەیە کە ئیمام علی و حسێن و عومەرو عوسمانی کوشت و هەر ئەو چەقۆیەشە کە کچەکانی خۆیان پێ سەردەبڕی، بۆیە کەلتووری ئیسلام نییە، پێویستە کەلتوری شۆڤینیانەی عارەب رەت کەینەوەو کەلتوری راستەقینەی ئیسلام وەرگرین و لە پاڵ ئەمەشدا مافی خۆمانە کەلتوری زەردەشت وەربگرین، چونکە هەر نەتەوەیەک مێژووی رەسەنایەتی خۆی نەزانێ، ئەوا پێناسەی نییەو خەڵکانی دیکە بەسەریدا زاڵ دەبن.

هەر نەتەوەیەک مێژووی رەسەنایەتی خۆی نەزانێ، ئەوا پێناسەی نییەو خەڵکانی دیکە بەسەریدا زاڵ دەبن.

*** سەروکارت لەگەڵ زەردەشتیایەتی چۆن دەستی پێکرد؟**

- ئاشنایەتیم لەگەڵ زەردەشتایەتی ئەوکاتە دەستی پێکرد کە چوومە سەر شوێنەوارە پیرۆزە فەرامۆشکراوەکانی زەردەشتەکان، لەسەردەمی پێشمەرگایەتی لەچیاو شاخەکانی کوردستان بەچاوەکانم زێتر شوێنەوارو ئاسەواری باوک و باپیرانی خۆمم بینی کە بەدەستی ئەنقەست کاول و وێران کراون، بەجۆرێک ئێمە وەک نەتەوەیەکی خاوەن ئەم شوێنەوارە دێرینانە بەلای ناچین و لێی ناپرسینەوە، بۆیە ئەوکات بڕیارمدا دەبێت هەوڵی ئەوە بدەم زانیاری دەربارەی ئەسڵ و ئایینی باب و باپیرانم بزانم گەرمن ئەو شتانە نەزانم ئەوا چۆن و بەچ مەبدەئێک کوردایەتی بکەم، بەداخەوە ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان دەربارەی کەلتوورو مێژووی کورد کردووە ئەوا سەنگی لێکۆڵینەوەکانیان ئاراستەی میرنشینە کوردییەکان کردووەو تا ئەو قۆناخە رۆیشتوون، ئەو میرنشینانەی ئێمە ئێستا وەک مێژوو دەیانخوێنینەوەو شانازییان پێوە دەکەین، هەڵگری هەمان کەلتوورو بیری رەگەز پەرستانەی عارەب بوونە بەجۆرێک لە

**جۆرەکان عەگال چییەتیان کردووە.**

وەک کورد لە ئان و ساتی ئێستادا زۆر پێویستمان بەزانینی بەهاو چەمکە مرۆییەکانی ئایینی زەردەشتییە چونکە ئەم ئایینە خاوەن کەلتوری پێکەوە ژیان و لێبوردنە.

## ئایینێکی قووڵ و پڕ بەها

*** وەک شارەزایەک لە ئایینی زەردەشت جگە لەو کەلتوورو بنەمایانەی باست کرد ئەو ئاینە لەڕووی کۆمەڵایەتی و هونەرییەوە چ پەیامێک لە خۆی دەگرێ؟**

- وەک لە سەرەتادا ئاماژەم پێکرد ئایینی زەردەشت ئاینێکی قووڵ و پڕ بەهایە، یاساو رێسای بۆ گشت بوارەکانی ژیان داناوە، ئەگەر بواری کۆمەڵایەتی بەنموونە وەربگرین ئەوا دەبینین لەم رووەوە زۆر پێشکەوتوو بەتایبەتی لە چارەسەرکردنی پەیوەندی خۆشەویستی کوروکچ لە بواری هونەریش بەهەمان شێوە، بەڵام بەداخەوە شانۆکارو هونەرمەندانی ئێمە لە کرۆکی زەردەشتییەت بێ

ئاگان گەر ئێمە زانیاریمان لەسەر (چەمەری) هەبێت ئەوا دەزانین ئەوکات باب و باپیرانمان بەشێوازی ژەنینی مۆسیقا مردووەکانیان ناشتووە خاڵێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە زەردەشت خۆی مۆسیقا ژەنێکی لێهاتوو بووەو، بە (تەمووور)ەکەی دەستی و بەهۆی ژەنینی مۆسیقاوە مووناجاتی لەگەڵ خودا کردووە. دەنگی زەردەشتیش دەنگێکی خۆش و سۆزدار بووە لەڕووی نووسینەوەش گاتاکان کە بەشێکی گەورەو گرنگی ئاڤێستا پێک دێنێت ئەوا خۆی نووسیویەتی، لێرەدا من دەپرسم گوناه نییە ئێمە بێئاگاین لەم کەلتوورە مەزنە.

*** زەردەشتایەتی لەسەر ئاستی کوردستان و دەرەوەدا چۆن دەبینی؟**

- لە کوردستاندا زۆر کەس هەن بێ ئەوەی هەست بکەن ئەوا هەڵگری پەیامی زەردەشتن، بۆ نموونە ئەو مرۆڤانە لەهەر بارودۆخێک دابن درۆناکەن و ڕاست گۆن لەگەڵ خۆیان و دەوروبەریان، هەروەها خاوەن کردارو گوفتاری جوانن گەر تۆ بیرت پاک بێت قسەت پاک بێت کردارت پاک بێت کەواتە تۆ خودا ناسێکی ڕاستەقینەی، خوداش ڕاستگۆیی و پاکی لە ئێمە دەوێت، ئەمانەش بنەمای ڕاستەقینەی ئایینی زەردەشتن.

### ناسەواری زەردەشتییەکان

*** شوێنەواری پەرستگا زەردەشتییەکان لە کوردستان دەکەونە چ ناوچەیەکەوە؟**

- بەڵێ شوێنەواریان زۆرە، بەڵام لە ڕێگەی بەرنامەیەکی داڕێژراوی داگیرکەرانی کوردستان هەوڵی نەهێشتنی شوێنەواری ئەو پەرستگایانە دراوە بۆ ئەوەی وا لە ئەوەی ئەمڕۆ بگەیەنن کە ئێمە هیچ نینەو خاوەن کەلتورێکی ڕەسەن نین، سەبارەت بەو ناوچانەی تائێستا ئەو شوێنەوارانەیان تێدا ماوە بەزۆری دەکەونە ئێران، وەک شارەکانی ئەسفەهان و تاران، هەر لە وڵاتی ئێران بەرەسمی پەرستگای زەردەشتییەکان هەیە تێیدا هەوادارانی ئەم ئایینە خوداپەرستی خۆیان تێدا دەکەن و ئەندام پەرلەمانێکی زەردەشتی لەنێو پەرلەمانی ئێراندا کە کۆمارێکی ئیسلامییە هەیە، زۆر بەراشکاوانە بەرگری لە ئاینەکەی دەکات، بۆیە دەتوانین ئێران بەکانگەی زەردەشتییەت لە قەڵەم بدەین. گومان لەوەدا نییە باب و باپیرانی ئێمە زەردەشتی بوونە، بەڵام بەداخەوە تۆمەتێکی نەشیاو خراوەتە پاڵ زەردەشتییەت کە زۆر لێی دوورەو پەیوەندی پێوە نییە، ئەویش تۆمەتی ئاگرپەرستییە، چونکە زەردەشتییەت وەک هەر ئاینێکی دیکە تەنها یەک خودا دەپەرستێت و پەیوەندی بەپەرستنی ئاگرەوە نییە.

### ئاگر لە زەردەشتیەتدا

*** کەواتە زەردەشتییەت چۆن دەڕوانێتە ئاگر؟**

- ئاگر لەو ئاینەدا ڕووناکییە کەس دەتوانێ لە تاریکیدا نوێژ بکات و خوا پەرستی بکات.

هەموو مرۆڤێک لە تاریکی هەست بەدڵتەنگی و شپرزەیی دەکات، لەم گۆشە نیگایەوە زەردەشت ئاگر ناپەرستێ بەڵکو پیرۆزی دەکات و

ئایینی زەردەشت ئاینێکی قووڵ و پڕ بەهایە، پاساو ڕێنمای بۆ گشت بوارەکانی ژیان داناوە

روو لە رۆژ دەکات، چونکە رۆژ سەرچاوەی رووناکی سروشتە، کەچی هەر لەو کاتەدا میللەتانێک هەبوونە شەویان پەرستووەو ئاڵای رەشیان هەڵگرتووە، کە نیشانەی نائومێدی و تۆڵەسەندنەوەیە.

*** ئەی پەیوەندی ئاگری نەورۆز بەئاینی زەردەشتییەوە چییە؟**

- پەیوەندی لە نێوان زەردەشت و ئاگری نەورۆز هەیە، بەڵام دەبێ ئەو راستییە بزانین، کە نەورۆز زۆر لە زەردەشتی کۆنترە.

*** ئایا زەردەشت کوردبووە؟**

- زەردەشت خۆی خەڵکی ناوچەی ورمێی کوردستانی ئێرانە ئەو مرۆڤێکی جوتیاربووە، ئەو مامۆستایەک لە منداڵی وانەی پێگوتووە هەستی بەپێغەمبەرایەتی و لێهاتوویی ئەو منداڵە کردووە، زەردەشت ناوی (سیم یار) بووەو لە تەمەنی (٧٠-٧٥) ساڵی لە پەرستگا کاتێک نوێژی ئازادکردنی خاکەکەی دەکرد لەلایەن تورانییەکان شەهید کراوە. دایکی ناوی (داگ دۆمایە) واتە دۆژین (بێری) ، خەڵکی (رەی)یە کە دەکەوێتە دەرەوەی کوردستان، بەڵام باوکی ناوی (پوشاسما)یەو بەنۆ پشت دەچنەوە سەر (سپیت مان)، وشەی زەردەشتیش لە (زەر دەسترا) هاتووە، کە مانای (ئەستێرەی زەرد) دەبەخشێت، هەندێک قسەی واش هەیە کە گوایە پێغەمبەر (ئیبراهیم) زەردەشتی بووە، چونکە تەنها یەک زەردەشت نەبووە، ئەمانە قسەی من نییە، بەڵکو قسەی چەند پسپۆڕو لێکۆڵەرەوەیەکی ئەم بوارەن، سەبارەت بەشوێنی جوگرافی کوردستان و خاکەکەی ئەوا من ئەم خاکەم لە هەموو پارچە زەوییەکی دیکەی جیهان پێ پیرۆزترە ئەو کاتەی تۆفانەکەی حەزرەتی نوح روویدا، نوح بەخودای پەروەردگاری گوت: (ربی أنزلنی منزلا مبارکا) خوداش کەشتییەکەی لەسەر چیای (جوود) گیرساندەوە، کە جەرگەی خاکی کوردستانە، بۆیە ئەوەی خاک و ئاڵای کوردستانی لا پیرۆز نەبێت جا کورد بێت یان غەیرە کورد، ئەوا کافرە.

**زەردەشت و رۆحی نیشتمان پەروەری**

*** دەتواندرێ پەیام و بنەماکانی زەردەشتییەت لەگەڵ رۆژگاری ئەمڕۆ بگونجێندرێت و کاری پێبکرێت؟**

- بێگومان تۆ ناتوانی ئایینێک کە زیاتر لە دوو هەزار ساڵ بەسەرداچووبێ ئەمڕۆ دەقاودەق پەیڕەوی بکەیت، بەڵام دەتوانین لە چەند بوارێکی هونەری وەک شانۆو مۆسیقا سودی لێوەربگرین، بەکورتی دەتوانین وەک مادەیەکی کەلتووری وەری بگرین و بینای مۆدێرنی لێ دروست بکەین.

*** دەستنووسی کتێبی ئاڤێستا تائێستا ماوە؟**

- بەڵێ ماوە کاتی خۆی یۆنانییەکان هاتن دانەیەکیان لە دەستنووسەکەی سوتاند، بەڵام ساسانییەکان لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی (ئەردەشێری بابکان) بڕیاری کۆکردنەوەی دەقەکانی ئاڤێستایان داو، لە ماوەیەکی دیاریکراودا کۆیان کردەوەو تەفسیریشیان بۆ نووسی، ئێستاش ئەم کتێبە بەچەند زەمانێک دەست دەکەوێت.

*** خواپەرستی و جێبەجێکردنی پەیڕەو ئاینییەکان لە ئاینی زەردەشتدا چۆنە؟**

- نوێژیان هەیە وەک ئیسلام دەست نوێژ هەڵدەگرن، بەڵام دەستنوێژ هەڵگرتنیان لەهی موسڵمانان قورسترە، چونکە ئەوان دەستیان تا بن باڵیان و قاچیان تا سەر چۆکیان دەشۆن، حەز دەکەن ماڵەکانیان روو لە رۆژ بێت، بەجۆرێک ئەو ماڵەی رووی لە رۆژ نەبوایە دەیانگوت خواردنی ئەو ماڵە حەرامە، هەروەها کەڵەشێر لەلای ئەوان زۆر پیرۆزە، چونکە تاکە گیاندارە پێشوازی لە رۆژ دەکات، هەروەها رۆژانە سێ نوێژی سەرەکیان هەیە کە سروشتی وەرزشی پێوە دیارە.

**ئا: هێمن نوری**

# خولانه‌وه له‌بازنه‌ی لاساییکردنه‌وه په‌تایه‌که زۆربه‌ی شانۆکارانی کوردی گرتۆته‌وه

**هونه‌رمه‌ند زیاد که‌ریم له‌ساڵی ۱۹۷۲ له‌شارۆچکه‌ی (دووبز) له‌دایک بووه. له‌ساڵی ۱۹۹۰ ده‌ستی به‌کاری هونه‌ری کردووه، ده‌رچووی به‌شی شانۆی په‌یمانگای هونه‌ره جوانه‌کانی هه‌ولێره له‌ساڵی ۱۹۷۷- ۱۹۹۸، به‌شداری کۆمه‌ڵێک کاری شانۆیی کردووه وه‌ک (کێ تاوانباره، کێ بشێته، نامانه‌وێ، داری زۆردارو پشتی هه‌ژار، شۆڕشی تارماییه‌کان، ئه‌نتیگۆنا، دووبرا، له‌دایکبوون، لالۆ کوردۆ، قایغێک له‌دارستان) وه‌ک ده‌رهێنانیش کۆمه‌ڵێک کاری بۆ منداڵان کردووه له‌وانه (پاوانی گورگ، دارستانی تێنوو، مام ڕێوی فێڵباز، هه‌ڵه‌بجه).**

**کۆمه‌ڵێک نووسینه‌وه‌ی ڕه‌خنه‌بیشی له‌سه‌ر چه‌ند کارێکی شانۆیی نووسیوه. به‌پێویستمان زانی ئه‌م دیداره‌ی له‌گه‌ڵدا سازبکه‌ین:-**



*** به‌شی شانۆی په‌یمانگای هونه‌ره جوانه‌کان تا چه‌ند ئاستی ڕۆشنبیری له‌ڕووی خوێندنه‌وه‌ی شانۆیی ئێوه‌ی په‌روه‌رده‌کردووه؟**

- به‌ر له‌وه‌ی بچمه په‌یمانگای هونه‌ره جوانه‌کان خوێندنه‌وه‌م بۆ شانۆ به‌جۆرێک بوو، به‌ڵام پاش چوونم بۆ په‌یمانگای هونه‌ره جوانه‌کان تێڕوانینه‌کانم بۆ شانۆ به‌ته‌واوی گۆڕاو له‌وکاته‌وه خوێندنه‌وه‌م بۆ شانۆ له‌سه‌ر بنه‌مایه‌کی ئه‌کادیمیانه‌وه په‌ره‌پێداو ئاستی ڕۆشنبیری شانۆیشم گۆڕانکارییه‌کی به‌رچاوی به‌خۆیه‌وه بینی.

*** ئایا ده‌توانین بڵێین له‌م بارودۆخه‌ی ئه‌مڕۆدا بوارێکی گونجاو بۆ شانۆکاران ڕه‌خساوه بۆ ده‌رخستنی تواناو سه‌لیقه شاراوه‌کانیان؟**

- بوارێکه هه‌موو کاتوسه‌رده‌مێک ڕه‌خساو بووه، به‌ڵام کۆمه‌ڵێک به‌ربه‌ستو قه‌یران هه‌بوون له‌به‌رده‌م هه‌وڵو توانستی شانۆکاران، بۆیه ناکرێ بڵێم ئه‌م بارودۆخه‌ی ئێستا له‌بارنییه، جیاوازی هه‌یه، به‌ڵام که تواناکانی شانۆکاران هه‌ر به ته‌نهایی بێنێته‌وه هه‌وڵ و تواناکان نه‌خرێته گه‌ڕ بارودۆخ چه‌رۆڵێل ده‌بێ، تواناو سه‌لیقه پێویسته، به‌ڵام وزه‌و خوێنگه‌رمیشی ده‌وێ.

*** داهێنانی شانۆکارانی کورد له چ ئاستێکدا ده‌بینی؟**

- هه‌ر ئه‌زموونێکی تازه، هه‌ر کارێکی نه‌کراو خۆی له‌خۆیدا ده‌چێته قالبی داهێنانه‌وه، ئه‌فراندنیش به ده‌سته‌به‌رکردنی پێداویستیه



هونەرییەکان و پشگیری هونەرمەندان بکرێ، هونەرمەندی داهێنەریش دەبێ سەرەدەری لەگەڵ ڕۆشنبیرییە جیاجیاکان بکات، بەڵام هونەرمەندە شانۆکارەکانی کورد تا چەند توانیویانە داهێنان بکەن؟! من پێموایە خولانەوە لەبازنەی لاساییکردنەوە پەتایەک بووە زۆربەی شانۆکارانی کوردی گرتۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ بەرهەمی جوان دەبینرێ، بەڵام ناچنە قاڵبی داهێنانەوە.

*** ئەمە بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە دەق و شێوازی نمایشەکان خۆی لە بازنەی لاسایی دەرنەخستووە؟**

- نەک دەق و نمایشەکان، بەڵکو جەستەو بیرکردنەوەو خوێندنەوەکانیشمان بۆ شانۆ لەگەڵ لاسایی کردنەوە بەستەڵەک بووەو توانای دەرباز بوونمان لێی نییە، تا خۆرێک بۆ ئەم پەتایە هەڵنەیێ و ئەم تەوقە نەشکێ شانۆی کوردی هەر لە پەراوێز دەمێنێتەوەو، نابینە خاوەن ناسنامەی تایبەت بەشانۆی خۆمان.

*** بایەخدان بە توانای شانۆکارانی نوێخواز، تا چەند ئازاد شانۆی کوردی دەبێت لە لاسایی کردنەوە؟**

-پرۆژەی نوێخوازی شانۆیی لە کوردستان لەبەردەم پرسیارە، چیبکەین تا سەردەمیانە کار لەو جۆرە پرۆژانە بکەین، ئایا ئێمە توانیومانە بەشێوەیەکی هاوچەرخانە مامەڵە لەگەڵ شانۆدا بکەین، تا هەنگاو بۆ پرۆژەیەکی نوێخوازی بنێین، ئەمە خەونی من و سەرجەم شانۆکارانە کە ڕۆژانێک بێکار لەو پرۆژانە بکەین، تەختەی شانۆکانمان بەم جۆرە نمایشانە برازێنینەوە، گەلێ جار ئەزموونێکی تازە ئەنجام دەدەین و ناوی دەنێین کارێکی نوێخوازی کەچی بەهزرو ستایلێکی نوێخوازانەوە کاری بۆ ناکەین.

*** دوا وتەت؟**

- هەموومان ببینە فاکتەرێک، کارێک بکەین بۆ ئەوەی شانۆی کوردی لەو ئیفلیجییەی کە تووشی هاتووە رزگاری بکەین، بینەر بە هۆڵەکانی شانۆ ئاشنا بکەینەوەو کار بۆ بنەبڕکردنی قەیرانەکان بکەین.

**ئا/ ڕەوەند محەمەد**

ڕوونکردنەوە

**ئەو وێنەی کە لەلاپەڕە(١)ی ژمارە ١٨٥ی گۆڤاری کارواندا بلاوکراوەتەوە کاری هونەرمەند (پۆل کلەیە)و پەیوەندی بەبابەتی(لەبارەی هونەری مۆدێرن)ـە کە لەهەمان ژمارەدا لە لاپەڕە(٣-١)ی گۆڤارەکەدا بلاوکراوەتەوە، وێنەکەش وێنەی هونەرمەند (پۆل کلە)یە نەک محەمەد تیرانی.**

**لەگەڵ ڕێزمان**

**گۆڤاری کاروان**

# ئەفسانە و مێژوو
## لە ناو هونەری شێوەکاریدا

جەبار جەمال غەریب

چەند وشەو کتێب هەڵگری ماهیەتی فکرو شاهید و دۆکیومێنتی زیندوون لەسەر چۆنیەتی ژیان و بیرکردنەوەی مرۆڤ ئەوە رەنگ و تابلۆش بە ئەندازەی ئەوان و زیاتریش رۆڵیان لە گواستنەوەی شێوەی بیرکردنەوە و ژیانی مرۆڤدا هەبووە.

هەر بۆ نموونە بەبێ لەبەرچاوگرتنی مێژووی شێوەکاری و پەیکەرسازی یۆنان ناتوانرێ سەدە زێرینەکانی ئەو وڵاتە ببینرێ. بەواتایەکی دیکە **سەدە زێرینەکانی دنیا ئەو سەدانەن کە هونەری شێوەکاری تێیدا گەشەی کردووە.** هەستی زیباناسی دنیا لە پلەی یەکەمدا دوای سروشت قەرزداری تابلۆ و رەنگی هونەرمەندانن.

دنیای بابەت لە هونەری شێوەکاریدا زۆر جیاوازو هەمەرەنگە، بۆیە لەم ژمارەیەدا لە بڵاوکردنەوەی بەشەکانی دیکەی تایبەت بە پۆرترەیت دەوەستم و هەوڵی رۆشنکردنەوەی رۆڵی هونەری شێوەکاری دەدەم لە گواستنەوەی ئەفسانە و مێژووی فکری ئینسان.

بەشی یەکەممان لەو بوارەدا بەناوی **«میتۆلۆژیای کۆن و مێژوو»**.

* ئەو تابلۆیانە پشتیان بە یۆنانی کۆن و سەرچاوەکانی لاتین بەستووە. ئەوانە چیرۆک دەگێرنەوە.. رووداوەکانی میتۆلۆژیا وێنە دەکەن، وەکو رووبەڕووبوونەوەی «Apollo» ئەپۆلۆ و دافنی «Daphne»، یان ئەو چیرۆکانەی مێژوونووسەکان باسی دەکەن. وەکو «ترازیان و بێوەژنەکە» ئەم جۆرە تابلۆیانە لەسەدەی شانزە لە هونەری شێوەکاری زۆر باو بووە و هونەرێک بووە بۆ خەڵک. ئەنیم ماڵ و رازانەوەی کۆشک و ژوورسەری شوێنی نووستن بەکارهاتوون.

لە هەزارو پێنج سەدەکانیش



جارێکی دیکە ئەو هونەرە توانی بایەخی خۆی نوێبکاتەوە و سەرنجی جوانناسانی دنیا بۆ خۆی راکێشێ.

تێبینی:

ئەمڕۆ ئەو تابلۆیانەی میتۆلۆژیای کۆن و مێژوو دەگێرنەوە بوونەتە رەمزی جوانناسی مرۆڤانی هەموو دنیا نەک تەنیا یۆنانی کۆن و رۆمانەکان. ئەو سامانە کلتوریە مەزنە بە تابلۆ و پەیکەرەکانەوە بوونەتە سامانی هەموو ئینسانیەت و هەموو خەڵکانی سەر زەوی شانازیان پێوە دەکەن.

* بێگومان ئەوە جێگای داخ و کەسەرە کەلێنێکی گەورەو سارێژ نەبوونی نەک مێژووی شێوەکاری کورد، بەڵکو کەلێنێکی گەورەی کلتور و مێژووی ئینسانیشمانە کە هەتا لە مێژووی نوێماندا کورد پشکێکی لەشێوەی سامانێکی ئاوادا نییە. واتا لەسەرەتای سەرهەڵدانی جووڵانەوەی شێوەکاری، کلتوری کورد و ئەفسانەی کوردی نەبوونەتە بابەت و جێگای بایەخ و گرنگی شێوەکاران و سوژەی کارەکانیان. بۆیە **ئینسانی کورد تا سەر ئێستا برسی رەنگەکانی مێژوویەتی، برسی رەنگەکانی ئەفسانەکانیەتی، برسی رەنگەکانی شکست و مردنەکانیەتی.**

لەم بەشەدا سێ تابلۆ دەکەمە نموونەی گێڕانەوەی ئەفسانە لە رێگای رەنگ و وێنەوە «ئەگەر چاپ جوانناسیەکەیان نەکوژێ».

وریا بوداغی

# بزاڤی شێوەکاری لەبۆکان خۆرسک و خاوەن بنەماو خاوەن پڕۆژەیە



وریا بوداغی هونەرمەندێکی شێوەکاری ڕۆژهەڵاتی کوردستانەو خاوەن سەبت و ستایلی شێوەکاری خۆیەتی و هەڵگری پەیامێکی مرۆڤدۆستانەیە، فلچەو ڕەنگ و سکێچەکانی گوزارش لە بەها ئیستاتیکی هونەرییەکان و لەناواخنیشدا باس لە کارەساتی میللەتەکەی دەکات، وریا ئێستاکە قوتابی زانکۆی سەلاحەددینەو لە هەولێر دادەنیشێ لەم گفتوگۆیەدا ڕووبەڕووی چەند پرسیارێکمان کردەوە:-



*** مێژووی سەرهەڵدانی هونەری شێوەکاری لە بۆکان دەگەڕێتەوە بۆ کوێ؟**

- ئەگەر بەشێوەیەک باس لە هەوڵێکی جیدی و تا رادەیەک زانستییانە بکەم، ئەم لقە لە هونەر(شێوەکاری) لەشاری بۆکاندا نیو سەدەیە سەری هەڵداوە و تەمەنێکی زۆر کورتی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵەکان زۆر جیدی و رێکوپێک بەڕێوە چوون.

*** لە رووی مێژووی شوێنەوارەوە شاری بۆکان خۆی بەخاوەنی چ هونەرێک دەزانێ؟**

- مێژووی شوێنەوار لە بۆکاندا وەکو زۆربەی شارەکانی دیکەی کوردستان لەبواری هونەریدا و ئەوەی کە زۆر بەرچاوبێت بیناسازی یەکە لەچەند شوێنی وەکو قەڵایچی و قەڵای ناوشاری بۆکان و چەند شوێنێکی دیکە کە رەنگە ئێستاش کاریان بەمەبەستی دۆزینەوەی مێژوویان لەسەر نەکرابێ دێتە بەرچاو، بەڵام میعماری تەنیا یەک لایەنی هونەری شوێنەواری بۆکان نییە، بەڵکو لە گوندو دێهاتەکانی دەوروبەری بۆکاندا ئەوەندەی کە دۆزراونەوەو بەدەست خەڵکەوە بوون، یان زۆر بەکەمی پارێزرابن، سواڵەت و هەموو ئەم حاجەتانەی کە لەماڵدا، لەکۆن کەڵکی لێ وەرگیراوەو بە گڵ و قوڕسازکراون(کووپەو جەڕەو قاپ و...)ئەوەندەی کەمن ئاگاداربم و بیستبێتم، کە دڵێم بیستبێتم لات سەیر نەبێ، چونکە هەتا ئێستاش لەشاری بۆکان شوێنێکی وەکو مۆزەخانە نییە، کە هەموو ئەم شتانەی تێدا کۆ بکرێتەوەو بپارێزرێ. بەشێکی زۆر لە گوندەکانی بۆکان خاوەن ئاسەواری مێژوویی هەن و کاتێک گوێ بۆ پیرەکانی ئەم شوێنانە رادەگری، ئەوان تا رادەیەک ئاگاداری ئەم شوێنانە هەن و دیارە ئەمەش بە شێوەی زارەکی لە باب و باپیرانیانەوە بۆیان بەجێماوە کە نیشانەی ئەم شوێنانە دووردن. بەداخەوە تا ئێستاش بە شێوەیەکی بەرچاو و زانستانە لە لایەن دەسەڵاتی ئەم وڵاتەوە پسپۆڕو لێکۆڵەری ئەم بوارە دانەنراوە کە بەشوێن ئەم بابەتانە بکەون، بەڵام پێچەوانەی ئەوەی بەشێوەیەکی بەرچاو و ئاشکرا، ئەم شوێنەوارانە دەدرێنەوە و ئاسەوارەکانیان دەدزرێ و ئەمەش خەسارەتێکی گەورەیە لە ئاسنامەی نەتەوەیی و بەگشتی هەموو ئاسەواری کورد.

**هونەرمەند بۆی نییە لەبارەی کارەکانی خۆی بدوێ مەگەر ئەوەی کە شتێکی نوێی پێبێ.**

*** باشە وەک شێوەکارانی هاوچەرخ دەکرێ ئاماژە بە ناویان بکەی؟**

- بانەڵێین هاوچەرخ، لەبەر ئەوە وەک چۆن لەسەرەوە ئاماژەم پێدا شێوەکاری وەک لە هەموو کوردستاندا، لە بۆکانیشدا نەگەیشتۆتە سێ چارێگە سەدە، ئێمە نە مێژووی شێوەکاری و نەشێوەکاری ناهاوچەرخمان بووە کە پرسیاری هاوچەرخەکانم لێ دەکرێ، بەڵام بۆ وەڵامی

پرسیارەکەت ئەوانەی کە لە ئێستادا خەریکی کارکردنن. هونەرمەندان، مامۆستا مستەفا شێرزاد، مامۆستا رەئوف نادری (پەشێو)، مامۆستا محەمەدی رۆستەم زادە(نامۆ)، شێرکۆ سەعادەتی، شۆرش ئاهی، سمایل جان براغی، هێمن مام عەزیزی، هێمن قارەمانی، سودابە مام عەزیزی، خانمی نادری، سەعید حەسەن زادە و کۆمەڵێک کەسی دیکە کە بەشێکی یەکجار زۆریان گەنجن و کە ناویان ناهێنم، غەدر نەبێ لەوان بەراستی ناویانم بەباشی لەبیرنەماوە، کە هەموویان بەباشی خەریکی کارکردنن لەناوەندە هونەرییەکان و زانکۆکانی ئێران...

*** ئەی ئەم هونەرمەندانە سەر بەچ رێبازێکی هونەرین؟**

- کارکردن و ئەزموونەکانی هونەری شێوەکاری لە بۆکاندا، بەم تەمەنە کورتەیەوە، نابێت چاوەڕوانی ئەوەی لێ بکرێ کە دەست بەجێ خۆی لەناو رێبازو شێوازەکاندا بدۆزێتەوە، بەڵام ئەوەی کە بەرچاوەو دەبینرێ، زیاتریان کاری نوێیە هەم لە تابلۆداو هەم لەدەرەوەی تابلۆ ئەم هونەرە زۆر پابەندی نەریت و کۆت و بەندەکان نییە کەواتە ئەوە هونەرمەندەکانن کە برێکی بەچەشنی نوێخوازییان هەیە میتۆدی کاری ئەم هونەرمەندانە سەر دەرهێنان لەهەموو کەلێن و قوژبنەکانی فکری فەلسەفی نییە، یان باشتروایە بڵێم کە سەر بەچەند قوتابخانەو رێبازی هونەری تایبەت نین بۆ وێنە کەمتر دێتە بەرچاو کە یەکیان بانگەشەیەکی بۆ کۆپیزم لە کارەکانیدا کردبێ، ئەم هونەرمەندانە نوێخوازن بەگشتی دوورەپەرێزن لە هەر چەشن و کارکردنێک کە تەنیا کلاسیکی بێ و کۆنەپارێزیش نین، با ئەوەت پێبڵێم کە چەخماخەی هونەری شێوەکاری مۆدێرن، لە ئەمپریشیزمەکان-ە بوو، مەبەستم ئەوەیە کە ئەگەر بەشێک لەوان بانگەشەی هونەری مۆدێرن دەکەن، مەرج نییە کە بچنەوە ناو شێوازو قوتابخانە هونەرییەکان و لەسەرەتاوە ئەم رەوتە درێژە پێبدەن ئەوەی کە ئەوان لەم شێوازانە تێناگەن، بەڵام پێشم وانییە ئەوەندە چاوەڕوانی شێوازە هونەرییەکان بکەن کە ببنە سەردەمداری رەوتەکەیان. بەکورتی داهێنان، وەکو یەکەم خاڵی دەسپێک بۆ تابلۆ لەواندا بەدیدەکرێ. جا ئەو داهێنانە چ عەقڵی بێ یان ناعەقڵی(هەستی). چ بەرەنگ و تابلۆ بێت، یان کەرەسەکانی دەوروبەر. زۆریەک لە کارەکاندا بابەت رۆڵی سەرەکی هەیە ناوەرۆک دەور دەبینێ، بەڵام نەک بەو جۆرەی کە ناوەرۆک داگیرکەری سەرلەبەری فکرو کەرەسە بێ و ناوەرۆکێکی سواوە بێ، بەڵکو ئەو ناوەرۆکەی کە زۆرجاران لە

لەهیچ رێبازێکی هونەری دانیم. ئەم پرسیارە زۆرم بەلاوە ناخۆشە.





کەرستە دەردەکەوێ و بینەر سەرسام دەکا. بۆ وێنە من دەتوانم ئاماژە بە پێشانگایەکی مامۆستا محەمەدی رۆستەم زادە بکەم، کە چەند ساڵ لەمەوبەر لە بۆکان بەڕێوەی برد ئەم کارە بەر لە هەرشتێک کارێکی ئابستراکت ئیکسپرسۆنیزم بوو، بەڵام داهێنانێکی گرنگ لەو کارەدا بەدی دەکرا ئەگەر مەجالم بدەنێ کەمێک لەم پێشانگایە بۆت بدوێم. لەم پێشانگایەدا زیاد لە ٣٥ تابلۆی تێدابوو بەگشتی تابلۆکان لە ئەندازەیەکی ١٨٠ تا ١,٥٠×٥٠ /بوون، سەردکیترین کەرەستە نایلۆن بوو کە پانتیی تابلۆکانی داگیر کردبوو هەر ئەم نایلۆنە لەهەموو تابلۆکاندا هاتبووە دەرێ، (سنوورە

**تابلۆ چوارچێوەیەکی زۆربەرتەسکەو حەزیش ناکەم تەنیا ڕەنگ و فلچە بەکار بەرم.**

چوارچێوەییەکانی تێپەڕاندبوو) و لەناو هۆڵەکەدا بلاو ببوونەوە، کە ڕەنگە زۆر بەسەر نایلۆنەکانیشدا ڕۆیشتبێ و زۆر کەسیش خۆی لێ لادابن، ئەمە چەشنێک داهێنانە لەم شێوازەدا، کە دووبارە هێنانەوەی کەرەسەیەک، یان شتێک لە سروشتەوە بۆ ناو گالەری و ڕۆحییەتێکی ئیکسپرسیۆنیزم-ی پێدان بەو کارێکی نوێ بوو. کەواتە پێویستە پرسیار بکرێ ئەرێ داهێنان بەدی دەکرێ، یان نا؟

*** ئێستابزاڤی شێوەکاری لەشاری بۆکان چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟**

- بزاڤی شێوەکاری لە بۆکان، بزاڤێکی خۆڕسک و خاوەن بنەماو و خاوەن پڕۆژەیە، بە گەنجێتی لەدایک بووەو بەرچاوی تەواو ڕوونە. چاولێکەری و لاسایی کردنەوە نییە، بەگشتی یان باشتروایە بڵێم بەشێکی زۆر لەو شێوەکارانە لە ماناو فەلسەفەی هێڵ دەگەن، جا دواتر خۆ لە هونەری چەمکی« ConceptuaL Art » دەدەن بزاڤێک کە شارەزایی باشی لە بنەماو مەبانییەکانی هێڵ و ڕەنگ بێ و پرۆژەی نوێ و ئەمرۆیانەی پێ بێ. دەرەنجامی باش دەبێ بەکورتی بزاڤی شێوەکاری لە بۆکان بزاڤێکە تا ئێستا ئەم بوێریەی بووە کە خۆی لە کارەکانی دوای ١٩٥٠ی ئەمریکا بدا، کە ئەمڕۆکە دەغدەغەی هەموو هونەری جیهانە وەک چۆن بزاڤە نوێییەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکان و بەتایبەت ئەمەریکاو بەتایبەتیش بەدوای پاپ ئارتدا« pop Art » سەرنجی هەموو شێوەکارانی جیهانی بۆخۆی ڕاکێشاوە، سەرنجی ئەم بزاڤە تەمەن کورتەش بۆ لای خۆی ڕاکێشاوەو، بەڵام بەهۆشیارێکی تەواوەوە هەنگاو دەنێ.

*** لە چەند پێشانگای تایبەتدا کارت کردووە؟**

- تائێستا پێشانگایەکی تایبەتم کردۆتەوە کە ئەویش بەدوایدا هاتم بۆ شاری هەولێر، لەوێ بەڕێوەم برد، لەژێر ناوی«خوانێک بۆ سەدام حوسێن لە کوردستان» کە مانگی یەکی ٢٠٠٤ بەڕێوەم برد.

*** ئەو ئەزموونە هونەرییەت لەو قۆناغەدا چۆن دەنرخێنی؟**

- لەبارەی کارەکەی خۆمەوە نادوێم، بەڵام زۆر جیاوازتر بوو لەم کارانەی کە لێرە دیتوومن، بەشێکی زۆر لە کارەکانی ئێرە تابلۆن، بەڵام هی من سنوورەکانی تابلۆی تێکشکاندو هاتە ناوگالەرێوە بینەریش بۆی هەبوو ئاڵوگۆڕ لە کەرسەکاندا پێکبێنێ. ماکس بێکمان ئیکسپێرنیلش کاری ئەڵمانی لە وتارێکدا کە لەبارەی کارەکانی خۆیدا ددوا، بەناوی«سەبارەت بە شێوەکارەکانی خۆم» دەڵێ: هونەرمەند بۆی نییە لەبارەی کارەکانی خۆی بدوێ مەگەر ئەوەی کە شتێکی نوێی پێبێ، ئەوە لە حاڵەتێک دابوو کە ناوی وتارەکەشی تەنانەت لەبارەی شێوەکارەکانی خۆیەوە بووە، منیش لە سەرەتادا گوتم لەبارەی کارەکەی خۆمەوە نادوێم، بەڵام ئەم چەند دێرەی سەرەوەشم پێ وتی. چۆنێتی هەڵسەنگاندنی کارەکەشم دەخەمە ئەستۆی تۆ و بینەرو رەخنەگر،

*** ئەی رای رەخنەگران و جەماوەری هونەرەکەت رایان چۆن بوو بەرامبەر پێشانگاکەت؟**

- بەشێکی زۆریان پێیان باش بوو، بەڵام بینەرێک سەرنجی راکێشام کە هات پێی وتم: داوای لێبووردنت لێدەکەم من لە هۆڵەکە، دەچمە دەرێ چونکە خەریکە دەرشێمەوە دیارە من لەم کارەدا فەزایەکی یەکجار وەحشییانەم سازکردبوو، ماوەی سێ رۆژ بە قەسابخانەکانی ناو شاری هەولێر گەڕام و هەرچی پاشماوەی کوشتارو کەللەسەری ئاژەڵ و هێسک و ورگ و ریخۆڵەو پێ و پۆخڵەواتی ئەم شوێنانە بوو، کۆم کردەوەو، لەسەر مێزەکەی ئێوارە خوانەکەم دا هەڵڕشت و بەگشتی فەزایەکی تەواو بێ لەزەت و پیس و بۆگەنیوم سازکردبوو، ئەم بینەرە راستگۆترین بینەری من بووە.

*** لەو پێشانگا هونەرییە گشتیانەدا لەگەڵ کێدا بەشداریت کردووە؟**

- لەیەک پێشانگای گشتیدا، لەشاری سەقز بەشداریم کرد لە ساڵی ٢٠٠٠ز بەتابلۆیەک، لەگەڵ دوو هونەرمەندی شێوەکاری دیکە بەناوی هێمن مام عەزیزی و شێرکۆ سەعادەتی لە بۆکانەوە بەشداریمان کرد، دیارە لەوێش شێوەکاری دیکە لە شارەکانی دیکەی کوردستانەوە هاتبوون، ئەم پێشانگایە بۆ رێزلێنان لە شێوەکاری کورد فەیزوڵڵا خانی ناهید بەڕێوە چوو.

*** لەکام رێبازی هونەریدا کار دەکەی؟**

- لەهیچ رێبازێکی هونەری دانیم. ئەم پرسیارە زۆرم بەلاوە ناخۆشە، بەهیچ جۆرێک خۆشیم لەو جۆرە پرسیارانە نایە!!

**ئێستا ج هونەرێک لە جیهاندا نەکەوتۆتە ژێر کاریگەری یەکترەوە بەجیاواز لە قوتابخانەکان هەندێکیان وەک ئەمپرسۆنیزم.**





بەڵام با بێوەڵامت نەکەم خۆشیم لە داهێنان دێ، بەداهێنانەوە سەرقاڵم و سەرقاڵیش دەبم، هەرشتێک سەرنجم رابکێشێ بەلامەوە گرنگە، پەیکەرەکانی ئولدێنبورگ، پەیکەرەکانی کارۆ، کارەکانی ئەندی وارهۆل، کریستو، فۆتۆریسمەکان و بۆتۆ چوونی، شێوەکاری منداڵ کە بوێرێکی سەرسوڕهێنەری تێدا دەبینم، چاولێکە ئەمن هەموو ئەوانەم خۆش دەوێ، زۆرم پێخۆشە لە نزیکەوە پەیکەری، «گیرە، کەوچکە، سوراو ،ژولەب)ی ئولدێنبێرگ و ڤان برووگێن ببینم، من تەواو چێژ لەوانە وەردەگرم، بەڵام سەر بەهیچیان نیم. هەموو ئەوانە کە ناوم بردن، جیاوازیان لەگەڵ یەک هەیە، کەواتە منیان دەوێ سەر بەهەموویان بم، یان سەر بە هیچیان، من ئەوەی دەوەمیان هەڵدەبژێرم، کە خۆشم لە کارێکی هونەری دی لاسایی ناکەمەوە ئەگەر سەرنج بدەیە ئەم وشەیە: دەڵێم«خۆشیم» لەو کارانە دێ، یانی دەمەوێ پێت بڵێم کە تەنیا «خۆشیم» لێیان دێ، ئیتر نەلەم رێبازە هونەریەدا کاردەکەم و نە لەوی دیکەیان. لە رەخنە زارەکیەکانی گالەریدا، کاردکەمیان بە کارێکی پێویست مۆدێرنە ناساند. راستە وەک مێژوو، ئەم کارەو سەرهەڵدانی ئەم جۆرە کارانە لەنیوسەدە تێناپەڕێ، کە ئەویش لە ئەمەریکادا سەری هەڵدا، بەناوی پاپ ئارت«pop Art» هی من یەکێک بوو، لەم لقانەی «pop Art» پاپ ئارت. ئەوەش بەو مانایە نییە کەمن شتێک هەر لەو رێگایەدا کاردەکەم، من پرۆژەم بۆ داهاتووی دوور نییە، بابەت ئەوەندە کۆن ناکەم و بینەری پێ ماندووبکەم و **غەدریش** لەبینەری کارەکانم **ناکەم**، دەوروبەرم **پڕە لە بابەت، من** زیاتر شتەکان **رادەکەم تا** بەدوایانەدا **بگەڕێم، بەڵام** ئاگاداربە **کە هەموو** ئەم شتانە بەرگێکی نوێیان پێدەبەخشم، بەرگی نوێ مەبەستم کەرەسەی نوێیە، زۆرتر گرنگی بە ناوەرۆک و کەرەسە دەدەم هەتا شێواز، یان شێوازی بێ ناوەرۆک.

*** ئەی چۆن لە چوارچێوەی تابلۆدا هاتیە دەرێ؟**

– تابلۆ چوارچێوەیەکی زۆر و بەرتەسکەو حەزیش ناکەم تەنیا رەنگ و فلچە بەکار بەرم بایەخ بەزۆر شتی دەوروبەرم دەدەم، کاتێک خەریکی کارکردنم لە زۆر شتی دەوروبەریشم کەڵک وەردەگرم بۆ ناوەرۆکی کارەکەم، کەواتە نەخۆم و نەکەرەسەکانم لەناو تابلۆدا جێمان نابێ، کەرەسەی کارەکانم زۆر لە چوارچێوەیەکی ناو تابلۆ خۆشتردەوێن بۆیە غەدریشیان لێ ناکەم. هیچکات وێنەی گلاسێک ناکێشمەوە. گلاسەکە دادەنێم، رەنگە کەسێک لە هۆڵەکەدا تینووی بێ و ئاوی پێ بخواتەوە. جا دەیهێنێتەوە جێگەی خۆی، یان نایهێنێتەوە پرۆژەکەی من تا کۆتایی پێشانگاکە هەر بەردەوامەو بینەری خۆی دەبێ. هەمووی ئەم شتانە، منیان هاندا لە تابلۆ

بێمەددرێ.

*** چۆن دەڕوانییە بزاڤی شێوەکاری لە شارەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان؟**

- ئەم بزاڤە لە شارەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا هەیە ماوەی ساڵێک لێردم و بەر لەهاتنیشم بۆ هەولێرو بەگشتی باشووری کوردستان دووساڵ لە باشووری ئێراندا ژیام، هەمووی ئەم بزاڤانە زۆر بەخێرایی و بەتایبەت لەم دواییانەدا بوون، خۆشت ئەوە باش دەزانی کە بەرهەمی هونەری پێشانگایە، مەبەستم ئەوەیە کە زیاتر وەک پێشانگا راڤەی بەرهەمی شێوەکاری دەکرێ و منیش ئەم ماوەیە لێیان دووربووم و نەمتوانیوە زۆر سەردانی پێشانگاکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بکەم، بەڵام کاری دوو بزاڤ بە دوو جۆری جیاواز هەم لەوێ لەسەقزیش بزاڤێکی نوێخوازی هەیەو خەریکی شکل گرتنە، وەک یەکەم کەس، یان لە باشترینیان دەتوانم ئاماژە بە کارەکانی ناسری فەیزوڵلاهی بکەم و لەشاری سنە ئەوەی کە زیاتر بەرچاوە، ئەم بزاڤەیە کە بەشێک لە هونەرمەندەکان روویان کردۆتە کاری کلاسیکی و ریالیستی، دیارە ئەمەش لەژێر کاریگەری پەیکەرسازو شێوەکار(هادی زیائەدینی) دایە کە بانگەشە بۆ ئەم چەشنە هونەرە(کلاسیک) دەکاو لەکاری خۆشیدا کەسێکی شارەزاو لێهاتوو و هونەرمەند[، بەتایبەتی لەم چەند پەیکەردیەی دواییەدا، کە پەیکەری«مامۆستا هەژار» کە لەشاری مهابادەو پەیکەری«هێمن»و هەروەها پرۆژەکانی دیکەشی لە شێوەکاریدا، کە باسی شارەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ناکەم، نامەوێ قەت لێیان بدوێم چوون بەراستی تەواو ئاگاداری کاریان نەبووم و نیم.

*** تا چەند شێوەکارانی کوردی ڕۆژهەڵات لەژێر کاریگەری هونەری شێوەکاری ئێرانی دان؟**

-بەرلەوەی کە باسی کاریگەری هونەری ئێران بەسەر هونەری ئەم بەشە لە کوردستان بکەم، با لەشتێک بدوێم بەهۆی نەبوونی هەولێکی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دابەشکردنی ئەم خاکە بۆ چواربەش و بەسەر چوار دیکتاتۆرو...هتد.

دۆخێکی نالەبار لەدوای دابەشکردنی کوردستانەوە روویکرد بۆ کورد، بۆ وێنە لە ئێران، فارسەکان هەتا



ئێستاش دانیان بەوەدا نەهێناوە، کە کورد نەتەوەیەکەو تەنانەت زمانی کوردی، بەزاراوەیەکی فارسی دەزانن، بەڵام خۆ هەموو شتەکان جاری وایە لە بەرژەوەندی ئەواندا نییە. لە رۆژهەڵاتی کوردستان پەیوەندییەکان لەگەڵ تاران و هەموو شوێنەکانی دیکەی ئێران باشە هونەرمەندە کوردەکان، هاتووچۆی شارەکانی دیکەی ئێران دەکەن و چاویان بەکاری هونەرمەندە فارسەکان دەکەوێ زۆرجار دیالۆگ و گفتوگۆ سازبووە، لەبەشێکی زۆر لە زانکۆکانی ئێراندا. (کۆلێژە هونەرییەکان) کوران و کچانی رۆژهەڵاتی کوردستان خەریکی خوێندنی هونەرن، لەم هاتوچۆو جموجۆڵە ئاساییانەشدا جاری وایە بەهرەی باشی دەبێ، ئێران لەو ناوچەیەدا لەرووی هونەرو کولتوورو شارستانییەت پێشکەوتوترە لەزۆر وڵاتی دیکە، فارسەکان لەم دواییانەدا هەڵمەتێکی بەربڵاویان بردەبەر ئێران و لەهونەری شێوەکاریشدا بەدەیان کتێبی وەرگێران و نووسینی باشیان هەیە، لەماڵێکدا ئەوەندەی من ئاگادارم. ئێستاش لە رۆژهەڵاتی کوردستان کتێبێک لەسەر شێوەکاری نەنووسراوەو نە وەرگێردراون، بۆیە لەم بارەشەوە کەڵکی باش لە کتێبە فارسییەکان وەرگێڕاوەکانیان لە لایەن هونەرمەندە کوردەکانەوە وەرگیراوە، دەسەڵات سنوورێکی سازکردووە وەک سنووری جوگرافیایی، کەمتر بوارو و توانای چوونە دەرەوە هەیە، بۆیە بەناچاریش بێ، هونەرمەندی کورد دەبێ لەم سنوورە جوگرافیایە بەناو «ئێران»دوە کەڵک وەرگرێ، دەمەوێ ئەوەت پێ بڵێم، کە پەیوەندییەکان زۆرن، کە کتێبە فارسییەکان و وەرگێڕاوەکان دەخوێندرێتەوە، ئەمە خراپ نییە، بەڵکو قازانجیشی زۆرە تا ئێستا لەئێران(تاران) دوو فیستیڤاڵ بۆ هونەری چەمکی «کانێپتچوال ئارت» بەرێوە چووە، ئەمە کارێکە کە بەدوای ١٠ ساڵ لە ئەمریکاوە گەیشتە ئێران و لەهەموو ئێرانەوە بۆ ئەم فیستیڤاڵە کاریان ناردبوو، هەموو ئەم شتانە بۆ کەڵک وەرگرتن بۆ دێن. نەک بۆ ئەوەی کە بچێتە ژێر کاریگەرییەوە، بەڵام من پرسیارێک دەکەم، ئێستا چ هونەرێک لە جیهاندا نەکەوتۆتە ژێر کاریگەری یەکتردوە بەجیاواز لە قوتابخانەکان هەندێکیان وەک ئەمپرسۆنیزم، کە تەواو خۆرسک بوو کەباس لە فەلسەفەی تیشک و رەنگ دەکا، لەم دواییانەشدا «pop Art» کە ئەویش خۆرسک بوو، بەڵام ئەوەی رۆژهەڵاتی کوردستان دووجۆرە، لە کلاسیک خوازەکانی (زیانەدینی)یەوە هەتا دەگاتە مۆدێرن خوازەکانی ئەوێ، هونەرەکەیان رەنگ و بۆی ئەم شوێنەی بەخۆوە گرتووە، بەڵام ئەم بزاڤە نوێیەی کە لەئێستادا هەیەو لەگەڵ بزووتنەوە ئەمریکییەکانی فارسەکانی ئێران، هەمووی رووی کردۆتە هونەری دوای ١٩٥٠کانی ئەمریکا، لە رێگەی پەیوەندییەکان، ئینتەرنێت، راگەیاندن هەرچەندە هەمووی سانسۆری لەسەرە، بەڵام ئەم بزاڤە راستەوخۆ ئاگاداری بەسەر کارە نوێییەکانی رۆژئاواو ئەمریکادا هەیە، جا لێرەدا کاریگەری تا چ رادەیەک دروست دەبێ، یان نا، نازانم چۆن هەموو ئەمانە مێژوویەکی کورتی بووە لە ئێرانیش و رۆژهەڵاتی کوردستانیش دادەنێ چاوەڕوانی گەشەی لێ بکرێ، بەڵام لەکۆتاییدا ئەوە دەڵێم هەرچەند بەشێکی زۆر لە مامۆستاکانی خۆمان لەوێ لەتاران کاریان کردووە، بەڵام نەئەوان و نە ئێمەش وەک قوتابی ئەوان نەکەوتینە ژێر کاریگەری هونەری ئێرانەوە، بزاڤی نوێکاری شێوەکاری رۆژهەڵاتی کوردستان شارەزاو ئاگاداری بزاڤ و رەوتی «pop Art» پاپ ئارت و بزاڤە نوێییەکانی دیکەی جیهانە.

* تا چەند مامەڵەت لەگەڵ کەلەپووری میللی شێوەکاری کوردەواری کردووە؟

- کەلەپووری کوردەواری، لای من بایەخێکی یەکجار زۆری هەیە چ بەباری مادی و چ بەباری مەعنەوییەکەیدا، بەڵام هەتا ئێستا لە کارەکانمدا رەنگی نەداوەتەوە، لە راستیدا پێویستیم پێ نەبووە، بەڵام بایەخیشی بۆ دادەنێم

**ئا/ نیاز محەممەد**

# دۆخاندنی سروشتە خود لە قاوخی واقیعێکی دیکەدا

## بەدیدی هونەرمەند دلّپاک سەعید

نووسینی: سۆزان ئیسماعیل



خانمە هونەرمەندی شێوەکار (دلّپاک سەعید) لە دوا ئەزموونی هونەرییدا بەکردنەوەی پێشانگای تایبەتی دووەمی لەژێر ناونیشانی «سیمفۆنیای دەشت»، دوای تێپەڕبوونی چوار سالّ بەسەرکردنەوەی پێشانگای یەکەمی کە لە سالّی (٢٠٠٠) ئەنجامی دابوو، وا ئەمجارەیان گۆڕانکاری بەشێکی زۆری بەرهەمهێنانی تابلۆکانی گرتۆتەوە، بۆیە پێم باشبوو وەک کەسێکی پێداچوو بەسەر هەریەک لە کەڤالّەکانی هونەرمەند چەند تێبینی و سەرنجێک لەگەلّ گەرمەی بەسەرکردنەوەی پێشانگایەکە تا ساتی ئێستای ئەم نووسینەم بخەمەڕوو.

لە چوونە نێو قولّایی کارەکانی ئەم هونەرمەندە بەسەرەتاگەیەک لە فۆرمیولای وێناندنی کەڤالّەکانیدا، راگرتەی ئەو تێگەیشتن و بۆچوونانەی دێنێتە دواندن و قسە لەسەرکردن

سەبارەت بەوەی کە چ فاکتەرو مەبەستێک هەیە لەم دامەزراندنەی بناغەیی لە کاردکانیدا ، لە پاڵ دەرخستنی ئەم جۆرە خۆنیشاندانە، «ستانسلافسکی» دەڵێت: «پێویستە هونەرمەند هونەرەکەی لە خۆیدا خۆش بوێت، وادیارە دڵپاک سەعیدی هونەرمەندیش لە گرێبەستێکدایە بۆ توند بەندکردنی نێوان هەستی جوانی هونەری خۆی لەلایەک و جوانی سروشتی و واقیعییەت لەلایەکی تر بە هۆی ئەوەی سروشت پێگەیەکە بۆ گەیاندنی ئێستێتیکای رەنگ و چێژ بە خشینی شەهوەتی خود بۆ تێربوونی لە سیمای ئەو فۆرمە جۆراوجۆرانەی کە هەردەم بۆ ئاوێزانی هەموو بوونەوەرێکدا باوەشکراوەیە، هەر لە رەنگاڵەیی گوڵ و گوڵاڵەو سەوزە لانی رووەک و درەختەکان و جووڵەو هارمۆنیای شەپۆلی رووبارو دەریاکان، هەروا فراوانی فەزای ئەو ئاسمانەی کە هەناسەکان تێیدا حەوانەوەی ئیلهام پێدەدرن، ئەمانە هەر هەمووی بەتەک خۆیەوە دەبێت بەوهاوەڵ پەیداکردن بۆ هونەر، لێرەدا ئەم هونەرمەندەی بەر لە تێکەڵبوونی لەگەڵ سروشتدا بۆخۆی حەزو خولیای هونەر لە ناخیدا جێگیربووبێ، ئەمە بەچەشنێکی تر لەگەڵ تێروانین و تێرامانی هونەری تێکدەکەنەوە، چەشنی تری هونەرمەند هەیە کاریگەری سروشت تەنهاو یەکلایەنە چێژی پێ هەڵدەرێژێ و لە هونەرەکەیدا رەنگدانەوەی دەبێت، بەڵام جۆری دڵپاک سەعیدی هونەرکار بۆ خۆی عیشقێکی تایبەتی لەگەڵ هونەردا هەیە پاشانیش تێکەڵی سروشتی دەوروبەری خۆی بووەتەوەو سەرنجی بە ئینتیباعی تێکەڵبوو لەگەڵ خەیاڵ و ئەندێشەی پێکردووە، بۆیە ئەگەر چڕتر ئاخافاتنی لەسەر بکەین رەنگە لێک بەستنەوەی هەستی هونەری لە چوارچێوەی فۆرمی غەریزە خودگەراییەکان و هەست رێژ شتن لە سنووری بازنەی ئەو سروشتە گەردوونییەی کە ژیان لێ کەوتۆتەوە جۆرێک لە ئەستەمی و قورسایی بخاتە سەر دۆزینەوەی چارەسەر، بۆ حاڵەتە توش هاتەی کەکەسی





هونەرمەندی گرتۆتەوە، بەڵام من وا دەڕوانم هونەرمەند لە هەوڵ و تەقەلادایە بۆ لە خشتە دارشتن بۆ ئەم مەعریفە تیۆرییەی کە بەر لە بەپراکتیکردنی بۆ سەر رووبەری تابلۆ خۆی لە قەرەی داوە، لەکاتی بەئەنجام گەیاندنی کارەکەی لێزانی و سەلیقەی هونەرمەند لەوەدایە بەچۆن تەکنیکێک بە کەرستەی ئەو توخمی پێکهاتنەی تابلۆکانی بداتە بەر نەخشەی شێواز پێدانەکەی، لەنێوان ئەم پێکهاتانە چۆن بەبابەتی فیکرەکانی ببەستێتەوە و رێکخستن و بەرجەستەیی یەکتریان بکات.

هەمدیسان ئەمانە بۆ خۆی مەرجێکن بۆ پێداویستی هێنانەدی ئامانجی هونەرمەند.

(سیزان)ی هونەرمەند دەڵێ: «لە دوای رواڵەتە جۆربەجۆرەکانی سروشتەوە یەک حەقیقەت هەیە، کە بەردەوام هەمیشەییە و، پێویستە هونەرمەند بیدۆزێتەوەدو لەودیو رواڵەتی ساکارە بگۆڕەکان حەشاردراوە».

لێرەدا دەکرێ بڵێین تەوزیفکردن بەسەر ناوەڕۆکی هەر بابەتێک ئەوە دەست کاریکردنە بەسەر سیستەمی ئەو پێکهاتە ماددییەی کە سروشتی بابەتەکانی لێپێکهێنانەوە.

بەدیوێکی دیکە گۆڕانکاری بەسەر خاسییەتی هەرشتێکی مەبەستدار بۆ دووبارە پێکهێنان و دروست کردنەوەدیەتی دوای لێکترازان و تێکشکاندنی چ لەڕووی فۆرم بێت یان ناوەڕۆک ئەوە بوونێکی نوێ دێنێتەکایەوە، کە لەگەڵ هەلومەرجی تازەی ئەم سەردەم و تاقە هەوڵدەدات بیانگونجێنێ کە لەگەڵ رێساو یاسایەکی خودەکی (الذاتی) دەبێت.

وەلێ ئەم پرۆسیسە کارکردنە جێگای سەرمەست بوونە بۆ هاتنە نێو کۆری گەرمی بزاڤی شێوەکاری هونەرمەند بەگوێرەی ئەو پێوەدانگە نزیکراوەی کە گۆڕەپانی بەرهەمهێنانی کارەکان لەسەر پەیڕەو کردووە. ئەم بەهاوکێشە

کردنە بۆ سەر دیاردەی ئامانجدارییەتی شێوازی کارکردن هونەرمەند لەسەر بنچینەی پەنابردنە بەر ئەبستمۆلۆژیا خوازی بۆ کارەکانی لەمەدا تێربوون لە میتا واتای شتەکان دەرهەق بە ئیمپرێشنیزمی ناوەختی خود بەرامبەر دەوروبەر دووبارە بوونەوەی واقیعیی شتەکان بۆ خاسیەتی خۆی هونەرمەند دەگاتە پەیڤێک لە نێوان

خۆشحاڵیبوون و وەرزبوون، بۆیە دزەکردن بەنێو ئەو بەسەر یەکگردبوانە دەکات و بەسەرنجخوازێکی زانین بۆ کایەی بوون سروشت دەهێنێتە بەر قەپێلک لە واقیعێکی تردا.

سەرباری ئەوەی بەچڕی رۆشنبیرییەکی تیۆری گشتیدا خول دەداتەوە.

بەڵام پێدەچێت وەرگێڕانی زۆری تێگەیشتن و مانابەخشین لە چەمکییەتی هونەری شێوەکاریدا بە ئێستاتیکای دۆخی سروشت بدات هونەرمەند لە وەزیفەیەکی تری بار پێدان بەبنچینەی توخمە پێکهاتەکانی کەڤاڵەکاندا ئیشارەت بۆ هێمابوونی سیفەتی ئەو لق و پۆپ و ریشاڵەی پێکهاتووی سروشتی رووەکەکان دەکات، بەسایەی ئەو توانستە ماددییە



دەربڕینکارانەی کە یەکایەتییەکی یەکبوون رەگەزەکانی پێکهاتەی کوتلەی شێوەکان بەشێوەکاری دەگەیەنێت. بەم روانگە گەیشتنەی کارەکانی هونەرمەند دڵپاک ئەوە بۆ چەندین پرسیاری دیکە پەلکێشی ناو تایبەتمەندبوونی شێوازی خۆیان دەکاتەوە. بۆ نموونە لە هەڵبژاردنی بیرۆکەی بابەتەکانی نەهاتووە تەنها وەک خۆی لە پێکهاتەی ماتریالییەتی هەرتەن و ماددەک سیفەت بیەخشێتەوەو دووبارەی بکاتەوە تەنها لە مەنلوفییەت رزگاری بکات، بەڵکو لەبری ئەوە هاتووە دامەزرانێک بۆ بنەمای بیرۆکەی هەر ماددەیەک دابنێت و جۆرە ئایدیایەکی تری بەباڵا بکێشێت و، لەگەڵ شوێنگەی تۆپۆگرافیای ناوچەگەریدا بیگونجێنێت و خۆی لە تەرحکردنی تەلیسمی بابەتەکان تێبگات و بەداخواستن هێنانەوە وەسف بۆ بوونی کەرەستەی بەکارهێنراو دابنێت و، لەسەر هێڵێکی گشتی گوزارەپێکراو سەرنجخوازی فۆتۆریزمی سنوور دەکێشێت بۆ

میتۆدۆی کارەکانی.

لەلایەکی تریش هەر لە چوارچێوەی گرتەی تێڕوانینمان بۆ مەغزای کارەکانی هونەری دەکرێ بڵێین، ئایا هونەرمەند لەڕێگای شێوازەکەی بەباتەکانی روون و ئاشکرابووە یان بەپێچەوانەوەیە؟

ئەگەر شێواز وەک ناسنامەی هونەرمەند بناسرێتەوە، هونەرمەندیش لە پێگە بەستراوی ئەو واقیع و سروشتەوە هاتۆتە بوون، کەواتە هونەرمەند بەوەرگر دادەنرێت، وەرگری ئەو بابەتانەی نێوان خۆی و سروشتەکەی، واتە هونەرمەند پڕیەتی لە بابەتی جۆراوجۆر، کۆبوونەوەی ئەو بابەتانەش پێویستی بەشێوازێکە بۆ ئەوەی لە ناسنامەیەک تۆماربکرێ و، کە تیایدا بناسرێتەوەو ببێتە بەخاوەنی.

لە ڕێگەی ڕۆچوونێک بەنێو سایکۆلۆژیای کەسایەتی هونەرمەند بەپێی دانیشتووی ناوچەکەی جۆرێک لەناجووتبوونی دوو حاڵەتی دەگەیەنێت لەکاتی پراکتیزەکردنی کارەکانیدا.

بەشێوەیەک کە هونەرمەند ژیان لەناوچەیەکی ڕۆژهەڵاتی کاریگەربوو بە ڕەنگە ئۆرینتالییەکانی گەرم دەباتە سەر، لەکاتێکدا ڕەنگ بەکارهێنانی هونەرمەند لە بابەتی تابلۆکاندا سیمای ڕەنگی سارد رووبەری سادی هەموو تابلۆکان گرتۆتەوە.

خولخواردنەوەی هونەرمەند لە دەوری ئەم ڕەنگانە بۆخۆی ڕەنگدانەوەی حاڵەتێکی تایبەت بەکەسایەتی سایکۆلۆژی ئەو نیشان دەدات، بۆ هەست و نەستی بەرامبەر بەتیۆری ڕەنگ و مامەڵەکردن لە گەڵیدا.

جیا لە ماف پێدانی سایکۆلۆژییەتی زانستی سروشتی ڕەنگەکان بەپێی هەر ناوچەو شوێنێکی بەرکەوت بەسەرچاوەی دەرچوون ڕەنگ لە چاوگی خۆیەوە، ئەویش لەو تیشکانەوەن کە لەکەشکەلانی شەبەنگی خۆرەوە گوزەر دەکەن، کە زیاتر ناوچەی ئێمە وەک کوردستان ڕەنگی گەرم دەگرێتە بەر.

ئەم بۆچوونەی هەڵبژاردنی ڕەنگی سارد بۆ بابەتی تابلۆکان و تێکەڵ بەو دەربڕین کاردەی کەسی خۆی سانابوونە بۆ دیارخستنی شێوازی کارکردنی. کە تیایدا چەندین تێڕامان و دەلالەت غەریزەی کەبت بووی شرۆڤە کردووە. بەچەشنێک لە جێدانانی گەڵاو لق و بۆیەکان ریتمی مۆسیقا ژەنینەوە پێکچووی هەست و نەستی ئاوێتە بەیەکتر کردووەتە ناو سروشت کە هەردەمەو لە دۆخێکدان و سیستەم و ئیقاعێک بەژیان دەبەخشن. لەو بەرزو نزمانەی ئاستیاندا ژیان بەواتا کۆمەڵایەتییەکەن دەمانهێنێتە بەردەم ورووژانێک بەسەر ڕۆژگاری پڕ لە کەف و کوڵی ئەو کێشەو گرفتە ئەزەلییانەی تائێستاش لەناو خۆیی و بەشێوەیەکی تاکڕەویی ڕێبەری ئەستەمی ژیانەو تانەو رادەی بەکۆیەندی پێکەوەیی و جووتبەندی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی گرتۆتەوە.

هەر لەم پێداگرتنەی بە ئیحتیوای کەشی تابلۆکانی لە دەربڕینی ژیان و ئەو دەرهاوێشتانەی ڕێگا بە دەروازەی بابەتەکان دەکاتەوە بۆ بەردەم بزاوتنی ویژدان و بەزەیی هونەرمەند، ئەویش تاوێک ئاوڕدانەوەیە بە بەخشندەیی ڕۆح لەبەرەکان› ئەگەرچی بەدەرە لە ئادەمیزاد واتە وێناندنی مرۆڤ نابینرێت لەتابلۆکان کە وا دیارە ئەنترۆبۆلۆژیای مرۆڤ (النزعة الانسانیة) لە مرۆڤ بۆ مرۆڤەوە هۆکارێک بوویێ تیایدا هونەرمەند فەرامۆشی کردبێت، یانیش زاڵبوونی پیاوسالاری وایکردووە وێنەی هیچ بونیادێکی وەک توخمی نێر نەخرابێتە نێو هیچ سوچێکی تابلۆکان دەرخستنی سیمای ئافرەتیش وەک مێینە لە بەهێمابوونی و لە جێدانانی سروشتەوەیە ئەو ڕۆڵەی پێدراوە و، لەمەوە وا پێدەچێت پیرۆزییەک بۆ ئاسکییەتی و سۆزدارییەتی ئەو کائینە ببەخشێت بەبەراورد لەگەڵ سروشت ›بەبێ بوونی هیچ رووخسارێک وەسف لە پێکەوەیی ژیان دەکات بەمانا جوانییەکانی سروشت.



# ئەدەب

## بەرهەمهێنەری بەها جوانەکان

زیرەک کەمال

بەدرێژایی مێژووی خۆمان ستەمێکی زۆرمان لە ئەدەب کردووە، هەرگیز پێناسەی ئەدەبمان وەکو خۆی مامەڵەمان لەگەڵ ئەم ژانرە وەکو بوونێکی خاوەن هێزی مەعریفی و مەعنەوی سەربەخۆ نەکردووە. چونکە بەردەوام ئەدەبمان بەستۆتەوە بەپاشخانە سیاسی و سەرجەم کایە کۆمەڵایەتی و فیکرییەکان و وەکو پاشکۆی ئەم پاشخانەو کایە جۆراوجۆرانە سەیرمان کردووە، لەکاتێکدا ئەدەب خۆی شانشینی سەر تەخت و عەرشی خۆیەتی، ئەوە فکرو فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیاکان دێن بوونی خۆیان لە ئەدەب دەخوازن و خۆیان بەستاتیکاو جوانییەکانی ئەو ئارایشت دەکەن و تارادەیەکی زۆریش لەم دنیایە پڕ لە سیحرو ئەفراندن و راهێناندا هەناسە دەدەن، مۆدێرنەو پۆستمۆدێرنە بەر لەوەی بوونی خۆیان وەکو میتۆدێکی گەورەی فیکری رابگەیەنن، لەنێو باوەش و رەحمی ئەدەب چاویان هەڵهێنا. شکسپیر هەموو داهێنان و شاکارەکانی خۆی بەشیعر نووسین. ئەوەتا خودی دکتاتۆرەکانی مێژووش بەردەوام لە رێگای بەشاعیر بوونی خۆیان لە هەوڵی بێهودەو ماندووبوونی بێ ئاکامدا بوونە. ئەحمەد دیوانێکی شیعر ئەدەب بەرهەمهێنەری بەها جوانەکان بەچاپکەیاند رادۆڤان کەرازچی دیکتاتۆر رۆمانێکی نووسی ئاخر هیتلەریش دەیکوت شیعرە و سەدام حوسێنیش سێ رۆمانی نووسیوە، بەڵام هیچ کامێکیان نەیانتوانی دیکتاتۆر بەردەوام بۆ ناشرینی کردن و کوشتنی جوانییەکان و بەتاڵکردنەوەی ژیان لە هەموو مەغزاو جوانییەک بوون، ئێمەش وەکو هەر نەتەوەیەکی تری ئەم (رۆژهەڵاتە رۆژ لەبەر پێیەدا) بەردەوام ئەدەبمان بەهەموو شاکارو لق و پۆپ و ژانرەکانییەوە خستۆتە ژێر پێخوسی ناشیرینییەکان و کردوومانەتە پیشەیەک بۆ پینەکردنی جلە دڕاوەکانمان - جارێک دەیکەین بە لیزکی ئێوەدەستی خوا پێداوەکانەوە جارێک دەیکەین بەگوڵدانی سەر مێزی شەوانی بێ مانایی و، دەیکەین بەبەرخودی گاڵتەو گەپ و کوشتنی کات، راستە سەردتای بیری نەتەوەیی ئێمەش لەسەر دەستی ئەحمەدی خانی بەشیعر پژاو ئەو پیاوە گەورەی مێژوویان لەم رێگایەو لە فانتازیاو خەیاڵی شیعر وەکو گرنگترین ژانری ئەدەبی دەوڵەتی کوردی چێ دەکرد، راستە حاجی قادری بلیمەت ویستی لە رێگای شیعرەوە بینای رۆحی مەعریفی و دەروونی و شارستانی تاکەکانی کۆمەڵی کوردەواری و بکات راستە دنیای ئەدەب لە هەناوی خۆیدا نالی و گۆران و هەژارو... هتد، بەرهەم هێنا، بەڵام منیش هاوڕام لەگەڵ ئەو بۆچوونەی کە پێی وایە لە هەموو مێژووی رابردوو بگرە ئێستاشماندا ئەدەب نەیتوانیوە وەکو بوونێکی سەربەخۆ، وەکو کەسایەتی مەعنەوەو هێزی مەعریفی ئامادەبن خۆی لەنێو کایە جۆربەجۆرەکان و پانتاییە رەنگالەییەکان بیسەلمێنێت، چونکە چەمک و کایەو هێزی سیاسەت بەردەوام بەپاساوی ئاڵۆزییەکانی مێژوو، جەنگ و ململانێیەکی لە چارەسەر نەکردووی لەگەڵ تازەگەریدا کردووە، ئەو تازەگەرییەی کە دەبوایە ئەدەب پێشقەرەوڵ و داینەموو بزوێنەری بووایە، ئەمەش ناوێک بوو لەسەرەتادا ئەفلاتون ریشتی چونکە ئەو بەرلەوەی هەرشتێک بکات شاعیرەکان و هەموو وزەو جوانییەکانی ئەدەبی لە کۆمارەکەی خۆی وەدەرنا - بۆ ئەوەی زیندوویتی خۆمان لەسەر زەمینی واقیعدا زیاتر بسەلمێنێت، بۆ ئەوەی بەکردەوە زیانێکی گەشەدارو ترو دوارۆژێکی پڕ لە ئەشنەو داهێنان دەستەبەر بکەین، دەبێت ئەدەب لەنێو رارەوەکانی مێژوو و رەقەڵانی ژیاندا، رەوتی ئاسایی خۆی وەربگرێت. چونکە ئەدەب سایەو سێبەرێکە توانای پاراستنی ژیانی هەیە لە هەموو مردن و ناشرینییەک و ئاخر ئەتەوەی بێ ئەدەب بوونەوەرو هۆشیارێکی نووستووە، هەموو ئەوانەی کە ئەگەر بیانەوێت ئەخنکێن پەنا بۆ ئەدەب دەبەن، خۆ ژیانیش ئەوەندە جوان و خۆش نییە. ئەگەر ئەدەب بەژیان رانەگاو ئەوە جوانی و چێژو ماناش بەژیانەوە نامێنن.